حیزبەکانی تر حیزبی دوەم ئەبون. هەمو رەخنەیەک لە داوودەزگاکانی حکومەت و حیزبی دەسەلاتدار ئەبو لە ناو چوارچێوەی جەبهەدا ئەبرێتە دەرەوە.

٢. ڕێکخستنی سیاسی لە ناو هێزە چەکدارەکان دا: جەیش، جەیشی شەعبی، شورطە، ئەمن.. بە تەنها پاوانی بەعس ئەبو، هیچ حیزبێکی کە بۆی نەبو حیزبایەتییان تێ دا بکا.

٣. ڕێکخراوە پیشەیی و دیمەوکراتیەکانی کرێکاران، جوتیاران، قوتابیان، مامۆستایان.. ئەبو یەک بخرێن.

٤. حوکمی عیراق لە ڕێگای «مجلس قیادە الثورە» وە بە تەنها لە دەس خۆی دا ئەبێ.

لە ناو سەرکردایەتی پارتی دا هەبو، بە تایبەتی هەندێ لەوانەی وەزیر بون، بەشدار بونی لەم جەبهەیەدا بە چاک ئەزانی. بەلام مەلا مستەفا بێ سەودو ڕەتی کردەوە. حشع بەو مەرجە قورسانە بە تەنیا لە گەل بەعس چوە جەبهەوە، بەلام «بەرەیەکی سیاسی نابەرامبەر» بو.

*

سالی ١٩٧٤ کە شەری بەعس و کورد دەستی پێ کردەوە، دوسال زیاتر بو حشع هاوپەیمانی بەعس بو. چالاکی قانونی دەس پێ کرد بو: ڕێکخراوەکانی بارەگای ئاشکرایان لە شارەکان دا دامەزراند بو، ڕۆژنامەی «طریق الشعب» و هەفتەنامەی عەرەبی - کوردی «الفکر الجدید - بیری نوی» ی لە بەغدا دەرئەکرد و، لە پەرەدا بوبون بە ئەندام و، بە دو وەزیر: عامیر عەبدوللا و موکەڕەم تالەبانی، بەشداری لە وەزارەت دا و، بە چەند ئەندامی: یوسف حەننا، شیروان عەلی ئەمین، ئەحمەد حامید قادر، ئەحمەد دلزار، ئیبراهیم حاجی مەحمود، حەمە سەعید حەبیب، قادر ڕەشید، خەیری عەبدولحەمید قازی، مەحمود فەقێ خدر، سامیە شاکیر، لە داوودەزگا کارتۆنیەکانی حوکمی زاتی بەعسی دا (مەجلیسی تەنفیزی و مەجلیسی تشریعی) دا، بەشداری کرد بو.

حشع لە سەرەتادا هیوای زۆریان لە سەر هاوکاری خۆیان و بەعس هەلچنی بو، «پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری» لە گەل یەکێتی سۆڤییەت و، «ڕێگای ناسەرمایەداری» بەعس و دروشمە پێشکەوتووەکانی، بە جۆری سەری لە سەرانی حشع شێواند بو، کەسێکی خاوەن ئەزمونی درێژی وەکو عەزیز محەمەدی سکرتێری یەکەمی کومیتەی ناوەندی حیزبەکە، چاوەڕوانی ئەوە بو صەددام حسێن ببێتە «کاسترۆ» ی عیراق و، سەرەنجام حیزبی شیوعی و حیزبی بەعس تێکەلاو بێن و، بێن بە یەک حیزب.

لە ململانێ ی بەعس و کوردا سالی ١٩٧٤، حشع هەمو قورسایی خۆی خستبوە لای بەعس. لە سەر ئاستی دنیا، هەولێکی زۆری دا، شۆڕشی کورد بەدناو بکا و، لە هەمو حیزبە کومونیستی و سوسیالیستیەکانی دنیای دابڕی. لە سەر ئاستی ناوخۆش، هەرچیەکی پێ کرا لە بواری سیاسی، ڕاگەیاندن، چەکدار، تەنانەت کوکردنەوەی دەنگوباس و هەوال بۆ حیزبی بەعس و دەزگا ئەمنیەکانی کردی.

*

حشع سالی ١٩٣٤ دامەزراوە. لە ١٩٣٤ ەوە تا سالی ١٩٧٩، کاتی جیابونەوەی لە بەعس، تەنها ٣ جار کۆنگرەی گرتوە.

کۆنگرەی سێیەمینی حیزب، لە تەمەنی ٤٢ ساڵیی حیزب دا، لە ژێر دروشمی: «دەس لە ناو دەس بۆ پێشەوە بەرەو دامەزراندنی سۆشیالیزم لە عێراق دا» لە ناوەراستی ئایاری ٧٦ دا لە بارەگای، حیزب لە گەرەکی مەسبەح لە بەغداد بە ئامادە بونی ٣٠٠ ئەندام بەسترا. بەڵگەنامەکانی کۆنگرەکە بە زۆری تەرخان کرا بۆ بۆ پیا هەڵدانی دەسکەوتەکانی حوکم و، بەرە.

عەزیز محەممەد لەو تەقریرەدا کە بە ناوی کۆمیتەی ناوەندییەوە لە بەردەمی کۆنگرەدا خوێندییەوە لە چەند جێگایەکی دا بەمجۆرە باسی جوڵانەوەی کوردی کرد:

– «ویقف فی مقدمة منجزات الجبهة وضع قانون الحکم الذاتی لمنطقة کردستان وتصفیة التمرد الیمینی الرجعی فیها»

– «وان انهیار التمرد الرجعی المسلح خلق امکانیة موضوعیة افضل لتطبیق الحل السلمی – الدیمقراطی للمسألة الکردیة»

د. مکەرەم تالەبانی، کە ئەوسا یەکێ بو لە دو وەزیرەکەی حشع لە ناو وەزارەتەکەی بەعس دا، لە ستایشی ئەو عەقڵەدا کە بەعس بۆ بەشدارانی جوڵانەوەکەی دەرکرد، سەر وتارێکی بە عەرەبی لە ژێر ناونیشانی: «اشداء علی الکفار رحماء بینهم» بۆ گۆڤاری «رۆژی کوردستان – شمس کردستان» نوسی. لە وتارێکی کەدا کە بە کوردی بۆ هەمان گۆڤاری نوسی بو بە بۆنەی گرتنی دو کۆنگرەی جیاوازی کۆمەڵەی خوێندکارانەوە بە هۆی ئاکۆکی یەکێتی و پارتییەوە، ئەم دو لایەنەی شوبهاند بو بە سەگەکانی لەیلان و تەپلو.

پێخۆشحاڵی ئاشکرای حشع بە تێشکانی بزوتنەوەی کورد و، پشتیوانی لە رێککەوتنی جەزائیر، لە لایەک بۆ رازی کردنی سەرکردایەتی بەعس، بە تایبەتی صەددام حسێن و، لە لایەکی ترەوە لە بەر ئەوە بو وای ئەزانی ئەو بۆشاییە گەورەیەی لە ئەنجامی ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی بارزانی دا دروست بوە، بەمان پڕ ئەکرێتەوە. ئەمە خەیاڵێکی بەتاڵ دەرچو. بەعس ئەیویست خۆی بۆشاییەکە پڕ بکاتەوە. کە لە مەسەلەی کوردا یەک چاو بوەوە و، ئیتر ئیشێکی بە حشع نەما، کەوتە تەنگ هەڵچنین بە بنکەکانی حیزب و، ئازاردانی ئەندامەکانی پلەکانی خوارەوە.

کومیتەی ناوەندی لە ئازاری ١٩٧٨ دا کۆبونەوەی تەواوی ئەندامەکانی کرد و، راپۆرتێکی درێژی لە سەر هەلومەرجی جیهانی و، عەرەبی و، ناوخۆ بڵاو کردەوە. مانشێتی راپۆرتەکە ئەمە بو: «صیانة التحالف الوطنی وتعمیق المسیرة الثوریة مهمة کل قوی شعبنا التقدمیة».

سەرەتا راپۆرتەکە بەمجورە دەس پێ ئەکا:

«شهد العالم خلال السنة المنصرمة – منذ انعقاد الاجتماع الکامل الاعتیادی للجنة المرکزیة فی ١٨/ شباط ١٩٧٧ – استمرارا لعملیة تغیر میزان القوی لصالح القوی الثوریة العالمیة، وفی طلیعتها المنظومة الاشتراکیة.

فقد تحققت فی بلدان المنظومة الاشتراکیة، وفی مقدمتها الاتحاد السوفیتی، انجازات کبیرة فی تنفیذ خطط تطویر الاقتصاد الوطنی علی طریق تعزیز اسس المجتمع الاشتراکی المتطور، وبناء القاعدة المادیة والتکنیکیة للشیوعیة، واحراز منجزات ضخمة فی میادین العلم والتکنیک، وتعزیز القدرة الدفاعیة، وتوطد التلاحم والتعاون الوثیق بین الاحزاب الشیوعیة

في بلدان المنظومة الاشتراكية، ويتعزز التكامل الاقتصادي فيما بينها.»

له پاسی هەلومەرجی ناوخۆدا دوای ئەوەی ستایشی سیاسەتی عێراق ئەکا لە دوژمنایەتی پیلانەکانی ئیمپریالیزم و سەهیونیزم و کۆنەپەرستی دا، باسی خۆش بونی گوزەرانی زۆر لە کەرتەکانی گەل و، بەدیهێنانی مافی شارستانیی ئافرەتان، ئەکا، ئینجا ئەنوسی: «وواصل العراق سياسته المعادية للامبريالية، على الصعيد الدولي، وساند سياسة التعايش السلمي والانفراج الدولي ونزع السلاح، و عارض بحزم سباق التسلح وانتاج القنبله النيوترونيه. وقدم الدعم السياسي والمادي لحركات التحرر الوطني في اسيا وافريقيا وامريكا اللاتينيه. وكان موقف العراق في منظمه الامم المتحده ووكالاتها والمنظمات العالميه بارزا في الدفاع عن مصالح الشعوب والتصدي للسياسه الامبرياليه.»

ان مسيرة العراق التقدمية هذه تثير حقد الدوائر الامبريالية والصهيونية والرجعية، التي راحت تخطط، ضمن الهجمة الشرسة على حركة التحرر الوطني العربية للتآمر على العراق. واصبح العراق هدفا مباشرا لهذا التآمر، خاصة بعد التطورات الاخيرة، في اوضاع المنطقة، اثر زياره السادات للقدس المحتله وتزايد المساعي لاحياء الاحلاف العسكريه الرجعيه - الامبرياليه، وتوريد السلاح الامريكي بكميات هائله ونوعيات متطوره الى الانظمه الرجعيه في المنطقه.

ومما له دلالته الخاصه، بهذا الصدد، اتساع الحمله الفكريه والاعلاميه الامبرياليه - الرجعيه ضد العراق. اذ دابت وسائل الاعلام، بشكل ملحوظ موخرا، في بعض الدول الرجعيه في المنطقه والقوى الرجعيه واليمينيه في الداخل، على السعي لشق الصف الوطني، واثاره الخلافات بين اطرافه، ومهاجمه الجبهه الوطنيه والقوميه التقدميه، والتحالف بين حزب البعث العربي والحزب الشيوعي العراقي، وتسعير العداء للشيوعيه والتشكيك بعلاقات الصداقه والتعاون مع الاتحاد السوفيتي، ومهاجمه تعزيز القدرات الدفاعيه للعراق، والتهديد باثاره المصاعب الداخليه وتقديم المساعدات للعناصر المعاديه للسلطه الوطنيه.»

هەرکەس بە چاوی بەراورد و رەخنەوە لەم راپۆرتە ورد ببێتەوە بۆی بە جەماوەری حشع دا دیتەوە، چ سەرکردایەتیەکی هەبوە و، چۆنی سەرکردایەتی کردوە، دەربارەی خێزی بەعس هەمو بۆچونەکان پێچەوانە دەرچون:

- عیراق لە چوارچێوەی سیاسەتی ئەمەریکی دا پەیمانی جەزائیری لە گەڵ شا مۆر کرد بو، بۆ ئەوەی کێشەی کوردی لە کوڵ ببێتەوە و، دەستی بەتاڵ بێ بۆ دوژمنایەتی سوریا، چونکە سوریا لەو کاتەدا دژی ڕێککەوتنی «فصل القوات» ی ئیسرائیلی - عەرەبی بو.

- عیراق خەریکی دروستکردنی چەکی کوشتنی بە کۆمەڵ بو: چەکی ناوکی، کیمیایی، بایولوجی.

- عیراق سیاسەتی پێکەوە ژیان بە ئاشتی نەگرت بو، لە گەڵ دراوسێکانی: سوریا و ئێران ناکوک بو، زۆری نەخایاند هێرشی کردە سەر ئێران جەنگێکی خویناوی درێژی هەڵگیرساند لە هەردو میللەت سەدان هەزار کەس کوژرا و، سەدان ملیار دولار زیانی ماددییان لێ کەوت.

- ستایشی یەکێتی سۆڤیێت و پێشکەوتنی ئابوری و تەکنولوجی بە راست دەر نەچو، چونکە ئەویش هەرەسی هێنا و، کە حشع بەر لەوان کەوت نە سۆڤیێت و، نەهیچ

وڵاتێکی تری «مەنظومە» ی وڵاتانی سۆسیالیستی لە سەری هەڵ نەدابە و، لە سەری نەکردەوە.

*

بەعس لەو کاتەوە هات بونە سەر کار دەستی بە سەر هەمو رۆژنامەکانی عێراق دا گرت بو:

- الثورە، رۆژنامەی سەرکردایەتی حیزبی بەعس بو.
- الجمهوریە، رۆژنامەی وەزارەتی ئیعلام، واتە رۆژنامەی حکومەت بو.
- التاخی، رۆژنامەی پارتی بو، دوای دەس پێ کردنەوەی شەر بەعس خۆیان بە ناوی حیزبە کارتۆنییەکانی کوردەوە دەریان ئەکرد. دوایێتر ناوەکەیان گۆڕی بە العراق.
- طریق الشعب، رۆژنامەی حیزبی شیوعی بو.
- هەفتەنامە و مانگنامەی عەرەبی، ئینگلیزی، کوردی، تورکمانی کە لە عێراق دەرئەچون، هەمویان مولکی دەوڵەت بون، رۆژنامە و گۆڤاری ئازاد یا مولکی تایبەتی نەما بو.
- الراصد، کۆلکە رۆژنامەیەکی عەرەبی بو لە پاشماوەی رۆژنامەکانی سەردەمی عارف، کابرایەکی قەڵەمفرۆش بە ناوی: مصطفی عبداللطیف الفکیکی، ناو بە ناو بە فەرمانی بەعس، بۆ باسی بابەتێکی تایبەتی، بڵاوی ئەکردەوە.

دوای بڵاوکردنەوەی راپۆرتەکەی حشع، «الراصد» هەر چوار لاپەڕەکەی ژمارەی ٤٢٨ ی رۆژی ٢٩ ی نیســـــان - ١٢ ئایاری ١٩٧٨ ی بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم راپۆرتە تەرخان کرد بو. بە مانشێتێکی گەورە نوسی بوی: «نهج غیر موضوعی علی حساب الحقیقە: مناقشە نقدیە للتقریر السیاسی للجنە المرکزیە للحزب الشیوعی العراقی». دیار بو بەعس ئیتر ئیشی بە حشع نەمابو، گەڕی پێ نەکرد، حشع ئەبو لە فیکەی خۆی تێ بگەیشتایە.

هەمو ئەم مەدح و سەنایە، حیزبی بەعسی رازی نەکرد، لە مانگی مایس دا ٣١ ئەندامی حیزبی شیوعی، بە تاوانی ئەوەی لە ناو ریزی هێزە چەکدارەکانی عێراق دا ریکخستنیان دروست کرد بو، بە ئیعدام حوکم دا و ئیعدامی کردن و، کەوتە گرتن و راونانی ئەندامەکانی. سەرکردایەتی حیزب چاوەڕوانی هێرشی وەهای نەئەکرد لە بەر ئەوە هیچ پلانێکی نەبو بۆ خۆپارستن. هەمو هەوڵەکیان ئەوە بو عەزیز محەمەد چو بۆ بینینی صەددام بۆ ئەوەی تکای لێ بکات ئەگەر هەر ئیعدامیان ئەکات، لە رۆژی دامەزراندنی حشع دا ئیعدامیان نەکات، بەڵکو جێبەجێ کردنەکەی چەند رۆژێ دوا بخات، بۆ ئەوەی ئەو یادەیان لێ تێک نەچێ و سوکایەتیان بە سەردا نەیەت. ئەندامانی سەرکردایەتی بە دوای یەک دا چونە دەرەوەی عێراق. بە وڵاتانی سۆشیالیستی و یەمەن و لوبنان و سوریادا بڵاو بونەوە. چەند کەسێکیان لە بەغداد و کوردستان مابونەوە. دەزگاکانی ئەمن شیوعیەکانیان زەلیل ئەکرد، ئەیان گرتن و پاکانەیان پێ ئەکردن و، ئیعترافیان پێ ئەنوسین.

لەو هەلومەرجە سەختەدا کە شیوعیەکانی تێ کەوت بو، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، ئەندامی کومیتەی ناوەندی حشع، لە شوباتی ١٩٧٩ دا گەیشتە ناوزەنگ. مامجەلالی بینی. مەلا ئەحمەد نەیئەزانی حیزبەکەیان بە تەمای چییە و چی ئەکا. لەو کاتەدا دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی لە کوردستانی ئێران دا نەما بو. حدکا خەریک بو دەسەڵاتی پەیدا

ئەکرد. چو بۆ تیهران لەوێ سەردانی حدکای کرد. بە تەمای ئەوە بو کادر و ئەندامە راونراو و لیقەوماوەکانیان لە کوردستانی ئێران دا نیشتەجێ بکا تا ئاسۆی سیاسی روون ئەبێتەوە و، دەرتەکەوێ کە پەیوەندیەکانی ئێران ئەوان و حیزبی بەعس بە کوێ ئەگا. وا دیار بو حدکا بە دەنگیەوە ئەهات بو. مەلا ئەحمەد گەرایەوە ناوزەنگ بارەگایەکی بچوکی دانا. سەرکردایەتی یەکێتی هەندێ چەکیان بە دیاری دایە و، خەرجی ژیانی بارەگاکەیانی وەکو هەمو بارەگاکانی تری یەکێتی دابین کرد. تاک و تەرا شیوعیەکان ئەگەیشتنە بنکەکەی خۆیان و، یەکێتی «تەعلیمات» ی دابو بە هەمو ڕێکخراوەکانی و پێشمەرگەکانی لە هەر کوێ یەک هەر شیوعیەک پێویستی بە یارمەتی بو کۆمەکی بکەن، بە تایبەتی بۆ دەرباز بون لە چنگ داوودەزگاکانی بەعس. لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حشع: فاتح رەسول و توما توماس و، هەندێ لە کادرە ناسراوەکانیان گەیشتنە ناوزەنگ. بەمجۆرە سەدان شیوعی دەرباز کران و، زوری پێ نەچو ژمارەیان گەیشتە چەند سەد کەسێ.

مامجەلال و هاوڕێکانی تر بە خۆشییەکی زۆرەوە جیابونەوەی بەعس و حشع یان وەرگرت. یەکەم، چونکە لایان وابو بە هاتنی حشع بۆ شاخ، پشتیوانی یەکێتی سۆڤیەت و هەمو حیزبە شیوعییەکانی دنیا لە گەڵ خۆی ئەهێنی بۆ شاخەکانی کوردستان. دوەمیان، بۆچونەکانیان سەبارەت بە حیزبی بەعس و سروشتی ڕژێمەکەی و، پاشەڕۆژی هاوپەیمانیەتی شیوعی – بەعس، بە ڕاست دەرچو بو.

*

لە مانگی نیسان دا بەهائەدین نوری و کەریم ئەحمەد بە دوای یەک دا گەیشتنە ناوزەنگ. هەردوکیان لە سوریاوە بە ڕێگای تاران دا هات بون. ئەوان هاوڕێکانی خۆیان و ئێمەیان ئاگادار کرد کە حشع بڕیاری داوە خەباتی چەکدار بکا بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس و، ئەیانەوێ بەرەیەکی سیاسی فراوان لە هەمو هێزە عیراقییەکانی نەیاری بەعس پێک بهێنن. بەهائەدین و کەریم زور نەمانەوە گەڕانەوە بۆ ئێران لەوێوە چونەوە بۆ سوریا. مەلا ئەحمەدیش زوری وەختەکە لە ئێران بو، بە زوری فاتیح ڕەسول لە ناوزەنگ بو.

تا ئەو کاتە جگە لە ناوزەنگ لە هیچ جێگایەکی تر بنکەیان نەبو و، هێشتا مەفرەزەی چەکداریشیان دروست نەکرد بو.

سەرانی حشع بە یەک چاو سەیری یەکێتی و پارتیان ئەکرد. لە ناکۆکی نێوان یەکێتی و قم دا، ئەیانویست دەوری ڕیش سپی ببینن. کەوتنە هەوڵدان بۆ ئەوەی لە گەڵ قم یش دوستایەتی دابمەزرێنن. قم ئەو کاتە هێزێکی سیاسی بەدناوی دابڕاو بو لە هێزەکانی تر، پێویستی بە دوستایەتی حشع هەبو، بۆ ئەوەی ناوبانگی خۆی چاک بکا لە ناو کۆڕە پێشکەوتنخوازەکان دا، حشع یش چونکە لە گەڵ بەعس هاوکاری کرد بو دژی شۆڕشی کورد و پارتی، ئەیویست ئەو ڕابوردوە ناشیرینەی خۆی لە گەڵ پارتی پاک بکاتەوە. ڕاستییەکەیشی حشع پێویستییەکی زوریان بە پارتی هەبو، چونکە ئەوان لە بادینان ئەیانتوانی بۆ کاری حیزبی و هاتوچۆی سوریا، ڕێگایان بدەن یا ڕێگایان لێ بگرن.

سەرانی حشع بەرامبەر بەعس باوەڕیان وابو: بەعس لەو ڕۆژەوە خراپ بوە کە لە مانی داوە.

لە هەمو سەیرتر ئەوەبو، حشع ئەوسا و ئێستایش خۆی بە نوێنەری (تەیار) ی دیموکراتی دائەنا. کە هێزەکانی موعارەزەی عیراقی پۆل پۆل ئەکران بۆ (تیار) ی قەومی

عەرەبی، دینی، کوردی.. ئەو خۆی بە نوێنەری تەیاری دیموکراتی دائەنا. لە کاتێک دا کۆمۆنیزم، بە تایبەتی لەو زەمانەدا، باوەڕی بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا هەبو نەک بە دیموکراسی.

من خۆم پێشتر هیچ تێکەڵاوییەکم لە گەڵ سەرانی حشع نەبو، کەسم لە سەرکردەکانیان لە نزیکەوە نەدی بو و، نەمئەناسی، بەلام لە سەردەمی «اتحاد الشعب» و «ئازادی» ەوە تا سەردەمی «طريق الشعب» و «الفكر الجديد» و «الثقافة الجديدة» بەردەوام ڕۆژنامە و بلاو کراوە ئاشکرا و نهێنیەکانم خوێند بونەوە و، چاودێری ڕەوتی سیاسی و ناکۆکییەکانی ناو ڕیزەکانیانم کرد بو. زۆر لە هاوڕێکانم کە پێشتر ناوی هەندی لە سەرکردەکانی حشعی بیست بو، کە دەیان ساڵ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و، مەکتەبی سیاسی بون و، لە سۆڤیێت خوێند بویان و، سەردانی چەندین کۆنگرەی جیهانیان کرد بو، وایان ئەزانی ئەمانە سیاسی زانا و بلیمەت و، فەیلەسوفی هەلکەوتون، تیۆر و ئەزمونێکی سیاسی و ئایدیۆلۆجی بە جوڵانەوەکە ئەدەن. دوای ناسین و ئاشنا بون، وەکو ئەڵێن: «دەنگی دەهۆڵ لە دور خۆشە» دەرکەوت زۆری ئەمانە کەسانی بێ ئاگا بون لە ڕوداوەکانی کوردستان و عیراق و ناوچەکە و دنیا. سەرچاوەی سەرەکی ڕۆشنبیریان هەندی لە نامیلکە و کتێبەکانی «دار التقدم» و، سەرچاوەی ئاگاداری و زانیارییەکانیشیان بەشی عەرەبی رادیۆی مۆسکۆ بو.

*

## جیابونەوەی بزوتنەوە

ئیمە لە خۆشیی ڕوخانی شا و سەرکەوتنی گەلانی ئێران دا بوین، هەزار و یەک هیوای سەوز و سورمان لە سەر هەلچنی بو، لە پڕ یەکێتی دەلاقەیەکی تێ کەوت.

نەورۆزی ۷۹ ڕەسوڵ مامەند بارەگاکەی خۆی لە زەلی وە گوێزایەوە بۆ گۆزەشیر و، د. مەحمود عەلی عوسمانیش لە ناوزەنگەوە چو بۆ لای. بەمجۆرە بزوتنەوە جیابونەوەی خۆی لە یەکێتی ڕاگەیاند و، د. مەحمودیش دورکەوتنەوەی خۆی ئاشکرا کرد و، «بزوتنەوە» و «کومیتەی ئامادە کردن» پێکەوە کەوتنە هەوڵی دروستکردنی حیزبێکی تازە. چەند ڕۆژێ بو حازم لە سوریاوە هات بو. حازم ئەو زەمانە «امین سر» ی «قیادەی قطری» ی حیزبی بەعسی سەر بە سوریا و، لێپرسراوی «مكتب شؤون العراق» بو لە «قیادەی قەومی» لە شام. هەوڵێکی زۆری لە گەڵ داین، جیابونەوەکەیان دوا بخەن و، ئەو بکەوێتە ناوبژی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان یەکێتی و ئەوان. هەوڵەکەی سەری نەگرت بو.

ئەم تاقمە لەم جیابونەوەیە بە تەمای چەند شتێ بون:

– لایان وابو ئەگەر لە یەکێتی جیا ببنەوە و، سەربەخۆیی سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیان هەبی، زوورتر گەشە ئەکەن و زیاد ئەکەن و، بەهێز ئەبن.

– لایان وابو ئەتوانن خەتی سێهەم لە نێوان جەلالی و مەلایی دا دروست بکەن و، هاوسەنگی نێوان ئەم دو حیزبە تێک بدەن. زۆری پێشمەرگەکانی هەردولا و، ئەندام و کادرەکانیان کە لە ناکۆکی ئەم دولایە و، شەڕی براکوژی بێزار بون، لە مان کۆ ئەبنەوە.

- لایان وابو حکومەتی عیراق ئامادەیە بە ڕێگای گفتوگۆی سیاسی چارەسەری کێشەی کورد بکا، بەڵام یەکێتی بۆ ڕازی کردنی سوریا و تورخ دریژە بە شەر ئەدا. ئەگەر ئەمان سەربەخۆ بن بە جیا لە یەکێتی ئەتوانن لە گەڵ بەعس ڕێک بکەون.
بۆ جیابونەوەکەیشیان چەند بیانویەکیان ئەهێنایەوە:
- مامجەلال تاکڕەوە، گوێ ناداتە سەرکردایەتی بە کۆمەڵ، بیروراکانی خوی ئەسەپێنی، تورە ئەبی و ڕێزی شعوری هاوڕێکانی ناگری.
- مامجەلال بە لای کۆمەڵەدا دائەشکێنی، کومەلە لە سەر حسابی بزوتنەوە بە هێز ئەکا. لە دابەشکردنی چەک و پارەدا زورتر بەشی کومەلە ئەدا، کومەلەیش «ماوی» و «متطرف» ن، دژی دین و مەلان و، دژی ئاغا و سەروک عەشیرەتن.
هیچ هەوڵ و تەقەلایەک بۆ پەشیمان کردنەوەیان لەم هەنگاوە سەری نەگرت. سور بون لە سەر هەلویستی خۆیان. حدکاش، بە تایبەتی د. قاسملو، کە ئەو کاتە بوبون بە هێزێکی گرنگ لە ناوچەکەدا، هانی دابون و بەلێنی دابونی یارمەتیان بدات و کارئاسانیان بۆ بکات.

*

رەسوڵ مامەند لە سەرەتادا کە چوە گورەشێر و جیابونەوەی بزوتنەوەی لە یەکێتی ڕاگەیاند، لە ئەندامانی سەرکردایەتی: تایەری عەلی والی، حاجی حاجی ئیبراهیم، سەید کاکە، قادر عەزیز، مەلا ناصیح و، د. مەحمودیش، قادر جەباری و عەدنان موفتی لە گەڵ رویشت بو. بە هەمویان ۱۰ کەسێک ئەبون. جیابونەوەی رەسوڵ شتێکی چاوەڕوانکراو بو، بەلام رویشتنی د. مەحمود بۆ هەمومان کتوپر بو، چونکە هیچ کاتی باسی شتی وای نەکرد بو. بەلام دوایی دەرکەوت د. مەحمود دەستێکی باڵای هەبوبو لە هاندانی رەسوڵ و هاوڕێکانی دا بۆ ئەم کارە. ئێمە کە دانیشتین بۆ لێکولینەوەی کێشەکە و، دیاریکردنی هەلویستی یەکێتی لەوان، گەیشتینە ئەو باوەڕەی مادەم ئەوان بە هاوخەباتی ئێمە ڕازی نین خواحافیزیان بێ و، هەرکەسێکی کەش ئەروا بۆ لایان ڕێگەی لی نەگرین خوا حافیزی بێ.
ئەم کارە هێزەکانی یەکێتی و ڕێکخراوەکانی بزوتنەوەی لە سەرانسەری کوردستان دا لەت کرد و، پشێوی و ئاژاوەی قوڵی خستە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگەوە. پاش چەند ڕوژی هەندی لە فەرماندەکانی پێشمەرگەیش جیابونەوەی خۆیان ڕاگەیاند. بە کردەوە بەشی هەرەزۆری سەرکردەکانی بزوتنەوە و، ڕێکخراوەکانی و کادرەکانی و پێشمەرگەکانیان لێمان جیا بونەوە. عومەر مستەفا مابوەوە، ئەویش کەسی لە بزوتنەوە بە دەورەوە نەبو.
مامجەلال حەزی ئەئەکرد ئەو ڕاستیە بسەلمێنی کە: بزوتنەوە لە یەکێتی جیا بۆتەوە، بەلکو ئەیوت ئەمە باڵێکی بزوتنەوەیە و بزوتنەوەی ڕاستەقینە لە گەڵ یەکێتی ماون. لە گەڵ کاک عومەر قسەی کرد بۆ ئەوەی بزوتنەوە دروست بکەنەوە. نامەیان بۆ هەندی لە کادرەکانی شار نوسی کە لە ڕیزی بزوتنەوەدا کاریان ئەکرد و، زوریان کۆنە جەلالی بون بینە دەرەوە. بە دوای یەک دا هاتن. لە ڕاستی دا بزوتنەوەکەی ئەمان لە چاو ئەوەی رەسوڵ دا لاواز و، تا ڕادەیەک دروستکراو بو، ئەیتوانی کادر و فەرماندەکانی بزوتنەوە ڕابکێشێتەوە بۆ لای خۆی، هەرگیز نەیتوانی ئەو بۆشاییە لە ناو یەکێتی دا پر بکاتەوە کە بە جیابونەوەی رەسوڵ و هاوڕێکانی دروست بوبو.

*

**سیروان و زەڕینجو**

شەوی ٢٩ - ٣٠ ی نیسانی ٧٩ جاشەکانی زەرایەن، بە سەرکردایەتی حەمە خانی حاجی دارا، بۆسەیەکی گەورەیان لە نزیک ئاوایی زەڕینجو لە دەشتی شارەزوور دانا. سیروان (فەیصەل رەشید تالەبانی) و، تاقمی لە پێشمەرگەکانی هەرێمی کەرکوک کە لە سەرکردایەتیەوە ئەگەڕانەوە بۆ بەری قەرەداغ کەوتنە ناوی. پێشمەرگەکان لە ناو عەرەبانەی تراکتۆرێک دا سوار بوبون. لە بۆسەکەدا ٥ پێشمەرگە: سیروان (فەیصەل تالەبانی)، صدیق ئیبراهیم (حاجی چاوشین)، حەسەن ئەحمەد خاوی بێ، عەلی چەلەبی، نەجات رەحیم کەریم و، دوهاوڵاتی: کوژران و، ئەوانی تریان زۆر بە زەحمەت دەرباز بون.

حەمەخان وەکو دوایی دەرکەوت جاش - پێشمەرگەی پارتی بو، کە ئەم لەو ناوچەیەدا چاند بوی.

سیروان، هاوڕێ ی کۆمەڵە و، یەکێ بو لە پێشمەرگەکانی مفرەزەکانی سەرەتای دەسپێکردنەوەی خەباتی چەکدار. لە پێشمەرگایەتیەوە دەستی پێ کرد بو، بوبو بە فەرماندەی مفرەزە و، کەرت و، ئینجا فەرماندەی هەرێمی کەرکوک. یەکێ بو لە باشترین فەرماندەکانی پێشمەرگە. شارەزاییەکی زۆری لە ناوچەکە و دانیشتوانی و، هێزەکانی دوژمن دا پەیدا کرد بو. سەرکردایەتی دەیان چالاکی کرد بو. داوودزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم بە تایبەتی جەیش زۆر بە داغ بون لێ ی. لە مایسی ٧٩ دا هاتە ناوزەنگ. ماوەیەک مایەوە، چەند ڕۆژێکی میوانی من بو. لەو بێ سەر و بەرەیدا کە ئێرانی تێ کەوت بو، زۆری پادگان و پاسگاکان تالان کرا بون، چەک و تفاقی جەنگ لە بازاری شارەکان دا ئەفرۆشران. هەندێ چەکی سوک و ئارپیجی و نارنجۆک و مین و هوکی ترکی مان بۆ هەرێمەکەی کڕی و، گەڕایەوە بۆ ناوچەی قەرەداغ.

سیروان لە ناو پێشمەرگە و خەڵک دا خۆشەویست بو، کوژرانی زەرەرێکی گەورە بو لە کۆمەڵە و یەکێتی.

ئەم خێزانە تێکۆشەرە لە شۆڕش دا زەرەری زۆریان لێ کەوت. جگە لە سیروان، براکانی تری: ئەیوب و غەریب و عومەر، هەریەکەیان لە مەیدانێکی تێکۆشان دا کوژران.

*

به بۆنەی مردنی مەلا مستەفاوە:

# مەلایی و جەلالی لە تەرازودا

ڕۆژی ١ ی مارتی ١٩٧٩ ئاژانسەکانی دەنگوباس بڵاویان کردەوە کە مەلا مستەفای بارزانی لە نەخۆشخانەیەکی واشنتۆن کۆچی دوایی کردوە. ئەم هەواڵە چاوەڕوانکراو بو، چونکە لە مێژ بو مەلا مستەفا توشی شێرپەنجە (سەرەتان) بوبو. هەر بەو بیانوەشە لە تارانەوە چو بوە ئەمەریکا و لەوێ مابوەوە. ڕۆژنامەی «دەیلی تەلەگراف» ی لەندەنی لە ژمارەی ڕۆژی ٣ ی مارت دا نوسی بوی کە بارزانی لە سەر حسابی «سیا» تیمار کراوە. بەلام ق م ئەم هەواڵەی بە درۆ خستەوە و، نوسی کە خۆیان خەرجی نەخۆشخانەکەیان داوە، داوایان لە ڕۆژنامەکە کرد بە درۆ خستنەوەکەیان بڵاو بکاتەوە، ڕۆژنامەکە پشت گوێ ی خست.

کۆچی مەلا مستەفا لە کوردستان و، لە ناوچەکە و، لە ناو حیزبە کوردیەکانی کوردستان دا، بە جۆری جیا جیا دەنگی دایەوە.

ناوبانگی مەلا مستەفا و پارتی لە تاران دا باش نەبو. بە نۆکەری شا و ساواک ناسرا بون. لە ناو کوردا بە بەرپرسی خوێنی سلێمانی موعینی و چەندین کەس لە کوردەکانی ئێران ناسرا بو. هەر لەبەر ئەوەش لە خۆپیشاندانی شارەکانی کوردستانی ئێران دا، یەکی لەو هوتافانەی دوبارەیان ئەکردەوە:

قیادەی موەقەتە – گورگە لە ناو مێگەلدا.

کێ بو کاک سولەیمانی کوشت؟ بارزانی بو بارزانی!

لە کۆبونەوەی نوێنەرانی شورای شارەکانی کوردستان دا لە مەهاباد یەکی لە داواکانیان لە نوێنەرانی حکومەتی ئێران دەرکردنی سەرانی قیادەی موەقەتە بو.

مردنی مەلا مستەفا لە ناو ئێران دا بە جۆری جیاواز دەنگی دایەوە. ڕۆژنامەکانی تاران، بە تایبەتی ئەوانەی لای چەپ بون، بە خراپی لە سەریان نوسی. قسەکەرێکی حدکا لە ڕۆژنامەکانی تاران دا دژی قسەی کرد و، کۆمەڵەی زەحمەتکێشان بەیانێکی درێژی لە سەر دەرکرد کردەوەکانی مەلا مستەفای بەرامبەر کوردەکانی ئێران بە بیر هێنا بوەوە. بەلام هەڵوێستی ڕەسمیی حکومەتی ئێران جیاواز بو. ڕێگەیان دا تەرمەکەی لە ئەمەریکاوە بهێننەوە بۆ تاران و، حکومەتی ئێران خۆی بە هالیکۆپتەر گوێزایانەوە بۆ شنۆ و، ڕێگەیان دا بە پارتی ئەمە بکا بە موناسەبەتێک بۆ خۆپیشاندانی سیاسی و چەکدار.

بنەماڵەی بارزانی و سەرانی پارتی ویستیان ئەم ڕوداوە بکەن بە بۆنەی کردنەوەی تابوری خۆیان. ساڵی ١٩٤٥ کە بارزانیەکان چونەتە ئێران بە هۆی نەخۆشی تیفوسەوە چەند سەد کەسێکیان لێ مرد بو، لە شنۆ نێژرا بون. تەرمی مەلا مستەفایان بە فڕۆکە هێنایەوە تاران و، حکومەتی ئێران بە هالیکۆپتەر گوێزایەوە شنۆ. پارتی هەر دۆستێکیان لە کوردستانی ئێران دا هەبو نامەیان بۆ هەموویان نوسی، هەروەها هەمو بارزانیەکان و ئەندامەکانی پارتی و چەکدارەکانیان بانگ کرد لە شنۆ کۆ ببنەوە. مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەیان بە جێ هێنا. چەند کەسی بەم بۆنەیەوە شیعریان خوێندەوە و مەسعودیش لە

پاتی بنەماڵەکەیان سپاسی بەشدارەکانی کرد.

بێگومان مەلا مستەفا یەکێ بو لە گەورەترین سەرکردەکانی کورد لەم قەرنەدا. لە ناو خەڵکی کوردستان دا لە هەمو سەرکردەکانی کە زیاتر پشتیوانی لێ کراوە، لە هەمویان زورتر سەرکردایەتی جولانەوەکەی کردوە و، لە هەمویان زیاتر لە سیاسەتی ناوەوەی عیراق و، لە سیاسەتی کوردیی دەولەتانی ناوچەیی ئێران و تورکیا و، دەولەتانی گەورە: بەریتانیا، یەکیتی سۆڤیەت، ئەمەریکادا دەوری هەبوە.

بە زور زمانی جیاواز، وتار و نامیلکە و کتێب لە سەر مەلا مستەفا و بارزانیەکان نوسراوە. زوری ئەم کتێبانە بێلایەن نین، یا دەرویشەکانی بارزانی نوسیویانە بو ستایش و پیا هەڵدان، یا دوژمنەکانی نوسیویانە بو شکاندن و سوکایەتی پێ کردن. هەتا ئێستا بیوگرافی مەلا مستەفا و لێکولینەوەیەکی بێلایەن، پشت ئەستور بە بەڵگەکانی کورد خوی و، بە بەڵگەی ناو ئارشیفەکانی عێراق، ئێران، تورکیا، یەکیتی سۆڤیەت، بەریتانیا و ئەمەریکا، لە سەر خوی و جولانەوەکانی نەنوسراوە. بێگومان ئەمە ناتەواوییەکی گەورەیە لە رۆشنبیری کوردی دا.

ئەوانەی هاوچەرخ و هاوکاری مەلا مستەفا بون، کەسیان شتێکی ئەوتۆیان لە سەر نەنوسیوە. هەندێکیان مردون و هەندێکیشیان بە رێگاوەن بەرەو مردن. رەنگە زۆر مەسەلەی گرنگ کە رونکردنەوەی بو مێژوی کورد پێویست بێ، بە مردنی ئەمانە بچێتە ژێر گڵ.

بە مردنی مەلا مستەفا دەوری بنەماڵەی بارزانی لە ناو جولانەوەی کوردا تەواو نەبو. ناکۆکی نێوان یەکیتی و پارتی هەرما. بو تێگەیشتن لە پێشینەی مێژویی ئەم ناکۆکییە لێرەدا بە پێویستی ئەزانم ئاگادارییەکانی خوم، کە هەندێکیم لە کتێب و سەرچاوەی جوراوجور وەرگرتوە و، هەندێکیم لە هاوکارەکانی بیستوە و، هەندێکیشی خوم تیا ژیاوم، بەم بونەیەوە بگێرمەوە. خوزگەم ئەوی ئەم باسەی من ئەخوێنێتەوە، باسەکەی هەژاری موکریانی پێش ئەخوێندەوە کە کردویەتی بە پاشەکی چاپی تارانی «شەرەفنامە» بو ئەوەی تێگەیشتنێکی باشتری لە لا دروست بێ. هیوادارم لە پاشەروژدا کەسانێ کە لێکولینەوەی زانستی لە سەر لایەنە جیاوازەکانی ژیانی مەلا مستەفا بنوسن.

*

### شیخ محەممەدی بارزانی

ناوی بنەماڵەی بارزانی لە مێژ نییە کەوتوتە ناو مێژوی سیاسی کوردەوە. ریچەڵەکیشیان بو دور ناچێ. هەرچەندە هەندێ نوسەری تازەی کورد، ریچەڵەکیان ئەبەنەوە بو سەر میرەکانی ئامێدی و، لەوانیشەوە بو سەر خەلیفەکانی عەبباسی، بەڵام جگە لە ئیدیعایەکی بێ بناغەی مەلا مستەفا خوی، کە لە ساڵانی دوایی تەمەنی دا کردویەتی، هیچ بەڵگەیەکی مێژویی پشتیوانی لەم چیروکە ناکا. بێگومان مەلا مستەفا نەوەی خەلیفەکانی عەبباسی بێ یا نەبێ هیچ لە مەسەلەکە و، لە هەڵسەنگاندنەکان ناگورێ.

ناوی ئەم بنەماڵەیە، بو یەکەمین جار لە سەردەمی شیخ عەبدولسەلام (؟ - ١٩١٤) دا کەوتوتە ناو ناوان.

شیخ عەبدولسەلام برا گەورەی شیخ ئەحمەد، مەلا مستەفا، شیخ محەممەد صدیق، شیخ بابو بوە و، کوری شیخ محەممەد بوە. شیخ محەممەدیش کوری شیخ عەبدولسەلام.

ئەمانە شێخی ئیرشادی تەریقەتی نەقشی بوون لە بارزان. لەو سەردەمەدا سەدان خانەقا و تەکیە لە کوردستان دا هەبوو. شێخانی بارزان تەریقەتیان لە شێخانی نەهری وەرگرتوە و، خانەقای بارزان سەر بە خانەقای نەهری بوو. دوای ڕووداوەکانی ١٨٨٠ کە خانەقای نەهری تێکچوو، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و کوڕەکانی دوور خرانەوە بۆ حیجاز، خانەقای بارزان زیاتر ئازادیەکی زۆرتری هەبوو. بەڵگەیەکی نووسراو لە سەر شێخانی بارزان و خانەقاکەیان، کە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش شێخ عەبدولسەلام، ژیانی کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگیان ڕوون بکاتەوە، لە بەر دەس دا نیە. عوسمان صەبری، ئەدیب و سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد لە سوریا، چیرۆکێکی لە سەر مردنی شێخ محەممەد نووسیوە، ئەبێ لە خۆیانی بیست بێ، چونکە ماوەیەک لە ناو بارزانیەکان دا ژیاوە.

عوسمان صەبری لە ژمارەی ١٧ ی دوەمین ساڵی گۆڤاری «ڕۆناهی» ڕێکەوتی ١ ی تابی ١٩٤٣ کە لە شام لە لایەن «میر جەلادەت بەدرخان» ەوە چاپ و بڵاو کراوەتەوە، ئەم چیرۆکەی بڵاو کردۆتەوە.

*

## شێخی بارزانیان چۆن هەڵفڕاند؟

ئەمڕۆ لە ناو کوردەکانی خوارودا کاتێ باسی شێخی بارزان ئەکەن، پیاو شێخ ئەحمەدی بیر ئەکەوێتەوە کە بە خودانی بارزان ناسراوە. ئەم شێخەی کە هەڵفڕێنراوە، شێخ ئەحمەدی خودانی بارزان نیە، بەڵکو شێخ محەممەدی باوکیەتی. دەرهەق خودانی بارزانیش، لە ژمارەکانی تردا، من زانینی خۆم ئەنووسم.

ئەم چیرۆکەی کە ئەمەوێ بیگێڕمەوە، شتێکی خەیاڵی نیە، بەڵکو شتێکی قەوماو و ڕاستە. لە پێشەوە من ئەم چیرۆکەم لە دەمی شێخی گارسی شێخ ئەورەحمان بیست، پاشان دوورودرێژ پرسیم و دوایی کە چومە بنجوبناوانی، قسەکانی شێخی گارسی ڕەحمەتی بە تەواوی ڕاست دەرچوو.

شێخ محەممەدی بارزان یەکێ بوو لە شێخەکانی تەریقەت، لەو شێخانەی کە نازانن شێخایەتی و مریدایەتی چیە، بە تەنیا لە نەزانیی میللەت کەڵک وەرئەگرن و، خۆیان لە ژێر ناوی شێخایەتی دا بە سەر کوردی هەژارەوە ئەکەن بە گەورە و ڕێگای دەربارێکی شاهانە بۆ خۆیان و ڕێگای مەزنایەتی بۆ کوڕەکانیان خۆش ئەکەن. سەرەڕای ئەمەش شێخ محەممەد مرۆڤێکی بەرادایی نەبوو لە زۆر شێخ چاکتر و باشتر بوو. وەک شێخەکانی ترمان ڕێ ی بێ فەرمانیی خوای نەگرتوە، ئەگەر گوناحێکیشی هەبوبێ، ئەوە بوو بێ ئەوەی هێزێکی مەعنەوی هەبێ، خۆی بە خاوەن مەعنەویەت پیشان دابوو و لە قەزای زیبار دا زۆر کەسی بە مرید لە دەوری خۆی کۆ کرد بووەوە، هەر ئەم گوناحەش بوو کە بوو بە هۆی هەڵفڕاندنی.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا لە قەزای زیبار شێخ محەممەدی بارزان لە ناو عەشیرەتەکانی مزووری، شێروان و بەرۆژیان دا ناوبانگێکی باشی پەیدا کرد بوو، خەڵکی ئەوی ئەوەندەیان خۆش ئەویست، لە پێناوی شێخ و داخوازیەکانی دا، مردنیان بە بەختیاریەکی گەورە دائەنا. سەرەڕای دڵپاکی خەڵکی، دڵپاکی و ڕوخۆشی شێخ ئەم خۆشەویستیەی ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد ئەکرد. هەمو ڕۆژێ دوای نوێژی ئێواری، شێخ ئامۆژگاری دینیی مریدەکانی ئەکرد و، دژواریی ڕۆژی قیامەت و ئاگری دۆزەخی بە بیر ئەهێنانەوە.

شێخ، ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ناو ئامۆژگارییەکانی دا باسی ڕابوونی جەنابی مەهدی ئەکا، لەوێ دا یەکێ لە مورپیدە بە ساڵاچووەکان ناو و سیفەتەکانی مەهدی و چۆنیەتی و دەمی ڕابوونی لە شێخ ئەپرسی. شێخ بەم جۆرە وەڵامی مورپیدەکەی ئەداتەوە:

– مەهدی، لە دوای پێغەمبەر چاکترین پیاوی خوایە، ناوی محەممەدە، ملی لە هی هەمو کەس درێژترە، گوناى ڕومەتی نوری لێ ئەبارێ، هەروەک شمشێر نایبڕی تفەنگیش کاری تێ ناکا، کاتی هەڵسانی زۆر نزیکە. ڕەنگە ئەمرو هاتبێتە دنیاوە. ئەو ڕۆژەی کە خوا فەرمانی پێ ئەدا دەرئەکەوێ..

مورپیدێکی تر هەڵئەستێ و ئەپرسێ:

– قوربان! بەو شێوەیەی کە ئێمە لە شێخمان بیست، جەنجاڵیش وەک مەهدی هەڵئەستێ و کەرەکەیشی زۆر خێرایە، ئەتوانێ بە ڕۆژێ ڕێگای ساڵێک ببڕێ. گەلۆ، جەنابی مەهدی چۆن لەم زاڵمە ڕزگار ئەبێ؟

بێگومان ئەو کاتەی شێخ باسی جەنجاڵ و کەرە خێراکەی بۆ مورپیدەکانی کرد بو، شێوەی ڕزگار بونی مەهدی بە بیردا نەهات بو، بەڵام وا یەکێ لە مورپیدەکان ئەپرسێ و پرسیارەکەیش ئەبێ وەڵامی بدرێتەوە. ئەزانین لە لای شێخان تەنها کاتێ شێخ بینی هەمو گوێگرەکان چاویان تێ بڕیوە و چاوەڕوانی وەڵامێکن، شێخ بێ ڕامان ئێلێ:

– ئەفرێ، ئەفرێ کوڕم ئەفرێ...

لە هیچ کتێبێک دا حیکایەتی فڕینی مەهدی نیە. بەڵام بۆ ئەوەی شێخ خۆی بە ئەزان پیشان ئەدا ئەمەی وت مورپیدەکانیش باوەڕیان پێ کرد، بەڵام نازانم خوایش ئەم درۆیەی لە شێخ قوبوڵ ئەکرد یا نە.. ئەمە لە سەرەنجامی شێخ دا ئەبینین. دوای ئەوەی شێخ ئامۆژگارییەکانی تەواو ئەکا لە مزگەوت دەرئەچێ و ئەچێ بۆ دیوەخان.

ئەوانەی کە ماڵی شێخی بارزانیان بینیوە ئەزانن شوێنی دیوەخانی شێخ چەند بەرزە. قاتی خوارەوەی مزگەوتە، هی دوەم خانەقایە (تەکێ) و، هینی سێیەمیش دیوەخانە.

کاتێ شێخ لە مزگەوتەوە ئەچێ بۆ دیوەخان، مورپیدەکان لە ناو خۆیان دا لە سەر ئامۆژگارییەکانی ئەو ڕۆژەی شێخ (سیفەتەکانی مەهدی) ئەدوێن. ئەیانویست بزانن کە ئەم سیفەتانە لە کێ دا هەیە. لە بەر ئەوەی ئەو سیفەتانەی شێخ باسی کرد بون هەموی لە خۆی دا هەبون، هەندێ لە مورپیدەکان ئەڵێن: هەبێ و نەبێ شێخی ئێمە خۆی مەهدییە. هەندێکی تریان ئەڵێن: کەی شێخ ڕاستیی لە ئێمە شاردۆتەوە تا ئەمڕۆ لێمان بشارێتەوە، ئەگەر ئەو مەهدی بوایە خۆی پێ ی ئەوتین. لە سەر ئەم قسەیە برای گەورە ئەڵێ:

– ئەی نایەتە بیرتان کە شێخ وتی: «دەمی ڕابونی زۆر نزیکە، لەوانەیە ئەمڕۆ هاتبێتە دنیاوە و ئەو ڕۆژەی کە خوا فەرمانی پێ ئەدا دەر ئەکەوێ». بەڵێ شێخ، مەهدی خۆیەتی، بەڵام بە فەرمانی خوا دەرئەکەوێ.

برای دوەم لە سەر قسەکەی سورە کە شێخ مەهدی نیە. ئەم گفتوگۆیەیان درێژە ئەکێشێ و لە هەردو لا کەسیان ناتوانێ ئەوی تر بهێنێتە سەر قسەی خۆی. ئەوسا ڕیش سپییەک لە مورپیدەکان بە هەردو برا ئەڵێ:

– کە عەقڵ هەبێ پێویست ناکا بەم شێوەیە بە گژ یەکتری دا بچن. نایەتە بیرتان شێخ وتی: تفەنگ کار لە مەهدی ناکا. وەرن بچین بۆ دیوەخان بیدەینە بەر تفەنگ، ئەگەر مەهدی بێ گوللە نایبڕێ.

ئەم تاقلەی بارزان بیری لەوە ئەکرد بووە کە ئەگەر شێخ مەهدی ئەبێ، بەمە ئەمرێ. ئەمە بە بیری هەردو برایش دا ئەهات. قسەی هەموویان لە سەر ئەم تەگبیرە ئەبێ بە یەک. شەش پیاو تفەنگەکانیان هەڵئەگرن و ئەچنە دیوەخان. لە پڕ هەر شەشیان لوولەی تفەنگەکانیان لە شێخ ئەکەن و پەنجە ئەخەنە سەر پەلەپیتکە.

لە دەنگی تفەنگان و راچڵەکینی دوای ئەو، شێخ تێئەگەیشت کە ئەمانە بە بێ بەختی ئەیکوژن. بۆیە یەکسەر هەڵئەستێ و را ئەکا. موریدەکان لە بەر دەرگا ئەیگرن. سەیر ئەکەن هەمو گوللەکان بە جلەکانی کەوتون و بە لەشی نەکەوتون. دوای ئەم تەجروبەیە ئیتر گومانیان نامێنێ کە شێخ مەهدیە.

بەڵام هەندێک لە موریدەکان دیسان نایانەوێ باوەڕ بەمە بهێنن، بۆیە لە نێوان ئەمان و ئەوانی تر (ئەوانەی باوەڕیان بە مەهدیەتی شێخ هێناوە) ئەبێ بە دەمەقاڵێ. ئەوسا ئەو تاقلەی کە ڕێگای تفەنگ بە شێخەوە نانی پیشانی موریدەکان دابو ئەکەوێتە بەینیان و ئەڵێ:

– ئایا ئەم قسانەی ئێوە پێویست بەم دەمەقاڵەیە ئەکا؟ نایەتە بیرتان شێخ وتی: مەهدی ئەتوانێ بفڕێ؟ وەرن با تاقی بکەینەوە.

ئەم قسەیە ئەچێ بە مێشکی هەموویان دا و پێکەوە ئەچنە لای شێخ و بەم شێوەیە داواکەیانی پێ ئەڵێن:

– قوربان! زۆرمان باوەڕمان وایە کە شێخ مەهدیە، بەڵام هەندێ بێ ئیمان لە ناو ئێمەدا هەن باوەڕ بەمە ناهێنن. ئەمانەوێ شێخ ئەم گومانەیان لە دڵ دەرکا!

– من چۆن ئەتوانم ئەم گومانەیان لە دڵ دەربکەم و کێ پێ ی وتون کە من مەهدیم؟

– قوربان! دڵی ئێمە هەمو ئەڵێ تۆ مەهدیت. ئەی شێخ نەیوتوە دڵی چل موسوڵمان لە سەر هەر شتێک بێ بە یەک ئەو شتە راستە و درۆ نیە؟ هەر گومانێ لە دڵی هەندێ لە موریدەکان دا هەبێ ئەتوانی تۆ بەم فرینە لە دڵیان دەربکەی.

– کوڕە ئێوە چەن ئەحمەقن، من چۆن ئەتوانم بفڕم؟

ئەوسا تاقلەکەی بارزان، ئەو موریدەی کە پێشتر ڕێگای تەجروبەی تفەنگەکەی پیشانی هاوڕێکانی دابو، ئەڵێ:

– گەلی موریدان! لە بەر ئەوەی دەمی راپونی مەهدی هێشتا نەهاتوە، بۆیە شێخ خۆی ئاشکرا ناکا، بەڵام ئێمە ئەتوانین تاقی بکەینەوە. وەرن با دەست و قاچی شێخ بگرین و لە سەر خانەقاوە بیدەینەوە خوارێ! ئەو کاتە ناچار ئەبێ بفڕێ!

هێشتا تاقلەکەی بارزان قسەکەی تەواو نەکرد بو موریدەکان دەست و لنگی شێخ ئەگرن و بێ ئەوەی گوێ بدەنە داد و هاواری ئەو ڕەبەنە لە سەر خانەقاوە ئەیهاوێژن بۆ خوارێ.

شێخ محەممەد کە زەلامێکی کەتە بو بە سەلامەتی ناگاتە عەوشە. هەردو دەست و قاچێکی و ملی و پشتی لە شەش جێگاوە ئەشکێ و شێخ بە راستی ئەبێ بە مەهدی! دوای ئەوەی وڕان پشت و ملی شێخ شکا بو، ئیتر پێویست ناکا بڵێن ڕۆژی دوایی گیانی بە گیانکێش سپارد و و لەشی بە گۆڕ! ئەو کاتە ئەم شێخ ئەحمەدەی کە بە خوداتی بارزان ناسراوە تەمەنی شەش ساڵ بو. عوسمان صەبری

*

ئەم چیروکـە هەندێ لایەنی باوەری بارزانیـەکـان و شـیـخـەکـانیـان رون ئەکـاتەوە. عوسمان صەبری وەکو بەلێنی دا بو لە ژمارەکانی ترا زانیارییەکانی خۆی لە سەر خودانی بارزان بنوسی، بەلێنەکەی بە جێ نەهێناوە. هۆکەی چی بوە، دیار نیە.

ئەم چیروکە راست بێ یان هەلبەستراو، ئوبالەکەی لە ئەستوی عوسمان صەبری دایە، کە بە درێژایی ژیانی و هەتا مردیش دلسوزی مەلا مستەفا بو.

*

## شیخ عەبدولسەلام

لە دوای مردنی شیخ محەمەد، شیخ عـەبدولسـەلامی کوری لە جیگای دانیـشت. عەبدولسـەلام برا گەورەی شیخ ئەحـمـەد، مـحەمەد صدیق، شیخ بابۆ، مـسـتـەفا بو. بارزان گوندیکە کەوتوتە نیوان رەواندز و ئاکری و سنوری تورکیا و لە بەینی هەردو روباری زێ ی بادینان و روکوچک دایە.

شـیـخـەکـانی ئەوی ترانی بویان هەندێ لە عـەشـیـرەتەکـانی دەوری خویان لەوانە: شیروانی، دولەمەری، مزوری، بەروژی، نزاری و، بەشیکی گەردی و هەرکی بنەجی، بهیننە سـەر باوەری خـۆیان. ئەوانەی چوبونە سـەر ری و رەوشـتی شـیـخی بارزان، خـۆیان بە «میللەت» یک دائەنا کە دلسـوزی و گویرایەلی بو شیخی بارزان پیکەوەی ئەبەستن. لەناو خویان دا هاوکاری یەکتریان ئەکرد، یەدەنگ یەکەوە ئەچون و ژن و ژنخوازیبان تەنیا لەناو خویان دا ئەکرد. بە شیخی «بارزان» یشیان ئەوت «خودان» کە بەرزترین دەسەلاتی دینی و دنیایی ئەوان بو. «خودان» واتەی خاوەن و، جوریکە لە «صاحب الزمان» ی شیعە.

شـیخ عـەبدولسـەلام پیاویکی هەلکەوتو بو. لە سـەردەمی ئەودا بارزان ئەهەمیـەتی پەیداکرد، نفوزی زیادی کرد، «خودان» بو نەهیشتنی زولمی کومەلایەتی لەناو میللەتەکەی خوی دا هەندیک ریفورمی ئابوری، کومەلایەتی کرد، مولکیەتی زەویزاری هەلوەشاندەوە کردیە خاوەنیتی گشتی هەموان، ژن و ژنخوازی ئاسان کردو مارەیی هەلگرت، هەولی دا عەشیرەتەکانی ژیر دەستی خویان چەکدار کەن، بارزان بوبوە پەناگای زولملیکراوان.

شیخ عـەبدولسـەلام نیوانی لەگەل مـەسیـحیـەکان خوش بو، حورمەتی ئەگرتن و، لەگەل میسیونیرەکانی ئینگلیزیش برایان: «ویگرام» دوستایەتی خوش بو. لە کتیبەکەیان دا: «کوردستان: بیشکەی شارستانیتی» باسی ئەم دوستایەتیە ئەکەن.

شیخ عەبدولسەلام پەیوەندی لەگەل ریکخراوە سیاسیە کوردیەکانی ئەستەمول هەبو، کە دوای ئینقیلابی عوسمانی (١٩٠٨) دامەزرابون، بە تایبەتی لە گەل شیخ عەبدولقادری شەمزینی، کە ئاشنایەتیەکی دیرینەی بنەمالەییان هەبوە. بلاو کراوەکانی ئەم ریکخراوانە ئەگەیشتە خانەقاکەیان لە بارزان.

یەکی لە هەولە نیشتمانیەکانی شیخ عەبدولسەلام تەلەگرافیکە کە بو کاربەدەستانی عوسـمانی ناردوە دەربارەی هەندێ مافی روشنبیری و بەریوەبەرایەتی و دینی کـورد، پێ ئەچی ئەسـەی بە هاندان و بۆ پشتیوانی لە شیخ عـەبدولقادری شـەمزینی بوبی، کە ئەوسا پیشەوای بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد بوە لە ئەستەمول.

دالدەدانی زولملیکراوان لە بارزان و رەفـتـاری خـودان لەگـەل مـیللەتەکـەی و، ریفورمەکانی کە بوبون بە هوی بیزارەی سەروکی عـەشیرەت و شیخەکانی دەوروپشتی و،

گازاندەی بەردەوامی ئەوانە لەرەفتاری خودانی بارزان لە لای کاربەدەستانی تورک، هەروەها ناردنی ئەم تەڵەگرافە و کەمبونەوەی دەسەڵاتی عوسمانی لەناوچەکە، کاربەدەستانی عوسمانی لە موسڵ تورە ئەکاو، بریار ئەدەن شێخی بارزان تەمێ بکەن و ناوچەکە بهێننەوە ژێر دەسەڵاتی حکومەت. فەریق محەممەد فاضیل پاشای داغستانی سەرکردایەتی هێزێکی گەورەی عوسمانی ئەکا بو هێرشی سەر بارزان. عەشیرەتەکانی دراوسێی بارزان نەک هاوکاری عەبدولسەلام ناکەن، بەڵکو ئالیکاری عوسمانی ئەکەن بو داگیر کردنی ناوچەکە. بارزانیەکان چەن روژێک بەرەنگاری هێرشەکە ئەکەن، سەرەنجام خویان پێ راناگیری. شێخ عەبدولسەلام خوی ئەشارێتەوە پەنا ئەباتە بەر مارشەمعون لە هەکاری. مارشەمعون دالدەی ئەدا. داغستانی بارزان داگیرئەکا، هەندی لە گوندەکانی تالان ئەکاو ئەسوتێنی و، هەر کەسی بەردەس ئەکەوی بە دیلی ئەیبا بو موسڵ. لەناو دیلەکان دا مەلا مستەفا و دایکی ئەگیرین.

شێخ عەبدولسەلام بە نهێنی گەرایەوە بارزان چەکدارەکانی لەچیای شێرین کوکردەوە، کەوتە پەلاماردانی هێزەکانی عوسمانی، ناچاری کردن لە ناوچەکە بکشێنەوە. والی نوێ ی موسڵ بە نەرمی لەگەڵی جولایەوە، کەوتە گفتوگو لەگەڵی، دیلەکانی بەردان، هەندی زەرەری بو بژاردن، ژیانی ئاسایی گەرایەوە بو ناوچەکە.

لە ١٩١٣ دا والی موسڵ سولەیمان نەظیف، کە روشنبیرێکی کوردی «ئیتیحاد» ی بو، هێزێکی گەورەی ناردە سەر بارزان بو گرتنی شێخ عەبدولسەلام. سەرخێڵەکانی کورد، بە تایبەتی فارس ئاغای زێباری، هاوکاری لەشکری تورکیان کرد. شێخ ئەمجارەش خوی نەدا بە دەستەوە و سەرلەنوی خوی شاردەوە، بە نهێنی چو بو راژان بو لای سەید طەهای شەمزینی و، سەردانی سمکوی کرد و، پێکەوە چون بو تفلیس بو دیتنی جێنشینی قەیسەری روسیا، بو ئەوەی داوای پشتیوانی لی بکەن. کاربەدەستانی تورک خەڵاتێکیان دانا بو بو ئەو کەسەی شێخ عەبدولسەلام بە زیندویەتی یا بە مردویەتی بگری. شێخ لە گەرانەوەدا لە گوندێکی ناوچەی سوما پرادوست لە لایەن کابرایەکی شوکاکەوە لەگەڵ ٣ پاسەوانی دا بە فێڵ لە خەو دا گیران، و لە پایزی ١٩١٤ دا لە «سەرو» تەسلیمی کاربەدەستانی عوسمانی کردن. لەوێوە بە گیراوی برانە زیندانی موسڵ. پاش محاکەمەیەکی روکەش لە ١٤ی کانونی یەکەمی ١٩١٤ دا شێخ عەبدولسەلام و هاورێکانی لە دار دران.

*

شێخ ئەحمەد

لەپاش هەڵواسینی شێخ عەبدولسەلام، شێخ ئەحمەدی برای جێگای گرتەوە.

شێخ ئەحمەد دوەمین کوری محەممەد و، براگەورەی محمد صدیق و شێخ بابو و مەلا مستەفا بو.

شێخ ئەحمەد سالی ١٨٩٦ لە بارزان لە دایک بوە، سالی ١٩١٤ کە عەبدولسەلامی برای لە موسڵ هەڵواسرا، شێخ ئەحمەد لە جێگەی ئەو بو بە «خودانی میللەتی بارزان».

شێخ ئەحمەد خوێندەواری نەبو، بەڵام لە بەرێوەبردنی کاروباری بارزانیەکان دا شارەزا بو، جێگەی بروای هەمویان بو. گوێرایەڵیی بی چەن و چونیان ئەکرد، تەنانەت مەلا مستەفاو براکانیشی کە ئەچون بو زیارەتی ئەبو لەبەردەمی دا بە «چوک» دا بێن. بەڵام




پایتەخت

شارکە دانیشتوانی زیاترلە ١٠٠٠٠٠

شارکە دانیشتوانی کەمترلە ١٠٠٠٠٠

شارۆچکە

شاخ

رووبار

دەریاچکە

سەد

جادە

خەتی شەمەندەفەر

بیری نەوت

# کوردستانی عیراق

1 : 2 500 000

0 — 100 km

رۆشنبیریی گشتی ئەبو، شارەزای کاروباری سیاسی کوردستان و عیراق و دنیا ئەبو، هەروەها شارەزای کاروباری جەنگی ئەبو، بایەخیشی پێ نەئەدا. هەولی ئەدا خۆی و عەشیرەتەکەی لە کاروباری سیاسیەوە نەگلێن، بە گۆشەگیری دوور لە کارتێکردنی دەورو پشت بژین.

لەسەردەمی عوسمانی دا بە هۆی هەلواسینی براکەی و لەشکرکێشی عوسمانیەکانەوە بو سەر ناوچەکەیان، هەلویستی لە حکومەت سەلبی بو، بروای پێ نەئەکردن و دوای هاتنی ئینگلیزیش ١٩١٨ دیسان هەلویستی لە پەرسەندنی دەسەلاتی حکومەت سەلبی بو، بە ئاگاداری ئەم هەندێ لە بارزانیەکان بەشداری دانانی ئەو بوسەیە بون کە لە ١٤ ی تشرینی دوەمی ١٩١٩ لە «بیرە کەپرە» بو حاکمی سیاسی موسل کولونێل بیل و حاکمی سیاسی ئاکری کاپتن سکوت دانراو هەردوکیان کوژران، لەدەس بەسەراگرتنی شاری ئاکرێ یش دا بەشدار بون. هەروەها توشی چەن تێکهەلچونی چەکدار بون لەگەڵ ئاسوریەکان کاتێک ئینگلیز ئەیویست لە ناوچەکانی ئەوان دا نیشتەجێی یان بکەن. دوای ئەوە ئیتر لە بارزان گوشەگیری هەلبژارد، خوی لە کاروباری سیاسی و حکومەتی هەلنەئەقورتاند.

شێخ ئەحمەد هەولی دا ئەریتەکانی شێخەکانی بارزان دایان هێنا بو بچەسپێنی، هاوکاری یەکتری، دامەزراندنی پەیوەندی لەسەر بنچینەی دادپەروەری و وەکیەکی، گویرایەلی بی چەن و چونی میللەت بۆ خودان. پاریزگاری میللەتی بارزان لە تێخزانی نوفوزی حکومەت و بیرو باوەری دەرەوە. هەولی ئەدا میللەتی بارزان وەکو کومەلێکی داخراو بپنیتەوە، نوفوزی دەولەتی تێ نەپەت، لەبەر ئەوە: دژی دامەزراندنی دەسەلات و دەزگا ئیداریەکانی حکومەت و، دژی دامەزراندنی قوتابخانە و، دژی تێکەلاوی بو لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەت لە شارەکان، تەنانەت براکانی نەخستە بەر خوێندن بو ئەوەی غەیری خوێندەواری نەبن، هەروەها دژی چالاکی پارتایەتی بو لەناو بارزانیەکان دا.

شێخ ئەحمەد نوێژ و حەجی لە سەر بارزانیەکان هەلگرت. ئەمەش لە لایەن دراوسیکانیەوە بە لە دین دەرچون دائەنرا.

ناوچەی ژیانی بارزانیەکان مەلبەندێکی شاخاویە، ئەرزی کشتوکالی کەمە، بەروبومی زوری نیە. مازوچنین و کوکردنەوەی تووی کنگر و، ئاژەلداری، بە تایبەتی راگرتنی بزن، یەکێک بو لە سەرچاوەکانی ژیانیان. لەبەر ئەوە لە سەر مەسەلەی لەوەرگا و پاوان هەمیشە لەگەڵ عەشیرەتەکانی دراوسی یاندا: برادوست، زیباری، سوورچی، هەرکی، ریکانی ... کیشەیان بوە.

*

## شورشی بارزان ١٩٣١ - ١٩٣٢

لە هاوینی ١٩٣١دا برادوستیەکان هیرشیان کردە سەر گوندەکانی: کرکاڵ، کرلەک، بابکی، لە ناوچەی شیروانیەکان، هەندێ خانویان سوتاندن، ئاژەل و گاو گوتالیان بە تالان بردن. هێزێکی بارزانیەکان بەسەروکایەتی مەلا مستەفا چون بە دویان دا، لە دەشتی هیرتی پەلاماریان دان تالانیەکانیان لی گیرانەوە.

زنجیرەیەک تێکهەلچونی چەکدار لە نیوان برادوست و بارزانی دا روی دا مەلا مستەفا کە برا بچوکی شێخ ئەحمەد و براکانی تری بو وەکو قارەمانی ئەو شەرانە ناوی دەرکرد. قائیمقامی زیبار بو ناوبژی کردنی هەردو عەشیرەت سەرانی هەردوکیانی بانگ

گرد، شێخ ئەحمەد چونکە لە کۆنەوە لە حکومەت بەدگومان بو، هەروەها گومانی ئەکرد کە قائیمقام بەلای دوژمنەکانیان دا دایشکێنێ، خۆی نەچو، بەڵکو یەکێ لە براکانی لە جێگەی خۆی نارد. لە بەیانی ٩ ی کانونی یەکەمی ١٩٣١ دا هێزێکی جەیشی عێراقی کە بارەگاکەی لە « بلە» بو بە سەرکردایەتی عقید برلی المسکری دەوری گوندی بارزانی گرت و داوای لە شێخ ئەحمەد کرد خۆی بەدەستەوە بدا. شێخ ئەحمەد ئامادە نەبو خۆی بەدەستەوە بدا، بارزانیەکان هەڵیانکوتایە سەر هێزەکانی عێراق و شکاندیان.

جموجۆلی سپایی بە هۆی زستانەوە راوەستا. لە ١٢ ی کانونی دوەمی ١٩٣٢ دا ئەنجومەنی وەزیران بە بەهانەی یاخی بونی شێخ ئەحمەد و پەلاماردانی ئەو عەشیرەتانەی سەریان بۆ دەسەڵاتی حکومەت دانەنواندوە و، بە بەهانەی نەدانی باجەوە.. بو دامەزراندنی «أداره مدنیە منظمە» کە مەبەستی مەخفەری پولیس و دەزگای مدیری ناحیە بو بریاری دا جەیش بنێریتە سەر بارزان، جێبەجێ کردنیشی سپارد بە وەزارەتەکانی دیفاع و کاروباری ناوخۆ.

لە ١٠ ی مارتی ١٩٣٢ دا وەزارەتی داخلیـە ئینزاری شێخ ئەحمەدی کرد کە لە ماوەی ٤ رۆژدا بو دەربڕینی گوێڕایەڵی و دڵسۆزی بو حکومەت لە بەردەمی قائیمقامی زیباردا ئامادە بێ، هەروەها حاکمی سیاسی ئینگلیزیش هەمان داوای-لی کرد. بەڵام شێخ ئەحمەد ئامادە نەبو بچێ چونکە ئەترسا بیگرن، بەڵکو خۆی بو بەرگری ئامادەکرد. لە ١٥ ی مارتی ١٩٣٢ هێزی زەمینی عێراق بە یارمەتی فڕوکەکانی بەریتانیا هەڵیان کوتایە سەر بارزان، ناوایەکان زەرەری زۆریان لی کەوت، بەڵام نەیانتوانی شێخ ئەحمەد بگرن، وە نەیانتوانی بەتەواوی دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرن. دو فڕوکەی بەریتانی کەوتنە خواری، یەکێکیان فڕوکەوانەکانی تی دا مرد و، ئەوی کەیان دو فڕوکەوانی بە پەرەشوت لی دابەزی و گیران. کاپتن هولت بو بەردانی فڕوکەوانەکان چو بو دیدەنی شێخ ئەحمەد، لەبەرامبەر ئازادکردنی ٢٥ بارزانی گیراودا بەردران. دوای ئەو شێخ نوردەینی بریفکانی بە نوێنەرایەتی حکومەتی عێراق چو بۆ گفتوگۆ لە گەڵ شێخ ئەحمەد. شێخ ئەحمەد هیچ خواستی سیاسی یا نەتەوەیی لە حکومەت نەبو، بەڵکو ئەیویست: «عفو» بکری و وازیان لی بهێنن لە شوێنی خۆیان بژین، حکومەت دەست وەرنەداتە کاروباری ناوچەکەیانەوە، لە ناکۆکی ئەوان و عەشیرەتەکانی تردا بەلای دوژمنەکانی دا دانەشکێنی. بەڵام حکومەت هیچ یەکێ لە خواستەکانی قبوڵ نەکرد و، داوای خۆبەدەستەوەدانی بی مەرج و، رێگە نەگرتن لە دامەزراندنی دەزگاکانی پولیس و تەیارەیان لی کرد.

دوای چەند پیکادانێک جەیش لە ١٨ی مایسی ١٩٣٢ دا بە بی شەر بارزانی گرت و پێشرەوی کرد بۆ چەند شوێنێکی تر. شێخ ئەحمەد بریاری دا خاکی عێراق بەجێ بهێلی و بچێتە تورکیا. نامەیەکی ماڵئاوایی بۆ قائیمقامی زیبار نوسی. لەگەڵ ٤٠٠ خێزان رۆژی ٢٢ ی حوزەیرانی ١٩٣٢ پەرینەوە گوندی گرانە لەناو تورکیا کە سەربازگەیەکی تورکی لی بو، لەوی چەکەکانیان دانا. کاربەدەستانی تورک شێخ ئەحمەدیان بردە ئەنقەرە، چەن ماڵێکیان گوێزانەوە ئەرزروم، پاش ماوەیەک مەلا مستەفا بارزانیەکانی کەیان رێگە دا بگەرێنەوە ناوچەی شەمزینان.

لەشکرکێشی جەیشی عێراق دژی شۆرشی بارزان ٣ مانگ و ٥ رۆژی خایاند. ٦ فەوجی پیادە و ٢ بەطریەی چیایی و کەتیبەیەک سوارە بەشدار بون کە هەموی ئەیکردە:

٢٠٥ ئەفسەر و ٤٤٣٧ سەرباز. بە هەموی ٤٨ کەسیان لێ کوژرا (لەوانە ٣ ئەفسەر) و ٧٨ کەسیان بریندار بو. لە شۆڕشگێڕانی بارزانیش ١٩ کەس کوژراوە.

*

## لێبوردنی گشتی و دور خرانەوەی شێخەکانیان

تورکیا و عێراق و بەریتانیا کەوتنە گفتوگۆ بۆ دیاریکردنی چارەنوسی بارزانییەکان. سەرەنجام عێراق لە ١٣ ی نیسانی ١٩٣٣ دا «لێبوردنی گشتی» بۆ دەرکردن. مەلا مستەفا و شێخ محەممەد صدیق و ئولویەگ لە گەڵ ٢٠٠ کەسی کە لە ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٣٣ دا لە شێروانی مەزن خۆیان بە دەستەوە دا. دوای ئەوانیش شێخ ئەحمەد گەڕایەوە.

عێراق شێخ ئەحمەدی لە موسل دەس بەسەر دانا و پاش ماوەیەک ڕێگەیان دا بگەڕێتەوە بارزان. تاقمێک لە بارزانییەکان بەسەرکردایەتی خەلیل خۆشەوی بە چەکداری لە ناوچەکەدا مانەوە، تەسلیم نەبون، چونکە بەر لێبوردن نەکەوت بون. عێراق ئەترسا سەرلەنوی ڕاپەڕینێکی چەکدار بقەومێ. شێخ ئەحمەد و براکانیان بانگ کردنە موسل لەوێ دەسبەسەر گل درانەوە، بۆ دابینکردنی ژیانیان حکومەت موچەیەکی کەمی بۆ بڕینەوە. لە کوتایی ١٩٣٦ دا گوێزرانەوە بۆ بەغداد و لە وێوە برانە ناصرییە. کە جەنگی جیهانی دوەم هەڵگیرسا، بەریتانیا ئەیویست کورد ئارام بکاتەوە و لەگەڵی نەرم بێ، شێخ ئەحمەد و براکانی لەسەر داوای خۆیان لە ناصرییەوە، کە شارێکی عەرەبی بو، گوێزرانەوە بۆ سلێمانی، کە شارێکی کوردی بو (١٩٣٩)، ئەوسا دورخراوەکان بە ژن و پیاو و، گەورە و منالەوە ٨٦ کەس بون.

*

## بارزانییەکان لە سلێمانی

مەلا مستەفا بە منالی نەنرا بوە بەر خوێندن. هەرگیز خوێندنی مەلایەتی نەخوێند بو و، لای هیچ کەس و لە هیچ مزگەوتێکیش دا «ئیجازە» ی مەلایەتی وەرنەگرت بو. مەلایەتییەکەی لە ئازناوێک زیاتر نەبو. ئەو ماوەیەی لە سلێمانی بو هەندێ دەرسی لای مەلا عەبدوللای چروستانی و هەندێ دەرسیشی لای مەلا مستەفای صفوەت خوێند.

مەلا مستەفا ئاتومێد بو لەوەی ڕێگای بدەن بگەڕێتەوە سەر جێگاورێگای خۆی لە بارزان، خۆیان تەعیین کرد بو بە «قزلچی غابات» و هەندێ لە خزمەکانیشی بە «حەسەحەسی شەو». ئەو موچەیەی بۆیان بڕی بونەوە بەشی ژیانی نەئەکردن. بیری لەوە کردەوە بە بێ موافەقەتی حکومەت بە نهێنی بگەڕێتەوە بارزان و، زور بۆ حکومەت بهێنێ ڕێگای شێخ ئەحمەد و بارزانییەکان بدا بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان. شێخ لەتیفی حەفید لە مەدا یارمەتی دا. چەند کەسێکی بۆ هاودەنگی و شارەزایی لە گەڵ نارد، لەوانە محەی سالە سور، مەجیدی قالەی حەمامچی، تا بە لای پێنجوین دا، بە نهێنی بیگەیەننە بانە لە دیوی ئێران.

مەلا مستەفا ڕۆژی ١٢ ی تەموزی ١٩٤٣ سلێمانی بەجێ هێشت بەرەو بانە و سەقز و مەهاباد و بە لای نەغەدەدا بۆ ناوچەی شنۆ و، لە وێوە چوەوە ناوچەی برادۆست لە دیوی عێراق و ڕۆژی ٢٨ ی تەموز گەیشتەوە بارزان.

مەلا مستەفا لە ڕێگای گەڕانەوەی دا بۆ بارزان، چەند کەسێکی لەو بارزانیانەی لە

گرنده‌کانی نزیک ئه‌فسه‌ده و شنۆ دانیشت بون، له گه‌ل خۆی برد بوموه و، له براده‌ستیش تاقمی بارزانی له حکومه‌ت قاچاخ بون ئه‌وانیشی دۆزیه‌وه. ئه‌مانه هه‌مو یه‌کیان گرته‌وه.

مه‌لا مسته‌فا، به هۆی ئامیر مه‌خفه‌ری شیته‌نه‌وه خۆی هه‌والی بۆ حکومه‌ت نارد که‌وا: گه‌ڕانه‌وه‌ی ناوچه‌که و، له به‌ر خراپی هه‌لومه‌رجی ژیانیان و، ره‌فتاری کاربه‌ده‌ستان هه‌لاتوه، نیازی شه‌ڕ و خراپه‌ی نیه و، ئاماده‌یه به گفتوگۆ هه‌مو گیروگرفته‌کان چاره‌سه‌ر بکا. حکومه‌ت خواسته‌کانی مه‌لا مسته‌فای پشت گوێ خست و، شیخ ئه‌حمه‌د و بارزانیه‌کانی له سلیمانیه‌وه دور خسته‌وه بۆ حیلله.

به درێژایی مانگی ئاب و ئه‌یلول به ناوچه‌که‌دا گه‌ڕا، تا ئه‌هات هێزه‌که‌ی زیادی ئه‌کرد. مه‌لا مسته‌فا که زانی حکومه‌ت گوێ ی ناداتی که‌وته گوشاربردن. له مانگی تشرینی یه‌که‌م دا که‌وته په‌لاماردانی مه‌خفه‌ره‌کانی ناوچه‌که. هه‌ندێ له بارزانیه‌کان بو بون به پۆلیس، له‌م مه‌خفه‌رانه‌دا بلاو بوبونه‌وه، ئه‌مه‌یش کاره‌که‌ی مه‌لا مسته‌فای ئاسان ئه‌کرد. مه‌خفه‌ره‌کانی: شانه‌ده‌ر، خه‌ره‌زۆک، بیره‌که‌پره، زیت، چه‌می، سپلکی، مه‌رۆز، ئه‌رگوس، طیل، شنگیل، کانی بۆت، بیدیال، شیروان، ریزان، شیتنه، بیداروێن، کانی ره‌ش.. گیران. بارزانیه‌کان پڕ چه‌ک بون و هێزه‌کیان گه‌وره بو. به‌لام مه‌خفه‌ره‌کانی: میرگه سور، بارزان، بله، که له وانی تر گرنگتر بون نه‌گیران. عیراق لیوایه‌ک سه‌ربازی جه‌یشی نارد بۆ میرگه سور. ئه‌م لیوایه رۆژانی ٦ و ٨ و ١٠ ی تشرینی دوه‌می ٤٣ به پشتیوانی فرۆکه، چه‌ند هێرشێکی کرد، به‌لام له هه‌مویان دا شکا. راستیه‌که‌ی چه‌ند ئه‌فسه‌رێکی کوردپه‌روه‌ر له‌م لیوایه‌دا بون، له‌وانه: نوری مه‌لا مارف، ئه‌وره‌حمان قازی، نوری مه‌لا حه‌کیم، نوری ئه‌حمه‌د طه‌ها.. به نهێنی هاوکاریان له گه‌ل مه‌لا مسته‌فا ئه‌کرد.

*

په‌یوه‌ندی و گفتوگۆ له نێوان مه‌لا مسته‌فا و کاربه‌ده‌ستانی عیراقی و به‌ریتانی دا ده‌ستی پێ کرد. داواکانی مه‌لا مسته‌فا له سنوری گیروگرفت و خواسته‌کانی عه‌شیره‌ته‌که‌ی ده‌رنه‌ئه‌چو. داوای ئه‌کرد: رێگای شیخ ئه‌حمه‌د و بارزانیه‌کان بدرێ بگه‌ڕێنه‌وه شوێنه‌کانی خۆیان و، له‌و سه‌رده‌مه‌دا که خۆراک به هۆی جه‌نگی جیهانیه‌وه به «کارتی ته‌موین» دابه‌ش ئه‌کرا، به‌شی ئه‌مانیش ئازوقه‌یان بۆ دابین بکرێ. فه‌رمانبه‌رانی ته‌موین له‌و کاته‌دا باریان به قوتی هه‌زاران ئه‌کرد.

*

حیزبی هیوا و شۆڕشی بارزان

حیزبی هیوا، گه‌وره‌ترین رێکخراوی سیاسی ئه‌وسای کورد، ویستی گه‌شه به جولانه‌وه‌که بدا له بزوتنه‌وه‌یه‌کی خێله‌کی داپراوه‌وه بیگۆڕێ بۆ بزوتنه‌وه‌یه‌کی سیاسی نه‌ته‌وه‌یی. په‌یوه‌ندی له گه‌ل مه‌لا مسته‌فا دامه‌زراند. بۆ پشتیوانی له شۆڕش و تاوانبار کردنی حکومه‌ت له به‌غداد به‌یانی ده‌رئه‌کرد و، بیرخه‌ره‌وه‌ی به سه‌فاره‌تی ده‌وله‌ته گه‌وره‌کان ئه‌دا.

جولانه‌وه‌ی کورد له‌و زه‌مانه‌دا بێ پێشه‌وا بو. بۆشایی سه‌رکردایه‌تی تێ دا دروست بوبو. شیخ مه‌حمود له کوردستان دور خرابوه‌وه و، ده‌ستی له کاری سیاسی هه‌لگرت بو. ره‌فیق حیلمی که بو بو به سه‌رۆکی حیزبی هیوا، له ناو حیزبه‌که‌ی دا جێگای پێ لێژ بوبو، حیزبه‌که‌یشی خه‌ریک بو هه‌لئه‌وه‌شا. که‌سێکی وا هه‌لنه‌که‌وت بو ئه‌م بۆشاییه پڕ

بکاتەوە. لەو کاتەدا کورد پێویستی بە یەکێ بوو، یان وەکو ئەو زەمانە وتویانە بە «زەعیم» هەبوو، ڕێبەری بکا. حیزبی هیوا و ئەفسەر و ڕوشنبیرەکانی کورد ئەم «زەعامەت»ەیان بە شیاوی مەلا مستەفا ئەزانی و، هەر ئەو زەمانە بە «زەعیم مەلا مستەفا» ناویان ئەبرد.

*

لەو کاتەدا هێشتا دووەمین جەنگی جیهانی بە لادا نەکەوت بوو. پشێوی و نائارامی بە قازانجی بەریتانیا نەبوو. بەریتانیا داوای لە مەلا مستەفا کرد، دەس لە شۆڕش هەڵبگرێ، هەڕەشەی لێ کرد، کە درێژەدان بە شۆڕش دژی عێراق، واتە دوژمنایەتی بەریتانیا و دەوڵەتانی هاوپەیمان و، داوای لە حکومەتی عێراقیش کرد کێشەکە بە خۆشی چارەسەر بکا.

*

نوری سەعید، لە ٢٥ی کانونی یەکەمی ٤٣ دا وەزارەتێکی نوێ ی پێک هێنا. ٣ کورد لە وەزارەتەکەی دا بوو. دوانیان: ئەحمەد موختار بابان و عومەر نەظمی، پەیوەندییان بە جوڵانەوەی کوردەوە نەبوو، بەڵام سێ یەمیان، سیاسی ناسراوی کورد؛ ماجید مستەفا بوو، کە ماوەیەکی درێژ هاوکاری شێخ مەحموود بوو لە شۆڕشەکانی دا و، دوایێتر پاش کۆتایی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود چوو بووە ناو دەزگای بەڕێوەبەرایەتی عێراقەوە. کرایە وەزیری دەوڵەت. چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەم سپێردرا.

*

ماجید سەردانی شێخ ئەحمەدی کرد لە حیللە. داوای لێ کرد یەکێ لە کوڕەکانی بنێری بۆ لای مەلا مستەفا بۆ ڕاگرتنی شەڕ و دانانی ڕێوشوێنی گفتوگۆ. شێخ ئەحمەد، محەممەد خالیدی نارد و، دوای موافەقەتی مەلا مستەفا، ڕۆژی ٢٩ی کانونی یەکەمی ٤٣ گەڕایەوە. بە دوای ئەمەدا ماجید مستەفا ڕۆژی ٧ی کانونی دووەمی ٤٤ چوو بۆ سەردانی مەلا مستەفا لە مێرگە سوور. ماجید دوای یەک ڕۆژ گەڕایەوە بەغداد.

ماجید مستەفا لە دیدەنی بارزانی دا هانی دابوو، کە لە باتی خواستنی ناوچەیی داوای مافی نەتەوەیی بکا و، ئەفسەرەکانی پەیوەندی بەش هەمان ئامۆژگاری و داوایان لە مەلا مستەفا ئەکرد و، بەڵێنیان ئەدایە هاوکاری بکەن و، لە جموجوڵی جەیش و حکومەت ئاگاداریان ئەکرد.

دوای ئەمە ئیتر، ناوەڕۆکی شۆڕشی بارزان خەریک بوو ئەگۆڕا. ئەگەر تا ئەوسا شۆڕشێکی خێڵەکی بوو، دژی زوڵمی کۆمەڵایەتی و، لە پێناوی چەسپاندنی دادی کۆمەڵایەتی دا، بوو بە شۆڕشێکی کوردی خاوەن داوای سیاسی.

*

لە سەر داوای ماجید وەزارەتەکەی نوری سەعید لە دانیشتنی ڕۆژی ٢٥ ی کانونی دووەمی ٤٤ دا بڕیاری دا چەند ئەفسەرێکی کورد، کە تا ئەوسا لە ڕیزی جەیش دا بوون، دابنێ بە ئەفسەری پەیوەندی لە ناوچەکانی کوردستان دا. ئەمانە زۆربەیان ئەندامی حیزبی هیوا بوون. کران بە ئەفسەری پەیوەندی: بەهادین نوری بۆ سلێمانی، ئەمین ڕەواندزی بۆ ڕەواندز، عیززەت عەزیز بۆ بارزان، مستەفا خۆشناو بۆ بلە، میرحاج ئەحمەد بۆ ئاکرێ، مەجید عەلی بۆ ئامێدی، سەید عەزیزی شەمزینی بۆ مێرگە سوور، فوئاد عارف بۆ پشدەر. حکومەت دەسەڵاتی سوپایی و شارستانی دابوونی بۆ چاودێری جۆری دابەشکردنی ئازوقەی

جیگاو ریگای پەیدا کرد و، بڵاوکراوەکانی یەکیتی لەوی چاپ ئەکرد. هاوڕێ و کەسوکاری شەهیدەکان بە هەڵیان زانی بو، هەر کەسە وینەیەکی دەس کەوت بو پۆستەریکیان بۆ کرد بو. پۆستەری سەدان شەهید چاپ کرا بو. زۆر لەم پۆستەرانە ئەبرانەوە بۆ دیهاتەکانی کوردستانی عیراق هەڵئەواسران.

من کە لە سەفەر گەرامەوە سەیرم کرد دیواری ژوورەکانی بارەگاکەمان بە سەدان پۆستەری پیوەیە. زۆریشیان هی ئەو شەهیدانە بون کە لە گەڵ خۆمان پیشمەرگە بون یا ناسیاو بون. دیمەنیکی سامناکی هەبو. بە پیشمەرگەکانم وت: «راستە ئەمە بۆ ریز لینان لە شەهیدەکان پیویستە، بەلام هەرچی بیتە ئەم ژوورەوە، وینەی ئەم هەمو کوژراوە ببینی، یەکسەر ورەی ئەروخی».

*

من تازە گەیشت بومەوە ناوزەنگ، بەفریکی ئەستور باری بو، رۆژی ۱۸ ی تشرینی یەکەمی ۷۹ جاریکی تر دەستەی نوینەرایەتی ئیران هاتنەوە بۆ کوردستان. نامەیەکی پەلەی مامجەلالم پی گەیشت، داوای لی کرد بوم دەسبەجی بچم بۆ بنوخەلەف، بۆ ئەوەی لە گەڵ دەستەی نوینەرایەتی ئیران بگەریمەوە بۆ تاران، بۆ سەرپەرشتی گویزانەوەی چەک لە دیمەشقەوە بۆ تاران. لە ناو هاوریکانی ئەوی دا هاتوچۆکردن بۆ من ئاسانتر بو چونکە پاسپورتم هەبو و، بە قانونی هات بومە ئیرانەوە. مژدەی دابومی کە ئیران موافەقەتی کردوە چەکەکان بە فروکە بگویزینەوە.

دەسبەجی بەرەو بنو خەلەف بە ری کەوتم. هیشتا نوینەرانی هەردولا لە گەرمەی گفتوگۆدا بون.

نوینەرانی ئیران: داریوشی فروهەر، وەزیری کار. سەرتیپ دانشوەر، فەرماندەی ژاندارمەری. سەرتیپ ئازەری قەمروغ، فەرماندەی نیروی زەمینی. کوریکیش بە ناوی کەریمخانی سکرتیری فروهەر بو.

نوینەرانی کورد: مەلا شیخ عیزەدینی حوسەینی. فاتیحی شیخولئیسلامی. صەلاحەدینی موهتەدی. ئیبراهیمی عەلی زادە، نوینەری سازکا و، کوریک بە ناوی حەسەین نوینەری چریک بو. لە حدکا کەس نەهات بو.

منیش چومە ژوورەکە لە نزیک شیخ عیزەدین دانیشتم. دەمەقالییەکی زۆر گەرم بو لە نیوان صەلاحەدینی موهتەدی و داریوشی فروهەر دا، هەرلایەکیان ئەوی تری تاوانبار ئەکرد. گفتوگۆکەیان هی شەر بو نەک هی ئاشتبونەوە. مەلا شیخ عیزەدین لی ی پرسیم:

«هیچ فارسی ئەزانی؟»

وتم: «بەلی!»

وتی: «ئەمە بخوینەرەوە بزانم نەزەرت چیە؟»

کاغەزیکی دایە دەستم یادداشتیک بو بە ناوی مەلا شیخ عیززەدینەوە بۆ ئیمام خومەینی و کاربەدەستانی ئیرانی نوسرا بو. خواستەکانی کوردیان تی دا نوسی بو. دوای ئەوەی خویندمەوە شیخ عیزەدین پرسی: «نەزەرت چیە؟»

وتم: «مامۆستا ئەم یادداشتە هی شەرە، کە لایەنیکی سەرکەوتو نوسیبیتی، ئەمە ری خوش ناکا بۆ ئاشتی، زۆر توندە. تۆ مەلای و سەرانی شۆرشی ئیران مەلان، پیویستە بە یەسەلە دەس پی بکا و، داواکان بە هەندی ئایەتی قورئانی پتەو بکەی و، زمانی

یادداشتەکەیش خاو بکرێتەوە!»

هەندێ قسەی تریشم کرد. ئەویش یادداشتەکەی بە دڵ نەبو، بەڵام تا ئەو کاتە نەیویست بو قسە بکا، بۆ ئەوەی نوێنەرەکانی ساواکا و چریک بە «سازشکار» ی دانەنێن. ئیتر ئەویش کەوتە رونکردنەوەی باری سەرنجی خۆی. کۆبونەوەکە بە ئەنجامێکی باش نەگەیشت.

دەستەی نوێنەرایەتی تهران گەڕانەوە. فەوزی راوی و، حەمە سەعید و منیش لە گەلیان رۆیشتین. پێش ئەوەی بگەینە سەردەشت لە رێگا تاقمێ پاسدار هەندێ تەقەیان لێ کردین. پێ ئەچو ئەوان گفتوگۆی ئاشتیان پێ باش نەبێ. لە سەردەشت چوینە پادگان. لەوێوە بە هالیکۆپتەر رۆیشتینە سنە و لە سنە فڕۆکەیەکی بچکۆلەیان ئامادە کرد بۆ ئەوە چوینە تاران.

ململانێ ی دەسەڵات لە ناو سەرانی شۆڕش و سەرانی حکومەت دا بە لادا نەکەوت بو. باڵی دینی ئەیویست کاروبار بگرێتە دەست و باڵی نەدینی ئەیویست شوێنەکانی خۆی لە دەس نەدات. نزیکێ لە باڵیکیان، باڵەکەی تری ئەکرد بە دوژمنی. سەبارەت بە گفتوگۆ لە گەڵ سەرانی کورد و، جۆری چارەسەری کێشەی کورد ناکۆک بون. هەندێ لە سەرانی باڵی دینی ئەیانویست کێشەی کورد بە سەرکوتکردن چارەسەر بکەن و، هەندێک لەوانەی باڵی نەدینی ئەیانویست بە گفتوگۆ چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە. بەڵام هیچ لایەکیان پرۆژە یا بۆچونێکی دیاریکراویان نەبو بۆ رەفتار لە گەڵ مەسەلەی کورد.

فروهەر لە سەفەرەکەی دا سەرکەوتنی بە دەس نەهێنا بو، کەوتە بەر هێرشی رەخنەی نەیار و ناحەزەکانی. هەندێ لە رۆژنامەکانی ئەو رۆژانە ناکۆکییەکانی بە ئاشکرا باس ئەکرد. منیش لە ئوتێلی پارس کەوت بوم. بارەگای حیزبەکەی فروهەر: «حیزبی میللەتی ئیران» بە تەنیشت ئوتێلەکەوە بو. جاروبار ئەچوم بۆ بارەگاکەیان. چەند جارێ فرهەرم بینی و بەرم نەخستەوە کە من بۆچی هاتوم. رۆژێکیان وتی سەرێکی دانشوەر بدە. دانشوەر فەرماندەی ژاندارمەری بو، ئەو زەمانە دەستی زۆر ئەڕۆیشت. چەک و ئازوقە و پارەی لە بەر دەس دا بو. پارتی لە گەڵ ئەم پەیوەندییان دامەزراند بو، ئەم یارمەتی ئەدان.

سەری سەرتیپ دانشوەرم دا. فەوزی دانیشوەری ناو نا بو: «الاعضب» چونکە یەکدەستی هەبو، باڵێکی لە شەری عەشائیردا فرتا بو. بیروراکانی خۆی بۆ رون ئەکردەوە. خۆی بە «پان ئیرانیست» و، کوردی بە ئیرانیی رەسەن و خوێنپاک دائەنا. قینی خۆی لە عەرەب نەئەشاردەوە. ئەیوت: «وەسیەتم کردوە کە مردم ئێسک و پروسکم لە کەناری فورات دا بنێژن چونکە فورات سنوری سروشتیی ئیرانە!»

وتم: «تێمسار من لە گەڵ ئێوە هاتم بۆ ئەوەی کارئاسانیم بۆ بکەن ئەو چەکانەی لە سوریا هەسانە لە رێگای ئیرانەوە بیگوێزمەوە بۆ کوردستان، ئەوە چەند رۆژێکە من لێرە دانیشتوم کەسی لە من ناپرسێتەوە و، وەڵامێکم نادەنەوە، تکام وایە رێگایەکم پیشان بدە، بگەڕێمەوە بۆ لای خۆمان یان بێنمەوە؟ ئەگەر بێنمەوە چی بکەم؟»

دانشوەر وتی: «ئێوە لە ناوچەکانی سنوردان. حدکا و دوژمنەکانی ئێمە لەو سنورەوە چەکیان لە عێراقەوە بۆ دێ. تا ئێوە سنورەکان لە روی دوژمنەکانی ئێمەدا دانەخەن ئێمە یارمەتیتان نادەین. ئەگەر بەڵێن بدەن کە سنورەکان دابخەن و، وەکو گروهی بارزانی ئێرەش شەریان بکەن، من لەو چەکانە زۆر زیاترتان ئەدەمێ کە ئێوە بە تەمان لە سوریاوە

ببهبڵێنا»
وتم: «تیمسار من به پێ ی بەڵێنی خۆتان کە بە ئاغای تالقانیتان داوە هاتووم بۆ گوێزانەوەی چەک نەک بۆ گفتوگۆی سیاسی. تیهران چوارسەد هەزار سەربازی هەیە سنوورەکانی خۆی پێ لەو تالانانە ناگیرێ، ئیمە هێزێکی پارتیزانیی پچووک چۆن ئەو کارەمان پێ ئەنجام ئەدرێ!»
تێگەیشتم مانەوەم بێ کەڵکە، بەڵێنەکەیان هیچی لێ سەوز نابێ، منیش گەڕامەوە، وەکو مامە شێخ رەزا ئەڵێ: «ئەمما بە عاجزی».
ئەگەرچی د. قاسملو بە گەرمی لایەنگری گفتوگۆ بوو، بەڵام لە سەرەتاوە حەزی نەئەکرد، مامجەلال ناوبژیکەر بێ. ئەو دانیشتنانەی مامجەلال رێکی خست بۆ گفتوگۆی تیهرانی – کوردی، نە خۆی بەشداری کرد و، نە نوێنەرێکی دەسەلاتداری نارد، بەڵکو ژێر بە ژێر هەوڵی ئەدا ئەوی لێ دەربهێنێ و، خۆی و حیزبەکەی ببن بە هێزی سەرەکی گوێ لێ گیراو. حدکا لە بیروت داوای لە پاسر عەرەفات کرد بوو، کە داوا لە ئیمام خومەینی بکا، شەڕی کوردستان رابگرێ و، کێشەی کورد بە ئاشتی چارەسەر بکا. هەروەها کاربەدەستێکی تیرانیشیان لە مەهاباد قەراند بوو، دوای ماوەیەک بەرێیان داوە بە ڕیش دا هەواڵیان بۆ کاربەدەستانی تیهران نارد بوو کە حدکا ئامادەیە بۆ موزاکەرات.

*

«هەیئەتی نومایەندەگی خەڵکی کورد»
ڕۆژی ۲۹ ی تشرینی یەکەمی ۷۹ رادیۆی تاران راگرتنی شەڕی کوردستانی ڕاگەیاند. هەمو ڕێکخراوەکان ئەمەیان بە هەڵ زانی کادر و پێشمەرگە و ئەندامەکانی خۆیان ناردەوە شارەکان. بارەگای دەفتەری سیاسی حدکا تا ئەو کاتەیش هەر لە ئاشی پشکاوێ بوو لە نێوان گوندی شینی ی عێراق و گوندی گورشەری ئیران دا.
ڕۆژی ۱ ی تشرینی دووەم کۆبوونەوەیەکی ۳ قۆڵی: یەکێتی، حشع، حدکا لە زەڵێ کرا. مامجەلال و د. قاسملو لەم کۆبوونەوەیەدا بەشدار بوون. مامجەلال هەوڵێکی زۆری لە گەڵ نوێنەرانی حدکا داوە بۆ ئەوەی بە دەستەیەکی یەکگرتو و، خواستی یەکگرتووەوە بچنە موزاکەراتەوە لە گەڵ نوێنەرانی حکومەتی ئیران.
ڕۆژی ۱۷ ی تشرینی دووەم، ئیمام خومەینی ئەم پەیامەی بۆ کورد نارد.

*

بسم الله الرحمن الرحیم
سلام بر خواهران و برادران کرد که با وفاداری خود به اسلام و جمهوری اسلامی از توطئه خائنین به کشور جلوگیری کردید. گزارشات هیأت ویژه همانطور بود که متوقع از برادران و خواهران کرد بود، که هرگز خودرا از اسلام و ایران جدا نمی دانند و آنچه بدخواهان به آنان نسبت می دهند چیزی جز افساد و توطئەگری نیست. اکنون من باید به شما برادران و خواهران کرد و سایر برادران مطالبی را تذکر دهم:
۱. در این موقع حساس که ملت ما با چپاولگران که در رأس آنها آمریکا مواجه هست و برای احقاق حق خود و به دست آوردن ذخائر هنگفتی که محمد رضا پهلوی به غارت برده و به محاکمه کشیدن این جانی قیام نموده و همه قشرهای ملت با هم در این امر حیاتی متحد و همصدا شده اند و برادران و خواهران کرد ما هرجا هستند باید به طور

اولویت در این امر شرکت کنند و با سایر خواهران و برادران هماهنگ شوند و لازم است از اختلافاتیکه بدخواهان ایجاد می کنند به طور قاطع جلوگیری کنند.

برادران من! امروز هر اختلافی به نفع آمریکا و دیگر اجانب است. آنان هستن که از اختلافات ما بهره گیری می کنند و مارا می خواهند به اسارت بکشند. بپاخیزید و توطئه‌گران را نصیحت کنید و در صورت عدم قبول از خود برانید و از مناطق خود بیرون کنید یا آنانرا گرفته تسلیم مقامات دولتی کنید.

۲. اینجانب و همه ملت از ستمهائیکه به شما برادران کرد در طول حکومت استبدادی شده‌است و از تبعیض هائی که بر خلاف اسلام بر شما روا داشته‌اند، مطلع هستیم. لیکن باید بدانید که این شما برادان نبودید که مورد ستم و ظلم واقع شدید. سایر برادران ترک و لر و عرب و بلوچ و فارس و ترکمن هم با شما شریک بوده‌اند و همه محروم بودند از آنچه محروم بودید. شما اگر به زاغه‌نشینان و گودنشینان تهران توجه نمائید خواهید دید آنان از همه محروم ترند. اینجانب می دانم که در حکومت موقت هم آنطور که خواست شما و ملت است، رسیدگی نشده، لیکن باید بدانید باز در این امر همه برادران شما شریک می باشند و دولت موقت با کمال جدیت اشتغال به کار سامان دادن بود، لیکن آشفتگیها به قدری زیاد است، که اصلاح محتاج به زمان است. -

و من امیدوارم که برای همه‌ی ملت و برای شما برادران کرد وسائل رفاه حاصل شود. شما برادران می دانید که نوسازی و عمران در محیطی که آشفته است و مردم در امان نیستند، مشکل یا غیر ممکن است. شما برادران غرب کوشش کنید و آرامش خودرا حفظ کنید و بدانید که با ارامش کارها اصلاح می شود و به صلاح شما و به صلاح اسلام و مسلمین است.

۳. از هیأت ویژه می خواهم که به مذاکرات خود با کمال حسن نیت ادامه دهند، و با شخصیتهای مذهبی و سیاسی و ملی و سایر قشرها تماس بگیرند، تا تامین خواسته‌های آنان که خواست ما نیز هست، به طور دلخواه بشود و آرامش و امن که از بزرگترین نعمتهای الهی است در منطقه برقرار گردد، و شما برادران کرد در کنار سایر برادران به طور رفاه و آسایش زندگی نموده و طمع اجانب برای همیشه از کشورمان قطع شود.

٤. اسلام بزرگ تمام تبعیض هارا محکوم نموده و برای هیچ گروهی ویژگی خاصی قرار نداده و تقوا و تعهد اسلام تنها کرامت انسانها است، و در پناه اسلام و جمهوری اسلامی حق اداره‌ی امور داخلی و محلی و رفع هرگونه تبعیض فرهنگی و اقتصادی و سیاسی متعلق به تمام قشرهای ملت است منجمله برادران کرد، که دولت جمهوری اسلامی موظف و متعهد به تامین آن در اسرع وقت می باشد و مقررات و قوانین مربوط به آن به زودی انشاءالله تعالی تدوین می شود.

٥. اخیرا باز نظر شریف علماء اعلام و مشایخ عظام و روشنفکران و سایر برادران عزیز در سراسر ایران را به موضع حساس امروز ایران و جبهه‌گیریهای دشمنان میهن و اسلام و در مقابل ملت عزیز و تشبثات همه جانبه‌ی آنان برای سرکوبی نهضت اسلامی و ملت معظم و برای اعاده‌ی همه جانبه بر کشور اسلامی ما جلب می کنیم، آیا در این موقع تقاضای متواضعانه‌ی این خدمتگزار که روزهای آخر عمرش را می گذراند، به جا

نیست!

۶. خواهران و رادران هم میهن در سراسر کشور، من دست خودرا به پیش شما دراز می کنم، و از شما به خاطر خدا و اسلام و کشور عاجزانه می خواهم که تمام توان خودرا برای نجات کشورتان به کار برید، و اسلحه‌های سرد و گرم یعنی قلم و بیان و مسلسل را از نشانه‌گیری به روی یکدیگر منحرف و به سوی دشمنهای انسانیت که در راس آن امریکا است نشانه روید. باری الهی من ماموریت خودرا که نصیحت به ملت است به قدر توان ضعیف خود انجام دادم، و تو ای خدای بزرگ با قدرت لایزال خود قلوب ملت مارا پیوند برادرانه عطا نمود، انک قریب مجیب. سلام گرم من به ملت عزیز و برادران کرد و رحمت خداوند بر همه. روح الله الموسوی الخمینی

۲۶ آبان ۵۸ - ۲۶ ذیحجه ۹۹

*

قسەکانی ئیمام خومەینی وەکو قسەی هیچ یەکێ لە کاربەدەستانی تیهران نەبو. قسەکانی ئەم بە حوکمی شەرعی دائەنرا، کەس نەیئەتوانی بە ئاشکرا دژی راوەستێ. ئەم پەیامەی پێشەوای ئینقیلاب زۆر گرنگ و، مەسەلەی زۆر گرنگی تێ دا بو، لەوانە:

۱. سەلماندنی زۆرلێکراوی و چەوساوەیی کورد.

۲. سەلماندنی مافی کورد بۆ بەڕێوەبردنی خۆی لە ناوچەکانی خۆی دا.

۱. راگرتنی شەڕی راگەیاندن و شەڕی تفەنگ.

۲. گفتوگۆی سیاسی لە گەڵ کەسایەتی دینی و نەتەوەیی و سیاسی کورد بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی.

*

چەند رۆژێ دوای ئەوە، د. قاسملو لە ئاشتی پشکاوی وە چوەوە مەهاباد، لە خۆپیشاندانێکی گەورەدا پشتیوانی لە پەیامەکەی ئیمام کرد و، لە قسەکانی دا وتی: «ما به پیام امام لبیک میگوئیم..» و، ئیتر خۆیان ئامادە کرد بۆ گفتوگۆ.

*

حدکا، لە گەڵ شیخ عیززەدین و سازکا و چریک ریک کەوتبو دەستەیەکی هاوبەشی نوێنەرایەتی بە ناوی: «هەیئەتی نومایندەگی خەلقی کورد» پێک بهێنن. لە سەرەتاوە دیاربو گفتوگۆی کورد و تیهران بە ئەنجام ناگات. هیچ لایەکیان باوەری بەوی تر نەبو. چریک، شاخەی کوردستانی دامەزراند بو، چارەسەرکردنی کێشەی کوردی بە لاوە گرنگ نەبو، بەلکو ئەیویست کەلک لە کوردستان وەربگری وەکو بنکەیەک بۆ چالاکییەکانی خۆی و، کەلک لە کێشەی کورد وەربگری وەکو گوشارێک بۆ سەر داوودەزگای ناوەندی لە تاران. سازکاش، باوەریان بەوە نەبو، بە گفتوگۆ لە گەڵ داوودەزگای دینیی تیهران بگەنە هیچ جورە چارەسەرێکی ئاشتی کێشەی کورد، بەلکو خۆیان ئەیانوت، لەم گفتوگۆیانەدا بەشداری ئەکەین بۆ «ئیفشاگەری»، واتە بۆ ریسواکردنی رژێم! حدکا توشی چەند هێزێکی توندرەو ببو، هەمو نەرمییەکی ئەمیان بە «سازشکاری» لە قەڵەم ئەدا و، ئەیانکرد بە کەرەستەی پروپاگاندە دژی.

سەرەنجام هەیئەتی نومایندەگی خەلکی کورد لە: ٤ ئەندامی حدکا، ۲ ئەندامی سازکا، ۲ ئەندامی چریک، بە سەروکایەتی مەلا شیخ عیززەدین پێک هات. ئەندامێکی

حەدکا، قسەکەری رەسمیی «سخنگو» بو.
ئەم هەیئەتە پروژەیەکی ٢٦ ماددەییان ئامادە کرد کە ببی بە بنچینەی گفتوگۆ لە گەڵ نوینەرانی دەوڵەت.

*

## خواستەکانی کورد

خواستەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لە ئیران دا، لە بابەتی ئەو خواستانە بو کە چەند ساڵ بو کورد لە عیراق دا داوای ئەکرد. بە کورتی ئەمانە بو:
١. سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لە سەر بنچینەی ئۆتۆنۆمی (خودموختاری).
٢. دیاریکردنی سنوری کوردستانی ئیران لە سەر بنچینەی زورایەتی دانیشتوانی ناوچەکە.
٣. هەڵبژاردنی «شورا» ی ئۆتۆنۆمی کوردستان بە دەنگدانی نهینی و راستەوخو، ئەویش بۆ راپەراندنی کاروباری بەریوەبەرایەتی، ئابوری، روشنبیری، کومەلایەتی، ئاسایشی ناوخو.. «هەیئەتی ئیجرائی» دایەزرینی.
٤. کوردی ببیتە زمانی رەسمیی خویندن و بەریوەبەرایەتی.
ئەمە ناوەروکی خواستە نەتەوەییەکانیان بو، جا هەندی جار بە پروژەی ٨ ماددەیی و هەندی جار بە ٦ ماددەیی و، هەندی جاری تر بە پروژەی ٢٦ ماددەیی دەریان ئەبری.

*

«هەیئەتی حوسنی نییەت»، کە نوینەری دەوڵەت بو بۆ گفتوگۆ لە گەڵ سەرانی کورد لە دواهەفتەی مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٩ دا «طرح خودگردانی» لە روژنامەکانی تاران دا بلاو کردەوە. کوردەکانی ئیران هەرزو ناویان لی نا «طرح سرگردانی». ئەم پروژەیە خواستەکانی کوردی بە دی نەئەهینا، بەلام لە چاو تیگەیشتنی سیاسی حوکمرانەکانی ئیران دا هەنگاویک بو بۆ پیشەوە، ئەوە جاری یەکەم بو «دەسەلاتی ناوەندی» لە تاران ئامادە بی هەندی لە دەسەلاتەکانی خوی بە ئوستانەکان ببەخشی و، جوری، یا کەم و کورتیش بی، «نەناوەندیتی» بسەلمینی.
گەورەترین کەموکوری ئەم پروژەیە لەوەدا بو دابەشبونی بەریوەبەرایەتی ناوچە کوردنشینەکانی وەکو خوی هیشت بوەوە، هەمویانی یەک نەخست بو لە یەک ناوچەی بەریوەبەرایەتی دا. بەلام بە گویرەی ئەم پروژەیە ئەکرا زمانی کوردی لە پاڵ زمانی فارسی دا بۆ کاروباری حکومەتی بەکار بهینری و، روژنامە و بەرنامەی رادیو و تەلەفزیونی پی ئامادە بکری و، ئاسایشی ناوخو بە دەزگای ناوچەیی سپیردرا بو.
لە گەڵ دەستپیکردنەوەی شەردا لە کوردستان ئەم پروژەیەش مرد.

*

ئیران وڵاتیکی فرە نەتەوەیە، کاربەدەستەکانی لە کونەوە ترسیکی زوریان لە پارچە پارچە بونی هەیە و، ئەم ترسەیان کردوە بە بیانوی سەرکوتکردنی بزوتنەوەی نەتەوەکانی ئیران و، خواستە نەتەوەییەکانیان سەبارەت بە بە کارهینانی زمانی نەتەوەیی. لە ئیران دا چەندین نەتەوە و رەگەزی جیاواز هەیە: فارس، ئازەری، کورد، بلوچی، تورکمان، عەرەب.. سەرەرای ئەمانیش هەندی قەوم هەن خویان بە هیچ کام لەم نەتەوانە نازانن وەکو لور، گیلەکی.. لە ناو ئەم نەتەوانەدا ئازەری بە ژمارە لە هەمویان زورترن، ئەگەرچی لە

دوای دووەمین جەنگی جیهانی جمهوریەتی ئازەربایجانیان دروست کرد و، دوای سەرکەوتنی شۆرشی ئێران، هەم حیزبی تودە فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی دروست کردەوە و، هەم حەدکا و نەتەوەپەرستەکانی حیزبێکی تایبەتیمان بە ئازەربایجان دروست کرد، بەلام بزوتنەوەی نەتەوەیی ئازەری، وا بە هێز و تەوژم نەبو وەکو بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد، ئەمەش ئەگەرێتەوە بۆ چەند هۆیەک:

١. ئەگەرچی ئێران بە ناو بە دەولەتی فارس ناسراوە، بەلام لە کۆنەوە زنجیرەی ئازەرییەکان حوکمی ئێرانیان کردوە: سەفەوی، ئەفشار، قاجار.. کە چەند سەدە حوکمرانی ئێران بون هەموویان ئازەری بون، لە ناو ئەوانەدا دوجار حوکمرانی لە دەس زنجیرەی ئازەری دەرهاتوە: جارێکیان سەردەمی زنجیرەی زەند، کە بە ڕیچەڵەک کورد بون، جارێکی تر سەردەمی پەهلەوی، کە بە ڕیچەڵەک خەلکی شمالی ئێران بون.

فارس زورتر لەوەی نەتەوەی حوکمران بێ، زمانەکەی زمانی ئەدەب و فەرهەنگ و حوکم بوە.

٢. ئازەرییەکان، هەمیشە و بە درێژایی زەمان، لە دەزگای حوکمرانی دا دەسەلاتدار و زال بون، ژمارەیەکی زوری وەزیر، ئوستاندار، ئەفسەرانی ئەرتەش، ژاندارمەری، ساواک ئازەری بون. بەشێکی گرنگی بازار و بازرگانی و پیشەسازی سەرانسەری ئێران بە دەس ئەوانەوە بوە. لە دامەزراوی شیعەدا ئازەرییەکان هەمیشە دەسەلاتدار و خاوەن نفوز بون.

ئەم هۆیانە وایان کردوە، ئازەری هەست بە چەوسانەوەی نەتەوەیی بەرامبەر بە دەولەتی ئێران و، بە چەوسانەوەی مەزهەبی بەرامبەر دامەزراوی دینیی شیعە نەکەن.

لە بەرامبەر ئەمەدا نەتەوە پچوکەکانی تر: کورد، بلوچ، تورکومان، عەرەب.. لە ئێران دا، بە مەزهەب سونی بون و، لە داودەزگای حوکمرانی دا بێ بەش بون و، لە بازار و بازرگانی دا دەورێکیان نەبوە.

دوای سەرکەوتنی شۆرش، هەروەکو کورد داوای مافی نەتەوەیی ئەکرد، بزوتنەوەی نەتەوەیی لە بلوچستان، کومەڵەسەحرا، کومەڵەکاوس، خوزستان ئەلیەوە و، هاودەنگ لە گەل کورد ئەوانیش داوای مافەکانی خویان ئەکرد. بەلام جولانەوەکانی ئەوان زوتر لە هی کورد دامرکێنرایەوە، چونکە:

١. ئەو پیشینە مێژوییە درێژەی جولانەوەی کورد هەیبو، ئەوان نەیان بو.

٢. بە ژمارە لە کورد کەمتر بون.

٣. هەلکەوتی جوگرافی شوێنەکانیان، لە چاو هی کوردستانی ئێران دا، خراپتر بو.

## پیکهێنانی حسک

دوای جیابونەوەیان: «بزوتنەوە» و «کومیتەی ئامادە کردن» تا مانگی ئاب، بە کردەوە یەکیان نەگرت بو، کومیتەیەکی هاوبەشیان دروست کرد بو سەرپەرشتی کاروبارەکانی ئەکرد. لە روژانی ٣ - ٦ ی ئابی ٧٩ کوبونەوەیەکی فراوانیان بە کادرەکانی بزوتنەوە و کومیتەی ئامادە کردن کرد و پاسوکیشیان بانگ کرد. لەم کوبونەوەیەدا ناوی ڕیکخراوەکەیان نا: «حیزبی سوسیالیستی یەکگرتوی کوردستان: حسبک» و، سەرکردایەتی حیزبەکەیان دیاری کرد.

ئەمانە لە ناو خویان دا ئاتەبا بون، کاغەزی یەکتریان ئەئەخوێندەوە، کەسیان خوی

لەوی تریان بە کەمتر نەئەزانی، زۆرجار لە پاشملە گاڵتەیان بە یەکتری ئەکرد. هەر لە بەر ئەوە کە نامەیان بۆ حیزبێکی تر ئەنوسی ٣ کەس ئیمزای ئەکرد و، کە ئەچوون بۆ کۆبونەوەیەکی هاوبەش لە گەڵ حیزبێکی کەدا زۆربان ئەچوون. د. مەحمود و رەسول مامەند هەر کەسەیان خۆی بە شایستەی ئەوە ئەزانی کەسی یەکەمی حیزب بێ. بەڵام هێزی راستەقینە هی رەسول بو. د. مەحمود هێزێکی ئەوتۆی نەخستبوە سەر هێزەکەی رەسول.

*

جیابونەوەی چەکدارەکانی بزوتنەوە، لەشکرێکی تری لە کوردستان زیاد کرد و، بیری یەکخستنی چەکداری هەمو حیزبەکان، لە «یەک لەشکری یەکگرتو» دا، کە لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتیەوە باس ئەکرا و، ئەمانویست هەمو لایەنەکان بەم بیرە قانیع بکەین، بە یەکجاری داروخا. لەوە بە دواوە کوردستان بەرەو «فرە - لەشکری» رۆیشت. جگە لە یەک کە هەر لە سەرەتاوە لەشکری خۆی هەبو، حیزبەکانی تریش: حسک، پاسۆک، حشع و، دوایی تریش هێزەکانی سەر بە ئێران و، گەل.. هەر یەکەیان میلیشیای تایبەتی خۆی دروست کرد. فرە - لەشکری، هۆی سەرەکی شەری ناوخۆ بو. راستە ناکۆکیەکان هەمیشە لە سەرچاوەی سیاسیەوە هەڵئەقوڵین، بەڵام ئەگەر ئەم حیزبانە لەشکری تایبەتی خۆیانیان نەبوایە، نەیانئەتوانی پەنا بەرنە بەر شەری چەکدار بۆ یەلاداخستنی ناکۆکیەکانیان، کە زۆرجار سیاسی نەبون.

*

- لەشکرەکەی حسک، کە دوای لەشکرەکەی یەکێتی، لە چاو هەمو لەشکرەکانی ترا بە ژمارە زۆرتر بو، تەنیا بۆ ئەوەی زۆر بن و بالادەستی پەیدا بکەن، جۆرەکەسێکیان لە ریزەکانی خۆیان دا ئەکردەوە، بێ ئەوەی گوێ بدەنە رابوردوی و، مەبەستی راستەقینەی لە هاتنی بۆ پێشمەرگایەتی.
- لەشکرەکەی حسک بو بە پەناگای دالدەدانی هەمو ئەوانەی لە دەس لێپرسینەوەی حیزبی، لە ناو حیزبەکانی ترەوە، رایان ئەکرد.
- سەرکردایەتی حیزبەکە توانای دارایی ژیاندنی لەشکرەکەی نەبو، چاوپۆشی لێ ئەکردن بۆ دابینکردنی ژیانی خۆیان و پێویستیەکانیان، بە ناوی جیا جیاوە، بە زۆر پارە لە خەڵک بسێنن و، راوورووت بکەن.
- فەرماندە و پێشمەرگەکانی لەشکرەکە گوێیان لە فەرمان و ئامۆژگاری سەرکردایەتیەکەیان نەئەگرت، ناوی حسکیان وەکو چەترێکی سیاسی بە کار ئەهێنا بۆ ئەوەی بە ئازادی و بێ ترسی لێپرسینەوە، چییان ئەوێ بیکەن. سەرکردایەتی حیزبەکەیش دەستی بە سەر لەشکرەکەی دا نەئەرۆیشت و، بۆ ئەوەی لە ژێر چەترەکەی دا بیبیننەوە چاوپۆشی لە خراپەکانیان ئەکرد.

*

حسک لەو شوێنانەی جۆری لە بالادەستی هەبو هێزەکانی یەکێتی دەرئەکرد. سەید کاکە لەم روەوە لە هەمویان زیاتر توندوتیژ بو. لە چەند جێگای وەکو بیدەلان لە ناوچەی سەرکردایەتی، خۆشناوەتی، دەشتی هەولێر، بناری کۆسرەت.. هێزەکانی یەکێتی دەرکرد و، لە چەند جێگایەک چەکی ئەکردن و، لێ ی ئەکوشتن. هێزە راونراوەکان، هەندێکیان بە چەک کراوی، ئەهاتنەوە بۆ ناوزەنگ.

*

لە پەراوێزی ئەو کۆبونەوانەدا کە لە سەر داوای حدکا ئەکراو، ینک و حشع و حسک بەشداریان تێ دا ئەکرد، نوێنەرانی ینک: عەلی حەویز و فاضیل کەریم و، نوێنەری حسک: حاجی حاجی برایم ڕۆژی ٤ ی ئەیلولی ٧٩ لە پێنوخەلەف کۆبونەوە. هەردولایان ڕێککەوت بون لە سەر ئەوەی لەمەولا زۆ زۆ یەکتری ببینن، هەوڵ بدەن باوەڕکردن بە یەکتری بینا بکەنەوە، هاوکاری یەکتری بکەن، ناکۆکییەکان بە گفتوگۆی برایانە چارەسەر بکەن و، هەڵوێستیان بەرامبەر ڕژێم یەک بخەن. بڕیاریان دابو هەردولا بڵاوکراوەی ناوخۆ بۆ ڕێکخستن و پێشمەرگەکانیان بڵاو بکەنەوە بۆ ئەوەی بەم گیانە کار بکەن.

*

شەفیق زاهیر و سەرباز ئەحمەد هەردوکیان کۆیی و هەردوکیان ئەندامی بزوتنەوە بون. لە سەر کیشەیەکی خیزانی لە ناو خۆیان دا ناکۆک بون بە دوای یەکتری دا ئەگەڕان بۆ کوشتن. لە جیابونەوەی بزوتنەوەدا ئەوانیش لە یەکیتی جیا بوبونەوە. هەردوکیان فەرماندەی کەرت بون. پاش ماوەیەک شەفیق گەڕایەوە ناو یەکیتی. شەفیق و سەرباز لە گوندی شۆرشکە لە بناری کۆسرەت توشی یەک ئەبن و ئەبی بە شەڕیان. چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت و بریندار کرد. ئەم ڕوداوە هیچ پەیوەندیەکی بە کیشەی سیاسی یەکیتی و حسکەوە نەبو. سەید کاکە کردی بە بیانو و لەشکری کۆ کردەوە چو بۆ دۆڵی جافەتی. لە باخەمەر ڕۆژی ١١ ی ئابی ٧٩ هەڵی کوتایە سەر هێزێکی یەکیتی پێشمەرگەیەکی کوشت و چەند کەسێکی تریشی بریندار کرد. یەکیتی لەو ناوچەیەدا بەهێز بو بە سەید کاکە چار نەئەکرا. لە بەر ئەوە هەر زو لەو ناوچەیە کشایەوە بۆ بەری کۆسرەت و خۆشناوەتی.

دوای جیابونەوەی بزوتنەوە، یەکیتی لە دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی لاواز بوبو. سەرانی حسک ئەیانویست هەولێر بۆ خۆیان پاوان بکەن و، کادر و پێشمەرگەکانی یەکیتی لێ دەربکەن. شەڕیان بە مەفرەزەکانی یەکیتی ئەفرۆشت. چەکیان ئەکردن و لە ناوچەکە دەریان ئەکردن. چەند جاری ئەم ڕوداوانە دوبارە ئەبونەوە. بۆ ئەوەی یەکیتی لەو ناوچەیەدا هەڵبستێتەوە و، حسک زات نەکا پەلاماریان بدا. کادر و پێشمەرگەکانی هەولێر کۆ کرانەوە و سەید مەجید کرا بە لێپرسراویان. سەلاح چاوشین و هێزێکیشیان بۆ پشتیوانی لە گەڵ ناردن. ئەم هێزە تیکەڵاو و بێ سەروبەر بو. فەرمانەکانیان کەسیان بە قسەی ئەوی تریانی نەئەکرد بو. هەندێکیان تازە هات بونە شاخ ئەجروبەی پێشمەرگایەتیان نەبو. بە کۆمەڵ لە نازەنین پالیان لێ دابوەوە. سەید کاکە هەمو هێزەکانی خۆیانی لە سەر کۆ کردنەوە و، شەوی ٥ ی ئەیلولی ٧٩ لە ناکاو لە نازەنین چوە سەریان. هێزەکەی یەکیتی پەرەوازە کرد. هەندێکیان گیران و هەندێکیان دەرباز بون. دو ڕۆژ دوای ئەوە مەفرەزەیەکی یەکیتی لە ئاوەگرد خۆی قایم کرد بو چوە سەر ئەوانیش. هەندێکی لێ کوشتن و هەندێکی لێ بریندار کردن. ئەمە جەزرەبەیەکی کاریگەر بو حسک لە یەکیتی سرەواند. ئەیویست دەس بە سەر ناوچەکەدا بگری.

*

حەمەی حاجی مەحمود، ئەوسا فەرماندەی هەرێمی ١ ی شارەزور و هەورامانی

یەکیەتی بو، هەلی دەستدرێژییەکانی سەید کاکەی بە دەرفەت زانی، ئەویش لە ۲۳ ی ئەیلول دا هەلی کوتایە سەر بارەگای عوسمانی قالە مەنوەر لە بلەکی لە ناوچەی بانە. بارەگاکەی گرت و، چەکدارەکانی هەمو چەک کرد. تەنیا عوسمان و یەک پێشمەرگە دەرباز بون. حەمە ئەم کارەی لە خۆیەوە کرد بو، سەرکردایەتی یەکیەتی ئاگادار نەبون. گوایە ئەمەی لە تولەی کارەکانی سەید کاکەدا کرد بو، رەنگە بیانوەکەی راست بوبی، بەلام راستیەکەی ئەوە بو: تەماعی کرد بوە چەکەکانی هێزەکەی عوسمان.

*

هەر لەو ماوەیەدا پەیوەندیشیان لە گەل حکومەت دامەزراند بۆ دەستپێکردنی گفتوگۆ. رۆژی ۳۰ ی ئەیلولی ۷۹ وەفدیان بە ڕێ کەوت بۆ بەغداد.

بە کردەوە ئەو ڕێکەوتنەی لە گەل حاجی لە بنرخلەف کرا بو، هیچ نرخێکی نەما.

*

گفتوگۆی حسک – بەعس

سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ۷۹ دەستەی نوێنەرایەتی حسک کە پێک هات بو لە د. مەحمود و عەدنان موفتی لە قەلادزەوە بران بۆ کەرکوک و، لەوێشەوە بۆ بەغداد. لەم چونەدا سەعدون شاکیر، وەزیری کاروباری ناوەوە و، د. فاضیل بەرراک، بەڕێوەبەری گشتی ئاسایش و، دوای ئەوانیش صەددام حسینیان بینی بو. چەند مانگی بو صەددام ببو بە سەرۆکی کومار.

پێ ناچی هیچ لایەکیان پرۆژەیەکی دیاریکراوی هەبوبی بۆ چارەسەری کێشەی کورد، چونکە هیچ لایەکیان شتێکی نوسراوی بلاو نەکردەوە، تەنیا قسە و باسی گشتییان کرد بو. صەددام داوای لێ کرد بون دەس هەلبگرن لە خەباتی چەکدار و بگەرێنەوە ژێر بالی حکومەت. بەلام بەلێنی هیچ دەسکەوتێکی سیاسی پێ نەدا بون.

یەکیەتی و حشع لەم کارەی حسک پەشۆکان. بە جوتە یادداشتێکیان لە ۱ ی تشرینی دوەمی ۷۹ دا دا بە حسک، یادداشتەکە توند و، بە زمانێکی رەق نوسرا بو، پەشۆکان و توڕەیی هەردو حیزب لە ناوەرۆکی یادداشتەکەدا ئەخوێنرێتەوە. داوایان لە حسک کرد بو دەس لە گفتوگۆی یەکلایەنی هەلبگری و، ناکۆکییەکانی لە گەل یەکیەتی بە ڕێگای گفتوگۆ چارەسەر بکا و، شان بە شانی ئەوان خەبات بکا بۆ روخاندنی رژێمی دیکتاتوری عیراق.

د. مەحمود لە دوای گەرانەوەی مامجەلالی لە شینێ دی. د. مەحمود ویست بوی مامجەلال ئیقناع بکا، یەکیەتی یش لە گفتوگۆکەدا بەشدار بی، مامجەلالیش ویست بوی د. مەحمود ئیقناع بکا واز لە گفتوگۆ بهێنی. جەلالی حاجی حسێن، نوێنەری پاسۆک، لەم دانیشتنەدا بەشدار ببو.

د. مەحمود هەوالەکانی ئەم سەفەرەی بۆ فەوزی راوی، نوێنەری بەعسی سەر بە سوریا و، بۆ نوێنەرانی حشع، بە جیا گێرابوەوە، لای هەریەکێکیان جۆرێ لە بەهانەی هێنا بوەوە بۆ گفتوگۆی بە تەنیای خۆیان لە گەل بەعس و، بەلام ترسی خۆیانی لە یەکیەتی کرد بو بە بیانوی سەرەکی.

دوای ئەم سەفەرە، ئیتر د. مەحمود نەچوەوە بۆ بەغداد بەلام پەیوەندییان هەر نەبری

بو. له بەعس نائومێد نەبوبون و، پروپاگاندەیان بۆ کەلکی ڕێککەوتن ئەکرد. هەندێ لە پێشمەرگەکانیان، بەم هیوایە، پشتیان لێ کرد بوەوە بێ ترس لە هێرشی بەعس ئەگەڕان. ڕۆژی ۲۰ ی کانونی یەکەمی ۷۹ جەیش لە دوڵی سماقوڵی پەلاماری دان. سەید سەلیم، فەرماندەی هەرێمەکە و، شێبەی بولی، یەکێ لە فەرماندەی کەرتەکانیان و، چەند پێشمەرگەیەکی کە کوژران. ئیتر ئەمە هیچ هیوایەکی بە گفتوگۆ نەهێشت.

دواتر حسک بە بەیانێکی درێژ سەرنەگرتنی گفتوگۆکەیانی ڕاگەیاند. ئەو هیوایەی هەیان بو بە چارەسەری سیاسی نەهاتە دی و، ئەو واهیمەیەی کە لە سەرەتاوە هەیان بو، دەربارەی ئامادەیی بەعس بۆ چارەسەری سیاسی هێنانەی کێشەی کورد و، نائامادەیی یەکێتی بۆ بە دەنگەوەچونی، لە تاقیکردنەوەی خۆیان دا ناڕاست دەرچو. هەرچەندە ئەوان ئەیانوت: «لەم گفتوگۆیەدا ئەگەر هەموومان، بە تایبەتی حسک و یەکێتی، پێکەوە بوینایە، بەعس ئەهاتە پێشەوە». بەلام ئەمە بەهانە بو بۆ پاساودانی سەرنەگرتنی گفتوگۆکە.

سەرنەگرتنی ئەم گفتوگۆیە هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوان ئەکرا. لەو کاتەدا عێراق بە هێز و جوڵانەوەی کورد لاواز بو. تەرازوی هێزی سیاسی و چەکدار ناهەرامبەرێکی گەورەی تێ دا بو. جوڵانەوەی کورد لە ناو خۆی دا ناکۆک و ناتەبا بو. پشتیوان و یارمەتدەری نەبو. حسک یش هێزێکی سیاسی چەکداری بچوک بو، نەیئەتوانی نوێنەرایەتی هەمو جوڵانەوەی کورد بکا. بەعسیش ئامادە نەبو، هیچ دەسکەوتێکی سیاسی ڕاستەقینە بە کورد بدا.

*

شەفیق و قورە بەرازە

ڕۆژی ۱۱ ی ئابی ۱۹۷۹ هێزێکی گەورەی حکومەت هێرشێکی گەورەی ئەرزی و ئاسمانیان کرد بۆ سەر تاقمی لە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە گوندی قورە بەرازە لە دەشتی کۆیە. لەم شەڕەدا ۱٤ پێشمەرگە کوژران و ٥ یان بە دیل گیران. لە ناو کوژراوەکان دا: شەفیق زاهیر، مەولود شێنە، عارف، محەممەد قادر، ئاودێر عومەر، ئازاد ڕەفیق ئاتەوا، حەویز ئیبراهیم، ئەنوەر ئازەنینی، فەرهاد فەتحوڵلا، جەعفەر سەعید عەباس، سەعید تەلتەقی، عومەر ڕەفیق و، دو پێشمەرگەی سلێمانی ناویان ئەحمەد و شاکیر بو.

ئەمە جەزرەبەیەکی کارێگەر بو لە یەکێتی لە ناوچەی کۆیە، بە تایبەتی لەو کاتەدا کە بە هۆی جیابونەوەی حسکەوە، هەرێمەکانی پێشمەرگە پشێوانی تێ کەوت بو. لە ناو ئەم پۆلە تێکۆشەرەدا تاقمی کادری پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەییان تێ دا بو. شەفیق فەرماندەی پێشمەرگەکانی کۆیە و، ئاودێر کادری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە و حەویز کادری ڕێکخراوەیی بزوتنەوە بو.

شەفیق چوارەمین کەسی خێزانەکەیان بو لەم ڕێ یەدا سەر دانێ. زاهیری باوکی و، تۆفیقی برای لە شەڕدا کوژرا بون و، ڕەفیقی برای بەعس لە سێدارەی دا بو.

شەڕەکە بە ڕێکەوت ڕۆژێ پێش دەرچونی «عەفوی عام» بو. کاربەدەستانی ئیستیخبارات ئاگادار بون «عەفو» بە ڕێگاوەیە. بۆ ئەوەی دیلەکان بەر عەفو نەکەون، لە ناو سەربازگەکەی کۆیەدا هەر پێنجیان گوللە باران کرد بون.

*

## کیتلەی سیجن

سەددام بە بۆنەی ئەوەوە کە تازە ببوو بە سەرکۆماری عیراق لە ئابی ١٩٧٩ دا چەند «عەفو» یەکی دەرکرد. یەکێکیان «عەفوی عام» بوو لە گیراوەکان. هاوڕێکانی ئێمە کە لە زیندانی ئەبو غورەیب بوون لە بەغداد و، هەندێ لەو کەسانەی لە «ڕەدەهەی ئیعدام» ی زیندانی مووسڵ دا بوون، بە تایبەتی دیلەکانی پێشمەرگە، ئازاد کران. بۆ ئێمە ئەمە هەواڵێکی زۆر خۆش بوو. کۆمەڵی کادری ژیر و تێگەیشتوی تێکۆشەر لە زیندان بەربوون، تین و تاوێکی تازەیان ئەدا بە ڕێکخراوەکە و جوڵانەوەکە.

ڕۆژێکیان لە بن دیواری بە وشکە کەڵەک هەڵچنراوی بارەگاکەمان دا لە بەر بەرۆژکە خۆم هەڵکسست بوو، لە پڕ یەکێ سەلامی کرد، هیچ شتێکی تایبەتی نەبوو سەرنجی من ڕابکێشێ، بە جۆرێکی ئاسایی وەڵامم دایەوە. ئەو چاوەڕوانی پێشوازییەکی گەرمتر بوو، وتی: «کوڕی باش ئەلی ی نامانناسیتەوە؟» سەرم هەڵبڕی و باش لێی ورد بومەوە، سەیرم کرد عومەری سەید عەلی بوو. هەستام باوەشم پیا کرد و ئەملاو ئەولای یەکتریمان ماچ کرد. سەید عومەر باسی کرد کە هاوڕێیانی تریش بە ڕێگاوەن و، بۆ ئەوەی هەموویان بە سەلامەتی بگەن هەر یەکێکیان بە ڕێگایەک دا هاتوە.

هاوڕێیانی زیندان، کە دوایی‌تر پێیان ئەوتن: «کیتلەی سیجن» یەک یەک و دوو دوو ئەگەیشتن. فەرەیدون عەبدولقادر و پاکیزەی هاوسەری و، دارۆی شێخ نوری و نەرمینی هاوسەری و ڕوناکی دەزگیرانی مەلا بەختیار و، ئاوات عەبدولغەفور و پرشنگی هاوسەری و، ئەرسەلان و پەخشانی دەزگیرانی، ئەوانەش کە سەلت بوون وەکو: عەلی پچکۆل، جەبار فەرمان، ئەنوەر حەسەن بە تەنیا ، گەیشتن. ئەوانە خێزانەکانیان، لە ترسی گرتن، لە گەڵ خۆیان هێنا بوو. ئەمەیش یەکەمجار بوو ئافرەت بێتە ناوچەی سەرکردایەتی. تا ئەو کاتە ناوزەنگ کۆمەڵێکی داخراو بوو بۆ پیاوان، ئیتر ئافرەتیشی تێکەوت.

بڵاوکراوەکانی کۆمەڵە تا ژمارەی چوارەمی و، لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی یش «هەواڵنامە» تا ژمارەی چوارەمی من سەرپەرشتیم کرد بوو. تا خۆم لەوێ بووم ئەمنەهێشت لە ڕووی ناوەڕۆکەوە وتاری بێ پێز و، لە ڕووی نوسینەوە وتاری خوارو خێچی تێ دا بڵاو بکرێتەوە. هەندێ لە هاوڕێیانی کۆمەڵە ئەمەیان زۆر پێ ناخۆش بوو، ئەیانویست کۆمەڵە و هەواڵنامە وەکو «نشرەی جیدار» ی قوتابخانەکان بکەین بە مەیدانی خۆ فێرکردنی ئەوان.

ئەو ماوەیەی من سەفەرم کرد بۆ دەرەوە فرسەتیان هێنا بوو، بە ئارەزوی خۆیان لە هەردوکیان دا ئەوەی بە بیر و بە قەڵەمەکانیان دا هات بوو نوسی بوویان.

مەلا بەختیار بە ناوی «باوکی ئاوارە» وە، وتارێکی درێژی لە ژێر سەرناوی: «چەند تێبینیەکی، بە سەر هەندێ، لایەنی خەباتی کۆمەڵەدا» لە ژمارەی شەشەمی «کۆمەڵە» دا نوسی بوو، باسی بیروبۆچونەکانی خۆی کیرا بوەوە سەبارەت بە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵە و، دەس پێ کردنەوەی خەباتی چەکدار. هێرشێکی ناوەختی کرد بوە سەر سەرکردایەتی پێشوی کۆمەڵە، کە دوانیان لە سێدارە درا بوون و، ئەوانی تریشیان تازە بە تازە لە زیندان ئازاد کرا بوون.

هاوڕێیانی تازە - ئازاد کە هاتنە شاخ و، وتارەکەی مەلا بەختیاریان خوێندەوە، زۆر دڵگیر بوون و، بە کۆمەڵ و تاک هاتنە لام بۆ گلەیی. ئەرسەلانیش لە گەڵ گەیشتنی دا، ساڵار چی بوو بە گژی دا. ئەمانە چاوەڕوانی پێشوازییەکی گەرمتر بوون، ڕاستییەکەی

هەندێ لەو برادەرانە وەکو حەزیان لە چارەی بەرپرسەکان نەبوو، حەزیشیان نەئەکرد لە ناو کۆمەڵە و پێشمەرگەدا بیانبینن. لایان وابوو جێگەیان پێ لێژ ئەکەن. بۆ چارەکردنی ئەمە، لەو ڕووەوە گلەییم لە ساڵار کرد و، لە ژمارەی حەوتەمی «کۆمەڵە» یش دا ڕوونکردنەوەیەکمان نووسی: کە ئەو وتارەی مەلا بەختیار بیروڕای تایبەتی خۆیەتی و هی سەرکردایەتی کۆمەڵە نییە.

لە کۆبوونەوە فراوانەکانی پێشوودا بڕیارمان دا بوو: ئەو ئەندامانەی سەرکردایەتی کە لە زیندان دان، لە بەر ئەوەی بە هۆی خەباتی سیاسییەوە گیراون، هەرکاتێ ئازاد کران بێنەوە ناو سەرکردایەتی. کۆبوونەوەی سەرکردایەتی کۆمەڵەمان کرد هەموو ئەم برادەرانەمان بانگ کرد، کە لە کاتی خۆی دا ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە بووبوون: فەرەیدوون، عومەر، عەلی، ئاوات و، هەر یەکەیان کارێکی پێ سپێردرا. تا ئەو کاتە من خۆم سەرپەرشتی ڕێکخراوە نهێنییەکانم ئەکرد، هەموویم پەڕدەو ڕووی سەید عومەر کردەوە. سەید عومەر ئەم کارە گرنگەی پێ کارێکی پچووک بوو، بە نابەدڵی قبووڵی کرد.

ئەوانەی کۆمیتەی هەرێمەکانیان پێک هێنا بوو، حەزیان لە چارەی هاوڕێیانی زیندان نەئەکرد، دوای گیرانیشیان بڵاوکراوەیەکی ناوخۆیان لە سەر دەر کرد بوون. ئێستاش کە هات بوونە ناو شۆڕشەوە بە لالوتەوە بە خێرهاتنیان کرد بوون.

ئەوانەی لە زیندانیش ئازاد کرا بوون، حەزیان لە چارەی ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان نەئەکرد، لایان وابوو، لە کاتێک دا ئەمان ملیان لە ژێر چەقۆی بەعس دا بووە، ئەوان کاریان بۆ شکاندنی ئەمان کردووە.

بە کردەوە ئەم دوو تاقمە بوون بە دوو دەستە:

ئەوانەی لە کۆمیتەی هەرێمەکان بوون، خۆیان بە «خەتی شەهید ئارام» دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد درێژە بە خەتی ئەو ئەدەن.

ئەوانیش لە سەرکردایەتی پێشووی کۆمەڵە بوون، خۆیان بە «خەتی شەهید شەهاب» دائەنا و، وایان ئیدیعا ئەکرد درێژە بە خەتی ئەو ئەدەن.

ڕاستییەکەیشی ئەوە بوو هیچکامیان خەتێکی وای دا نەڕشت بوو ئەمانە شەڕی لە سەر بکەن، ئەو دوو شەهیدە کە دوو کەسایەتی بەڕێز و خۆشەویستی ناو کۆمەڵە بوون، ئەمان ناوەکانیان بۆ مەبەستی خۆیان لە ململانێ ی ناوخۆدا بە کار ئەهێنان.

من کە نە لە کۆمیتەی هەرێمەکان و نە لە کێشەی سیجن بووم و، لە ناکۆکییەکانی ئەوان دا بەشدار نەبووم، هەوڵێکی زۆرم دا بۆ ئەوەی ئەم لە یەک نەگەیشتنەیان چاک بکەم، کەڵکی نەبوو، تا ئەهات ناکۆکییەکانیان، کە زۆرتر شەخسی بوو نەک ئایدیۆلۆجی یا سیاسی، قووڵتر ئەبوو. بە کردەوە بووبوون بە دوو دەستەی جیاواز.

*

بۆ کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەموو ئەوانەمان بانگ ئەکرد کە پێش گیرانیان ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون. دوای ماوەیەک هەموویان کاروباریان پێ سپێردرا. کەسیان بەو کارە ڕازی نەبوو کە پێ ی سپێردرا بوو، هەندێکیان بە تەمای ئەندامەتی م س و، هەندێکیان م ع و، هەندێکیان بە تەمای ئەندامەتی سەرکردایەتی یەکێتی بوون، بەشەکەی ئێمە لە سەرکردایەتی یەکێتی دا بە هەمووی ٧ جێگا بوو، جێگای ئەو هەمووەی تێ دا نەئەبووەوە.

### کۆنگرەی نۆهەمی پارتی *

دوای ئاشبەتاڵ سامی سنجاری بە موافەقەتی مەلا مستەفا، پارتی لە ژێر ناوی قیادە موەقەتە دا ڕێک خستەوە. بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئەوروپای کرد. پاشان گوێزایەوە تورکیا. ئەگەرچی هەموویان لە ژێر سێبەری مەلا مستەفادا کۆبوبونەوە بەڵام بە گوێرەی زروف و زەمانی ئەوسا باسی ڕێکخستنەوەی پارتییان ئەکرد لە سەر بنچینەی مارکسی و، سەرەتا ڕێکخراوەییەکانی: ناوەندیەتی دیموکراتی، سەرکردایەتی بە کۆمەڵ و، ڕەخنە و ڕەخنە لە خۆ گرتن.

تا ئەو کاتە بە هۆی هەلومەرجی سیاسی ئێران و، دووری خۆیانەوە لە کوردستان، بنەماڵەی بارزانی نەیان توانی بو ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری حیزبەکە و، داتان و لابردنی کادرەکانی بکەن. زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی لایەنگری مەسعود و، هەندی لە کادرە ناوچەییەکان لایەنگری ئیدریس بون. دوای ڕوخانی شا کە ئیتر بە ئاشکرا و بە کۆمەڵ هاتنەوە ناو مەیدانی کاری سیاسیەوە، پێویستیان بەوە هەبو، هەندی گۆڕین بە سەر حیزبەکەیان دا بهێنن، لە گەڵ قۆناغی تازەدا بگونجێ، سەر لە نوێ دەسەڵاتی بنەماڵەی بارزانی لە ناو حیزبەکەدا قایم بکاتەوە. بۆ ئەمەش پێویستیان بەوە بو کۆنگرە ببەستن.

لە ڕۆژانی ٤ -١١ تشرینی دوەمی ٧٩ لە ئوردوگای زیوەی سەر بە ئوستانی ئازەربایجانی غەربی لە ئێران، بە ئامادە بونی ٣٢٥ کەس، کۆنگرەی نوهەمی گرت. لە دوای ئازاری ١٩٧٠ وە ئەوە یەکەمین کۆنگرەی بو.

لەم کۆنگرەیەدا مەسعود «ڕاپۆرتی سیاسی و عەسکەری و تەنزیمی» خوێندەوە. باسی ڕوداوەکانی دوای ئازاری کرد، بە تایبەتی ئاشبەتاڵ، بەڵام باوکی و بنەماڵەکەی خۆیانی لە هەمو ئوباڵێک پەراندەوە و، ئوباڵی ئاشبەتاڵ و ئەو کارەساتەی بە سەر کورد هات بو، خستە ئەستۆی دەوروپەوەندەکانی مەلا مستەفا و، شا و ئەمەریکا. لە ڕاپۆرتەکەدا ئەڵێ:

«پاش ١٩٧٠ یەعنی پاش ڕێککەوتنەکەی ١١ ی ئازار.. هەمومان توشی غرور بوین و ڕوژ بە ڕۆژ ڕوحی شۆڕشگێڕایەتیمان لە دەست دا. لە جیاتی ئەوەی سود لەو سەرکەوتنە وەربگرین و ڕێکخستنی پارتی بچەسپێنین لە ناو جەماوەر، دەرگای بەرەڵلایی و فەوزا کرایەوە، وە شتی ئەساسی کە بۆ هەر شۆڕشێک پێویستە لە بیر چو بو. لە سەر نیطاقی پەیوەندی دەرەوە دیسان زۆر ئیشتیباهات کرا چ لە ژێر ضغطی ڕوداو وە چ لە نەزانین، بە تایبەتی لە سالی ١٩٧٣ - ١٩٧٤..

«پاش نەکسەی ١٩٧٥ زۆر کەس رایان کرد لە مەیدان. پێش ئەو کاتە بە هەمو شت ڕازی بون. بەشدار بون لە هەمو بڕیارەکان باش یا خراپ وە دەوری بالایان هەبو.. بەڵام پاش نەکسە.. بە هەمو جۆرێک هەولیان دا مەسئولیەت بخەنە سەر شانی ئەو و بەس.. ئەبی بۆ تاریخ بلێین کە بارزانی پاش سالی ١٩٧٠ مەسئول نەبوە لە زۆر ئەخطائی کە کراو زۆر شتیش ئێمەومانان کە لە دەوری ئەو بوین لی ی مەسئولین.. بەڵکو هەمو قیادە مەسئول بوە و ئەمە واقیع و حەقیقەتە..»

«ئەسبابی نەکسە نە تەنها پیلانی جەزائیر بو. هەرچەندە ئەم پیلانە هۆیەکی سەرەکی بو، بەڵام ئەسبابی ناوخۆ دیسان دەورێکی زۆری هەبو کە پیلانی جزائیر

سەربگریت. بێگومان مەبەستی ئیمپریالیستی ئەمریکا و نۆکەرانی لە ناوچە، وە بە تایبەتی رژێمی دیکتاتۆری شاهی ڕوخاو و ڕژێمی فاشیستی بەغدا ئەوە بو کە ناوی کورد بە رابەرایەتی بارزانی و پارتی سەر هەڵنەداتەوە.

«هەر یەکێک لە ئێوە مەسئولە لە پاراستنی تراثی بارزانی.. ئێمەش وەک یەکێک لە ئێوە مەسئولین لە تراثی ئەو، وە ڕویشتن لە سەر ڕێگەی بۆی داناوین. ئەو ڕێگەیەی کە لە هیچ زەمانێک دا مساومەی نەکرد لە سەر مافی کورد..»

چەند مانگی بو واتەواتی لابردنی سامی هەبو. بنەماڵەی بارزانی لێی ناڕازی بون. لە کاتی هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی دا، بنەماڵەی بارزانی لیستەیەکیان ڕێک خست بو، بە ناوی ئەوانەی خۆیان ئەیانویست. زۆری ئەوانەی قیادە موەقەتەی تێ دا نەبو. سامی نەیویست، بۆ ئەوەی جێگەی لە ناو کومیتەی ناوەندی دا بە تەواوی لێژ نەبی، ئەو دوانزە کەسەی لە سەردەمی قیادەی موەقەتەدا لە گەڵی بون، لە کومیتەی ناوەندی تازەدا هەڵبژێردرێنەوە. بنەماڵەی بارزانی ئەم مەرجەیان لێ قەبول نەکرد و، ئەوەیان کرد بە بیانو بو لادانی ئەو و هەمو ئەوانەی گومانیان لە دلسوزیان ئەکرد. کومیتەیەکی ناوەندی هەڵبژێردرایەوە جێگەی ڕەزامەندی خۆیان بو. هوشیار زیباری؛ کە خاڵ و جێگای متمانەی مسعود بو، یەکێکیان بو.

لەم کۆنگرەیەدا:

- کومیتەیەکی ناوەندی هەڵبژێردرا دلسوزی بێ چەن و چونی بنەماڵەی بارزانی و، گوێڕایەڵی تەواوی فەرمانەکانی بو.

- هەڵبژاردنی مسعود و ئیدریس و، ئەو لیستەیەی ئەمان دیاریان کرد بو بۆ سەرکردایەتی حیزب و، هەڵبژاردنی مسعود بە سەرۆکی حیزب لە جێگای باوکی، ئەو نەریتەی بە تەواوی چەسپاند کە ئەم حیزبە هی بنەماڵەی بارزانیە.

- سەرکردایەتی حیزب «تراثی بارزانی» کرد بە چرای ڕێبازەکەی. بە پێی ئەو «تراثە» ش هەمو کاری حەلال بو بۆ خۆبەهێز کردن و دەسگرتن بە سەر مەیدانی کوردایەتی دا. بۆ ئەوەش لە پاتی ئەوەی چارەی سیاسی بۆ ئەو دوکێشەیە بدۆزێتەوە کە توشی بوبو: کێشەی حدکا و، کێشەی یەکێتی. لە کوردستانی ئێران شەڕی حدکای کرد تا پشتیوانی ئێران بە دەس بهێنی، لە دوژمنایەتی یەکێتی دا پارمەتی بدا. شەڕی یەکێتی کرد بۆ ئەوەی ئەو ملۆزمە لە کوردستانی عیراق نەهێلی.

پارتی بە پارمەتی ئێران، سەرلەنوی هەمو لق و ناوچە و ڕێکخراو و، هێز و بەتالیونەکانی، لە ناو شارەکانی ئێران و لە ناوچە سنورییەکان دا دروست کردەوە. بارەگای مەکتەبی سیاسی و، دەزگا سەرکردەییەکانی و، ئیستگای ڕادیوکەی، لە گوندی ڕاژان لە نزیک ورمێ دانا. بە ئاشکرا هارکاری لە گەڵ ئێران ئەکرد دژی کوردەکان.

ئەندامانی پێشوی قیادە موەقەتە هەمو چون بۆ ئەورووپا و، سامی پش ماوەیەک لە ئێران گیرا. دوای بەربونی ئەویش چو بۆ بەریتانیا. خۆی لە ناو کۆزرە تایبەتیەکانی دا، ڕای پیشان ئەدا لە بەر ئەوەی لە سیاسەتی بنەماڵەی بارزانی، بە تایبەتی بەرامبەر بە کوردەکانی ئێران، ڕازی نەبوە بۆیە وازی لێ هێناون. ڕاستیەکەی ئەوە بو: ئەوسا بنەماڵەی بارزانی، چارەی سامی نەئەویست.

*

### دەیڤید هیرست لە ناوزەنگ

ڕۆژنامەوانی بەریتانی دەیڤید هیرست پەیامنێری ڕۆژنامەی «گاردیان»ی لەندەنی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، کە لە بەیروت دانیشتبوو، سەردانێکی کوردستانی کرد و، بە سەر هەمو لایەنە کوردیەکان دا گەڕا بو. دەیڤید پێشتریش هات بو بۆ کوردستان و، زەمانی عەرەبی تەزانی. چو بو بۆ ورمێ بۆ بینینی سەرانی پارتی سامی دی بو، لەو کاتەدا خەریکی کۆنگرەی نوێیەم بون. دوای ئەوی چو بو بۆ دوله تو بۆ بینینی سەرانی حسک د. مەحمودی دی بو.

دەیڤید هات بۆ ناوزەنگ بۆ بینینی سەرانی یەکیتی. بە ڕێکەوت مامجەلال لەوی نەبو، چو بو بۆ بینینی قاسملو، لە بەر ئەوە من بینیم. عەبدولرەزاق فەیلی یش لەوی بو. سەردانی بارەگای حشع یشی کرد. لەو ناوە توشی دو پێشمەرگەی یەکیتی بوبو. هەندی پرسیاری لی کرد بون دەربارەی چالاکی پێشمەرگە لە ناو شارەکان دا، هەردوکیان باسی ئەوەیان بۆ کرد بو، کە تازە خۆیان لە چالاکیەکی ناوشاری سلێمانی گەڕاونەتەوە. ڕاستی ئەم هەواڵەی لە د. مەحمود پرسی بو، یەکسەر بە درۆی خستبونەوە. شەو لە لای ئێمە مایەوە. زۆری پرسیار کرد و، منیش پرسیاری زۆرم لی کرد. ئەوی سەرنجی دەیڤیدی ڕاکیشا بو، ئەوە بو: هەمو ئەم حیزبانە دژی یەکتری دوا بون. سامی دژی یەکیتی و حسک، د. مەحمود دژی یەکیتی و پارتی، منیش دژی پارتی و حسک. پرسیاری سەرەکیی دەربارەی هۆکانی ناکۆکیی ناو حیزبە کوردیەکان بو. چەندی هەولم دا بۆی ڕون بکەمەوە عەقلی نەبڕی.

دەیڤید زنجیرەیەک وتاری لە گاردیان دا لە سەر جولانەوەی کورد و، لە سەر گەڕانەکەی، بلاو کردەوە.

*

### کاری بەرەیی

هەولی یەکخستنی موعارەضەی عیراقی کۆنە. سەرەتای حەفتاکان تودع (التجمع الوطنی العراقی) دامەزرا بو. بەلام ئەمیش وەکو هێزێکی دەرەوەی ولات لە سەر ئەرز دەورێکی نەبو. کە یەکیتی بو بە ئەندامی تودع، تودع ئەبن و تاوێکی تی گەڕایەوە و، بە تەما بون شۆڕشەکەی کوردستان، لە ڕوی سەرکردایەتی و پێکهاتنی هێز و مەیدانی کارەوە، بیکەن بە شۆڕشێکی عیراقی. ڕادیۆکەی یەکیتی ناوی نرا بو: «دەنگی شۆڕشی عیراق» و، چالاکیەکانی پێشمەرگەکانی یەکیتی وەکو چالاکی تودع بلاو ئەکرایەوە. سەرکردایەتی تودع، سەرکردایەتیەکی مەیدانی بۆ جولانەوەکە دانا، ئەگەرچی ئەبو شەوقی (جواد الدوش) و، ئەبو عومەر (عونی قلمچی) لە «الحرکه العربیه الاشتراکیه» و، حازم (عبدالجبار الکبیسی)، صەفاء (فەوزی راوی) و، ئەبو صەلاح (مەهدی علیوی) و، هەندێکی تر لە سەرانی بەعس ماوەیەک لە ناوزەنگ بارەگایان دانا، بەلام ڕاستیەکەی ئەمە شتی ڕوکەش و ڕوالەت بو، هیچ کات شۆڕشەکە بە کردەوە لە هیچ ڕویەکەوە نەبو بە شۆڕشی گەلی عیراق.

دوای لێدانی حشع، زۆر لە سەرکردەکانی ڕویان کردە ئەوروپای ڕۆژهەلات و، سوریا و لوبنان. پاش ئەوەی نائومێد بون لە پێکهاتنەوە لە گەل بەعس و گەڕانەوە بۆ

بەغداد، لە کۆبوونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی دا دروشمی ڕوخاندنی ڕژێمیان هەڵگرت و، کەوتنە داوای پێکهێنانی «بەرەی فراوانی هێزە عێراقییەکان». حشع خۆی بە تەنیا لاواز بوو، لە بەر ئەوە پروپاگاندەیەکی زۆری بۆ ئەم بیرە ئەکرد و، لە هەمو کۆبوونەوە و دانیشتنێک دا ئەیان وتەوە. کاربەدەستانی سوریا و یەمەن و سەرانی فەلەستینییەکانیشیان تێ گەیاند بوو. هەندێ لە هێزە نەتەوەپەرستەکانی عێراق، بە تایبەتی بەعسییەکانی عێراقی سەر بە سوریا لەوانە حازم (عبدالجبار الکبیسی)، حەزیان لە چارەی شیوعیەکان نەئەکرد. ئەمانە لە بنچینەدا بە بیروباوەڕی «ئەنتی کومونیستی» پەروەردە کرا بوون. هاوکاری ئەوان و کاربەدەستانی عێراقیشی هات بوە یان.

*

کومیتەی ٤ قولی

هەوڵەکانی حشع لە سوریا سەری نەگرت بوو. سەرانی حشع لە کوردستانیش بەردەوام بوون لە سەر هەمان هەوڵ و تەقەلا. لە هەمو کۆبوونەوە دوقۆڵییەکانیان دا لە گەڵ یەکێتی ئەم باسەیان دوبارە ئەکردەوە. سەرەنجام لە ناوەڕاستی مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٩ یەکەمین کۆبوونەوەی چوار قۆڵی: یەکێتی، حشع، الحرکە الاشتراکیە العربیە (حاع)، حزب البعث العربی الاشتراکی - قیادە قطر العراق (سەر بە سوریا) کرا و، ڕاگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد. بڕیاریان دا لە دیمەشق کۆبوونەوەیەکی تر بکرێ. بە نوێنەرایەتی یەکێتی من دانرام کە بچم بۆ بەشداری لە کۆبوونەوەکەی شام دا.

بە کۆمەڵ بە ڕێ کەوتین بۆ تاران بۆ ئەوەی لەوێوە بچین بۆ سوریا. لە حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی. لە بەعس: ئەبو سەلاح. لە حاع: ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر. لە یەکێتی: من.

لە شام بیروڕای حازم جیا بوو لە گەڵ بیروڕای هاوڕێکانی لە کوردستان. کۆبوونەوەکە نەکرا و، کومیتەکە کۆ نەبوەوە و، کارەکە سەری نەگرت. لە شام چەند جارێ کەریم ئەحمەدم بینی. هەروەها حازم.

سەری لوبنانم دا. بیروت لەو کاتەدا بە کردەوە لە ژێر دەسەڵاتی فەلەستینییەکان دا بوو. نایف حەواتمە، سەرکردەی «الجبهە الشعبیە» و، جورج حەبەش سەرکردەی «الجبهە الدیمقراطیە» م بینی. بیروڕاکانی یەکێتی م بۆ باسکردن دەربارەی هەلومەرجی ناو عێراق و، هەڵوێستی یەکێتی لە ڕوداوەکانی تەوران. مامجەلال نامەی بۆ هەردوکیان نوسی بوو، من نامەکانم بۆ برد بوون. کەچی هەردوکیان زۆر بە ئاشکرا ڕایان دەرخست کە باوەڕیان بە مامجەلال نیە. قسە کۆنەکەم بیر کەوتەوە کە ئەڵێ: «بۆ بۆرەپیاو خۆت بە کوشت بدەی، ئەڵێ: بە دەردی خوا مردا». پێم سەیر بوو مامجەلال ئەو هەمو چاکەیەی لە گەڵ کرد بوون کەچی ئەوان بەو جۆرە سەیریان ئەکرد و چاکەیان ئەدایەوە. جیاوازیەکی ئەوتۆیان لە نێوان یەکێتی و پارتی دا نەئەدی.

*

هەر لەم سەفەرەدا جارێکی تر سەردانی نەمسام کردەوە. لە کۆنگرەیەک دا بەشدار بوم کە خوێندکارانی کورد لە نەمسا ئەیانگرت.

*

بەغداد، لە کۆبونەوەیەکی کۆمیتەی ناوەندی دا دروشمی روخاندنی رژێمیان هەڵگرت و، کەوتنە داوای پێکهێنانی «بەرەی فراوانی هێزە عیراقیەکان». حشع خۆی بە تەنها لاواز بو، لە بەر ئەوە پروپاگاندەیەکی زۆری بو ئەم بیرە ئەکرد و، لە هەمو کۆبونەوە و دانیشتنێک دا ئەیان وتەوە. کاربەدەستانی سوریا و یەمەن و سەرانی فەلەستینیەکانیشیان تێ گەیاند بو. هەندی لە هێزە نەتەوەپەرستەکانی عیراق، بە تایبەتی بەعسیەکانی عیراقی سەر بە سوریا لەوانە حازم (عبدالجبار الکبیسی)، هەزیان لە چارەی شیوعیەکان نەئەکرد. ئەمانە لە بنچینەدا بە بیروباوەری «نەتەی کۆمونیستی» پەروەردە کرا بون. هاوکاری ئەوان و کاربەدەستانی عیراقیشی هات بوە بان.

*

### کۆمیتەی ٤ قولی

هەوڵەکانی حشع لە سوریا سەری نەگرت بو. سەرانی حشع لە کوردستانیش بەردەوام بون لە سەر هەمان هەوڵ و تەقەلا. لە هەمو کۆبونەوە دوقولیەکانیان دا لە گەل یەکیتی ئەم باسەیان دوبارە ئەکردەوە. سەرەنجام لە ناوەراستی مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٩ یەکەمین کۆبونەوەی چوار قولی: یەکیتی، حشع، الحرکە الاشتراکیە العربیە (حاع)، حزب البعث العربی الاشتراکی - قیادە قطر العراق (سەر بە سوریا) کرا و، راگەیاندنێکی هاوبەشیان دەرکرد. بریاریان دا لە دیمەشق کۆبونەوەیەکی تر بکری. بە نوینەرایەتی یەکیتی من دانرام کە بچم بو بەشداری لە کۆبونەوەکەی شام دا.

بە کومەڵ بە ری کەوتین بۆ تاران بۆ ئەوەی لەوێوە بچین بۆ سوریا. لە حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی. لە بەعس: ئەبو سەلاح. لە حاع: ئەبو شەوقی و ئەبو عومەر. لە یەکیتی: من.

لە شام بیروڕای حازم جیا بو لە گەل بیروڕای هاوریکانی لە کوردستان. کۆبونەوەکە نەکرا و، کومیتەکە کو نەبووەوە و، کارەکە سەری نەگرت. لە شام چەند جاری کەریم ئەحمەدم بینی. هەروەها حازم.

سەری لوبنانم دا. بیروت لەو کاتەدا بە کردەوە لە ژێر دەسەلاتی فەلەستینیەکان دا بو. نایف حەواتە، سەرکردەی «الجبهە الشعبیە» و، جورج حەبەش سەرکردەی «الجبهە الدیمقراطیە» م بینی. بیروراکانی یەکیتی م بۆ باسکردن دەربارەی هەلومەرجی ناو عیراق و، هەڵویستی یەکیتی لە روداوەکانی ئیران. مامجەلال نامەی بۆ هەردوکیان نوسی بو، من نامەکانم بۆ برد بون، کەچی هەردوکیان زۆر بە ئاشکرا وایان دەرخست کە باوەریان بە مامجەلال نیە. قسە کۆنەکەم بیر کەوتەوە کە ئەلی: «بۆ بۆرەپیاو خۆت بە کوشت بەدەی، ئەلی: بە دەردی خوا مردا». بیم سەیر بو مامجەلال ئەو هەمو چاکەیەی لە گەل کرد بون کەچی ئەوان بەو جورە سەیریان ئەکرد و چاکەیان نەدایەوە، جیاوازیەکی ئەوتویان لە نیوان یەکیتی و پارتی دا نەئەدی.

*

هەر لەم سەفەرەدا جاریکی تر سەردانی نەمسام کردەوە. لە کۆنگرەیەک دا بەشدار بوم کە خوێندکارانی کورد لە نەمسا ئەیانگرت.

*

# سالی ۱۹۸۰

**لە تێرمینالی فڕۆکەوە بۆ چاپەری ستوور**

ڕۆژی ۱۳ ی شوباتی ۱۹۸۰ لە گەڵ عومەری حاجی عەبدوللا، شازاد گەیشتینە فڕۆکەخانەی مێهرئاباد لە تاران. عومەر شێخمووس و هاوسەرەکەیشی هاوزەمان گەیشتن. ئەمان کێشەیان نەبوو تێ پەڕین و، ئێمەش کەلوپەلەکانی خۆمان بەوان دا نارد. ئێمە چونکە ڤیزای ئێرانمان نەبوو ڕێگەیان نەداین بڕۆین. گلیان داینەوە خەریک بوو سواری فڕۆکەیەکی ترمان بکەن و ڕەوانەی سووریامان بکەنەوە. د. فوئاد مەعسوم ئەو کاتە نوێنەری یەکێتی بوو لای حکومەتی ئێران. بەڵێنیان دابوویە ڤیزاکەمان لای کاربەدەستانی فڕۆکەخانە بۆ دابنێن، بەڵێنەکەیان بە جێ نەهێنا بوو. گێچەڵی زۆریان پێ کردین. بۆ ئەوەی خۆمان گیر بکەین تا کارەکەمان بۆ جێبەجێ ئەبوو ناچار بووین سەرو بلیتی تازە بکڕین. پاش چەند سەعاتی چاوەڕوانی ڕێگەیان داین بچینە ناو تارانەوە.

*

لە ڕێگای مەهاباددوە چووینە گوندی بێوران. ئەو کاتە لە نێوان بێوران و سنووری عێراق دا هێنان و بردنی کەلوپەل لە برەودا بوو. لە بێوران و ناوزەنگ دوو تێرمینالی گەورەی ولاخی لێ بوو، هەر یەکەیان بە سەدان ئێستری تێ دا ڕاگیرا بوو.

ئەوی لێرەدا من بە «تێرمینالی ولاخ» ناوم بردوە، لە کوردی کۆن دا پێیان وتوە: «چاپەری ستوور». نالی لە شێعرنامە بە ناوبانگەکەی دا ئەپرسێ:

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو خانەقا بکە!
ئایا ڕەبیعی ئاهوە، یا «چاپەری ستوور»؟

ئەم دوو وشەیە ئێستا لە ناو ولاخدار و کاروانچییەکان دا بە کار ناهێنرێن. چاپەر: تەوێلە، بەهاربەند، کە ولاخی تێ دا ڕاگیراوە. ستوور: چوارپێ، ئێستا هەر لە وشەی «سەگ و ستوور» دا بە کار ئەهێنرێ کە بۆ سووکایەتی پێ کردن ئەوترێ.

*

ولاخی بارەبەر: ئەسپ، ئێستر، کەر، گا.. لە کوردەواری دا لە زۆر کۆنەوە گرنگییەکی ژیانیی هەبوە. بۆ ئێمەیش کە هەموو کات لە ناوچە شاخاوییە سەختەکان دا ئەژیاین و هاتووچۆمان ئەکرد، بوو بوو بە بەشێکی زەروری لە پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانە و ڕاپەڕاندنی کارەکانمان. لە بەر ئەوە منیش لە گەڵ ولاخ بوو بووم بە ئاشنا و، شارەزای هەڵسوکەوت و، ڕاگرتن و، پێویستییەکانی بووبووم.

«ولاخ» لە «ئولاغ» ی مەغۆلی وەرگیراوە. بەم بۆنەیەوە هەندێ وشەی مەغۆلی هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، لەوانە: یاسا، قۆناغ، چۆک و بە چۆک دا هاتن، تامغە، تەغار، ئەمن، تۆکمە، قەیتوڵ، ئۆردو، ئێل، .. ئەمە هیچ عەیبێکی تیا نییە. هەموو زمانە زیندووەکانی دنیا وشەی بێگانەیان وەرگرتوە و، لە زمانەکەیان دا تواندوویانەتەوە. وەرگرتنی وشە: یان یەکێکی ناسراو لە نووسینەکانی دا وەری ئەگرێ، یان خەڵک لە ئەنجامی زۆر بە

کار هێنان دا لایان ئەبی بە باو. لە هەردو حالەت دا ئەچیتە فەرهەنگی زمانەوە و، ئەبی بە مولکی ئەو زمانە.

*

ئەسپ

ئەسپ نێر و مایێن می، هەمیشە نرخێکی تایبەتی و رێزێکی تایبەتی هەبوە و، هەبونی نیشانەی پایەی کومەلایەتی خاوەنەکەی بوە. بە زوری بو سوار بون بە کار هێنراوە. کە کراوە بە هی بارپەردن ئیتر پێیان وتوە: «بارگیر»، یان «بارگین» و، کە خەسانلویانە پێیان وتوە: «یەختە» یا «یەرمغە».

ئەسپی رەسەن، کە دایک و باوکی ناسراو بی. لە ئەسپی تر کە دایک و باوکی نەناسراو بی پەسندترە. رەگەزی عەرەبی لە هەمویان پەسندترە. بە گوێرەی رەنگەکانی بە شێ، کوێت، کەحیلە، مورەنەک ناو ئەبرێن.

مایێن «جوانو» ی ئەبی و، کە بو بە دو سال پێ ی ئەلێن «نوما». تا ۳ سال هەر بە خێو ئەکری، لە بەر ئەوەی ئێسقانی برپرەی پشتی بەرگەی هەلگرتنی قورسایی ناگری، نە باری لی ئەنێن و نە سواری ئەبن. لە سالی چوارەم دا ئەلێن: «پشتی گرتوە»، ئیتر خەریکی راهێنانی ئەبن بو سواری، راهێنانی زانین و شارەزایی و حەوسەلەی درێژی ئەوی.

ئەسپ «رەوت» و «نەرمە غار» و «غار» و «لوقە» ئەکا.

ئەسپ ولاخێکی «یەک سم» ە، ئەبی سمی «نال» بکری، ئەگینا ژێر سمی برینداری ئەبی.

ئەسپ «زین» ی لی ئەکری. زین لە چەرم و تەختە و لباد دروست ئەکری. کاتی خوی بە خشلی زێر و زیو رازاندویانەتەوە. بو زوت کردنی لە سوار بون دا «ولغاو» ئەکریتە دەمی.

ئەسپ لە «تەویلە» دا ئەبەسترێتەوە و، لە «ئاخور» دا «ئالیک» ئەدری. پێشینان وتویانە: «لە ئەسپی ئەبو، ئاخور هەلئەبەستی!» لە بەهاران دا کە بە کوزەل لە لەوەرگادا بەرەللا ئەکرێن، پێ ی ئەلێن: «رەوە» و، ئەوی خزمەتیان ئەکا «مەیتەر».

لە ئەفسانەی کوردی دا، ئەسپەکەی روستەم ناوی «رەخش» و، هی خەسرەوی پەرویز «شەودیز» و، هی ئیمامی عەلی «دولدول» بوە، لە چاو ئەسپی ئاسایی دا هەریەکەیان هونەرێکی هەبوە.

پێشینان وتویانە: «سواری ئەسپی خەلک بی هەر پیادەی».
سالم لە باسی خوی و ئەسپەکەی دا ئەلی:
خانە خرێم میوان نەوازە، وەرنە سەیری پیاوەتی
دوشەکی خوم خاک و خول و، سەر راخەری ئەسپم سما
شێشی سور بێن وەرن خالیکمان داخ کەن بە جوت
چونکە ژاغان کرە: من و ئەسپم، لە بەر سەردی هەوا
ئەمن و بارگیری کوێت هەردو بنوین پشکم بە خەو
من ببینم روی خوراک و، ئەو ببینی روی کا

*

### کەر

نێرەکەر و ماکەر، یان وەکو پێ پشی ئەڵێن: گوێدرێژ، ئەمیش بۆ بارکردن و سواری بەکار هێنراوە، بەڵام ئەسپ لە ئێستر و، ئێستر لە کەر بەرزتر بوە. پێشینان وتویانە: «لە ئێستر دابەزی سواری کەر بو». عەرەب پێیان وتوە: «مرکب الصالحين» چونکە بۆ سوار بون و دابەزین ئاسانە و هیچ هونەرێکی ناوێ.

کەر وڵاخێکی «یەک سم»ە، سمی «نال» ئەکرێ. پەندێکی پێشینان ئەڵێ: «سم سمی کەرە و، چنگ چنگی مەیماسێ، یاران لەم کارە سەرم ئەماسێ!»

بە بەچکەی کەر و ئێستر ئەڵێن: «جاش». راستییەکەی زوڵمێکی گەورەیان لێ کردوە چونکە ئەم ناوەیان لە خائینانی جولانەوەی کورد ناوە، لە کاتێک دا جاشی کەر و جاشی ئێستر بە درێژایی مێژو خزمەتی کوردیان کردوە و، کەچی ئەوان زەرەریان لێ داوە.

کەری لای ئێمە چەند رەسەنێکی هەبوە بە ناویانگترینیان: حەساوی، بەغدایی، قوبرسی، لە گەورەیی ئەڵاڵەتیان دا جیاوازن.

کەر بە ئالیکی کەم دائەکەوێ و، بەرگەی ماندوێتی و برسیتی ئەگرێ.

کەر «جل» و، ئەگەر خۆشەویست بێ «کورتان» ی لێ ئەکرێ. پێشینان وتویانە: «کەرەکە مەمرە بەهارە، کورتانت بۆ دێ لە شارە!» جل لە کۆنە لباد و پەرە و، کورتان لە پەرە و پوش، دروست ئەکرێ.

کەر لە گەڵ مانگا و ئێستر ئەکرێتە «گەوڕ» ەوە.

لە گەڵ ئەوەی کەر، لە لای کورد، بە نمونەی دەبەنگی دائەنرێ، کەچی لە پەندی پێشینان دا جێگەیەکی تایبەتی هەیە. بۆ گەوجێتی ئەڵێن: «کەرێکە بە چوار پێ ئەروا»، و، بۆ هەڵپەرستی و بێ باری ئەڵێن: «کەری ناو جۆگایە، قەپاڵ لە هەردو بەر ئەدا». بۆ بەڵگەی پشت گوێ خران ئەڵێن: «کەس لێ ی ناپرسێ: کەرت بە چەند!»

پێشینان وتویانە: «کەرێکم دا بە کەرێ، سندان لە پنا گوێ ی دەرێ»، هەروەها: «کەر لە کوێ کەوتوە و، کونەدە لە کوێ دراوە!»، هەروەها: «کەر بارەکەی تفەنگ بێ گورگ هەر ئەیخوا!»، هەروەها: «کەر بە کاروان قەڵەو نابێ»، هەروەها: «کەرێ بە پارەی بەفر بکردرێ، لە ئاوا ئەخنکێ»، هەروەها: «بە کەر ناوێرێ بە کورتان ئەبێرە» هەروەها: «کەر نۆ بەرێ دەش ئەبا»، هەروەها: «بە بۆنی کەبابەوە چو، کەریان داخ ئەکرد»، هەروەها: «کەری خۆمە و گوێ ی ناڵ ئەکەم».

نالی لە باسی کەرەکەی دا ئەڵێ:

هەی کەرێکم بو، چ پەیکەر؟ تەیکەری هەوراز و لێژ
سینە پان و، موچە کورت و، شانە بەرز و، گوێ درێژ

لە دوا بەیتی دا ئەڵێ:

چەندە پێم خۆش بو زوبانی حاڵی دەیوت «نالیا»
هەردو حەیوانین، ئەتۆ گوێ کورت و ئەمنیش گوێ درێژ

*

### ئێستر

ئێستر، یاوەکو پێ پشی ئەڵێن: «قاتر»، ئەزۆکە زاوزێ ناکا. لە ئەنجامی «چاکردن» ی ماین دا لە نێرەکەر، پەیدا ئەبێ، بۆیە پێشینان وتویانە: «لە ئێستریان

پرسی: باوکت کێ بەا وتی: خاڵم ئەسپە». مەراسیمی ئەم چاککردنە بەزمێکی خۆشە شتێکی لە شایی کەمترە.

جاشی ئێستر ئەبی ٣ ساڵ لە سەری بوەستێ تا «پشت ئەگری»، ئەوسا لە گەلی خەریک ئەبن بۆ ئەوەی فێری بار هەڵگرتن بێ. ئێستر لە ئەسپ و لە کەر بەهێزترە و، بۆ ناوچەی شاخاوی ئازا و بە کارە و، زیاتر بەرگەی بار و هەوراز و ماندوێتی ئەگرێ.

ئێستر وڵاخێکی «یەک سم» ە، ئەبێ سێ «ناڵ» بکرێ.

هەندێ ئێستر دوای ڕاهێنانیش لە کاتی بارکردن و سوار بوون دا بە ئاسانی مل نادا و هەڵەتەبزێنی، «لەقە» و «جوتە» و «لوشکە» ئەهاوێژێ، بەمانە ئەوترێ: «چەموش» و، لە هەندێ ناوچە «شەموس». ئێستری پەسند ئەوەیە: هێمن بێ، گوێنە لوتەکانی فش و سنگی پان و، قاچەکانی لە یەک دور بێ بۆ ئەوەی لە ڕۆیشتن دا لە یەک نەدەن. ئەو ئێسترانەی قاچیان لە یەک ئەدەن پێیان ئەڵێن: «پەیزەن» و پەسند نین.

بۆ زانینی جوانی و پیری ئێستر سەیری دەمودانی ئەکەن، ئەگەر دانی کەوت بێ، یان سەر «خری»ی کانی لوس بوبێ، نیشانەی پیر بونە، ئەڵێن: «شیلە» ی پێ نەماوە، ئەگەر دانەکانی تیژ و زبر بێ و گرێچییەکانی سەر دانی مابێ، نیشانەی جوانییە ئەڵێن: «شیلە» ی پێ ماوە. هەر لە بەر ئەمەیە پێشینان وتویانە: «ئەسپی خەڵاتی تەماشای دەم و دانی ناکرێ».

بەرگی ئێستر «کورتان» ە. کورتان بەرەیەکە لە پوش ئەشاخنرێ، بۆ سواری و بۆ بار لێ ی ئەنێن. کورتان بە «بەرۆک» لە پێشەوەی لە سنگ و، بە «پاڵو» لە پشتەوەی لە بن کلکی و، بە «سەر پاڵو» لە خوارەوەی مورەغەی پشتی و، بە «تەنگە» لە بن ورگی قایم ئەکرێ. «قەیاسە» یش کورتانەکەی پێ توند ئەکرێ. بەرۆک، پاڵو، سەرپاڵو، تەنگە و قەیاسە، لە چەرمی نەرمی پانی وەکو پشتێن یان «کەژۆ» دروست ئەکرێ.

بۆ زەوتکردن و بەستنەوە و ڕاکێشانی «ڕەشمە» یا «هەوسار» ئەکەنە ملی.

ئەگێڕنەوە: یەکێ لە شێخەکانی بەرزنجە ماینێکی جەردەی هەبوە دەروێشەکانی خۆی پێ ڕوت کردۆتەوە. دەروێشەکان، نەیانوێراوە بە ئاشکرا بە شێخ بڵێن، لە حەلقەی زیکردا، بەم بۆنەیەوە، وتویانە: «ماینەکەت بردم، ڕەشمەکەم بەرزا دەروێشی خۆتم ڕوتم مەکەرزا»

تورەکەیەک ئەکەن بە کورتانەکەی دا کا و جۆی تێ ئەکەن، لە کاتی برسیتی دا ئەیکەنە ملی سەری تێ ئەخا و ئەیلەوەڕێ، پێ ی ئەڵێن: «جورک».

بۆ جوانی «سەرکەللە» ی بۆ ئەکەن کە بە «کوژەکە» و «مورو» و «گوڵنکە» ئەیرازێننەوە. «زەنگوڵە» ئەکەنە ملی. زەنگوڵە سەرەڕای ئەوەی دەنگێکی خۆش بۆ وڵاخەکە دابین ئەکا، لە کاتی ون بونی دا لە دەشتودەر یارمەتی خاوەنەکەی ئەدا بۆ دۆزینەوەی.

بە «سندم» «پێوەند» ی ئەکەن و، بە «میخ زنجیر» ئەیبەستنەوە.

زۆرجار لە ئەنجامی بار هەڵگرتنی زۆر دا، یان لە ئەنجامی گوێ پێ نەدانی خاوەنەکەی دا، سەر برپاگەی پشتی ئێستر بریندار ئەبێ و، برینەکەی قوڵ ئەبێ، ئەڵێن «تارکەپژ» بوە. ڕەگێکی ئەستور لە ناو لوتی دا پەیدا ئەبێ ئەڵێن: «کەرسمە» ی دەرکردوە. ناتوانێ باش هەناسە بدا. بە چەقۆیەکی تیژ ئەیبڕن و چاک ئەبێتەوە.

سج، گەنە، کەوڵە و کرنو، جۆروجانەوەری تر بە پێستی ئێستر دا ئەنوسێ و، ئەپوتێنێ زوری لێ ئەنیشێ، بە «ڕنەک» کە جۆرێکە لە شانەی لە ئاسن دروستکراو

ئەیکریان و، ئەیخوریان، جانەوەرەکانی لی ئەکەنەوە.
پیشینان وتویانە: «کەر چو بۆ بەغدا بو بە ئیستر»
شیخ رەزا لە باسی ئیسترەکەی دا ئەلی:
مهر بە سەد منەت هەناردی ئیستریکی روت و قوت
دەست و پا سست و سەقەت، ئەندامی هەروەک عەنکەبوت
لە بەیتیکی تری دا ئەلی:
شیخ فەتاحی مەیتەرم رۆژیک بە حوججەت لی ی نەوی
کلکی دەرهینا لە بن ئینجا بە ئاستەم گوی ی بزوت

*

گا

گا بۆ نیر و مانگا، یا چێل بۆ می. یەکی لە ولاخە بە نرخەکانی ژیانی مرۆڤ بوە.
بۆ جوت و گیرە و باربردن، بە کاریان هیناوە. کە پیریش بوە کوشتویانەتەوە گۆشتەکەیان خواردوە. ئەو سەردەمەی جاف رەوەند بوە، بە زوری گای لە باتی کەر و ئیستر بۆ بار هەلگرتن بە کار هیناوە.
گا وەکو مەر و بزن «دو سم» ە، «گاویژ» ئەکا.
گویرەکە، یا گۆلک، پاش لە شیر برانەوەی نیرەکەی ئەبی بە «نۆزەن» و میینەکەی بە «نینون» و، ئیمون لە سالی سییەم دا ئەبی بە «پارین» و، ئینجا «جوانەگا». گۆلک تا پی ئەگات چاودیریی و ماندوبونیکی زوری ئەوی. پیشینان وتویانە: «تا گویرەکە بە گا ئەکەی، خەریتی خۆت بە ئاو ئەکەی». گا رۆژانە بە کۆمەل ئەیری بۆ لەوەر، پی ی ئەلین: گاگەل، یا گاران. پیشینان وتویانە: «گا لە گاگەل بە جی بمینی، شاخی خۆی ئەشکینی»، هەروەها: «گای لە گاگەل دا نیە و، پی ی بەفر بردویەتی»، هەروەها: «دو گا لە دولیکا ئەگەر رەنگی یەک نەگرن، خوی یەکتری ئەگرن». ئەوی چاودیری گاران ئەکا پی ی ئەلین: «گاوان».
بۆ بی ئاگایی ئەلین: «لە گوی ی گادا نوستوە» و، بۆ نەزانی و نەشارەزایی ئەلین: «گا بە گونا ئەناسی» و، بۆ تیکچونی کاروباری ولات بە هۆی خراپیی گەورەی ولاتەوە ئەلین: «خەتای گای بنەیە!»

*

حەیوان لە سالیک دا ماوەیەکی دیاریکراو ئارەزوی «جوت گرتن» ی هەیە، لەو ماوەیەدا:
ماین و ماکەر بە «تەلەب و ئال» و، مانگا بە «کەل» و، دیلە سەگ بە «با» و، پشیلە بە «رشەمە» و، مەر بە «بەران» و، بزن بە «تەگە» ئەبی.
بۆ ئەو گیاندارە «ئاوس» انەی یەک یا دو بەچکەیان ئەبی «زاین» و، بۆ ئەو گیاندارانەی لە دو بەچکە زیاتریان ئەبی «ترەکین»، بە کار ئەهینری. بۆ نمونە:
ماین، مانگا، مەر، بزن.. ئەزی. پیشینان وتویانە: «مانگا بە دزی کەل ئەگری و بە ئاشکرا ئەزی».
سەگ، بەراز، پشیلە.. ئەترەکی.
بۆ مرۆڤ «مردن» و، بۆ ئەو گیاندارانەی گۆشتیان ئەخوری «مردار» و، بۆ ئەوانەی

گۆشتیان ناخۆری «تۆپیو» بە کار ئەهێنری.

پیاو ئەمری. پێشینان وتویانە: «مردن مردنە، لنگە فرتێ چیە!»

مانگا، مەڕ، بزن، مریشک.. مردار ئەبێتەوە. پێشینان وتویانە: «بۆ جگەری مەڕێ مردار ئەکاتەوە».

کەر، سەگ.. ئەتۆپێ. پێشینان وتویانە: «کەری دێز تۆپیوی خۆی و زەرەری ساحیبی ئەوی»، هەروەها: «لە کەری تۆپیو ئەگەڕێ ناڵی ئەکێشێتەوە»، هەروەها: «سەگ لە قسابخانە ئەتۆپێ عومری بە زایع ئەچێ».

ئەسپ ئەحیلێنێ، کەر ئەزەڕێنێ، ئێستر ئەپرمێنێ، گا ئەبۆڕێنێ.

## *
## کۆنگرەی چوارەمی حدکا

بە هۆی هەلومەرجی نالەباری ئێرانەوە حدکا لە دامەزراندنیەوە تا سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران ۳ جار کۆنگرەی گرت بو:

کۆنگرەی یەکەم لە ۱۹٤٥ دا.

کۆنگرەی دووەم لە ۱۹٦٥ دا لە گوندی سونێ لە پشدەر (کوردستانی عیراق) کە ئەوسا لە ژێر دەسەڵاتی بارزانی دا بو. ئەم کۆنگرەیە لە پاتی ئەوەی ڕیزەکانی حیزب یەک بخا و، ببێتە دەزگایەکی یەکگرتوی خەبات لە کوردستانی ئێران دا، ناکۆکییەکانی ناو ڕیزەکانی تەقاندنەوە و، پارچە پارچەی کردن.

کۆنگرەی سێهەم لە ۱۹۷٤ دا لە شاری بەغداد. سەرەڕای ناکۆکی شەخسی و سیاسی و ڕێکخراوەیی، ئەم کۆنگرەیە ڕیزەکانی دیموکراتی تا ڕادەیەک یەکخستەوە، کومیتەیەکی ناوەندی یەکگرتوی هەڵبژارد و، ئۆرگانی ناوەندی حیزبی بڵاو کردەوە و، پەیوەندی لە گەڵ ڕژیمی بەعس دا ڕێکخست...

کۆنگرەی چوارەم لە ۱۹ی شوباتی ۱۹۸۰ دا لە مەهاباد گیرا.

هەلومەرجی بەستنی کۆنگرەی چوارەم لە گەڵ هی هەمو کۆنگرەکانی تر جیاواز بو.

- شۆڕشی ئیسلامی ڕژیمی شاهەنی ڕوخاند بو، بەڵام هێشتا بە تەواوی دەسەڵاتی خۆی نەچەسپاند بو. بۆ یەکەمین جار ئێران ئازادییەکی بێ وێنەی بە خۆیەوە دی بو.

- کادرەکانی حدکا، دوای دەیان ساڵ دور وڵاتی و دەربەدەری، گەڕابونەوە کوردستانی ئێران و، بو بون بە هێزێکی دەسەڵاتداری گەورەی سیاسی، ڕێکخراوەیی، چەکدار لە کوردستان دا.

۳۱۰ ئەندام بەشداری کۆنگرە بون، کە نوێنەرایەتی ۳۰ هەزار ئەندامی حیزبی ئەکرد. پێش لە شۆڕش، هەمو کادر و ئەندامەکانی حیزب لە عیراق نەئەگەیشتنە ۱۰۰ کەس و، لە ئەوروپا بە پەنجەی دەست ئەژمێردران و، لە ناو ئێران دا لەوەش زۆر کەمتر بون. ژمارەی ئەندامانی حیزب لە ئەنجامی ڕوخانی ڕژیمی شا و، دروستبونی بۆشایی دەسەڵات لە کوردستانی ئێران دا، کتوپڕ و لە چەند مانگێکی کەم دا، وا زیادی کرد بو.

حیزب بۆ ئەوەی لە ململانێ ی دەسەڵات دا لە گەڵ کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی تر، ببێتە هێزی هەرە گەورە و زاڵی کوردستان، هەمو جۆرە کەسێکی، بێ گوێ دانە ڕابوردوی سیاسی لە ڕەوی چەپەوە بۆ ئەو پەڕی ڕاست، لە ڕیزەکانی خۆی دا کۆ کرد بوەوە.

کۆنگرە بە ڕاپۆرتێکی درێژی سکرتێری گشتی حیزب، د. ئەوڕەحمانی قاسملو،

دەستی پێ کرد. چەند ڕۆژێ درێژەی کێشا. هەلومەرجی ئاڵۆزاوی کوردستان و ئێران و کێشەکانی، لە ناو بیروڕای دانیشتوانی کوردستان و ئەندامانی حدکایش دا ڕەنگی دابووەوە. ناکۆکی لە ڕیزەکانی دا لە سەر کێشەی ئایینی و، جیاوازی بیروڕا لە شۆڕشی ئیسلامی و، حیزبی توودە و، جۆری بەڕێوەبردنی حیزب و، جوولانەوەی کورد.. لە ناو ئەندامەکانی دا ئاشکرا بوو. هیچ ڕێکخراوێکی کوردستانی عێراق، بۆ ئەم کۆنگرەیە، بانگ نەکرا بوو، بەڵکو لە ڕاپۆرتەکەدا تاوانبار کرا بوون بە دەستوەردانە کاروباری ناوخۆی کوردستانی ئێران. کومیتەی ناوەندی هەڵبژێردرایەوە، کە تێکەڵاو بوو لە کەسانی جۆراوجۆری خاوەن بیروباوەڕ و هەڵوێستی جیاواز.

*

لە ڕۆژانی شەڕی کورد و پاسدار دا، یەکێ لە تاقمە چەپەکان جارێکیان ویستوویان پردێکی ڕێگای مەهاباد - سەردەشت خراپ بکەن، وەکو بەشێ لە هەوڵی دواخستنی لەشکرکێشی هێزەکانی ئێران. پێشمەرگەکانی حدکا ڕێگەیان نەدا بوون و، دەریان کرد بوون. ئەوانیش وت بوویان: «ئێوە خۆتان داوای دیموکراسی ناکەن، ئەم کارەی ئێوە دژی دیموکراسییە». ئەوانیش وت بوویان: «ئێمە دیموکراسی مان بۆ ئێران داوا کردووە، بۆ ئێرە خودموختاری!».

د. قاسملو زۆر جار ئەم نوکتەیەی بە پێکەنینەوە ئەگێڕایەوە. ئەگەرچی خۆی بە هەڵگری بیروباوەڕی دیموکراسی دائەنا و، زۆری باس ئەکرد، زۆرجار ئەیوت: «خراپترین دیموکراسی لە باشترین دیکتاتۆری باشترە!»، بەڵام زۆر لە هاوڕێکانی لە ناو دەفتەری سیاسی و کومیتەی ناوەندی دا تاوانی ناکۆکی و سەپاندنی بیروراکانی خۆیان بە پاڵ ئەدا و، ئیبالی هەندێ لەم جیابوونەوە و وازهێنانانەیان ئەخستە گەردنی ئەو.

*

کۆبوونەوەی سەرکردایەتی یەکێتی

لە ڕۆژانی ٢ - ١٨ ی مارتی ١٩٨٠ کۆبوونەوەی کۆمیتەی سەرکردایەتی و، کادرە پێشکەوتووەکانی یەکێتی کرا. ئەم کۆبوونەوانە چەند خەلەلێکی گرنگیان لە یەکێتی دا ئاشکرا کرد کە لایەنی ڕێکخراوەیی و سیاسی و ئایدیۆلوجییان هەبوو:

- کەسی یەکەم و، جۆری بەڕێوە بردنی یەکێتی و دەزگا سەرکردەییەکانی.
- جۆری ڕاگرتنی تەبایی سیاسی و ئایدیۆلوجی لە ناو باڵەکانی دا.
- جۆری ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان باڵەکانی دا.

یەکێتی لە سەرەتای دامەزراندنی دا «دەستەی دامەزرێنەر» ی هەبوو کە پێک هات بوو لە ٧ کەس لە دەرەوەی وڵات. ئەم ٧ کەسە نوێنەرایەتی هیچ ڕێکخراوێکیان نەئەکرد، بەڵکو لە سەر بنچینەی لێوەشاوەیی خۆیان دەس پێشکەرییان کرد بوو بۆ دامەزراندنی یەکێتی و، لە ناوەوەی وڵاتیش داوا لە چەند کەسێک کرا بوو دەستەی دامەزرێنەری یەکێتی پێک بهێنان، ئەوانیش تا لە شار بوون نەیانتوانی بوو کۆ ببنەوە، دەستەی دامەزرێنەری وڵات دابەزیبوون و، ڕێوشوێنێکی سیاسی، ڕێکخراوەیی، پێشمەرگەیی یەکگرتوو بۆ کارکردن لە چوارچێوەی یەکێتی دا دابنێن. وەکو دوو ڕێکخراوی جیاواز و دابڕاو لە یەکتری کاریان کرد بوو تا هات بوونە شاخ. لە شاخیش نەیانتوانی بوو ڕێوشوێنێکی یەکگرتوو دابنێن، هەر لایەکیان بۆ خۆی کاری کرد بوو، بۆ ئەوەی ناکۆکییەکان دوابخەن سەرکردایەتییەکی

دوابەیان بۆ کاروباری سیاسی و پێشمەرگەیی دامەزراند بوو، بە تەمای گەڕانەوەی مامجەلال و، بە لاداخستنی ئەو گیروگرفتانە.

تا کۆبوونەوەی برادۆست یەکێتی و شۆڕشەکە سەرکردایەتییەکی یەکگرتووی نەبوو. لە پەیڕەوی ناوخۆیش دا باسی جۆری دروستکردنی و دەسەڵاتەکانی نەکرا بوو، بە جێ هێڵرا بوو بۆ گەشەکردنی یەکێتی و ڕووداوەکانی کوردستان. لە کۆبوونەوەی برادۆست دا، کە بە ئامادەبوونی نوێنەرانی بزوتنەوە و کۆمەڵە و مامجەلال کرا، بڕیار درا سەرکردایەتی یەکێتی یەک بخرێ و، سکرتێر هەڵبژێردرێ و مەکتەبی سیاسی لە ۲ نوێنەری بزوتنەوە و ۲ نوێنەری کۆمەڵە، پێک بهێنرێ. لەم کۆبوونەوەیش دا دەسەڵاتەکانی ئەو دەزگایانە دیاری نەکرا و، پەیڕەوی ناوخۆ وەکو جاران بێ دەستکاری مایەوە. بە دوای ئەوەدا زنجیرەیەک ڕووداو ڕوومان، سەرکردایەتی یەکێتی لە بەر ئەوەی هەموو ڕەنج و تەقەلای خۆی بۆ هەڵساندنەوەی یەکێتی و شۆڕشەکە تەرخان کرد بوو، نەیتوانی بوو لایەنە (فنی) یەکی جۆری پەیوەندییەکانی نێوان باڵەکانی یەکێتی و، دەزگا سەرکردەییەکانی: سکرتێر، مەکتەبی سیاسی، کۆمیتەی سەرکردایەتی، لقەکان، بە جۆرێکی گونجاو لە گەڵ پێویستییەکانی شۆڕش و بۆچوونی سەرکردایەتی باڵەکانی یەکێتی ڕێک بخاتەوە.

ئەم کۆبوونەوانە ئەو کێشەو گیروگرفتانەیان تەقاندەوە.

کۆبوونەوەکان بێ سەر و بەر بوون. ڕۆژانە درێژەیان پێ ئەدرا بێ ئەوەی ئەنجامی باشی هەبێ. مامجەلال ڕاپۆرتێکی درێژی نوسی بوو، زۆری کاتی کۆبوونەوەکە بە خوێندنەوە و لێدوانی ئەم ڕاپۆرتەوە گوزەرا. زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتی وەڕس ببوون، لە کۆبوونەوەدا خەویان ئەهات.

*

عومەرەکان

بە ڕێکەوت چەند کەسی لەوانەی لە دەزگا سەرکردەییەکانی یەکێتی دا کاریان ئەکرد، ناویان عومەر بوو: عومەر مستەفا و عومەر عەزیز لە بزوتنەوە، عومەر عەبدوڵڵا و عومەری سەید عەلی لە کۆمەڵە و، عومەر شێخموس لە خەتی گشتی. بۆ ئەوەی ئەم ناوانە لە یەکتری جیا بکرێنەوە، عومەرمستەفا بە کاکی کاکان و کاک عومەر و، عومەر عەزیز بە حاکم عومەر و، عومەری حاجی عەبدوڵڵا بە مولازم عومەر و، عومەری سەید عەلی بە سەید عومەر و، عومەرشێخموس بە هۆمەر ناو ئەبران.

ئەم ناوە لە یەکچوانە هەندێ جار «ئیشکال» و نوکتەی دروست ئەکرد. وەکو ئەیانگێڕایەوە:

جارێکیان، ۳ عومەر پێکەوە چوبوون بۆ لیبیا، یەکێ لە لیبییەکان کە بە ڕیز ناوی چەند عومەری بە دوای یەکا دێ بوو، وت بووی: بە ۳ عومەر ۱ عەلییان دەس نەکەوتوە لە گەڵ خۆیانی بهێنن.

جارێکی تر، ۳ عومەر پێکەوە سەردانی سەفارەتی ئێرانییان کرد بوو لە شام. ئەو کاتە نێوانی ئێران و یەکێتی ناخۆش بوو، ئەمان چو بوون خۆشی بکەنەوە. یەکێ لە ئێرانییەکان کە ناوەکانی دێ بوون ۳ عومەر بە دوای یەکا ڕیز بوون، وت بووی: ئەمانەیان ناردوە بۆ باشکردنی پەیوەندی یان بۆ هێرشکردن!

*

نوێنەرانی کومەڵە لە مەکتەبی سیاسی دا، وەکو خۆی، سالار و جەعفەر مانەوە. عومەرشێخموس و کەمال خۆشناو لە باتی خەتی گشتی، جەمال حەکیم و عەلی حەویز لە باتی بزوتنەوە دانران. ئەندامانی مەکتەبی سیاسی لە ناو خۆیان دا نەگونجاو بون. مەکتەبی سیاسی زورتر شتێکی روالەت بو، هەمو کۆبونەوەیەکی مەکتەبی سیاسی هەمو ئێچنامێکی سەرکردایەتی بەشداری تێ دا ئەکرد کە لەوێ بوایە.

نەمانتوانی ناکوکییەکان چارەسەر بکەین. ناکۆکی لە گەڵ رەسوڵ و بزوتنەوە قوڵتر بو، بە تایبەتی دەرگای کوردستانی ئێرانیان بۆ کرا بوەوە، ناکۆکییەکانی ناو کۆمەڵەیش تا ئەهات ناخۆشتر ئەبو.

*

روخانی شا بۆ ئێمە مزگێنیەکی یەکجار خۆش بو: لەو ئابلوقەیە دەرچوین کە تێ ی کەوت بوین و، قولاییەکی ستراتیجی مان بۆ دروست بو کە ئەمان توانی هاتوچوی پێ دا بکەین و، پێویستییەکانی جوڵانەوەکەی لێ دابین بکەین.

*

یەکێتی رێکخراوێکی فیدراڵی بو لە کاروباری سیاسی و پێشمەرگەیی و دارایی و راگەیاندن دا یەککگرتو بو، بەلام لە کاروباری رێکخراوەیی دا، هەر ۳ رێکخستن سەرکردایەتی و رێکخستنی تایبەتی و داخراوی خۆی هەبو، هەر رێکخستنە سەربەخۆ بو.

تا ئەم کۆبونەوانە تەنیا کۆمەڵە و بزوتنەوە رێکخراویان لە ناو وڵات دا هەبو، لە دەرەوەیش هەر یەکێتی رێکخراوی هەبو، رێکخستنی کۆمەڵە و بزوتنەوە لە دەرەوە کەم و پچوک و تازە لە سەرەتای دامەزراندن دا بون. لەم کۆبونەوانەدا مامجەلال هەوڵی دا سەرانسەری دەزگا و رێکخراوەکانی یەکێتی بکاتە دەزگای ۳ قلیچقانە: خەتی گشتی، بزوتنەوە، کومەلە و، لە هەمو دەزگاکان دا ئەم ۳ سەرییە خۆی بنوێنێ:

مەکتەبی سیاسی پێک بێ لە ٦ ئەندام: ۲ خەتی گشتی، ۲ بزوتنەوە، ۲ کۆمەڵە.

کومیتەی سەرکردایەتی پێک بێ لە ۲۱ ئەندام: ۷ خەتی گشتی، ۷ بزوتنەوە، ۷ کۆمەڵە.

لقەکان پێک بێ لە ۳ ئەندام: ۱ خەتی گشتی، ۱ بزوتنەوە، ۱ کۆمەڵە.

لە پێکهێنانی دەزگاکانی راگەیاندن، پێشمەرگەیی، رێکخستن، دارایی دا و، لە پێکهێنانی هەرێمەکانی پێشمەرگەیش دا هەمان شێوە پەیرەوی بکرێ.

بێگومان تواندنەوەی ۳ رێکخراوەیی لە مەکتەبی سیاسی و کومیتەی سەرکردایەتی دا شتێکی پێویست بو، بەلام لە خوار ئەوێوە: دەزگا، لق، هەرێم، تەنانەت ناوچە و کەرتەکان، گیروگرفت و کێشەی زوری دروست ئەکرد و، لە مەیدانی کار پێ کردن دا ئەنجامی خرایی ئەبو:

۱. لە پێ سپاردنی کاردا سەرەتای لێوەشاوەیی فەرامۆش ئەکراو، سەرەتای دڵسۆزیی حیزبایەتی، یان راستتر تاقمگەری، ئەبو بە پێوانە.

۲. لە بەر ئەوەی ئەم ۳ رێکخراوە لە هەمو ناوچەکان دا وەکو یەک کادریان ئەبو، بواری بۆ کەسانی هەلپەرست هەڵئەخست، خۆی بە یەکێ لەم رێکخراوانەدا هەڵبواسێ و، رێکخراوەکەیش بۆ لەمەکردنی خۆی بیگرێتە خۆی و، بە هەق و بە ناهەق لە سەری هەڵ بداتێ.

٣. مونافەسەیەکی ناڕاستی لە نێوان باڵەکان دا دروست ئەکرد بۆ ڕاکێشانی ئەندام و دۆست و، بۆ زمان دان لە یەکتری لای سکرتێری گشتی.

٤. یەکێتی ویست و کاری لە دەزگاکان دا ئەشەیشت و ئەگەڕەی لە خێرایی ڕاپەڕاندنی کارەکان ئەدا.

ڕێکخستنی جۆری پەیوەندی سکرتێر لە گەڵ مەکتەبی سیاسی و دەزگا سەرکردەییەکان و، هەر ٣ ڕێکخراوە جیاوازەکە، یەکی لە کێشە قوڵە چارەسەر نەکراوەکان بو. بێگومان یەکێتی پێویستی بەوە هەبو، کەسی یەکەمی هەبێ، کەسی یەکەم بێ هیچ مونافەسەیەک مامجەلال بو، هەمو لایەنەکان هەڵیان بژارد بو، ڕازی بون ئەو بێ.

لێرەدا چەند مەسەلەیەک ئەهاتە پێشەوە لەوانە:

ئەگەر مامجەلال بە تەنیا خۆی بە خاوەنی ڕێکخراوی خەتی گشتی ئەزانی، ئەوا ئەویش وەکو سکرتێرەکانی بزوتنەوە و کۆمەڵەی لێ دێ، خۆ ئەگەر سکرتێری گشتی یەکێتیە، نابێ ئیتر خۆی بە خاوەنی خەتی گشتی بزانی.

مامجەلال سکرتێری گشتی بێ، دەسەڵاتەکانی چیە و، چۆن پەیوەندییەکانی خۆی لە گەڵ باڵەکانی یەکێتی ڕێک ئەخا؟

مرۆڤی ڕۆژهەڵاتیی لە دەرونی خۆی دا حەزی لە تاکڕەوی و ئیستیبدادە، ئیمەی کوردی ئەو زەمانەیش ئەو نمونانەی شارەزای بون، هەمویان لەم بابەتە بون:

- نمونەی کوردی: مەلا مستەفای بارزانی.
- نمونەی عەرەبی: جەمال عەبدولناصر، عەبدولکەریم قاسم، حافظ ئەسەد، ئەحمەد حەسەن بەکر، صەددام حسێن.
- نمونەی جیهانی: ستالین، ماوتسیتونگ، تیتۆ، کاسترۆ...

مام جەلال چاوی لە مان، بە زۆری چاوی لە نمونە کوردییەکە ئەکرد. ئەوانەی لە ناو یەکێتی دا کۆئەبونەوە بە هیوای دامەزراندنی شێوەیەکی نوێ بون لە دارشتنی پەیوەندییەکانی ناوخۆ دا، بە تایبەتی ئەو جۆرە پەیوەندییەی مەلا مستەفا لە گەڵ سەرانی پارتی دایمەزراند بو، بە لای ئەمانەوە، یەکی بو لە هۆ سەرەکییەکانی لاواز کردنی پارتی و دەسەڵاتەکانی و، لە ئەنجام دا ئاشبەتاڵی پارتی و شۆڕش. ئەم دو جۆرە تێشکردنە جیاوازە زۆری کاتی ناو سەرکردایەتی بە شتی بێهودەوە ئەکوشت. ئەمانویست شێوەیەکی گونجاو بدۆزینەوە.

مەکتەبی سیاسی و، دەزگا سەرکردەییەکانی ڕێکخستن، پێشمەرگەیی، ڕاگەیاندن، دارایی، پەیوەندییەکان،. هەبون و بە ئەندامانی ٣ ڕێکخراوەکەی کۆمەڵە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، پڕ کرا بونەوە.

من هەمیشە پەیوەندییم لە گەڵ مامجەلال باش بوە. هەمیشە ڕێزی زۆری بیر و بۆچونەکانی منی ئەگرت، بە درێژایی تەمەنی درێژی برایەتیمان لە هیچ بۆنە و کات و شوێنێک دا بە گژ من دا نەهات بو. زۆر جار بیر و بۆچونەکانمان دژی بیر و بۆچونی یەکتری بوە بەڵام هەرگیز دەمان لە یەک نەگیراوە. لە یەکتری عاجز ئەبوین، زو پێک ئەهاتینەوە.

ئەندامانی سەرکردایەتی هەر هەمویان لە پاشمله گلەییان لە مامجەلال ئەکرد و، ڕەخنەیان لێ ئەگرت، بەڵام زۆری گلەییەکانیان لە سەر شتی بچوک و تایبەتی خۆیان بو،

وەکو: ڕێزی نەگرتوون، لە بەر چاوی خەلک لێیان تووڕە بوە و شکاندوونی، حورمەتی ڕەشی نەگرتوون و چزتەوە بە ئژیان دا.. سەرانی کۆمەلە چەند جاری لە کۆبوونەوەی تایبەتی خۆیان دا ئەم باسەیان ئەکردەوە و، داوایان لە من ئەکرد لە گەلی باس بکەم و، چارەیەکی بۆ بدۆزینەوە. زۆریان ئەیانوت: «ئەرکی قورسی شۆڕشەکە لە سەر شانی ئێمەیە، لە هەمەو لایەنەکانی کە زیاتر قوربانی ئەدەین، بە ژمارەی کادر و پێشمەرگە لە هەموویان زۆرترین.. بۆچی ئەمە لە مامجەلال قەبوول بکەین؟» کەچی هەمو جاری کە باسەکەم ئەکردەوە و لە گەلی ئەبو بە ناخۆشیمان، خاوەنی گلەیی و رەخنە لە باتی ئەوەی پشتیوانی لە من بکەن، ئەبوون بە ناوبژیکەر لە بەینی من و مامجەلال دا.

من زۆرم بیر لی کرد بوەوە، لە گەل زۆر لە هاوڕێکانم گفتوگۆم کرد بۆ چارەیەک بۆ ئەم کیشەیە بدۆزینەوە، تەنانەت ئەوانەی خەتی گشتی بوو، وەکو عومەر شێخموس و د. فوئاد مەعصوم، هەمان ڕەئیان هەبو. چەند جاری لە گەل مامجەلال قسەم کرد کە جۆری سکرتاریەتەکەی بگۆڕین بە یەکی لەم دو شێوە حوکمڕانییەی لە دنیادا هەیە: شێوەی سەرۆکایەتی وەکو لە ئەمریکا هەیە، یان شێوەی پارلەمانی وەکو لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا هەیە.

شێوەی سەرۆکایەتی، سەرۆک بارەتەیدەرەکانی خۆی بۆ کاروباری پێشمەرگە، ڕاگەیاندن، دارایی، کاروباری پەیوەندی دەرەوە... هەلئەبژیری. ئەمانە کۆبوونەوەی دەوریان نیە بۆ بڕیاردان لە سەر کاروبار بەلکو سەرۆک هەلیانئەبژیری و سەرۆک ئەرکەکانیان دیاری ئەکا و، هەر لە بەردەمی ئەویش دا لێپرسراو ئەبن. لە باتی مەکتەبی سیاسی دەزگایەکی لەو بابەتە بۆ خۆی هەلبژیری و، لە هەمان کات دا، لە باتی کۆنگریس، کۆمیتەی سەرکردایەتی ئەبی، تیکەلاو لە هەر ٣ ڕیکخراو، کە ناو بەناو کۆبوونەوە ئەکا بۆ دانانی سیاسەتی گشتی و لێپرسینەوەی کارەکانی سەرۆک.

شێوەی پارلەمانی، سەرۆکی وەزیران دوای پرس و ڕا لە گەل هاوڕێکانی ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران هەلئەبژیری و، ئەیانخاتە بەردەمی پارلەمان بۆ وەرگرتنی باوەڕ. ئەنجومەنی وەزیران کۆبوونەوەی بەردەوام ئەکەن، بڕیارەکان بە زۆرایەتی ئەدری. بە تاک و بە کۆمەل لە بەردەمی پارلەمان دا لێپرسراون. مامجەلال سەرۆوەزیر و، مەکتەبی سیاسی ئەنجومەنی وەزیران و، کۆمیتەی سەرکردایەتی پارلەمان، بی.

مامجەلال پێشنیارەکانی پی ناخۆش بو، هیچیانی قەبوول نەبو، ئەیویست وەکو خۆی بمێنیتەوە. وەکو خۆیشی مابەوە چونکە ئەندامانی م س و سەرکردایەتی نەیانئەویست تووشی بەرەنگاری ببن لە گەلی. عەبدولرەزاق فەیلی ئەیوت: «پارتی حیزبێکی عەشایریە بەلام بە ئوسلوبی عەسری ئیش ئەکا، یەکیتی حیزبێکی عەسریە بەلام بە ئوسلوبی عەشائیری ئیش ئەکا».

*

یەکیتی و حدکا

نێوانی مامجەلال و قاسملو و، یەکیتی و حدکا، لە سەرەتاوە بە ڕوالەت باش و خۆش بو، بەلام ڕاستیەکەی بی باوەڕی و گومان لەم پەیوەندییەدا هەبو. حدکا عیراقی بە پشتیوانیکی گرنگ دائەنا بۆ خۆی، نەیئەویست لە بەر خاتری یەکیتی یان هیچ ڕیکخراویکی تری عیراقی، دۆستایەتی بەعس لە دەس بدا. هەر بەم هۆیەوە، هەمو ئەو

کۆبوونەوانەی لە ئەورووپا لە ساڵانی رابوردوودا لە نێوان نوێنەرانی یەکێتی و حدکا و، ڕێکخراوە کوردییەکانی تورکیا و سووریا دا کرا بۆ دامەزراندنی «بەرەیەکی هاوبەشی کوردستانی» سەری نەگرت، زۆر جار نوێنەری حدکا تەگەرەی لەم کۆبوونەوانە ئەدا و، بە بیانووی جیاواز نەیئەهێشت بۆ پێشەوە بچێ.

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئێران، حدکا یەکێتی یان تاوانبار ئەکرد بەوەی دەستی وەرداوەتە ناو کاروباری کوردستانی ئێرانەوە. لە شارەکان دا ڕێکخستنی دروست کردووە و، بە هاندان و یارمەتی یەکێتی بوو دوژمنایەتی حدکا، سازکا دامەزراوە. بێگومان ئەمە ڕاست نەبوو خۆیشیان ئەیانزانی ڕاست نییە بەڵام کرد بوویان بە بیانوو و، بە بنێشتە خۆشەی ژێر دانیان، هەر ئەیانوت و ئەیانوتەوە. سازکا لە لایەن یەکێتییەوە دانەمەزرێنرا بوو، گوێ ی لە ئامۆژگاری و قسەکانی یەکێتی یش نەئەگرت، بەڵکو یەکێتییان بە ڕێکخراوێکی نەتەوەیی نامارکسی و، هەندێ جار بە «بۆرژوا لیبراڵیست» دائەنا. بەڵام یەکێتی پەیوەندی باش و دۆستانەی لە گەڵ سازکا و سەرکردەکانی و، مەلا شێخ عیزەدین و، هەموو ڕێکخراو و پیاوە ناسراوەکانی کوردستانی ئێران دامەزراند بوو. هەروەها لە تارانیش پەیوەندی باشی لە گەڵ هەندێ لە سەرکردەکانی شۆڕش و پیاوە ناسراوەکانی ئێران دامەزراند بوو.

ڕاستییەکەی یەکێتی هەوڵی زۆری دا پەیوەندی باش و دۆستانە لە گەڵ حدکا دابمەزرێنی، ئەمەش بێگومان ئەبوو بە هۆی دوراندنی دۆستایەتی حکومەتی ئێران و، تا ڕادەیەکیش سووریا، کە پێویستییەکی ژیانی بۆ یەکێتی هەبوو. یەکێتی لە ناو بازنەی ئابڵوقەیەکی بە هێزدا بوو. سنووری تورکیای لێ گیرا بوو، لە سنووری عێراقەوە نەیئەتوانی هاتوچۆ بکا، ڕووخانی شا یەکێتی لەم گەمارۆیە دەرهێنا و، دەرگای جیهانی بۆ کردەوە. دۆستایەتی لە گەڵ حدکا ئەبوو بە هۆی داخستنەوەی ئەم دەرگایە، بەڵام لە ڕوانگەی قازانجی نەتەوەییەوە لامان وابوو، کە لەو سەردەمەدا کێشەی کورد لە ئێران دا، گرنگییەکی کاریگەری پەیدا کردوە، ئەبێ هەموو کورد یارمەتییان بدا بۆ ئەوەی ئەو هەلەیان لە دەس نەچێ و، مافەکانی خۆیان بە دەس بهێنن.

حدکا هەڵوێستیان بەرامبەر یەکێتی دۆستانە نەبوو، کادر و پێشمەرگەکانیان ڕاسپارد بوو، کارئاسانی بۆ یەکێتی نەکەن:

- لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانی خۆیان دا و، لە لای حیزب و ڕێکخراوەکانی کە، دژی یەکێتی ئەدوان.

- لە هەر جێگایەکی دەستیان بڕوشتایە تفەنگیان بە پێشمەرگەکانی یەکێتی هەڵئەچنی و، لە هاتوچوودا ڕێگەیان پێ ئەگرتن و، چەند جارێ بۆ سووکایەتی پێ کردن چەکیان کردن.

- لە هەندێ جێگا نوقتەی گومرگیان بەرامبەر نوقتەی گومرگەکانی یەکێتی دانا و، ئاگاداری نوقتەکانی یەکێتییان کرد کە نابێ لە خاکی ئێران دا بنکە دابنێن. لەو کاتەدا گومرگ تەنیا سەرچاوەی دەرامەت و ژیانی یەکێتی بوو.

- کارئاسانییان بۆ ئەم ئەکرد لە ئەرزی کوردستانی ئێران دا بنکەی چەکدار دابنێن و، چەکدار کۆ بکەنەوە و، بە ئازادی هاتوچۆ بکەن.

- ڕەسوڵ مامەند و بزوتنەوە و، د. مەحموودیان هان دا بۆ جیابوونەوە لە یەکێتی و، بە چەک و پارە و کارئاسانی یارمەتییان دان.

چەند جارێ مامجەلال نامەی بو د. قاسملو نوسی و، نوێنەرانی یەکێتی سەردانیان کرد و، مامجەلال خۆیشی چو بۆ دیدەنییان، ئەمانە پیوەندی دوقولی باشتر نەکرد، هەتا جەنگی ٣ مانگە دەستی پی کرد و، هێزەکانی تیران، هێزەکانی حدکا و ڕێکخراوەکانی تریان لە زوری ناوچەکانی کوردستان راونا بەرەو سنوری عێراق، بۆ نزیک بارەگاکانی یەکێتی.

*

بۆ چاککردنی پیوەندی دوقولی یەکێتی دەستەیەکی نوێنەرایەتی پێک هێنا لە: عومەر شێخموس، عومەری حاجی عەبدوللا، جەمال حەکیم، شازاد صائیب و من. لە مانگی نیسانی ۱۹۸۰ دا بە کومەڵ بە ڕێ کەوتین بۆ سەردەشت. هەر لە سەردەشتەوە ئیتر خۆمان کرد بە میوانی حدکا. دوای ئەوەی شەوێک لە سەردەشت مابینەوە بۆ ڕۆژی دوایی بەری کەوتین بۆ مەهاباد. لە مەهاباد کۆشکێکی شاهانە لە نزیک بەنداوی مەهاباد هەبو لەوێ دایان بەزاندین.

گفتوگۆکانمان دەستی پی کرد. لە لایەن حدکاوە: د. قاسملو، مەلا عەبدوللای حەساکی، مستەفا شەلماشی و چەند کەسێکی کە بەشداری کۆبونەوەکان ئەبون.

ئێمە لە قسەکانمان دا ویستمان چەند مەسەلەیەکیان بۆ ڕون بکەینەوە:

«ئێمە هیچ هۆیەکی ڕاستەقینە نابینین بۆ ئەو ساردییەی لە پیوەندی دوقولی یەکێتی و حدکا دا هەیە و، هاتوین بۆ ئەوەی هۆکانی بنەبڕ بکەین و، قوناغێکی تازەی دوستایەتی و هارکاری دەس پی بکەین و، لە لای ئێمەوە سنورێک بۆ ئەو دۆستایەتییە نیە بە جی ی ئەهێلین ئێوە دیاری بکەن»

وتمان: «ئێستا کورد لە ئێران دا هەلێکی مێژویی بۆ هەڵکەوتوە، ناووناوبانگی حکومەتی ئێران بە تایبەتی دوای داگیر کردنی سەفارەتی ئەمەریکی لە دنیادا زور خراپ بوە. حکومەتی ئێران دابڕاوە لە دنیا. زوری ناوچەکانی کوردستانی ئێران و شارە گرنگەکانی ئازادن و، دەسەڵاتی حکومەتی تارانیان تی دا نەماوە، عێراق زور بە توندی دژی ڕژێمی تازەی ئێرانە، ئەتوانری کەلکی لی وەربگیری، کورد ئەگەر حکومەتێکی کاتیی تایبەت بە خوی دابمەزرێنی و، هەلبژاردنێکی گشتی بکا بۆ پێکهێنانی ئەنجومەنی کوردستان و، دارودەزگای ڕاگەیاندن (دەزگای ڕادیو، تەلەفزیون، ڕۆژنامە) و جەنگی (لەشکری نیزامی) دابمەزرێنی، ئێمە ئامادەین شۆڕش لە کوردستانی عێراق ڕابگرین و، هەمو توانای خۆمان هی پێشمەرگەیی و سیاسی و ڕێکخراوەیی و ڕاگەیاندن، ئەوی لە شاخ و ئەوی لە شار هەمانە، تەرخان بکەین بۆ خزمەتی ئەو هەنگاوە، بی ئەوەی چاوەڕوانی هیچ پاداش و دەسکەوتێک بین.»

د. قاسملو زور جار باوەڕی جیددی خۆی لە قالبی گاڵتەدا دەرئەبڕی، بە پێکەنینەوە وتی: «دیارە ئەتانەوی کێشە و گیروگرفتەکانی خۆتان لە کوردستانی عێراقەوە بهێننە ناو کوردستانی ئێرانەوە!»

ئەم پێشنیارەیان پەسند نەکرد، گیانی «ئێرانی بون» لە بیری سەرانی حدکا دا بەهێزتر بو لە گیانی «کورد بون». حدکا خۆیان بە تاکە پێشڕەوی بزوتنەوەی کورد دائەنا لە کوردستانی ئێران دا، ئەیانویست ئێمەش ئەوەیان بۆ بسەلمێنین.

چوینە سەر باسەکانی تر. هەوڵێکی زورمان دا بەدگومانییەکانیان دەربارەی

پارمەتیدانی سازکا دژی ئەوان و دەس وەردانە کاروباری کوردستانی ئێران بەرەوپێشەوە. بۆ هاوکاری دوقۆلی چەند سەرەتایەکمان دانا کە تێتر سالانی دوایی لە سەری رۆیشتین.

*

سەفەری مامجەلال بۆ دەرەوە.

مامجەلال لە مایسی ١٩٨٠ دا چو بۆ تاران. زیاتر لە مانگی مایەوە. لەو ماوەیەدا گەورە کاربەدەستانی ئێرانی بینی. هەر لە تارانەوە ئاگاداری کردین کە هەندی کاری پێویست هاتونەتە پێشەوە، ئەبی بچی بۆ شام بەلام زۆری پی ناچی ئەگەرێتەوە. لەو ماوەیەدا کاربەدەستانی سپای پاسداران بیرورایان بەرامبەر مامجەلال خراپ بو. مامجەلال سیانزە مانگ لە شام گیری خوارد نەیتوانی بگەرێتەوە.

*

ناوبژی

هەریمی ٧ ی بالەک یەکی لە هەریمە چالاکەکانی یەکیتی بو. ناوچەکەیان بە تەواوی راگوێزرا بو، هیچ ئاوەدانییەکی تی دا نەبو. زۆر لە پێشمەرگەکان بو حەسانەوە یا تەداوی یا کاروباری پێویستی خۆیان ئەچون بۆ کوردستانی ئیران.

ئەحمەد سۆزراو، فەرماندەی کەرتی گەلالەی هەریمی ٧ چو بو بۆ ئیران. چەکدارەکانی پارتی کە لە ناوچەی خانە بارەگایان هەبو، لە گەل کورەکەی دا، گرت بویان. ئەحمەد هیچ خراپەیەکی بەرامبەر پارتی نەکردبو، هیچ ئاوانێکیشی نەبو، جگە لەوەی پێشمەرگەی یەکێتی بو. لە رێگای ئەمرۆکەوە هەولیان دابو، بەری بدەن، سودی نەبو. پێشمەرگەکانی هەرێمەکە بە موافەقەتی ئێمە چونە سەر هێزێکی پارتی لە نزیک سەریشمە لە ناوچەی گەلالە ٢٤ کەسیان لی گرتن. هەرلەوی هەندێکیان بەردا بون و، ١٥ کەسیان لی گل دابونەوە و، بە گیراوی رەوانەی لای ئێمەیان کردن لە ناوزەنگ. پارتی پارەیان لی هەستا و، گلەییان گەیاند بوە لای حشع. هەر لەو ماوەیەدا لە دزلی بش لە لای مەریوان شەرێک لە نێوان حدکا و پارتی دا بو، چەند پارتیەک گیرا بون. ئەم دو رووداوە هیچ پەیوەندییەکیان لە گەل یەک نەبو. لە دو ناوچەی دور لە یەکتری و، لە گەل دو هێزی جیاواز بو.

حشع کەوتە بەینەوە. لەو لاوە لە گەل حدکا و، لەم لاوە لە گەل ئێمە.

پاش گفتوگۆیەکی زۆر لە سەر ئەوە ریک کەوتین: ئێمە گیراوەکانی پارتی بەر بدەین. پارتی بش گیراوەکانی یەکێتی بەر بدەن. گیراوەکانی پارتی ١٥ کەس بون، گیراوەکانی یەکێتی ٣ کەس بون. ئەحمەد سۆزراو و کورەکەی و، عەبدولواحید باجەلان کە ئەویش هەر لە ناو ئیران دا گیرا بو.

رۆژی ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٨٠ ئێمە هەمو گیراوەکانمان نارد بو لای حشع، تا ئەوان رەوانەی لای سەرکردایەتی پارتییان بکەن و، گیراوەکانی ئێمەش وەربگرنەوە و رەوانەی لای ئێمەی بکەن.

گیراوەکانی پارتی گەیشتنەوە لای سەرکردایەتی خۆیان، بەلام گیراوەکانی ئێمە هەرگیز نەگەیشتنەوە لای یەکێتی. ئەحمەد و کورەکەیان پاش چەند حەفتە بینوبەرە بەر دابو، بەو مەرجەی تەسلیمی عیراق ببیتەوە، ئەوی تریشیان بەر نەدا بە تۆمەتەیەکی درۆ کە

گوایە ویستوویەتی سەرۆکی پارتی بکوژێ. حشع، ئەم پەیمانشکێنییەی پارتی بە «رووحی ریاضی» وەرگرت، بە سووکایەتی دانەنا بۆ هەوڵەکەی و، هیچ نارەزایییەکی لە سەر دەرنەبڕی.
ئەمە نموونەیەک بوو لەو ناوێژییانەی حشع لە نێوان یەکێتی و پارتی دا ئەنجامی ئەدا.

*

«علاقاتی اممی»

یەکێ لە رەخنەکانی عومەری سەید عەلی و، هاوڕێکانی تری کە تازە لە زیندان ئازاد بوبوون، لە هەمەر کۆبوونەوەیەک دا دووبارەیان ئەکردەوە، ئەوە بوو کەوا: ئێمە علاقاتی اممی مان فەرامۆش کردوە و، هیچ هەوڵێکمان نەداوە بۆ دروست کردنی پەیوەندی لە گەڵ حیزبە شیوعییەکانی دنیا، بە تایبەتی حیزبی شیوعی سۆڤیێتی و، چینی کرێکارانی وڵاتانی سەرمایەداری و، خەباتی رزگاریخوازی گەلانی دنیای سێیەم. لەم بارەیەوە زۆر ئەدوایێن. باسی هەوڵە سەرنەکەوتووەکانی خۆمان و، گۆڕانی دنیامان ئەکرد.

سەید عومەر ئەو ماوەیەی لە زیندان بوو، دەنگوباسی جوڵانەوەکانی ئەفەریقای بە وردی چاودێری کرد بوو. ناوی زۆر لە سەرکردە و رێکخراوەکانی لە بەر بوو. زۆرجار بەخێلیم پێ ئەبرد و، هەندێ جار لە قسەکانی من تووڕە ئەبوو، بە تایبەتی کە بە گاڵتەوە باسی «٣ جۆگاکە»م لێ ئەپرسی. لە سەر دامەزراندنی «علاقاتی اممی» زۆریان پێ داگرت. بۆ ئەو مەبەستە خۆیان هەندێ لە سەرانی حشع یان بینی و، منیش بۆ ئەو مەبەستە سەردانم کردن و، دواتر لە حوزەیرانی ٨٠ دا نامەیەکی رەسمییمان بۆ پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیێتی نووسی و، بە رێگای حشع دا بۆمان ناردن. بەڵام نە لە حیزبی شیوعی سۆڤیێتی و نە لە هی عیراقی هەرگیز وەڵامان وەرنەگرتەوە.

هەندێ لە برادەرانی دەرەوە جێگایەکیان داوای بوو «زەمالەی سۆڤیێتی» یان بە پارە لێ ئەکرێ. سەید عومەر و هاوڕێکانی هیوایەکی ئەوتۆیان بە «علاقاتی اممی» نەما.

**

کتێبەکەی سەید عەزیز

سەید عەزیزی شەمزینی نەوەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری یەکێ بوو لەوانەی لە یەکێتی سۆڤیێت خوێند بوی. ئەگەرچی لە (کلیەی عسکری) عیراق دەرچوو بوو، بەڵام بنەماڵەکەیان لە تەهران دائەنیشتن. لە ئاکۆکییەکانی ١٩٦٤ دا سەید عەزیز ئەندامی م س بوو. مەلا مستەفا ماوەیەک دەسبەسەر داینا و، دوایی تەسلیمی ئێرانی کرد. ئێران وازیان لێ هێنا لە گوندی شەیخان لە نزیک شنۆ دائەنیشت. سەید عەزیز دۆستی مامجەلال بوو. زۆر جار نامەی بۆ ئەنارد. یەکەمین جەنەرەیتەری کارەبا کە رادیۆکەمانی پێ خرایە کار ئەم بۆی کڕین و بە دیاری بۆی ناردبێن.

سەید عەزیز لە یەکێتی سۆڤیێت دکتۆرای تەواو کرد بوو، نامەی دکتۆراکەی لە سەر جوڵانەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد نووسی بوو. کتێبەکەی کردە عەرەبی و بەشی زۆری لە سەرەتای شەستەکان دا بە زنجیرە لە خەبات دا بڵاو کردەوە. کتێبەکەی بە پێ ی پرۆگرامی مارکسی نووسرا بوو. پڕ بوو لە زانیاری تازە دەربارەی رێکخراوە کوردییەکان و شۆرشەکانی کورد و لێکۆڵینەوەی باش و بەنرخی تی دا بوو دەربارەی مێژووی نوێ ی کورد. لە یەکێ لەو سەفەرانەدا کە بۆ لەندەنی کرد بوو نەسلی رووسی کتێبەکە و مسودەکانی بە

عەرەبی هێنا بۆ دابوو بە شازاد لە بەیروت یا لە هەر جێگایەکی تر چاپی بکا. کتێبەکە لە بەیروت مابوەوە و چاپ نەکرا. لە یەکێ لەو سەفەرانەدا کە بۆ بەیروتم کرد. کۆپییەکی کتێبەکەم لە گەڵ خۆم هێنایەوە کوردستان. دەزگای ڕاگەیاندن بە عەرەبی چاپی کرد و، فەرید ئەسەسەرد کردی بە کوردی و، بە کوردیش چاپ کرا.

بۆ شارەزایی مێژووی کورد ئەندامانی کۆمەڵە ئەبوو ئەم کتێبەی د. عەزیز شەمزینی و «کورد و کوردستان»ەکەی د. ئەوڕەحمانی قاسملو و، هەندێ لە کتێبەکانی د. کەمال مەزهەر بە تایبەتی «کوردستان لە ساڵانی شەڕی یەکەم» دا بخوێننەوە.

*

## دامەزراندنی ڕادیۆ

دەزگایەکی ڕادیۆمان هەبوو لە برادۆستەوە لە گەڵ خۆمان بۆ نۆکان و لەوێوە بۆ قەندیل و لە قەندیلەوە هێنا بۆمانەوە ناوزەنگ. باری ئیستریک بو. لە گەڵ خۆمان ئەمان گێرا بێ ئەوەی بتوانین بە گەڕی بخەین. بە کار خستنی پێویستی؛ بە جێگایەکی ئەمین هەبو، دەزگاکە و ئاریەل و ماتۆر و ستودیۆی تۆمارکردنی قسەی لێ دابنرێ. هەروەها پێویستی بە تەکنیکار هەبو بۆ کار پێ کردنی.

طەلعەت گلی، ئەندازیارێکی کەرکوکی و، ئەندامی یەکێتی لە کوێت کاری ئەکرد. کاتی خۆی ئەو دەزگای ڕادیۆکەی هەڵبژارد بو. لە کوێتەوە بە نهێنی هاتە ناوزەنگ. دوای گەڕان بە ناوچەکەدا شوێنێکی هەڵبژارد پێیان ئەوت «گردی کەوان» بۆ دانانی داوودەزگای ڕادیۆ. دارستان گردەکەی داپۆشی بو، کانیەکیشی لێ بو.

شێرکۆ حسێن کرا بە فەرماندەی کەرتی پاراستنی ڕادیۆ و، لە شوێنی دیاریکراو خانوی دروست کرد. هێمن سەراوی و مام عەلی یارمەتییان ئەدا. پارەگایەکی ڕێکوپێکیان دامەزراند. چەند ڕۆژێ بۆ تاقیکردنەوە کاری پێ کرا و، دەرکەوت باش کار ئەکا.

وەکو نیشانەی بایەخدان بە ئیستگای ڕادیۆ بەڕێوەبەر و کادری نوسین و تەکنیکی، بە جیا لە دەزگای ڕاگەیاندن، بۆ تەرخان کرا. فەرەیدون عەبدولقادر کرا بە لێپرسراوی و، ئەرسەلان بایز بە یاریدەدەری. وتاری کردنەوەی ڕادیۆ بە عەرەبی فەرەیدون نوسی و، خۆی خوێندیەوە. دوای ئەمە بە چەند ڕۆژێ فەرەیدون سەفەری کرد بۆ شام. ئیستگەکە درایە دەس ئەرسەلان سەرپەرشتی بکا.

تاقمی ڕادیۆ تا ئەمات فەرمالیغ ئەبو. زۆری ئەوانەی خۆیان بە نوسەر و شاعیر و ئەدیب ئەزانی، کە ئەهاتنە ریزی پێشمەرگایەتی، لە دەزگای ڕادیۆ کۆ ئەبونەوە.

لەو کاتەدا فاضیل ئەندامی م س یەکێتی و، لێپرسراوی دەزگای ڕاگەیاندن بو. ئەمەی بە کەمکردنەوەی دەسەڵاتی خۆی دائەنا. بەڵام پێشتر جارێک ڕادیۆکە لە سەرەتای نیسانی ٧٩ دا خرا بوە کار، دوای چەند حەفتەیەک لە بەڕێوەبردنی دا سەرکەوتو نەبو بو لە بەر ئەوە دای خست بو. جگە لەوەش فەرەیدون و ئەرسەلان کەسیان ئامادە نەبون لە بەردەستی فاضیل دا کار بکەن، خۆیان لەو بەزلتر و شایستەتر دائەنا.

*

## نەخۆشخانە

تەنیا پزیشکی لە ناو هێزەکەمان دا بو، د.خدر مەعصوم بو. ئەویش چوبو بۆ خۆشناوەتی خەریکی کاروباری سیاسی بو. هاوینی ٧٨ د. جەعفەری شەفیعی هات بۆ

قەندیل. خیوەتێکی کرد بە تیمارگا. نەخۆشی تێ دا ئەدی. لە پایزدا د. خدریش هاتەوە لای ئێمە و، کە چوینە ناوزەنگ چاوگە خانوبەکیان تەرخان کرد بۆ نەخۆشخانە. بەلام د. خدر زۆرتر کاری ڕێکخراوەیی ئەکرد وەک لە پزیشکی چونکە لێپرسراوی لقی یەکێتی بو. بەر لە ڕوخانی شا د. جەعفەر بۆ کاری سیاسی گەڕابەوە بۆ ئێران. هەر لەو ماوەیەدا د. بەختیار خالید هاتە ڕیزی پێشمەرگایەتیەوە. لە بەری قەرەداخ بو بە پێشمەرگە. بەختیار گەنجێکی تازە پێگەیشتو بو لە موسل دەرچو بو، ئەندامی کۆمەلە و، لە دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی خوێندکارانی کوردستان بو. زورتر لەوەی پزیشکی بکا ئەویش خەریکی پێشمەرگایەتی بو لە چونەوەیەک دا بۆ سلێمانی لە بەهاریی ۷۹/۱/۳۱ دا کەوتە بۆسەوە کوژرا.

ڕوخانی شا بۆ ئێمە بو بە خێر. نەخۆش و بریندارەکانمان ئەنارد بۆ ئێران. هەندێکیان لە لای پزیشکە کوردەکانی ئێران تداوی ئەکران و، هەندێکیان ئەچونە «بیمارستان» ە حکومەتیەکانی تەوریز و تاران.

چالاکی پێشمەرگە و، شەر لە گەل هێزەکانی حکومەت دا زۆر بویو. لە ئەنجامی ئەوەش دا بریندارمان زۆر بو ئەبو جێگایەکیان بۆ تەرخان بکری. د. شادمان مستی لە یۆگۆسلاڤیاوە هاتەوە. شادمان هەمو کاتی خۆی بۆ نەخۆشخانە تەرخان کرد. هاوینی ۸۰ لە تۆژەلە نەخۆشخانەیەکی هاوینەی لە خیوەتێکی گەورەدا دامەزراند. هەروەها ڕێوشوێنی دروستکردنی نەخۆشخانەیەکی گەورەمان لە تەختاییەکی قولی ئێوان شێنێ و زەلێ لە سەر کانیەکی خۆش و لە ناو رەز و باخ دا دانا. شوێنەکە ناوی «قولە هەرمێ» و نەخۆشخانەکە ناو نرا «نەخۆشخانەی شەهید د. بەختیار». زۆری پزیشک و زۆری کەوتنی نەخۆش و، دەرمانگا و، زۆری نەشتەرگەرکاریمان تێ دا دروست کرد. شادمان نەخۆشخانەکەی بەڕێوە ئەبرد. لە گەل هەلگیرسانی شەردا لە گەل ئێران هەندێ پزیشکی کە هاتنە دەرەوە. هەندێکیان ماوەیەکی کورت ئەمانەوە، ئەڕۆیشتن بۆ ئێران و، لەوێوە ئەچون بۆ ئەورووپا.

نەخۆشخانەکە دوای ئەوەی ڕێگەی ئێرانمان لێ بەسترا بو بە ناوەندێکی گرنگی تەداوی زاماری پێشمەرگە بەردەوام ۱۰ برینداری تێ دا بو.

*

ناوچەکە زۆر قەرەبالغ بویو. بە سەدان کادر و پێشمەرگە و خوێندەوار لە تۆژەلە و ناوزەنگ و تۆکان .. کۆبوبونەوە. د. شادمان هەندێ جار قسەی خۆشی ئەکرد. وتی: «هەمو ئەو تەنگوچەلەمانەی لە پایتەختی ولاتە پیشەسازییە پێشکەوتوەکان دا هەیە لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەلەمەی بێکاری هەیە، لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەلەمەی خانو هەیە، لێرەش هەیە. لەوێ تەنگوچەلەمەی گرانی و ئاوسانی دراو هەیە، لێرەش هەیە...»

ڕاستی ئەکرد هەموی هەبو، بەلام هی ئێمە لە جۆرێکی تر بون.

*

بووردومان

پێش نیوەڕوی ۹ ی تەموزی ۸۰ لە تۆژەلە لە ژێر سێبەری دارگوێزێکی گەورەدا لە گەل عومەر شێخموس، جەمال ئاغا، سالار، عومەر دانیشت بوین کاروباری ڕۆژانەمان ئەنجام ئەدا لە پڕ پۆلێ فڕوکەی عێراقی پەیدا بون چەند بۆمبایەکی گەورەیان بەردایەوە. ناوچەکە

پڕ بو لە دوکەڵی ڕەش و تەپوتۆز و بۆگەنی باروت. بە دوای ئەوەیش دا چەند فڕۆکەیەک کەوتنە پەلامار تەقەیان لە خیوەت و بن بەرد و نوای بن شاخەکە ئەکرد.

لە دامێنی ئاوزەنگ دا بازاڕێکی گەورەی لێ بو کەلوپەلی عێراق و ئێرانی تێ دا ئەفرۆشرا بە زۆری لە کەپردا بون، ئاگر درا بو سوتا. بە سەدان مافور و ڕادیو و تەلەفزیون سوتا. بایی چەندین ملیون دینار زەرەر لە دوکاندارەکان کەوت.

دەزگای ڕاگەیاندنی یەکێتی لە دامێنی توژەڵە دا بو بە تەواوی خاپور بو، هەمو دەزگاکانیان شکا و سوتا و، یەکێ لە کادرەکانیان: بورهانی شێخ مستەفای قەرەداخی، کوژرا و، چەند کەسێکیان بریندار بو.

لە سەرچاوەی توژەڵەیش کە بنکەکانی ئێمەی لێ بو، کادرێکی سکرتاریەتی مامجەلال: محەمەد ئەبوبەکر، کوژرا و چەند کەسی بریندار بون، لەوانە: سەید مەجید ئەندامی م ع و، میران فوئاد مستی ئەندامی دەزگای دارایی و، پێشڕەو سەید ئیبراهیم لە سکرتاریەت، حەمە سەعید و هاوڕێ جەبار لە بنکەکەی من.

پێشمەرگەکانی دەزگای ڕاگەیاندن هاواریان لێ هەستا بو داوای یارمەتییان ئەکرد. هەر کە هێرشەکە کەمێ خاو بوەوە چوین بۆ بارەگای ڕاگەیاندن. ساغەکان چوبونە شاخ و، کوژراو و هەندێ لە بریندارەکان لەو ناوەدا بون. تێکڕا ۹ کەس بریندار بو بۆ تەداوی هەموومان ڕەوانەی سەردەشت کردن.

چەند مەفرەزەیەک بنکەیان لە توژەڵە بو بۆ پاراستنی مامجەلال سەر بە سکرتاریەت بون. فەرماندەکانیان: بەکر پیرۆت، مەلا وسوی خەندەکە، شێخەکۆل، بو. بۆ ئێوارە تەرمی هەردو پێشمەرگەی یەکێتی: بورهان و محەمەدمان لە سەرچاوەی توژەڵە بە خاک سپارد، مەلا وسوم بانگ کرد تەلقینیان دا بدا. مەلا وسو وتی: «تەلقین نازانم». وتم: «تۆ چۆن مەلایەکی تەلقین نازانی!» وتی: «بە منالی وەهایان ناو ناوم ئەگینا من مەلا نیما». هەشت بارەگاکانیان لە توژەڵە بو، بەلام بە ڕێکەوت زەرەر لەوان نەکەوت بو. ئەوانیش لە شاردنەوەیان دا بەشدار بون.

ئەو ڕۆژەی ئەم ڕوداوەی تێ دا قەوما ڕیپۆرتەرێکی تەلەفزیونی فەرەنسی لە ناوچەکە بو. بەر لە بۆردومانەکە وێنەی بازار و بنکەکان و ئاوایییەکانی زەڵی، شینێ، سونێ و، کاتی بۆردومانەکەش وێنەی فڕۆکەکان و، دوای بۆردومانەکەش وێنەی بازاڕی سوتاو و ئاوایی وێرانی گرت بو. بەرنامەیەکی ڕێکوپێکی لێ دروست کرد بو بۆ تەلەفزیون و، لە پاریس پیشانیان دابو. کەندال، کە دوایی بو بە سەرۆکی ئینستیتوتی کورد لە پاریس، لەو کاتەدا بە پێی ڕاسپاردەی د. قاسملو، نوێنەرایەتی حدکای لە فەرەنسا ئەکرد. نامەیەکی درێژی بۆ تەلەفزیونی فەرەنسی نوسی بو، ڕاپۆرتەکەی کابرای بە درۆ خستبوەوە و، نوسی بوی کە ئەو ڕوداوە هەموی لە کوردستانی ئێران دا بوەوە و، پەیامنێرەکەی ئەوان بە درۆ باسی کوردستانی عێراق ئەکا.

سەیرەکە لەوەدا بو: کەندال خۆی کوردی تورکیا بو، نوێنەرایەتی کوردی ئێرانی ئەکرد و، دژی کوردی عێراق کاری ئەکرد!

*

پاش چەند ڕۆژێ کەسوکاری محەمەد لە کۆیەوە و، کەسوکاری بورهان لە سلێمانییەوە هاتن بۆ گواستنەوەی تەرمەکان. لەیلی شێخ ئەنوەری قەرەداخی هات بو بۆ

بردنەوەی بورهان. فەحمی ناسیاوی گەرەک و سەردەمی خوێندنم بو، ئەویش وەکو من زانستی سیاسی لە زانکۆی بەغداد خوێند بو. ئەندامی کۆمەڵە و تێکۆشەرێکی ناوشار بو. زۆر لە مێژ بو نەمبینی بو. دوای ئەم سەفەرەی بە ماوەیەک بەعس گرتی و، تا ئێستاش بێ سەر و شوێنە.

*

## زیندان

سەردەمێک جێگەیەکی ئەمینمان نەبو گیراوی تێ دا گل بدەینەوە، لە بەر ئەوە ئەوانەی ئەگیران، ئەوەی تاوانی جاسوسیی لە سەر ساغ بوایەتەوە ئەکوژرا و، دیلەکان، وەکو دوایی لە بڵاوکراوەکان دا بۆ بو بە باو دوای ئەوەی دەربازی شۆڕشیان بۆ ڕون ئەکرایەوە! » بەر ئەدران.

لە گەڵ زیاد بونی چالاکییەکانی پێشمەرگەدا، تا ئەهات ژمارەی گیراوەکان زۆر ئەبون. ئەبو شوێنێکیان بۆ تەرخان بکرێ و، تاقمێکیان لێ بکرێ بە مەسئول. ئەمانویست زیندان بکەین بە دەزگایەکی شارستانی و، جۆری ڕەفتاری ئێمە لە گەڵ هی بەعس جیاواز بێ. ئەو مافانەی ڕاگەیاندنی جیهانیی مافی مرۆڤ و، یاسا ناودەوڵەتییەکان بۆ گیراویان سەلماندوە، ئێمەش جێبەجێیان بکەین.

عەلی شامار، کادری کۆمەڵە، کە لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکانی سەرەتا بو، هەڵبژێردرا بە لێپرسراوی زیندان و، کەرتێکی پێشمەرگەی بۆ تەرخان کرا. عەلی لە دامێنی دۆڵەکەدا خانویەکی بۆ بارەگای پێشمەرگەکانی و، خانویەکیشی بۆ زیندان دروست کرد.

گیراوەکان دو جۆر بون: جۆرێکیان دیل وەکو، سەرباز، جەیشی شەعبی، بەعسی، جاش، ئەمن و ئیستیخبارات.. کە لە شەڕو بۆسەدا ئەگیران. ئەوانی تر لە سەر تاوانی ناسیاسی وەکو کوشتن، دزی.. گیرا بون.

لێدان و سوکایەتی پێ کردن بە توندی قەدەغە بو، هەر پێشمەرگەیەک کارێکی لەو بابەتەی بکردایە بە توندی سزا ئەدرا.

خواردنیان وەکو خواردنی هەمو بارەگاکانی پێشمەرگە بو.

لە ئەخۆشی و ناساخی دا، وەکو پێشمەرگە، لە ئەخۆشخانەی شۆڕش دا تیمار ئەکران.

کەسوکاریان بۆیان هەبو هەر کاتێکی پیانویستایە بە ئازادی سەردانیان بکەن، خواردن و کەلوپەلیان بۆ بهێنن یا بۆ بنێرن.

بۆیان هەبو داوا و سکالا و شکات بۆ دەزگا سەرکردەییەکانی یەکێتی بنوسن.

کەسانی شارەزا و قانونی لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ ئەکردن و، دادگایەک کە پێک هات بو لە ٣ کەس: دو ئەندامی م س و، یەکێکی حقوقی، حوکمی ئەدان و، مەکتەبی سیاسی لە کۆبونەوەی خۆی دا دوا بڕیاری لە سەر حوکمەکە ئەدا.

حکومەتی بەعس، هیچ کاتی ئامادە نەبو، گیراو هەر پلەو پایەیەکی لە بەعس یا لە جەیش یا لە دائیرەکانی دەوڵەت دا هەبوایە، بگۆڕێتەوە. لە بەر ئەوە زۆر لە گیراوەکان بە تایبەتی سەرباز، مانەوەیان کەڵکێکی ئەوتۆی نەبو، زو بەر ئەدران. هەزاران کەسی عەرەب، سەر بە داوودەزگای جیا جیا، گیراون و بە بێ هیچ بەرامبەرێک ئازاد کراون.

*

## دروستکردنی خانوی تازە

هاوڕێیانی زیندان، کە زۆربەیان هاوسەرەکانیان لە گەڵ خۆیان هێنا بو، هەروەها کاری سیاسی، ڕێکخراوەیی، ڕاگەیاندنیان پێ سپێردرا بو، ئەبو ئەوانیش جێگە بۆ خۆیان خۆش بکەن. لە شێنێ، قولە عەرەبی، زەڵی، ناوزەنگ، تۆژەڵە.. چەندین خانوی نوی یان بۆ دەزگاکانی پێشمەرگە، ڕاگەیاندن، دارایی، ناوەندی کۆمەڵە، ڕێکخستنی بزوتنەوە دروست کرد. ناوچەکە ئاوەدان بوەوە، نزیکەی ۱۰۷۰۰ کەسی لێ ئەژیا.

ناوەندی کومەڵە ڕیزە خانویەکی خۆشی دروست کرد. دەزگای ڕێکخستن و دەزگای ڕاگەیاندنی تێ دا بو، شوێنێک بۆ کتێبخانە تەرخان کرا بو، هۆڵێکیش بە ناوی «هۆڵی شەهید شەهاب» دروست کرا جێگەی کۆبونەوەی ۳۰۰ کەسی تێ دا ئەبوەوە.

بۆ هاوینەکەی، منیش لە سەرو هەمان خانوی کە زستانی ڕابوردو لێ ی بوم، بە چەند مەترێک لە پاڵ تاشە بەردێکی گەورەدا خانویەکی ٤ ژووریم دروست کرد. ئەگەرچی بەنایەکی خەڵکی داوداوامان هێنا بو دیوارەکانی بۆ دانەنایین، بەڵام کرێکارییەکەی خۆمان ئەمان کرد. خانوەکەی من خۆشتر بو لە زۆری خانوەکان، حەمام و شوێنی چێشت لێ نانی تێ دا بو. دوایێتر بەردەمەکەیم تەخت کرد و، حەوزێکی گەورەی جوانم تێ دا دروستکرد و، چوار دەورەکەیم کرد بە گوڵ و ڕەز و باخ.

بەختیاری برام و حەمە جەزایش چەند خانویەکیان لە نزیک خانوەکەی من بۆ ژیانی خۆیان دروست کرد.

جگە لە بارەگای داوودەزگاکانی یەکێتی، حشع، پاسۆک، مەفرەزەیەکی بەعسی سەر بە سوریا، هەندێ ڕێکخراوی عەرەبی – عێراقی و، ئێرانی لەو ناوەدا خانویان کرد.

لەم کارانەدا ئەوەی سەرنجی ڕاتەکێشا دۆزینەوەی هەندێ کەرەستەی کۆن بو، کە دەریان ئەخست ئەم ناوچەیە لە کۆنەوە ئاوەدان بوە لە ناو دۆزراوەکان دا:

– لە زێنی سور لە کاتی هەڵکەندنی بناغەی خانوەکان دا چەند گۆڕێکیان دۆزیەوە. گۆڕەکان هی موسوڵمان نەبون، چونکە ڕوەو قیبلە نەنێژرا بون و، ملوانکە و متومورو یان لە گەڵ خرا بوە چاڵ. ئێسکەکانیان تێکەڵاوی گڵ ببو پوا بو.

– لە ناوزەنگ لە شوێنی هۆڵی شەهاب، دا دو گۆزەی گەورە و ساغ و، لە تۆژەڵەیش لەو شوێنەی کە ناوی: «گردی کوپان» بو ئیستگەی ڕادیوی لێ بو، لە نێوان تۆژەڵە و ناوزەنگ دا، چەندین گۆزە و، چەند دراوێکی سەردەمی ئەسکەندەری گەورە دۆزرایەوە.

گۆزە بۆ چەند مەبەست بە کار هاتوە: یەکێکیان وەکو تابوت بۆ هەڵگرتنی ئێسک و پروسکی مردو. ئەوی تریان بۆ هەڵگرتن و شاردنەوەی دانەوێڵە و خواردەمەنی و، گەنجینە لە چاوی دوژمن.

زەردەشتیەکان کە یەکێکیان لێ مردوە، تەرمەکەیان بردوتە شوێنێکی بەرز دایان ناوە، تا قەل و داڵ گۆشتەکەی خواردوە و، تیشکی خۆر ئێسکەکانی خاوێن کردۆتەوە، ئەوسا ئێسقانەکانیان کۆ کردۆتەوە و خستویانەتە گۆزەیەکەوە، گۆزەکەیان لە ئەرزدا ناشتوە.

ئەبێ کوردستان چەندێ لەم شوێنەوارە دێرینە بە نرخانە تێ دا بوبێ، کە ڕابوردوی

ناوچەکە و کوردیان ڕوون ئەکردەوە، بەڵام بەمجۆرە فەوتا بێ.

*

## گرتنی بیگانە

شۆڕشی ئەیلول هەر لە سەرەتاوە لە دنیادا دەنگی دایەوە و، ڕۆژنامەوانی بەناوبانگی دنیا سەردانیان کرد و، وتار و لێدوان و کتێبیان لە سەر نوسی. شۆڕشی حوزەیران، لە بەر چەند هۆیەک، لەم ئیمتیازە گرنگە بێ بەش بو:

١. عیراق «تعتیم اعلامی» خستبوە سەر چالاکییەکانی شۆڕش. بە هیچ جۆری لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی خۆی دا: ڕۆژنامە، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن.. باسی نەئەکرد و، نەیئەهێشت دەنگی بۆ دنیا دەرچێ.

٢. پەیوەندی عیراق لە گەڵ دەوڵەتانی دەرەوە باش و، داهاتی نەوت گەشانەوەیەکی زۆری دابو بە پەیوەندی ئابوری و بازرگانی عیراق و دەوڵەتانی تر و، زۆر لەم دەوڵەتانە لە ناو خۆیان دا پێشبڕکێیان بو کامیان باشترین سەودای بازرگانی لە گەڵ عیراق بە دەس بهێنێ. لە بەر ئەوە گیروگرفتی ناوخۆی عیراقیان پشت گوێ ئەخست، بە تایبەتی کە عیراق لە گەڵ ئێران کەوتە شەڕەوە.

٣. شێوەی چەوتی ڕاگەیاندنی یەکێتی.

یەکێ لەو تاکتیکە تازانەی لەم شۆڕشەدا داهێنرا، بۆ ئەوەی لە ئابلوقەی ئیعلامی دەرچێ و دەنگی بە دنیا بگات، گرتنی کارکەرانی بیگانە بو. گرتنی ئەمانە لە لایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنی ئەو وڵاتانەوە باس ئەکرا و، لە دنیادا دەنگی ئەدایەوە و، بەم ڕێگایە سەرنجیان ڕائەکێشرا بۆ هەبونی جوڵانەوەیەکی سیاسی - چەکدار دژی بەعس لە کوردستانی عیراق دا.

سەرەتا چەند کارکەرێکی فەرەنسی گیرا لە ئەندیل کاریان ئەکرد. بە دوای ئەوان دا پۆلۆنی و، ئەلمانی و، یۆگۆسلاڤی و ڕوس..

ئەم کارە لە لایەن دەوڵەتانی ئەوروپییەوە بە کاری تیرۆریستی دائەنرا و، ئەنجامەکەی:

- عیراق گوێ ی نەئەدایە و، خۆی نە ئەکرد بە خاوەنی. بە هیچ جۆری ئامادە نەبو گفتوگۆی لە سەر بکا بۆ گۆڕینەوەیان بە گیراو و دیلەکانی ئێمە و، بە هیچ جۆری ئامادە نەبو پارە بدا بۆ بەردانیان.

- دەوڵەتەکانی خۆیشیان دو جۆر بون: ئەوانەی ئەوروپای ڕۆژهەڵات، یەکێتی سۆڤیەت، پۆلۆنیا، یۆگۆسلاڤیا.. هاوڵاتییەکانی خۆیان فەرامۆش ئەکرد و، لە سەریان هەڵنەئەدان و بە تەنگیانەوە نەئەهاتن. دوەمیان، وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا، ئەمەیان بە کارێکی تیرۆریستی دائەنا، بەڵام ئەکەوتنە گفتوگۆی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ بۆ پاراستنی ژیان و بەردانیان.

ئەم کارە بۆ ئێمە لە چەند سەرەوە سودی هەبو:

١. ڕۆژنامەکانی ئەو وڵاتانە باسی گیراوەکانیان ئەکرد و، هەواڵی هەبونی جوڵانەوەی کوردیان ڕائەگەیاند.

٢. لە هەندێ وڵات ئەبو بە هۆی دامەزراندنی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ نوێنەرانی

یەکیتی. د. کەمال فوئاد چەند ساڵ لە ئەڵمانیا نەیتوانی بو پەیوەندییان لە گەڵ دابمەزرینی، بەم هۆیەوە پیوەندییان لە گەڵ دامەزراند.
٣. لە هەندێ وڵات ئەبو بە هۆی هەندێ دەسکەوتی ماددی: ناردنی دەرمان، تەداوی بریندار، دانی پارە..
ئەم کارە هەندێ لە هەڤاڵانی ئەورووپای سەغلەت کرد بو، وایان ئەزانی جیگەیان پێ لیژ ئەکا. لە باتی ئەوەی هەوڵ بدەن بە چاکترین شیوە کەلکی لی وەربگرن، گرشاریان بۆ سەرکردایەتی یەکیتی ئەهینا واز لەم تاکتیکە بهینێ، تەنانەت گەیشتە رادەی هەرەشەی وازهینان لە یەکیتی. بەلام ئەم تاکتیکە بو بو بە باو. هیزەکانی تریش پەنایان ئەبردە بەری لەوانە: حسک و پارتی. ئەگەر ئیمەش وازمان لی بهینایە ئەوان دریژەیان پێ ئەدا.

*

هاوینی ۹۸۰ لە بەری قەرەداخ ۹ کەسی سۆڤیتی لە کاتی راوەماسی دا گیران. هەریمی ٥ ی قەرەداخ ویستیان بە پەلە بیانپەریننەوە بەری شارباژیر بۆ ئەوەی بیانگەیننە بارەگاکانی سەرکردایەتی. جەیشی عیراق یەکی لە گەورەترین لەشکرکیشییەکانی کرد بۆ سەریان و، هەمو ئەو ریگایانەی ئەوان گومانیان لی ئەکرد بە هالیکۆپتەر لی ی دابەزین و، گرتیان. لە شوینیک دا پیشمەرگەکانیان دۆزییەوە. بو بە شەریکی قورس. ٦ کەس لە پیشمەرگەکان کوژران لەوانە: گۆران، کە یەکی لە باشترین فەرماندەی کەرتەکانی هەریمی ٥ بو و، ١٧ پیشمەرگە و دوان لە سۆڤیتیەکانیش بریندار بون.
مستەفا چاورەش، فەرماندەی هەریمەکە، بۆ ئەوەی هیرشەکەیان لە کۆڵ بیتەوە سۆڤیتیەکانی بەردا بو.
یەکی لە بریندارەکان شاهۆ (حەمەی تەلە) بو. شاهۆ شاخەوانیکی کەم هاوتا و، شەشالوژەنیکی شارەزا بو. لەم شەرەدا گوللەیەک لە سەری و گوللەیەک لە دەستی دابو. برینەکەی سەری لە زمان و، گوللەکەی دەستیشی پەنجەکانی لە کار خست بو، تا ماوەیەکی زۆر قسەی بۆ نەئەکرا و، تا کوژراش زمانی بە تەواوی بەر نەبو. چەند پەنجەیەکی دەستیشی سەقەت بوبو. لە گەرمەی شەر و هیرشی هالیکۆپتەردا بە برینداری لە بن دەوەنیک دا ئەبی، خوینی لەشی چۆراوگەی بەست بو. لەو کاتەدا ماریک لە نزیکی پەیدا ئەبی، دەس ئەکا بە لستنەوەی خوینەکەی. شاهۆ هۆشی لە لای خۆی ئەبی بەلام نە زمانی ئەبی هاوار لە هاوریکانی بکا و، نە دەستی بەرد ئەگری لە مارەکەی بگری. مارەکە تا تیر بوبو چۆراوگەی خوینەکەی لست بوەوە و، دوای ئەوە بی ئەوەی پیوەی بدا رۆیشت بو. بیگومان هەلویستیکی دژوار بوە دیمەنەکەی هەرگیز لە بیر شاهۆ نەئەچوەوە.

*

«گروهی حەوت نەفەر»
چوار مانگ دوای گرتنی چوارەمین کونگرەی حدکا، ٧ ئەندامی کومیتەی ناوەندی بەیانیکی دریژیان بلاوکردەوە، جیابونەوەی خۆیان لە حیزب راگەیاند، بە بیانوی جیاوازی هەلویستیان لە حکومەتی ئیسلامی تیران و، هاوکاری سەرکردایەتی حدکا لە گەڵ رژیمی بەعس. ناویان لە خۆیان نا بو: «پیرەوانی کونگرەی چوارەم».
لە ناو پیرەوانی کونگرەی چوارەم دا چەند کەسیکیان تی دابو تازە هات بونە ریزی حدکاوە، بەلام ٣ کەسیان لە ناودارە کونەکان بون: غەنی بلوریان، کە زیاتر لە ٢٠ ساڵ لە

سەر حدکا لە زیندانی شادا بو. رەحیمی قازی، کە لە سەردەمی جمهوریەتی مەهابادەوە چو بو بۆ سۆڤیت و تا رووخانی شا لەوێ مابوەوە. هیمن، کە ١٠ ساڵ زیاتر بو لە عیراق بو، دوای رووخانی شا ئەویش گەڕابوەوە.

حیزبی توودە لە ئێران دا لاواز بو، لە کوردستان دا سەرەڕای لاوازی بەدناویش بو. بەلام نفوزی حیزبی توودە لە ناو حدکا دا کۆن بو، ئەگەڕایەوە بۆ ئەو جۆرە پەیوەندییەی لە پەنجاکان دا لە نێوان هەردو حیزب دا دروست کرا بو. دوای سەرکەوتنی شۆڕش، ئەگەرچی ڕێکخراوی تایبەتی خۆی دامەزراند بو، پاشکۆی حەفتەنامەی «مەردوم»ی لە تاران بە کوردی بلاو ئەکردەوە، بەلام هەندێ لە توودەییەکان خۆیان خزاند بوە ناو ریزەکانی حدکاوە.

لەو کاتەوە د. قاسملو بو بو بە سکرتێری حدکا، حدکای بەرەو سەربەخۆیی لە توودە هێنا بو، لە بەر ئەوە لە گەڵی کۆک نەبون، دوای سەرکەوتنی شۆڕش، کە حدکا نەچوە ژێر باری سیاسەتی حیزبی توودەوە، ناکۆکییەکەیان قوڵتر بو، بە تایبەتی توودە پشتیوانی بێ چەندوچونی ڕژێمی ئیسلامی ئەکرد، بە بیانوی ئەوەی دژی ئیمپریالیزمی ئەمریکایە و، حدکا لە کێشە و شەڕدا بو لە گەڵ ئەم ڕژێمە چونکە مافەکانی کوردی نەئەسەلماند.

پەروانی کونگرەی چوارەم، بەم جیابونەوەیە لایان وا بو:

– زۆرایەتی ئەندامانی حیزب و دانیشتوانی کوردستان، کە لە شەڕ بێزارن و، ڕێزی تایبەتی دائەنێن بۆ رابوردوی سیاسی ئەم تێکۆشەرانە، لە دەوری ئەمان کۆ ئەبنەوە و، ئەمان ئەبن بە «حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران».

– یەکێتی سۆڤیەتی و، وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و، حیزبە کومونیستیەکانی جیهان پشتیوانی لەوان ئەکەن.

– ڕژێمی ئێران لە گەڵ ئەوان ڕێک دێ، ئەگەر خودموختاریشیان نەداتێ، بە ئاشتی کێشەی کورد چارەسەر ئەکا.

سەرکردایەتی حدکا زور زو چوەوە بە گژ ئەم تاقمەدا و، بە جاش و خائین ناوی بردن. لە بۆچونەکانیان دا و، لە زۆر – هەلسەنگاندنی خۆیان دا بە هەلە چوبون. جەماوەری حدکا بە زۆری لە دەوری سەرکردایەتی قاسملو مانەوە. ئومێدەکانی هەیشیان بو بە سۆڤیت و ڕژێمی ئێران نەهاتە دی. هاوکارییان لە گەڵ حیزبی توودە و، کاربەدەستانی ئێران هیچ دەسکەوتێکی سیاسی یا سەربەرزییەکی بۆ خۆیان دابین نەکرد. بە لاوازی مانەوە و، سەرەنجام پەرەوازە بون: هەندێکیان لە شەڕی حدکا دا کوژران (رەحمانی کەریمی). هەندێکیان چونە ئەورووپا (رەحیمی قازی و غەنی بلوریان)، هەندێکیشیان لە شارەکان دا جێگیر بون (هیمن و ئەوانی کە).

هیمن، شاعیر و ئەدیب بو زیاتر لەوەی سیاسی بێ، خاوەنی سرودی نەتەوەیی: «گەرچی تووشی ڕەنجەڕویی و حەسرەت و دەردم ئەمن..» و، خاوەنی: تاریک و روون، توحفەی موزەفەریە، نالەی جودایی و پاشەرۆک بو. سەخایە بو خۆی لە کاروباری حیزبایەتیەوە بگلێنێ.

*

## جەنگی عیراق – ئێران

ناکۆکی عیراق لە گەڵ ئێران پێشینەیەکی مێژوویی هەیە بە تایبەتی لە سەر دیاری کردنی سنور و، پیرۆزگاکانی شیعە. ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عوسمانی و صەفەوی. ئەو

ئاکۆکییانە بە میرات بۆ دەوڵەتی عێراق مابوونەوە. لە سەردەمی پاشایەتی دا هەردوو دەوڵەت جۆرێ لە پەیوەندی دۆستانەیان دامەزراند بوو، هەردووکیان ئەندام بوون لە پەیمانی بەغدادا. رژێمی جمهوری ئاکۆکییە کۆنەکانی هەموو زیندوو کردەوە. ئەوڕەحمان عارف هەوڵی دا ئیرانی عێراق لە گەڵ ئێران باش بکا، بەڵام ئینقیلابی بەعس لە ١٩٦٨ دا، نەیهێشت ئەم هەوڵە سەربگرێ.

ئێران رێککەوتنی ساڵی ١٩٣٧ ی دەربارەی شەطولعەرەب یەکلایەنە هەڵوەشاندەوە. ئەحمەد حەسەن بەکر پەم بۆنەیەوە لە ساحە التحریر لە بەغدا وتارێکی ئاگرینی دا، وتی: «وسوف لن أکون عربیا ولا مسلما اذا نسیت هذا الموقف الذلل...» عێراقی بەعسی لەو کاتەدا توانای روبەڕووبوونەوەی چەکداریی ئێرانی نەبوو. ئێران یارمەتی شۆڕشی کورد و دوژمنەکانی بەعسی ئەدا و، بەعسیش یاوەشیان بۆ موعارەضەی ئێرانی کرد بوەوە تا رێککەوتنەکەی صەددام - شا لە جەزائیر. ئەو کاتەی رێککەوتنی جەزائیر ئیمزا کرا، هەمان ئەو بەکرەی سوێندەکەی خوارد بوو سەرکۆماری عێراق بوو.

صەددام لە رێککەوتنی جەزائیردا (تنازل) یکی زۆر گەورەی کرد بۆ شا، نیوەی شەطولعەرەب و، چەند جێگای تری سنووری وشکایی لە کوردستان دایەیە، بەرامبەر دەسهەڵگرتنی شا لە کورد. ئەم (تنازل) ەی صەددام بۆ شا لە ناو کۆڕە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب دا بە خراپ دەنگی دایەوە. صەددام ئەگەرچی بە سەرکەوتنێکی مێژوویی گەورەی دائەنا و، بیانووی بۆ دائەتاشی، بەڵام لێ ی بوو بە گرێ یەکی رەوانی.

دوای رووخانی شا و سەرکەوتنی ئینقیلابی ئیسلامی، ترسی صەددام لە ئێران زۆر زیادی کرد. ئەترسا شەپۆلی ئیسلام دەسەڵاتی ئەویش راماڵێ. وەکو لە کۆڕە تایبەتییەکانی خۆی دا وت بووی: «پێش ئەوەی شەر بکەوێتە ناو ماڵی خۆتەوە، شەڕەکە بخەرە ناو ماڵی دوژمنەکەتەوە.» ئیتر خۆی بۆ پەلاماردانی ئێران ئامادە کرد. بە تایبەتی لەو کاتەدا رژێمی ئیسلامی هێشتا جێگیر نەبوو. ئەرتەشی ئێران بە هۆی پاککردنەوەی ریزەکانی لە ئەفسەرانی سەلطەنەت تەلەب دارزا بوو. سپای پاسداران هێزێکی بچووک و، بۆ ئاسایشی ناوخۆ تەرخان کرا بوو. کێشەی نەتەوایەتی لە کوردستان، عەرەبستان، ئازەربایجان، بلوچستان، تورکمان سەحرا تەقی بوەوە. باری ئابووری بە هۆی پشێوی ناوخۆیەوە باش نەبوو. ئێرانی تازە وەکو دەوڵەتێکی توندڕەو لە دنیا دابڕا بوو.

صەددام ئەمەی بە هەل زانی بۆ ئەوەی تۆڵە لە ئێران بکاتەوە و، رژێمەکەی بڕووخێنێ و وڵاتەکەیان پارچە پارچە بکا.

رۆژی ١٧ ئەیلولی ٨٠. «ئەنجومەنی نیشتمانی» بانگ کرد بۆ کۆبوونەوەیەکی نائاسایی. صەددام لە بەردەمی ئەم کۆبوونەوەیەدا وتارێکی دا لەوتارەکەی دا وتی:

«ولقد کانت اتفاقیة اذار ١٩٧٥ فی حینها قرارا شجاعا، وحکیما، قرارا وطنیا، وقومیا.

ولقد کانت اتفاقیة اذار بنت ظروفها، وقد فهمها شعبنا، واعتبرها فی اطار تلك الظروف انتصارا عظیما، واستقبلها بفرح عظیم.

ولما کان حکام ایران قد أخلوا بهذه الاتفاقیة منذ بدایة عهدهم بتدخلهم السافر والمقصود فی شؤون العراق الداخلیة، واسنادهم، کما فعل الشاه من قبل، وامدادهم لرؤوس التمرد المدعوم من امریکا والصهیونیة، ولامتناعهم عن اعادة الاراضی العراقیة التی اضطرننا

الى تحريرها بالقوة، فانني اعلن امامكم، اننا نعتبر اتفاقية ٦ آذار لعام ١٩٧٥ ملغاة، وقد اتخذ مجلس قيادة الثورة قراره بذلك..»

سەددام نە لە ئیمزاکردنی ڕێککەوتنی جەزائیر و بەخشینی شەطولعەرەب دا پرسی بە گەلی عیراق کرد بوو، نە لە هەڵوەشاندنەوەی دا.

ڕۆژی ٢٢ ئەیلول ١٩٢ فڕۆکەی جەنگی کەوتنە فڕین بۆ بۆردومانی ئێران.

ڕۆژی ٢٣ ی ئەیلول هێزی زەمینی عیراق لە ٣ لاوە پەلاماری ئێرانی دا:

لای سەروو بۆ ڕاگرتنی هێزەکانی ئێران لە شوێنەکانی خۆیان دا.

لای ناوەڕاست بۆ گرتنی هەندێ شار و شوێنی ئێران تا نەتوانن لەو قوڵەوە هێرش بۆ بەعقوبە - بەغداد بکەن.

لای خواروو بۆ داگیرکردنی کانگاکانی نەوتی ئێران. ئەمەیان هێرشی سەرەکی بوو.

سەددام ئەم جەنگەی ناو نا: «قادسیەی سەددام». لە مەش مەبەستی ژیاندنەوەی دوژمنایەتی کۆنی نێوان عەرەب و ئێران بوو. لە قادسیەی یەکەم دا لەشکری عەرەب، لەشکری ئێرانی شکاند و، دەولەتی ساسانیی ڕوخاند و، گەلانی ئێران موسوڵمان بوون. ئەم شەڕەی بەو شەڕە ئەشوبهاند.

لە سەرەتادا جەیشی عیراق هەندێ پێشڕەوی کرد و، هەندێ جێگای گرت. بەڵام نەیتوانی ئامانجەکانی بەدی بهێنێ. سەددام بە هیوا بوو ئاگربڕێکی وەکو ئاگربڕەکەی جەنگی شەش ڕۆژەی عەرەب - ئیسرائیلی ١٩٦٧ دوبارە ببێتەوە. کە ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی دا، سەددام چونکە خۆی بە سەرکەوتو ئەزانی یەکسەر قەبوڵی کرد، بەڵام ئێران بڕیارەکەی قەبوڵ نەکرد و درێژەی دا بە جەنگ.

: پیلانەکانی سەددام هەمووی بەتاڵ دەرچوو: ڕژێمی ئێرانی نەڕوخا و ئێران پارچە پارچە نەبوو. شەڕەکەش بە چەند هێرشێکی ئاسمانی و، بە چەند هێرشێکی زەمینیی و، بە شەش ڕۆژ کۆتایی نەهات.

لە کاتی گفتوگۆکانی ١٩٩١ دا کە بردێنیان بۆ دیدەنی سەددام، گوناحی درێژەکێشانی شەڕەکەی خستە ملی ئێمە. لە قسەکانی دا وتی: «کە شەڕ هەڵگیرسا لە گەڵ ئێران ٣ فەیلەقمان هەبوو. زیاتر لە یەک فەیلەق بە ئێوەوە خەریک بوو. لە بەر ئەوە نەمتوانی هەموو جەیشی عیراق بخەمە شەڕەوە دژی ئێران. ئەگەر ئێوەم لە گەڵ بوایە لە باتی ٨ ساڵ بە ٨ ڕۆژ شەڕەکەم بە لادا ئەخست..»

دوا بە دوای هەڵگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران لە زنجیرەیەک کۆبونەوەدا بەرنامەی کاری داهاتومان بەمجۆرە دیاری کرد:

١. هەوڵدان بۆ خۆ بواردن لە شەڕی لایەلا و خۆلادان لە هەر ئاکۆکیەکی لاوەکی سیاسی یا چەکدار، وە هەوڵدان بۆ خاوکردنەوەی گرێ ئاڵۆزەکانی باری ناوخۆی کوردستان لە کۆڕی بە گژاچونی ڕژێم دا.

٢. بەرزکردنەوەی ڕادەی چالاکی پێشمەرگە و دەس وەشاندنی، وە بە کار هێنانی هەندێ شێوەی نوێ لە شەڕکردن دا، بە تایبەتی تەرکیزکردنە سەر نوقتە و شوێنەکانی دوژمن لە شار و ئۆردوگاکان دا، وە هەوڵدان بۆ ئازادکردنی هەندێ ناوچە.

٣. پەرەپێدانی چالاکی سیاسی بۆ ڕاپەراندنی جەماوەر و بەگەڕ خستنی کۆمەڵانی

خەڵک دژی ڕژێم، بە مانگرتن و خۆپیشاندان و شێوەکانی تری خەباتی جەماوەری..
هەرێمەکانی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی یەکێتی لە پارێزگاکانی هەولێر، کەرکوک،
سلێمانی بە پێ ی ئەم پلانە و بە گیانی تەرخان کردنی هەمو هەوڵ و تەقەلایەک دژی هێزە
داگیرکەرەکانی ڕژێم و نۆکەرەکانیان کەوتنە چالاکی و جموجوڵ. لە سەرەتای جێبەجێ
کردنی ئەم پلانەدا بوین. لە پڕ هێزێکی گەورەی پارتی شاخەکانی بەرامبەریان لێ گرتین.

*

بەیانییەکی زو لە خەو هەڵیانساندم وتیان: «کابرایەک هاتوە نامەی پێیە.
ئەیەوێ وەڵامی بدەیتەوە و بگەڕێتەوە.» کابراکە شێخ عەبدولعەزیزی دارەڕولە و نامەکە
هی شێخ محەممەدی شێخ عەبدولکەریم بو.

شێخ محەممەد، لە دوای باوکی بوبو بە شێخی تەریقەتی قادری، لە گەڵ
داودەزگاکانی حکومەت تێکەڵاو بو. تەکیەکەیان لە کەرپچنە بو لە بەری قەرەداخ و، لە
بەغدادیش تەکیێ ی هەبو.

شێخ محەممەد لە نامەکەی دا نوسی بوی کە: «دوای ئەوەی شەڕ لە نێوان عێراق و
ئێران هەڵگیرساوە و، زۆری ڕێکخراوە ئێرانییەکان، تەنانەت ئەوانەیش کە دژی ڕژێمی ئێران
بون، پشتیوانی لە ئێران ئەکەن دژی عێراق. ئەرکی نیشتمانی ڕێکخراوە عێراقییەکانیش
ئەوەیە لەم شەڕەدا پشتیوانی لە عێراق بکەن دژی ئێران.» لە نامەکەی دا پرسی بوی کە
ئاخۆ یەکێتی ئامادەیە لە گەڵ حکومەت گفتوگۆ بکا بۆ یەلاداخستنی کێشەی کورد؟

مامجەلال سەفەری دەرەوەی کرد بو. شێخ محەممەدیش ئەیزانی، بەڵام نامەکەی بۆ
ئەو نوسی بو. بە شێخ عەزیزم وت: «شێخ نامەکەی بۆ مامجەلال نوسیوە. منیش ئەینێرم
بۆ ئەو کەی وەڵامەکەی نوسیبەوە بۆتان ئەنێرم.» شێخ عەزیز وتی: «پێ ی وتوم ئەگەر
مامجەلال لەوێ نەبو بیدەم بە تۆ و جوابەکەی لە تۆ وەربگرم.»

وتم: «باشە، تا تۆ پشویەک ئەدەی منیش وەڵامەکەی ئەنوسمەوە.»

لە نامەکەم دا بۆ شێخ محەممەدم نوسی: «ئەم دو حکومەتە: عێراق و ئێران،
ئەوەندەیان زوڵم لە کورد کرد و، کورد خۆیشی ئەیتوانی هەقی خۆیان لێ بسێنێ وا خوا
هەقیان لێ ئەسێنێ و، بەم شەڕە بەر غەزەبی خوا کەوتون. ئێمە پشتیوانی لە هیچکامیان
ناکەین، بەڵکو داوا لە خوا ئەکەین وەکو سەگەکانی ڕەزا بەگیان لێ بێ. لە گەڵ ئەوەیش دا
ئێمە هەرگیز دەرگای گفتوگۆمان دانەخستوە. ئەگەر عێراق بە ڕاستی بێتە پێشەوە، بۆ
چارەسەرکردنی کێشەی کورد، ئێمەش ئامادەین بۆ گفتوگۆ».

ڕەزا بەگ پیاوێکی قسە خۆشی سلێمانی بوە، خەیاڵێکی بە پیتی هەبوە بۆ
دروستکردنی حیکایەتی خەیاڵیی. وتویەتی: «دو سەگی گەورەم هەبو ڕۆژێکیان بو بە
شەڕیان، ئەمیان قەپاڵێکی لەو گرت دەستێکی خوارد، ئەویان قەپاڵێکی لەم گرت
دەستێکی ئەمی خوارد، وەختی ئاورم دایەوە هەردوکیان یەکتریان خوارد بو، تەنها
کلکەکانیان مابوەوە ئەجولا!»

وەڵامی نامەکەم دایەوە بە شێخ عەبدولعەزیز. شێخ محەممەد نامەکەی پێشانی
کاربەدەستان دابو. زۆر زیاتر لە جاران ڕقیان لێ هەڵگرتم. ئێستا کە بیری لێ ئەکەمەوە
ئەبو بە زمانێکی ئەدەبیتر نامەکەم بنوسیایە. ناشێ هەموجار پیاو ڕازی دڵی خۆی بڵێ.
وەکو دوایی بیستمانەوە نوری حەدیثی خاوەنی پێشنیارەکە بو، بەڵام وت بوی:

«بەستێکانە یەکێتی ئەکەوێتە نێوان کەماشەی پارتی و حکومەتەوە زۆر لاواز ئەبێ، ئیتر بۆچی لە گەڵی رێک بکەوین؟» پێ ئەچوو بەعس زانیاری پێ گەیشت بێ لە سەر نیازی پارتی بۆ لەشکرکێشی بۆ سەر بارەگاکانی یەکێتی لە ناوزەنگ.

*

## شەڕی راگەیاندن

پارتی رۆژانە لە رادیۆکەی دا هێرشی ئەهێنایە سەر یەکێتی. لە وتار و لێدوان و هەواڵەکانی دا، بە دەگمەن لێکۆڵینەوە و رەشی تێ دا بوو، بە زۆری موهاتەرات و جنێو بوو. وەکو دوایی دەرکەوت زەمینەی لەشکرکێشییان خۆش ئەکرد. بۆ ئەوەی گوێگر توشی بێزاری نەبێ لە دووبارەکردنەوەی ئەو بابەتە بێ بێزانە، ئێمە زۆر جار ماوەیەک بێدەنگ ئەبووین و بەرنامەکانی رادیۆمان تەرخان ئەکرد بۆ باس و بابەتی تر، بەڵام نەئەکرا قسەکانی پارتی بێ وەڵام بهێڵرێتەوە. ئێمە پەیرەوی فەرموودەکەی شێخ رەزامان ئەکرد، کە ئەڵێ:

........ بە فەردێ

نەت بیستوە ضەرب‌المسئلە: صد قُل و یک بردی!

لە چەند رۆژێک و لە چەند وتارێک دا بابی هەمو ئەو ماوەیەی رابوردو لە سەریان ئەدواین. بۆ وەڵامدانەوەی پارتی زنجیرەیەک وتارم بۆ رادیۆ نوسی دوایین ئەڵقەیان باسی «تراث»ی بارزانی بوو، کە سەرانی پارتی و نوسەرانی رادیۆکەیان خۆیان زۆری پێوە ئەنازین. دەزگای راگەیاندن ئەم وتارانەی لە کتێبێک دا چاپ کرد بە ناوی: «قیادەی موەقەتە لە چ بەرەیەکدا وەستاوە؟»

*

## هاتنی لەشکری پارتی بۆ دولەتو

دوای کۆنگرەی نۆهەم، پارتی زۆرتر هاوکاری لە گەڵ حکومەتی ئێران ئەکرد و، حکومەتی ئێرانیش یارمەتی ئەدان هێزەکانیان رێک بخەنەوە. لە سەر شێوەی جاران لق و ناوچەکانیان پێک هێنایەوە، بەڵام بارەگاکانیان هەموی لە ئێران بوو. حدکا، بۆ کزکردنی دەسەڵاتی یەکێتی، لە هەمو ناوچەکان دا کارئاسانییان بۆ ئەکردن.

جەنگی عێراق - ئێران گەرم ببوو، ئێران زۆری بۆ هێنا بوون لە ناو عێراق دا چالاکی چەکدار دژی جەیشی عێراق بکەن، بۆ ئەو مەبەستە لە ئەرتەش بەشێکیان دروست کرد بو بە ناوی «ستاد جنگهای نامنظم» پارتی هەمیشە بوونی هێزەکانی یەکێتی ئەکرد بە بیانوی راوەستانی چالاکییەکانی، گوایە یەکێتی رێگا لە وان ئەگرێ خەبات بکەن، راستییەکەی ئەوە بو سەرکردایەتی پارتی، بە تایبەتی بنەماڵەی بارزانی، لای وابو بە شەڕی کورد حکومەتی عێراق ناروخێ، لە بەر ئەوە نەیئەویست کادر و ئەندامەکانی لەو شەڕەدا بە کوشت بدا. نەیشی ئەویست هیچ جۆرە رێککەوتنێکی سیاسی لە گەڵ یەکێتی ئیمزا بکا.

سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ۱۹۸۰ بیستمان پارتی کەوتوتە سازدانی هێزەکانی. لە پڕ پەلاماری قەڵاتوکانیان دا. قەڵاتوکان وەکو ئیستگایەکی سەرە رێگا بۆ ناوچەکانی: قەڵادزێ، چۆمان، رەواندز، شەقڵاوە، هەولێر گرنگییەکی تایبەتی هەبو. هێزەکانی پارتی پەلامارێکی کتوپڕیان دابو گرت بریان و، هاوزەمان لە گەڵ ئەم هێرشەدا، هێزێکی گەورەیان لە دەراوی گوێزێ، دولە کوکە، دەروای دولەتو و چیاکانی پشتی دولەتو سەریان دەرهێنا. زۆری لێپرسراوە ناسراوەکانیان وەکو: عەلی عەبدوڵڵا، رۆژی نوری

شاوەیس، ئازاد بەرواری، عەبدوللا بەرواری، حەمە سالح جومعە.. لە گەڵ هات بو، دواتر مەسعود خۆیشی هات و، ئیدریسیش بە تەمای هاتن بو.

پەیوەندی حسک - یەکێتی ساردی تێ کەوت بو، بە پێچەوانەوە پەیوەندی حسک - پارتی خۆش بوبو، ئەم هاتنەیان، کە هەڕەشەی بۆ سەر یەکێتی دروست ئەکرد، پێ خۆش بو، بەڵکو بە دەسکیشی ئەوان بو. حدکایش کارئاسانییان کرد بو بۆ هێنانیان و، لە کاتی گوێزانەوەیان دا ئەوان پاسەوانی خۆیان لە گەڵ ئوتومبیلەکانیان نارد بو.

ئێمە کە بەمەمان زانی یەکسەر هێزێکمان پەراندەوە بۆ شاخەکانی بەرامبەر ئاوزەنگ - شینێ و، داوامان لە هەرێمەکان کرد هێزەکانیان بنێرن بۆ سەرکردایەتی و، داوامان لە حشع کرد، ئەویش هەڵوێستی خۆی لەم دەستدرێژییەی پارتی دیاری بکا.

ئەگەر شەڕ بکەوتایەتە ناوچەکەوە، ئەوان بیانویستایە یا نەیانویستایە، ئەگەر لە شەڕەکەشەوە نەگلانایە، ئەوا جێگەیان پێ لێژ ئەبو. لە بەر ئەوە کەوتنە خۆ بۆ ناوبژی و، هاتوچو کردن لە نێوان هەردولای ناکۆکییەکەدا.

سەرانی پارتی ئەیانوت هاتون شەڕ لە گەڵ ڕژێمی بەعس بکەن و، هێزەکانی بەعس لە پشدەر دەربکەن. ئەم بیانوە بۆ ئێمە جێگەی گاڵتە پێ کردن بو، لە شنۆ هەتا قەسری شیرین، نەیانتوانی لە سیدەکان هەتا خانەقین شەڕ لە گەڵ ڕژێم بکەن، هیچ جێگایەکیان نەدۆزیوەتەوە بیکەن بە مەیدانی شەڕ، دەوروپشتی بارەگاکانی ئێمە نەبێ؟

نوێنەرانی حشع: مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، بەهادین نوری، فاتیح ڕەسول.. چەند جاری هاتن بۆ لای ئێمە و چون بۆ لای سەرانی پارتی لە دەراوی دۆلەتو. ئێمە سور بوین لە سەر ئەوەی قەلاتوکان بە جێ بهێڵن و بگەڕێنەوە ناوچەکانی خۆیان و، ئەوان سور بون لە سەر تێپەڕین بە ناوچەکانی ئێمەدا بۆ پشدەر.

ئەوان لەم هاتوچۆیەدا بون، بەیانی ڕۆژی ١٩/١٠/٨٠ هێزێکی عێراق پەلاماری مامەندەی دا. ئەو جاشانەی لەم هێرشەدا بەشدار بون، لەوانە بون سەر بە پارتی بون. بەزمەکە لە پیلانێکی ڕێکخراو ئەچو. لەم لاوە پارتی هەڕەشەی لێ ئەکردین و لەو لاوە حکومەت هێرشی بۆ ئەهێناین.

هێزێکی دائیمی هەمیشە لە مامەندە بو بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی ناکاوی دوژمن، لە کاتی پێویست دا هێزی پشتیوانیمان بۆ ئەنارد. شەڕ لە مامەندە گەرم بو، هێزەکانی پارتی بە چیاکانی ئەوبەرەوە چاویان لە شەڕەکە بو. بە بیانوی یارمەتیدانەوە ویستیان لە چەمی نوکان بپەڕنەوە بۆ بەری بارەگاکانی ئێمە. یەکێکیان بە هۆکی تۆکی قسەی ئەکرد، وتی: «ئەمانەوێ بێین لەو شەڕەدا یارمەتیتان بدەین!» پێم وت: «پێویستیمان بە یارمەتی ئێوە نیە، بەشی هەردولاتان ئەکەین» بە هێزەکانی خۆمانم وت: «ڕێگایان نەدەن بپەڕنەوە و، حیزفرسەتی بکەن!»

عومەری حاجی عەبدوللا هێزێکی لە گەڵ خۆی برد. سەرکەوت بۆ مامەندە. سەرکردایەتی شەڕەکەی گرتە ئەستۆ. هێرشێکی ئازایانەیان کرد. هێزەکانی حکومەت شکان و، گەڕانەوە دواوە. بەڵام ٣ پێشمەرگە کوژرا و ٧ یش بریندار بون.

*

مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی قسەیەکی بە جێ ی کرد. وتی: «ئەم برادەرانە لە تاران دائەنیشن ئێوە جنێویان پێ ئەدەن ئەڵێن ناگەڕێنەوە کوردستان خەبات بکەن، ئەوا هاتون

ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، ئێوە ئەڵێن ئەبێ بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان. ئێستا ئەمانە بڕۆنەوە بۆ ئێران یا بڕۆنەوە بۆ کوردستان؟»

قسەکەی مەلا ئەحمەد بە جێ بوو.

لە ناو خۆمان دا باسی ئەوەمان کرد کە هەڵوێستی ئێمە لە پارتی چی بێ. لە نێوان ئێمە و ئەوان دا ڕابوردوویەکی خوێناوی هەبوو، هیچ ئاشتبوونەوە و ڕێککەوتنێکی بە دوادا نەهات بوو. بێ ڕێککەوتنێکی سیاسی هێزەکانی ئێمە و ئەوان چۆن پێکەوە هەڵ ئەکەن. بە تایبەتی ئەوان لە هەر جێیەک دا دەسەڵاتیان هەبووبێ، یەکێتییان لە ڕەگوڕیشە دەرهێناوە. ئێستایش ئاوا بە «کەلەگایی» ئەیانەوێ سواری ملمان بن و ناوچەکە داگیر بکەن. پڕۆژەیەکمان لە لا گەڵاڵە بوو:

١. جەنگی ڕاگەیاندن ڕابگرین.

٢. ماوەی ٣ مانگ شەڕیان لە گەڵ ڕابگرین.

٣. لای ڕۆژئاوای جادەی هاملتۆنیان بۆ چۆڵ بکرێ، هێزەکانیان لەوێ دابمەزرێنن، ئەوانیش بەری ڕۆژهەڵاتی جادەکە بە جێ بهێڵن.

٤. پارتی قەلاتۆکان چۆڵ بکا.

٥. هەر کێشەیەک ڕوو دا بە ناوبژی حشع بە خۆشی چارەسەر بکرێ.

ئەگەر ئەمانەیان قبووڵ کرد پاش ٣ مانگ سەر لە نوێ چاو بە مەسەلەکەدا ئەخشێنینەوە بۆ هەنگاوی داهاتوو.

هێزەکانی پارتی بە شاخەوە بوون، توانایەکیان نەبوو لە باران و سەرما بیانپارێزێ. شەو هەتا بەیانی هەڵئەلەرزین و، خەریکی ئاگر کردنەوە بوون. نەخشەیەکمان دانا ئەگەر بە خۆشی لە ناوچەکە نەکشانەوە، لە گەڵ دەس پێ کردنی بارانی «پەلە» دا لە چەند لایەکەوە پەلاماریان بدەین و دەریان بکەین.

*

حشع پێشنیارەکانی بە لاوە باش بوو، چەند گۆڕینێکی کەمیان داوا کرد: لەوانە هەموو حیزبەکان - جگە لە پارتی - بۆیان هەبێ لە قەلاتۆکان بارەگایان هەبێ، چونکە سەرە ڕێگای هەموویانە. هێزەکانی پارتی هەتا دەرگەڵە بێن. یەکەمیان پێ باش و دووەمیان پەسند نەکرد.

حشع پێشنیارەکانیان برد بۆ پارتی. سەرانی پارتی لە سەر زۆری ڕازی بوون. ئێمەش جەمال ئاغامان نارد بۆ ئەوەی ئاگاداری پێشمەرگەکانی یەکێتی بکا لە ناوچەکانی گرتک، ڕووست، گەڵاڵە، هەودیان.. واتا بەری ڕۆژئاوای جادەی حاجی ئومەران بکشێنەوە بۆ بەری ڕۆژهەڵاتی جادەکە.

سەرەتای مانگی تشرینی دووەمی ١٩٨٠ هێزەکانی پارتی دەستیان کرد بە کشانەوە بەرەو شوێنەکانی خۆیان لە ئێران. ئەم کێچەڵەی مانگێک زیاتری خایاند بە بێ شەر لە کۆڵمان بووەوە. پارتی هەندێ لە هێزەکانی خۆی بۆ ناوچەی حاجی ئومەران نارد، بە نیازی ڕزگارکردنی حاجی ئومەران، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون و، لەو شەڕەدا چەند کەسێکی ناسراویان لێ کوژرا، لەوانە: فەتاح ئاغا، سەعید تزماری..

فەتاح ئاغا ئەگەرچی خۆی بە هەڵگری بیری نەتەوەیی دائەنا و، تا هەڵوەشاندنەوەی کازیک، زۆر بە زۆر لە گەڵیان بوو، بەڵام تا کوژرا خۆی بە دڵسۆزی بنەماڵەی بارزانی

داتەنا. فەتاح ئاغا لە شەڕەکانی ٧٤ دا سەرلەشکری هێزەکانی سلێمانی و کەرکوک بو. لە ڕۆژانی ئاشبەتاڵ دا لە چەند جێگایەک بۆ لێکۆڵینەوەی هەڵوەمەرجی سیاسی کوردستان کۆبونەوە بە لێپرسراوەکانی شۆڕش کرا. یەکی لەو کۆبونەوانە لە پێنجوێن کرا هەمو فەرماندەی هێز و بەتالیون و، ئەندامەکانی لقەکانی پارتی.. بەشدار بون. لە پێش دا ڕێوشوێنی ئەوە داتەنین چۆن درێژە بە شۆڕش و بەرەنگاری بدری، لەو کاتەدا پروسکەی بارەگای بارزانییان بۆ دێ دەربارەی ئاشبەتاڵ. یەکی لە فەرماندەکانی پێشمەرگە کە بانگ کرا بو بۆ ئەو کۆبونەوەیە داوا لە فەتاح ئاغا ئەکا گوێ نەدەنە ئەو پروسکەیە و بمێننەوە و درێژە بە شۆڕش بدەن و، داوا لەویش ئەکا بمێنێتەوە بۆ سەرکردایەتییان. فەتاح ئاغا ئەڵێ: «قاچی بارزانی لە کوێ بێ سەری من لەوێ ئەبێ».

فەتاح ئاغا قسەکەی خۆی بردە سەر. لە ٧٥ دا ئامادە نەبو لە کوردستان بمێنێتەوە سەرکردایەتی هەزاران پێشمەرگە بکا. بە پەنابەری چو بۆ کەرەج. کەچی ٥ ساڵ دوای ئەوە، بۆ ڕازی کردنی دڵی بنەماڵەی بارزانی ئامادە بو لە کەرەجەوە بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و، خۆی لە شەڕێکی بچوک دا بە کوشت بدا.

*

جوقد و جود

مامجەلال لە نیسانی ١٩٨٠ دا چو بو تاران و لەوێوە چو بۆ دیمەشق. تاران - دیمەشق تەگەرچی لە سەر زور مەسەلە ناکۆک بون، بەلام میحوەرێکیان پێک هێنا بو، یەکی لە ئامانجەکانیان ڕوخاندنی ڕژێمی سەددام حسێن بو. بەرووڕای ئەم دو لایە لە سەر پاشەڕۆژی عیراق جیاواز بو. هەرچی تیران بو تازە لە گەرمەی سەرکەوتنی دا بو، ئەیویست شۆڕشی ئیسلامی هەمو دنیا، لە پێشەوە عیراق، بگرێتە بەر. هەرچی سوریایش بو ئەیویست سەرکردایەتی بەعس، بە تایبەتی سەددام و هاوڕێکانی بروخی، ئیستر داوودەزگاکانی حیزبی بەعس و حکومەتەکەی لە عیراق دا بە هی خۆی ئەزانی.

هەلگیرسانی جەنگی عیراق - تیران و، گرتنەوەی لولەی نەوتی عیراق - سوریا و، بێ بەش کردنی لەو دەرامەتە گرنگە، ئومێدێکی زۆری دابو بە نەیارەکانی سەددام. گفتوگۆی خۆ بە خۆ لە ناو سەرانی معارضەی عیراقی و، لە نێوان لایەنەکانی موعارضەی عیراقی لە لایەک و، کاربەدەستانی سوری و لیبی و فەلەستینی لە لایەکی ترەوە، سەرەنجام بە ڕێککەوتنێک کۆتایی هات «الجبهه الوطنیه القومیه الدیمقراطیه» یان لە نێوان ئەم لایەنانەدا پێک هێنا:

لایەنە عەرەبییەکان: حزب البعث العربی الاشتراکی - قیادە قطر العراق، الحرکه العربیه الاشتراکیه، الحزب الشیوعی العراقی، الحزب الاشتراکی العراقی، منظمه الجیش الشعبی لتحریر العراق، هەندی کەسایەتی سەربەخۆ.

لایەنە کوردییەکان: یەکێتی نیشتمانی کوردستان، حیزبی سوشیالیستی یەکگرتوی کوردستان.

شەوی ١٢ ی تشرینی دوەمی ١٩٨٠ ڕادیۆی دیمەشق هەواڵی دامەزراندنی جوقدی ڕاگەیاند و، حازم لە باتی بەعس و، مامجەلال لە باتی یەکێتی و، عەبدولرەزاق صافی لە باتی حشع وتاریان خوێندەوە. دامەزراندنی جوقد لە عیراق دا بە چاکی دەنگی دایەوە و، ناحەزانی سەددام ئومێدێکی زۆریان لە سەر هەڵچنی بو. من خۆم هیوایەکی زۆرم پێ ی

ئەبو. جۆری پێکهاتنی لایەنەکانی و، توانای سیاسی و ڕێکخراوەیی و جەماوەرییان لە سەر ئەرز و، جیاوازی بیروبۆچونیان لە سەر پاشەڕۆژی عیراق.. وای لێ کرد بوم من هیوایەکی ئەوتۆم بەم بەرەیە نەبی و، لام وابو شتی لە ئەرکی قورسی سەرشانی ئێمە کەم ناکاتەوە. د. خەسرەو خال، کە ئەوسا سەرپەرشتی خەتێکی گەورەی ڕێکخستنەکانی ناوشاری ئەکرد، لە نامەیەک دا بە هیوایەکی زۆرەوە باسی جوقدی کرد بو، داوای کرد بو «تفصیلات» ی ئەم بەرەیەی بو بنوسم. منیش لە وەلام دا بۆم نوسی حیکایەتی یەکێتی و جوقد وەکو ئەو پەندەی پێشینانە: «بە خوشتریان وت: مژدە بێ کورت بوا وتی: کوڕم بێ یا کچ کۆڵی خۆم بە پشتی خۆمەوەیە».

جوقد دەستەی نوێنەرایەتی پێک هێنا و، لە هەندێ جێگا مەکتەبی کردەوە. زیاتر لەوەی دەزگای خەبات بێ بۆ ڕوخاندنی ڕژێمی بەعس، بو بە دوکانی پارە پەیدا کردن و، هەندێ لەم لایەنانە بە ناوی پێکهێنانی لەشکر و، ڕێکخستنی خەباتی نهێنییەوە پارەی زۆریان لە لیبیا وەرگرت. کورد وتەنی: کێ ئەیکا و کێ ئەیخوا؟

*

لە جوقد دا پارتی ئاغەڕۆز کرا بو. ڕاستەکەیشی ئەوە بو، یەکێتی ئەیویست پارتی وەتەق بخات و، لە مەیش دا هەم بەعس و هەم حرکە هاوکاریی یەکێتیان ئەکرد. حشع و حسک دو لایەنی جوقد بون. د، مەحمود پەیمانی جوقدی لە باتی حسک ئیمزا کرد بو. بەلام سەرکردایەتی حسیک لە کوردستان بێ ئاگایی خۆی لەو ڕێککەوتنە پیشان ئەدا و، خۆی پێوە نەئەبەستەوە، ڕاستیەکەیشی ئەوەبو: ڕەسوڵ ئەیویست بیسەلمێنی کە پیاوی دەسەلاتدار و بڕیار بە دەستی ناو حسیک خۆیەتی نەک د. مەحمود.

دوای ڕاگەیاندنی جوقد بە چەند ڕوژی سەرانی حشع لە کوردستان: مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، فاتیح ڕەسول، کەوتنە هەولی پێکهێنانی بەرەیەکی تر لە گەڵ پارتی و حسک. بەرنامە و بەلگەکانیان ئامادە کرد بو. بێگومان کارێکی وەها گەورە، کە لەوانە بو بێ بە هۆی تێکچونی پەیوەندی حشع لە گەڵ زوری لایەنەکانی جوقد، لە دەسەلاتی دو کەسی بێ دەسەلاتی وەکو مەلا ئەحمەد و فاتیح دا نەبو، بەلکو لە سەروترەوە ڕایان سپارد بون. لە مەیش ئەیانویست بە تیرێک دو نیشان بشکێنن: یەکەمیان، یەکێتی، کە لە ڕوی پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی و جەماوەرییەوە، لە چاو هەمو هێزەکانی کوردستان دا بەهێزتر بو، بە هاوپەیمانێتیەکی ٣ قۆڵی گەمارۆ بدەن و، بالادەستی یا هاوسەنگییەکی پێشمەرگەیی و سیاسی لە گەڵ دروست بکەن. دوەمیان، مستی لە دەمی حازم و هاوڕێکانی بدەن.

لە گفتوگۆی دوقولی ئێمە و حشع دا چەند جاری زۆر بە وردی مەترسییەکانی ئەم کارەمان بۆ ڕون کردنەوە و، تێمان گەیاندن کە دامەزراندنی بەرەی دوەم نرخی بەرەی یەکەم ناهێلی. خۆ ئەگەر هەر سورن لە سەر ڕازی کردنی پارتی، لە باتی ئەوەی بەرەیەکی تازە دروست بکەن و، ناوی «بەرە» سوک بکەن، پەیمانێکی «هاوکاری دوقولی» یان لە گەڵ ئیمزا بکەن و، لە گەڵ لایەنەکانی جوقد خەریک بن پارتی یش بە ئەندام قبول بکەن.

گوێیان لە قسەکانی ئێمە نەگرت. ڕۆژی ٢٨ ی تشرینی دوەمی ٨٠. لە ڕاژان پەیمانی «الجبهه الوطنیه الدیمقراطیه» لە گەڵ پارتی و حسک ئیمزا کرد.

*

فەرهەنگی سیاسی حیزبە شیوعییەکانی عەرەب لە کاروباری حیزبایەتی دا لاسایی کردنەوەی سۆڤییت و ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلات بو، زوو جار زاراوەکانی ئەوانیشیان بە کار هیناوە. یەکی لەو شتانە «بەرەی یەکگرتو» بوە. کە هەندی لە پارتیە کومونیستیەکان لە سەردەمی دوەمین جەنگی جیهانی دا دایان هینا بو کوکردنەوەی حیزب و ریکخراوەکان دژی فاشیزم. لە هەمو ئەو بەرانەدا خویان بە «پیشرەو» و، حیزبەکانی تریان بە بورجوازی و وردەبورجوازی دائەنا. ناوی بەرەکانیشیان بە وشەی بریقەدار ئەرازاندەوە. حشع لەم بوارەدا پیشینەی میژویی هەبو.

– لە سەردەمی پاشایەتی دا «جبهه الاتحاد الوطنی» لە گەل حیزبە نەتەوەییەکانی عەرەب لە عیراق دا پیک هینا بو.

– سالی ۱۹۷۳ لە گەل بەعس و هەندی لە حیزبە کارتونیەکانی کورد «الجبهه الوطنیه والقومیه التقدمیه» پیک هینا بو.

– ئیستاش لە شام لە گەل هەندی لە حیزبە عیراقی و کوردیەکان «جوقد: الجبهه الوطنیه والقومیه والدیموقراطیه» و، لە راژان لە گەل دو حیزبی کوردی تر «جود: الجبهه الوطنیه الدیموقراطیه» یان ریک خستوە.

بیگومـان ئەمـانە زورتر قەوارەی بی ناوەروک و هیچ لە بارا نەبو بون، نەک داوودەزگای خەبات و روخاندنی رژیمی دیکتاتوری و دامەزراندنی رژیمی دیموکراسی، وەکو ئەلین: «ناوی زل و دی ی ویران» بون.

*

جەمیل رەنجبەر و پیرانە رەش

هەندی لەوانەی تازە ئازاد بوبون بە کاری ریکخراوەیی و سیاسی قایل نەئەبون، حەزیان ئەکرد کاری پیشمەرگەیی بکەن. عومەری سەید عەلی کرا بو بە بەرپرسی دەزگای ریکخستنی کومەلە، کارەکەی بو خوی بە پچوک ئەزانی و، چەند جاری لە کوبونەوەکان دا داوای ئەکرد کاریکی تری پی بسپیرن. چوە مەکتەبی عەسکەری و، ماوەیەک کاروباری دارایی م ع ی ئەکرد.

دوای ئەوەی گیچەلی پارتی مان لە کول بوەوە، ئەو هیزانەی لە سەرکردایەتی کو کرابونەوە، ئیتر پیویستی مانەوەیان نەما بو، کوبونەوەمان لە گەل کردن بو ئەوەی باسی گەرانەوە بو ناوچەکانی خویان و، وشاندنی دەس لە هیزەکانی بەعسیان لە گەل بکەین. سەید کەریم کە ئەندامی م ع بو، ئەویش ئەچو بو نزیک هەولیر. ژمارەیەک لە پیشمەرگە و کادرەکانی هەولیر و سلیمانی لە گەل چو.

روژی ۱۸ ی تشرینی دوەمی ۸۰ لە کاتیک دا ئەم هیزە لە گوندی جەلکەوە ئەچون بەرەو پیرانە رەش لە ناوچەی پشدەرە رەقە چەند هالیکوپتەریک ئەگاتە سەریان، بە شەستیر و نارنجوک هیزەکە دائەگرنەوە ۹ یان لی کوشتن و ۱۲ یان لی بریندار کردن. لە ناو کوژراوەکان دا جەمیل رەنجبەر و، دلشاد محەمەد، لیپرسراوی ناوچەی کوبە و، لە ناو بریندارەکان دا عومەری سەید عەلی و صابیر رەسولی تی دا بو.

جەمـیل سالی ۱۹٤۷ لە دایک بوبو. مـاموستـای سەرەتایی بو. حاجی صـالحی باوکیشی پیاویکی کوردپەروەر بو. لە سەرەتای شەستەکانەوە تیکەلاوی کاروباری سیاسی بو. لە سـەرەتای دامـەزراندنی کـومـەلەدا هات بوە ناو کـومـەلە. لە ۱۹۷٤ دا چوە ریزی

شۆڕشەوە. ساڵی ٧٦ چەند مانگێ گیرا و بەربوو. بەڵام ساڵی ١٩٧٧ لە گیرانی بە کۆمەڵی یەشی لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە گیرایەوە و ٦ ساڵیان حوکم دا. لە ئابی ٧٩ دا بەر عەفوی عام کەوت و بەر بوو. دوای ماوەیەک هاتە ڕیزی پێشمەرگایەتییەوە. جەمیل تێکۆشەرێکی کۆڵنەدەر و ڕۆشنبیرێکی تێگەیشتوو و، کادرێکی بە نرخ بوو. ماوەیەک لە دەزگای ڕاگەیاندن کاری کرد و ئینجا دانرا بە ئەندامی لقی یەکێتیی نیشتمانی لە هەولێر. لەم پەلامارە ئاسمانییەدا کوژرا.

لەو سەردەمەدا لە ناو ئەدیب و شاعیرەکانی هەولێردا وا باو بوو ناوی وەکو: بێ خەو، پەرێشان، زامدار، پەشێو، خەمبار.. یان هەڵئەبژارد بۆ خۆیان. لە زەمانی هێمنەوە ئەیانگێڕایەوە جارێک پێ ی وت بوون: ئەمە نەخۆشخانەیە یا لقی نوسەرانە؟ جەمیل، وەکو نیشانەی بیری پێشکەوتوانەی ناوی «ڕەنجبەر» ی کرد بوو بە نازناوی ئەدەبیی خۆی. ئەندامی یەکیتیی نوسەرانی کورد بوو. ساڵی ٦٩ یەکەمین دیوانی شیعری لە ژێر ناوی: «ڕاز و سکاڵا» دا بڵاو کرد بووەوە. دەزگای ڕاگەیاندن هەندێ لە شیعرەکانیان کۆ کردەوە و چاپیان کردەوە.

*

سەید عومەریان لە ناو دارە مەیت دا هێنایەوە ناوزەنگ، پشتیی وەکو بێژنگی لێ هات بوو، چەند پارچەیەک لە بەرەی پشتی دابوو. هەردوو قاچی لە کار کەوت بوو. لە نەخۆشخانەکەی خۆمان تەداوییەکی سەرەتایی کرا و، دەستبەجێ ڕەوانەی ئێرانمان کرد. پاشماوەیەک لە تەهرانەوە چوە سوید. ماوەیەکی درێژ لە نەخۆشخانەدا مایەوە. هەرچەندە قاچەکانی کەوتنەوە کار بەڵام هەرگیز وەکو جارانی لێ نەهاتەوە.

ئەو ماوەیە لە چەند جێگا، بە تایبەتی لە دەشتی کۆیە و لە جەبارێ، پێشمەرگەی یەکیتی توشی زەرەری قورسی گیانیی بوون، هۆیەکەیشی بێباکی و بێ پەروایی، یان وەکو پێ ی ئەڵێن: لە ئەنجامی «بە کەم گرتنی دوژمن» دا بوو. هێزەکانی جەیش لە هەندێ شوێنی کوردستان کێشرا بونەوە بۆ مەیدانەکانی جەنگ لە گەڵ ئێران، پێشمەرگە لایان وابوو بە هۆی شەڕی ئێرانەوە، عیراق نایپەرژێتە سەر ئەوان.

*

ستاری سەعید خەلەف

ستار دوای تەسلیم بونەوەی زۆر زو پەشیمان بوبووەوە. هەواڵی بۆ ناردبین کە ئەیەوی پەیوەندی لە گەڵ یەکیتی دابمەزرێنێ و لە ناو شار پلانی هەندێ کاری پێشمەرگانە دابنێ. ئێمە هەواڵەکەمان زۆر پێ خۆش بوو. ستار پیاوێکی ئازا و چاونەترس بوو، کاری گەورەی لە دەس ئەهات. بەڵام پەیوەندی لە گەڵ زۆر لەوانە کرد بوو کە تەسلیم بوبونەوە و، هەندێکیانی ڕێک خست بوو، لەوانە: عومەری ئاوەکەلە.. جارێکیان بە کەریمی دادە مەنە دا نامە و ژمارەیەکی زۆر کتێب و نامیلکەی زانستەکانی جەنگ، بە تایبەتی زۆری کتێبەکانی (کلیەی عسکری) عیراقی بە دیاری بۆ نارد بوین. کەریم لە لای ئێمە نەمایەوە چو بۆ لای حسک.

ستارمان ئاگادار کرد کە زۆر وریا بێ لە پەیوەندییەکانی و، لە هەڵبژاردنی ئەوانەدا کە قسەیان لە گەڵ ئەکا. ئەو باوەڕی زۆر بە خۆی هەبو، باوەڕی بەوانەش هەبو کە هەڵی بژارد بون. داوای چەند دەمانچەیەکی بێدەنگی کرد بو بۆمان نارد. بە تەنها بو چەند

کاریکی گەورە ئەنجام بدا: لەوانە کوشتنی بەرپرسەری ئەمنی سلێمانی، ئینجا بیتەوە دەرەوە.

لە سەرەتای تشرینی دوەم دا هەواڵمان پێ گەیشت. ستار لە ناو ئوتومبیلەکەی خۆی دا بە دەمانچەیەکی بێدەنگ کوژراوە. ئەم رووداوە بۆ ئێمە زۆر ناخۆش بو. تازە دۆستایەتی لە گەڵ ئێمە تازە کرد بووەوە. چاوەڕوانی کاری گەورە بوین لێ ی. کەوتینە دوای رووداوەکە.

لێکۆڵینەوە دەری خست عومەری ناوەکەلە لە سەرەتاوە «ئەمن» ی ئاگادار کرد بو. «ئەمن» عومەریان راسپارد بو لە گەڵ ستار بڕوا و، بە وردی چاودێری پلانەکانی بکات. وەختی کاتی جێبەجێ کردنی کارەکە نزیک بوبوەوە، «بەرپرسەری ئەمن» بە ناوی میوانداریەوە نارد بوی بە دوای دا. بە دەمانچە بێدەنگەکەی خۆی و، بە عومەری ناوەکەلەی کوشت بو، لە ناو ئوتومبیلەکەی خۆی دا فڕێیان دابو.

*

بەربونەوە لە چلەمین فڕین دا

رۆژی ٢٠ی کانونی یەکەمی ٩٨، فڕۆکەیەکی ئێرانی لە ناوچەی رانیە کەوتە خوارەوە. فڕۆکەوانەکەی ناوی سەرگورد عەبدوڵلای شەریفی بە پەرەشوت خۆی هاویشت بو. هەندێ ئازاری پێ گەیشت بو، بەڵام بە زیندویەتی کەوتە دەس دانیشتوانی ناوچەکە. ئەوانیش تەسلیمی پێشمەرگەکانی هەرێمی ١٤ ی ئاگۆیان کرد.

حکومەتی عیراق هەوڵێکی زۆری لە گەڵ سرار ئاغا دا و، تەماعێکی زۆری خستە بەری بۆ ئەوەی تەسلیمی ئەوانی بکا. ناردمان فڕۆکەوانەکەیان هێنا بۆ ناوزەنگ و رەوانەی ئێرانمان کردەوە. شەریفی خۆی ئەم رووداوەی کرد بە کتێبی لە ژێر ناوی: «سقوط در چلهمین پرواز» دا بڵاوی کردەوە. هەر لەو ماوەیەدا کتێبەکەیان کرد بە فلیمی سینەمایی.

نێوانی ئێران و یەکێتی ساردی تێکەوت بو، ئەم چاکەیەش نەیتوانی گەرمی بکاتەوە. لە فلیمەکەدا بە هیچ جۆرێ باسی دەوری یەکێتیمان نەکرد بو لە رووداوەکەدا، بەڵکو خستبویانە قاڵبی ئازایەتی فڕۆکەوانەکە و، پیاوچاکی دانیشتوانی ناوچەکە، کە لە بەر خۆشەویستی ئێرانی ئیسلامی ئەم کارەیان کردوە.

# ساڵی ١٩٨١

## بۆچی چووم و، تووشی چی بووم

ناوچەی هەورامان و شارەزوور لە سەرەتای دەستپێکردنەوەی شۆڕشەوە، یەکێ بوو لە ناوچەکانی نفوزی کۆمەڵە. یەکەمین مەفرەزەی ئەوێ: شێخ عەلی، عەلی ئەحمەد شیمە، حامیدی حاجی غالی، حەمەی حاجی مەحموود، دکتۆر ڕەزا، حەمەی حاجی سابیر.. لە سەرەتادا هەموویان ئەندامی کۆمەڵە بوون، بەڵام لە بەر هۆی جۆراوجۆر هەندێکیان لە کۆمەڵە تەکی بوونەوە.

حەمەی حاجی مەحموود زۆر زوو وازی لە کۆمەڵە هێنا بوو، دیسپلینەکانی پێ قبوول نەدەکرا و، فێری ئەوە ببوو لە سنووری کارەکانی خۆی دا بە ئازادی و بێ لێپرسینەوەی کەسێکی سەرووی خۆی کار بکا. لە پێشمەرگایەتی دا تازا و زیرەک و، توانایەکی باشی ڕۆیشتن و بەرگە گرتنی ناخۆشیی هەبوو. بە پێشمەرگایەتی دەستی پێ کرد بوو، ببوو بە فەرماندەی مەفرەزە، ئینجا فەرماندەی کەرت تا گەیشت بوو فەرماندەی هەرێمی ١ ی شارەزوور و هەورامان. لە زۆری شەڕەکانی یەکێتی دا دژی قم بەشداری کرد بوو. ئەم و جەمالی عەلی باپیر و ٦ کەسی تر لە کارەساتی هەکاری دەرباز بوون. لە گەڵ پێشمەرگەکانی دا نەرم بوو، پارەی ئەدانێ و چاوپۆشی لە کەموکوڕییەکانیان ئەکرد. لە بەر ئەوە پێشمەرگەی لێ کۆ ئەبووەوە.

مامجەلال کە چوو بوو بۆ ئیشکۆلان بۆ بینینی نوێنەرانی ئێران بۆ ناوبژی لە نێوان ئێران و کوردەکان دا. مامجەلال ئەمیشی لە گەڵ خۆی برد بوو، لەوێ لە گەڵ سالار ببوو بە ناخۆشییان. حەمە خۆی لە زۆری مەسئولەکان بە بچووکتر نەئەزانی و، بە مەسئولی خۆی دانئەنان.

زۆری کادر و فەرماندە و پێشمەرگەکانی هەرێمەکەی کۆمەڵە و، لە ناو کۆمەڵەیش دا لە توندڕەوەکان بوون. ماوەیەک بوو گەرەیان تێ ئالاند بوو ئەیانویست گزی بکەن و لە دەسەڵاتی بخەن. چەند جارێ لە گەڵیان تێک ئەچوو. ئێمە بۆ ئەوەی یەکێتی هەرێمەکە بپارێزین ئاشتمان ئەکردنەوە. هاوینی ساڵی ٨٠ لە ناو خۆیان دا تێکچوون، زۆری کادر و فەرماندەی کەرتەکان لێ ی هەڵگەڕا بوونەوە. خەریک بوو بێ بە شەڕیان. لە بەر ئەوە هەموومان داوا کرد بۆ ناوزەنگ.

هەردولایان شکاتیان لە یەکتری هەبوو. حەمە ئەوانی تاوانبار ئەکرد بە توندڕەوی و تێکدانی هەرێمەکەی و، ئەوانیش حەمەیان تاوانبار ئەکرد بە ڕاووڕووت و کۆکردنەوەی پارە و خەرجی بێ لێپرسینەوە. هەردولایشیان ڕاستیان ئەکرد. حەمە پارەیەکی زۆری کۆکرد بووەوە و خەرجی کرد بوو بێ پرسی سەرکردایەتی. ئەو پارانەی سەنەد بووی:

- لە هەموو دانیشتووانی ناوچە ڕاگوێزراوەکانی سنووری پێنجوێن و سوورێن و هەورامان، ئەوانەی «تعویض» یان وەرگرت بوو، لە سەدا چل تا لە سەدا پەنجای لێ سەند بوون.

- پارەی زۆری، بێ هیچ بیانوویەک، لە چەند کەسی تر سەندبوو، هەندێکیان لای سەرکردایەتی یەکێتی شکاتیان لێ کرد بوو، سەرکردایەتی داوای لە حەمە کرد بوو پارەکانیان بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام ئەو گوێ ی نەدابوویە. لەوانە: کامیاری مەجیدخان و حاجی ئەولەی هەڵەبجەیی..

حەمە ئەبوت بەو پارەیە چەک و تەقەمەنی بۆ پێشمەرگەکانی هەرێمەکەی کڕیوە، یارمەتی مانگانەی لێ داوە، یارمەتی ماڵە شەهیدەکانی داوە، ئەپارەکانیشی تەیانوت هەندێ لەو شتانەی کردوە، بەڵام زۆری پارەکەی بۆ خۆی هەڵگرتوە، تازەیش ژنێکی تری بە سەر ژنە کۆنەکەی دا هێنا بوو، تفەنگێکی کرد بووە ملی، لە گەڵ خۆی ئەیگێڕا.

*

مەکتەبی سیاسی هەیئەتێکی، بە سەرۆکایەتی عومەر شێخموس، دروست کرد بۆ لێکۆڵینەوەی شکاتەکانی هەردولا. ناکۆکییەکانیان وا توند بوبوو ئیتر نەیانئەتوانی پێکەوە کار بکەن، یان لە ناوچەیەک دا هەڵ بکەن. هەمومان لە ناوزەنگ کۆ دائەوە. بە تایبەتی لەو کاتەدا مەترسی هێرشی پارتی هەبو بۆ سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی.

لە ناو مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی دا، زۆریان ڕەئیان وابو: حەمە بە ناوی یەکێتییەوە، بەرەڵلایی و ڕاووڕوتی زۆری کردوە و، پارەیەکی زۆریشی کۆ کردوتەوە، پێویستە بێ سزادان وازی لێ نەهێنین، بەڵام لە بەر ئەوەی لە دەستی دێ یاخی بێ و بداتە پاڵ ناحەزەکانی یەکێتی یا بچێتە پاڵ ڕژێم، چاکتر وایە چەکی بکەین و بیگرین، ئەگەر دەستی کردەوە بیکوژین. من بە توندی چوم بەگژ ئەم ڕەئیەدا و، نەمهێشت هیچی لێ بکەن چونکە لام وابو بۆ ناوبانگی یەکێتی باش نیە بەو جۆرە ڕەفتار لە گەڵ کاربەدەستێکی ناسراوی خۆی بکا، ئیبی بە نەرمی و ئامۆژگاری لە گەڵی بجولێینەوە.

ڕوداوەکان دەریان خست من بە هەڵەدا چو بوم و، ڕەئی هاورێکانم ڕاست بو.

شەوێکی سەرەتای مانگی ئەیلول حەمە هەمو دەستە و داتیرەکەی خۆی کۆ کرد بوەوە لێ دا بو ڕۆیشت بو. گەڕا بوەوە شارەزور. نامەی بۆ سەرکردایەتی حسک نوسی بو، کە ئیتر وازی لە یەکێتی هێناوە و، ئەیەوێ بچێتە ناو ئەوانەوە و، داوای لێ کرد بون هێزێک بنێرن بۆ پشتیوانی. حسک، وای زانی بو هەنگی لە داردا دۆزیوەتەوە، بۆ بە پیرەوە چونی ئەم ڕوداوە، هێزێکی بە سەرکردایەتی تایەری عەلی والی بۆ نارد بو. قادر جەباری و شێروان شێرەوەندی و شێخ مەنصوری حەلەبجەیشی لە گەڵ بو.

*

زۆر لە مێژ بو هاورێکانم سەریان کرد بوە سەرم ژن بهێنم. زۆریان تا ئەو کاتە سەڵت بون. ئەیانویست من ڕچە بشکێنم و، ئەوانیش بە دوای من دا ژن بهێنن. بە تایبەتی جولانەوەکە زۆری خایاند بو، بەو نزیکانەش هیوای سەرکەوتنی لە ئاسۆدا دیار نەبو، ناوچەکانی ژیانی ئێمەش، بە هۆی شەڕی ئێرانەوە، وەکو جاران مەترسی دوژمنی لە سەر نەما بو. د. خەسرەو خاڵ، بەرپرسی یەکێ لە ڕێکخراوە گەورەکانی شار بو، ئەویش چەند جارێ لە نامەکانی دا داوای لێ کرد بوم ژن بهێنم. تا ماوەیەکی زۆر دوودڵ بوم. سەرەنجام د. خەسرەوم کرد بە وەکیلی خۆم ئافرەتێکم بۆ بدۆزێتەوە بە هەلومەرجی ژیانی سەخت و هەژارانەی من لە شاخ ڕازی بێ. ئاگاداری کردم کە کچێکی باشی بۆ دۆزیومەتەوە و، ناوەکەی و ناونیشانی بنەماڵەکەیانی بۆ نوسی بوم، تا ئەگەر ڕازی بم قسەی لە گەڵ بکا.

وەهاب کە شارەزای ئەو ناوچانە بو بانگم کرد و، قسەم لە گەڵ کرد، کە سەفەرێکی پەلە و نهێنی ناوەهام بە دەستەوەیە، داوام لێ کرد: دوسێ پێشمەرگەی شارەزام بۆ ئامادە بکا.

من و کامەران و شەهاب بە ۳ قوڵی لە ناوزەنگەوە بە پێ بەڕێ کەوتین.

*

ئەو سەردەمەی کە هێشتا ئۆتۆمۆبێل دانەهات بو یان کەم بو، خەڵک بە پێ یان بە سواری هاتوچۆیان کردوە. لە ڕێگا کە بە یەکتری ئەگەیشتن یەکتریمان بناسیایە یا نە مەرحەبا و چاکوچۆنیان لە گەڵ یەکتری ئەکرد. ئەمەیش هەندێ ڕەوشوێنی دیاریکراوی هەبو ئەبو پەیڕەوی بکرایە.

سوار و پیادە کە بە یەک ئەگەیشتن ئەبو سوار سەلام لە پیادە بکا.

ڕێوارێک کە بە لای دانیشتویەک دا بڕویشتایە ئەبو کابرای ڕەفتەنی سەلام لە دانیشتوەکە بکا.

ڕێوارێک کە بگەیشتایە بە ڕێوارێکی تر ئەیوت: «ماندو نەبی!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خۆت ماندو نەبی!»

ڕێوارێک کە بگەیشتایە بە یەکێ لە سەر کار بوایە، ئەیوت: «خوا قوەتت بدا!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خوا دەوامت بدا!»

ڕێوارێک کە بگەیشتایە بە شوان یا بە گاوان ئەیوت: «بە دەولەت بی!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خوا عاقوت کا!» مەبەستیان لە دەولەت: «ئاژەڵ» بوە.

لە هەندێ ناوچە لە باتی وەلامەکانی: «خوا عاقوت بکا» و «خوا دەوامت بدا» ئەیانوت: «بچیتە بەهەشتێ!»

ڕێوارێک کە بگەیشتایە بە یەکێ کە خەریکی دروێنە بوایە، ئەیوت: «تیغت بوڕا» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «دوژمن بڕنا!»

ڕێوارێک کە بگەیشتایە بە یەکێ کە لە سەر خەرمان بوایە، ئەیوت: «خەرمان بەرەکەت!» ئەویش لە وەلام دا ئەیوت: «خێر و بەرەکەت!»

مەکینە ئەم نەریتانەی کوێر کردۆتەوە.

*

ئەوکاتە حدکا لە شەڕدا بو لە گەڵ حکومەتی ئێران، بە درێژایی ناوچەکانی سنور بارەگای دانا بو. ئێوارەیەکی درەنگ لە گوندێکی سنور ناوی ئەڕوان بو لە ناوچەی بانە لامان دا، چوینە مزگەوتەکە. هاشمی کەریمی بەرپرسی کومیتەی شارستانی بانە بو، ئەو و، چەند کەسێکی تر لە ئەندامانی کومیتەکە و پێشمەرگەکانی لە هۆڵی مزگەوتەکە بون. کەسیان بە رو منیان ئەئەناسی، منیش خۆمم لە لا ئاشکرا نەکردن. هەندێ قسە و باسی گشتی کرا، من هەوڵم دا خۆمی لێ لا بدەم. شەو لەوێ مابنەوە بەیانی زو بە ڕێ کەوتین لە ڕێگا توشی سەید ڕەسولی بابی گەورە بوین. لە گەڵ ئەو یەکتریمان ئەناسی. چاکوچۆنیمان کرد، سەیری پێ هات منی بوچەوە و لەوێ بینی، وتم: «کارێکی پەلەم هەیە لە دیوی خۆمان. بە پەلە ئەڕۆم و بە پەلە ئەگەڕێمەوە. ئەمەوی کەس نەزانی. شەوی ڕابوردو لای کاک هاشم بوین. بەلام منی نەناسی و، خۆیشم نەمویست خۆم ئاشکرا بکەم!»

من بەرەو شارەزور ئەچوم، بە سەید ڕەسول دا لالە سەرحەدم پێرکەوتەوە.

*

کچەکە و بنەماڵەکەیانم ئەناسی، بە لامەوە پەسند بون و داوام لێ کرد قسەی لە گەڵ بکا. قسەی لە گەڵ کرد بو ئەویش رازی بو.

زور ماندو بوم و، لە ناو ململانێی ناوخۆ بە تەواوی بێزار بوبوم. ئەمویست ماوەیەک دور بکەومەوە. لە چەند نامەیەک دا داوام لە مامجەلال کرد بو هەولی گەڕانەوە بدا. گەیشت بوە ئێنم لە دوا نامەدا بۆم نوسی، ئەگەڕێمەوە یان نا ئارەزوی خۆتە، من بەم نزیکانە سەفەر ئەکەم. ئەمئەویست لە ناوزەنگ ژن بگوێزمەوە، ئەمویست لە ئەوروپا ئەم کارە ئەنجام بدەم. ئەو کاتە سەفەر لە عیراقەوە ئاسان بو. ئاگاداری د. خەسرەوم کرد بە کچەکە بلێ ئەگەر ئەتوانی خۆی ئامادە بکا بۆ سەفەر. لە ئەوروپا یەک ئەگرینەوە و، هەر لەوی مەراسیمی مارەکردن و گواستنەوەش جێبەجێ ئەکەم. وڵاتێکی ئەوروپا و، ماوەیەکیشم دیاری کرد بو، کە ئەگەر پەسندی کرد لەو ماوە دیاریکراوەدا لەو وڵاتە ئەوروپاییە بی، منیش لەوی ئەبم.

کچەکە بە گوێرەی تەگبیرەکەی من هەمو هەنگاوەکانی نا بو. منیش بە گوێرەی تەگبیرەکەی خۆم بەرنامەی کاری داهاتوی خۆمم رێک خست بو. بەڵام وەکو ئێرانی ئەڵێ: «تەگبیر» هەمو جاری لە گەڵ «تەقدیر» رێک ناکەوێ!

*

بۆ چاوترساندنی خەڵک ماوەیەک بو بەعس کابرایەکی دڕندەی بە ناوی موڵازم موحسین نارد بو بۆ سلێمانی، فەرماندەی مەفرەزەی هاوبەشی دەزگا سەرکوتکەرەکانی بەعس بو. زۆری ئازاری خەڵک ئەدا و، هەمو شەو ئەچوە سەر ماڵان و، خەڵکی ئەکوشت. چەند جارێک چو بوە سەر بەختیاری برام و ئەحمەدی مامەرزام. جارێک ئەوەندەی لە ئەحمەد دا بو، گوێ یەکی کەڕ کرد بو. هەڕەشەی لە بەختیار کرد بو، کە ئەگەر لە سلێمانی چی تر پیاوی حکومەت بکوژرێ، ئەویش بەختیار ئەکوژێ.

ڕۆژێک لە پڕ بەختیاری برام پەیدا بو. لە سلێمانیەوە رای کرد بو. حازمەی هاوسەری بەختیار و، دایکم و ئاڵەکەی خوشکیشم رایان کرد بو بۆ شارەزور لە ماڵی حەمەمینی فەتاح لە شاتوان، خۆیان شارد بوەوە. هاتنی ئەمانەم زۆر پێ ناخۆش بو، چونکە من خۆم بە تەمای سەفەری ئەوروپا بوم.

*

لە گەڵ بەختیار خەریک بوم بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و، دایکم و ئەوانیش بیاتەوە سلێمانی. وەها ترساند بویان، هەرچی لە گەڵم وت، کەلکی ئەگرت. دایکیشم بە پێشمەرگەیەکی شارەزوردا نامەیەکی بۆ نارد بوم کە چارێکیان لێ بکەم. لە ناوزەنگ خانوبەرەیەکی باشم هەبو. شوێنەکەیشمان ئەمین بو. بە سەلاحی حاجی رەفیق دا نامەیەکم بۆ دایکم نارد کە بێن بۆ ناوزەنگ، بەختیاریش لە گەڵی چو، بەڵام لە ڕێگا بەختیار لە گەڵ سەلاح بڕی ئەکرد بو، گەڕا بوەوە. سەلاح نامەکەی گەیاند. بەڵام دایکم تورە بوبو، وت بوی: «ئێمە لە سەر ئەو رامان لێ هاتوە، پانزە ساڵیشە ئەمبینیوە، کەچی هێشتا ئەو بە من ئەڵێ وەرە بۆ لام!» دایکم مەترسییەکانی ڕێگاوبانی نەئەزانی.

تازە عەزیز محەممەد گەیشت بوە کوردستان. چو بوین بۆ سەردانی و دەعوەتمان کرد بۆ سەردان و فراوین. بەڵام من ئیتر بڕیارم دا بچم سەردانێکی دایکم و خوشکم بکەم و، داوایان لێ بکەم بێن بۆ ناوزەنگ. ویستم کەم کەس بزانی، هاوڕێکانی خۆمم ئاگادار کرد.

لاله سەرحەمد یەکێ بوە لە پیاوە ناسراوەکانی تیرەی رۆغزایی ئێلی جاف. زۆر قسەی خۆش و نەستەق، و روداوی سەیری لێ ئەگێرنەوە. یەکێکیان خەوە بە ناوبانگەکەیەتی کە پیرەمێرد لە «گاڵتەو گەپ» و عەلادین سەجادی لە «رشتەی مرواری» دا گێراویانەتەوە. پێ ئەچێ لاله سەرحەمد خاوەنی خەیاڵێکی بە پێت بوبێ. لەو سەردەمەدا جەردەیی و رووتکردنەوەی کاروان باو بوە و، بە ئازایەتی و دەسەڵاتداری دانراوە. ئەویش تا گەنج بوە لەمەدا دەستێکی باڵای هەبوە. کە پیر ئەبێ و لە مردن نزیک ئەکەوێتەوە، کورەکانی کۆ ئەکاتەوە وەسیەتیان بۆ بکا. ئەڵێ: «تا گەنج بوم زۆرم بۆ کردون و زۆرتان پێوە ماندو بوم تا کردومن بە پیاو، ئەمەوێ دوای مردنیشم خێرێکتان بۆ بەمەوە. کە مردم مەیکەن بە هەرا بە بێدەنگی لیادیکم ئێوە بپێچن و، بە شەو ببەن لە داری مەحەمەی سەرەواڵە بڕکەم دەن. بەیانی کە رۆژ بوەوە بڵێن باوکمان دیار نەماوە. سوار بەو ناوەدا بڵاو بکەنەوە. ناوچەکە کەیو ماڵ بکەن تا ئەمدۆزنەوە. ئەوسا بڵێن خەڵکی ئەو ناوە باوکمانیان کوشتوە و هەمویان ساف لە ساف تاڵان بکەن. ئینجا پرسەیەکی گەورەم بۆ دابنێن و بڵێن: هەی بە زیندویی هەر خێر و بە مردویی هەر خەیرا»

گۆڕی مەلا مستەفا لە شنۆ بو. زیوانی بە دیارەوە بو. شەوێک، تاقمێکی نەناسراو، تابوتەکەیان دەرهێنا بو برد بویان لە شوێنێکی نزیک گلکۆکەی فڕێیان دابو. چەکدارەکانی پارتی لە کاتی قیام دا تەقەیان لە خۆپیشاندنی خەڵکی شنۆ کرد بو، چەند کەسێکیان لێ کوشت بون، لە بەر ئەوە خەڵکی شنۆ دوژمنایەتیان ئەکردن.

- بنەماڵەی بارزانی، ئەم تاوانەیان بە پاڵ حدکا و لە ناو ئەوانیش دا بە پاڵ سەید رەسولی بابی گەورە ئەدا.

- حدکایش بنەماڵەی بارزانییان تاوانبار ئەکرد کە خۆیان ئەم کارەیان کردبێ، بۆ ئەوەی بیکەن بە بیانو بۆ هاوکاری لە گەڵ هێزە چەکدارەکانی تەهران بۆ شەڕی ئەوان.

هەرچەندە گومانم نەبو کە حدکا لەم تاوانە بەریە، بەڵام قسەکانیان لەو حیکایەتە ئەچو کە بە زمانی لاله سەرحەمەدەوە ئەیانگێرایەوە.

بێگومان سوکایەتی بە مردو و بە گۆڕ تاوانێکی گەورە و ناشیرینە. لە کوردەواری دا ئەمە بە کارێکی زۆر نزم دائەنرێ. هیچ لێکۆڵینەوەیەکی جیددی و بێلایەن لە سەر ئەم تاوانە نەکرا تا دەستی تاوانباری راستەقینە ئاشکرا بێ.

*

لە گەڵ سەید رەسول جیا بوینەوە لە یەکتری و شەو ئێمە چوینە گوندی «چەمپاراو» میوانی ماڵە شێخێکی قسە خۆش بوین. رۆژی دوایی بە سورکێودا ئاوای دیوی کوردستانی عیراق بوین.

گوندەکانی سوەرەیان، زێ، چاڵە خەزێنە.. لە سەر رێمان دا بو، لە هیچیان لامان نەدا تا گەیشتینە قەڵاتێ. ماوەیەک لەوەو پێش هاڵیکۆپتەری عێراقی لە کاروانێکی گەورەی کاروانچییەکانی دابو. ئێسک و پروسکی ولاخە کوژراوەکان بە درێژایی رێگاکە کەوت بو، دیمەنێکی ناشیرین و خەمناکی هەبو.

لە قەڵاتێ گیر نەبوین بە دەشتی خەرمان دا بە رێ کەوتین بۆ دوستەدەرە. شەو چوینە ماڵێک لەوێ پیرەمێردێکی نورانی کەروڵاڵی لێ بو. بە ئیشارەت قسەمان لە گەڵ ئەکرد. حەمەی حاجی سابیر لێپرسراوی ناوچەکە بو، هەواڵم بۆ نارد بۆ رۆژی دوایی لە

گوندی ڕەزڵە ببینم و، مەبەستی هاتنەکەم بۆ باس کرد. هەواڵم بۆ مامە ڕەزام نارد کە ئەوسا لە سەید صادق دوکانی هەبو، وا ڕێک کەوتین ئەوان بێنە گوندی بەردەڕەش و منیش بچمە ئەوێ. نیوەڕۆی ڕۆژی داهاتو مامم بە تراکتۆر هەموویانی هێنا بو، لە بەردەڕەش یەکمان گرتەوە، پاش پانزە ساڵ دایکم و تاڵگم ببینیەوە و، بۆ یەکەم جاریش براژنم و منداڵەکانیم بینی. نانی نیوەڕۆمان لە ماڵی جوامێرێکی بەردەڕەشی خوارد. ماڵێکی باش و بە مەعریفەت بون و، بە ناو لە دورەوە منیان ئەناسی. قسەم لە گەڵ دایکم کرد و، لە گەلیان ڕێ کەوتم هەموویان بێن بۆ ناوزەنگ و، ئیتر لە یەکتری جیا بوینەوە: ئەوان گەڕانەوە بۆ شارەزور و من بەرەو ناوزەنگ.

لە گەڵ حەمەی حاجی سابیر و ٣ پێشمەرگە: کامەران، شەهاب، حەمەی ئامۆزای حەمەی حاجی سابیر بەرێ کەوتین بەرەو «چەمی گەڵاڵ». چەمی گەڵاڵ ناوچەیەکی شاخاوی سەختی پڕ لە دارو بار بو. گوندەکانی: کانی سپیکەی پەرخ، بەردەڕەش، قەوێڵە، هەنارو، مایندوڵ، پەری هیرو، شیرەبەرە، قزلجی، مزگەوتە، دوڵە چەوت، هۆزخواجا، سلێمانە، سێرمام، پەرخ، بیوەک، زلزلە.. هەندێکیان گوندی گەورە بون، بەڵام بە خوڕایی ناوچەکەیان ناو نابو چەمی گەڵاڵ، چونکە چەمەکەی وشک و، ناوچەکە بێ ئاو بو، بە هاوین چۆڵیان ئەکرد. دانیشتوانەکەی تێکەڵاون لە هۆزەکانی: جوجانی، بیسەری، قەوێڵەیی، زەردویی، کە پێیان ئەڵێن: «غەوارە». خێڵی زەردویی لە پەیمانی زەهاودا ناوی هاتوە و، بەر ئێران کەوتوە. دیارە لەو سەردەمەدا خێڵێکی گەورە بوە، پاشان کەم و کز بوە. خانوەکانیان تەنگ و تاریک و نزم و کشتوکاڵیان زۆر کەم بو، ئاژەڵداریان ئەکرد. قەڵای سروچک و، قەڵای شوجاع لە شوێنە دێرینەکانی بو. ئەوسا هیچ جۆرە جادەیەکی قیرتاو یا خاکی بە ناودا تێنەپەڕیشت.

چەتە!

چەتەی بە ناوبانگی ناوچەی سلێمانی: «خولە پیزە» لە تیرەی «بیسەری» بوە. لە سەرەتای پەنجاکان دا چەند ساڵی ئاسایشی لە ناوچەی شارباژێردا نەهێشت بو، بە دەیان پۆلیس و کاربەدەستی حکومەتی کوشت، تا سەرەنجام موتەصەریفی ئەوسای سلێمانی عومەر عەلی، لە ناو خۆیان دا چەند کەسێکی چاند، لە کاتی خەوتن دا کوشتیان.

لە سەردەمی عوسمانی دا گەلانی بالقان کە خەباتیان کردوە بۆ ئازادی، بە پارتیزانەکانیان وتوە: «چەتە» و بە شەڕی پارتیزانییان وتوە: «شەڕی چەتەگەری». شێخ مەحمودیش کە لە سلێمانی هەڵکەنرا و، ماوەیەک شەڕی پارتیزانی ئەکرد، بە پارتیزانەکانیان ئەوت: چەتەی شێخ مەحمود، یان چەتەی کورد. وشەی چەتە بەم مەعنایە لە ژمارەکانی «بانگی حەق» دا هاتوە، کە لە ئەشکەوتەکەی جاسەنە بە ناوی قەرارگای ئۆردوی کوردستانەوە دەرچوە. بەڵام هەندێ لەو چەتانە لە ساڵانی دوایی دا ئەوەندەیان دزی و جەردەیی و ڕاووڕوت کرد، مەعنای ئەم وشەیە لە ناو خەڵک دا لە پارتیزانەوە گۆڕا بۆ جەردە یان وەکو ئەڵێن: «خارج عن القانون».

ئێمەیش زۆر جار ئەترساین وشەی پێشمەرگەش وەهای لێ بێ.

*

کەماڵ شاکیریش گەیشتە لامان. بە حەسانەوە و فراوین لامان دایە گوندی سلێمانە. سلێمانە کەوت بوە ناو گەروی شاخێکی بەردەڵانەوە. حەمە و کەماڵ و من پێکەوە لە

مالیک و، کامەران و ئەواتی تریش لە مالیکی تر بون. خەریکی نان و ماست خواردن بوین، خاوەن مالەکە هاتە ژورەوە وتی: «شاخەکە چەکداری پیوەیە دەوریان گرتون!» بە پەلە لە مالەکە دەرچوین و، پیشمەرگەکانی تریش هاتنە دەری. لە بەرزایی شاخەکەوە دایان گرتینەوە. بە راکردن لە دی دەرچوین بەرەو شاخەکەی بەرامبەری. تا گەیشتینە ئەوی تەقەمان لە سەر بو. ئیمەش گەیشتینە شاخەکە و، ئیتر شوینەکەمان قایم و سەلامەت بو. چوینە سەر کویرە کانیەک، ئاویکی کەمی هەبو، بۆ پشودان دانیشتین. لە دەستریژی یەکەم دا گوللەیەک لە ئەژنوی کامەرانی دابو، بە بریندراری لە سلیمانە بە جی ما بو، شەهابیشمان لی دابرا بو. ما بوینەوە حەمە و حەمەی ئامۆزای و کەمال و من.

رۆژی رابوردو، فەرەیدون حەمە سالح، فەرماندەی یەکی لە کەرتەکانی هەریمی یەک، چەند پیشمەرگەیەکی حسکی لە مزگەوتەکەی بیوەک دا چەک کرد بو، ئاریچیەکی لی سەند بون. چەکدارەکانی حسک ئەم پەلامارەیان بۆ سەر ئیمە لە تۆلەی روداوەکەی دوینی دا کرد بو. واسان بە چاک زانی دەمەو ئیوارە بچین بۆ قەوپلە و، لەویوە من نامەیەک بو تاهیری عەلی والی بنوسم.

شەو چوینە گوندی قەوپلە، لە مالی حاجی عەلی، کە ئاسیاوی حەمەی حاجی سابیر بو، دابەزین. میوانیکی کەیشیان هەبو، دەرویشیکی قسە خۆش بو. نامەیەکم بو تاهیر نوسی و، لە نامەکەدا ئاگادارم کرد بو کە بۆ کاریکی تایبەتی خوم هاتومەتە ناوچەکە و، ئامادەیی خۆمم دەربری بو بۆ بینینی و بۆ ئەوەی هەردوکمان هەولی خاوکردنەوەی گرژی نیوان پیشمەرگەکانی هەردولا بدەین و، سەرسورمانی خۆمم دەربری بو لەوەی کە پاش چەند سال ئەوە یەکەم جارە ئەو بیتە خواری بۆ «جەولە» و، جەولەکەیشی بە شەری یەکیتی دەس پی بکا.» کەمال شاکیر نامەکەی برد و رویشت، شەو ئیتر نەهاتەوە بۆ لای ئیمە. بە ئاسیاویکی خوی دا ناردبوی بۆ کاک تاهیر لە گوندی هوزخواجا. تا ئەو کاتە کەسیان نەیانئەزانی کە من لەو ناوچەیەدام، تەنانەت کامەرانیش، کە بە بریندراری گیرا بو، باسی هاتنی منی بۆ نەکرد بون. دوای گەیشتنی نامەکەم ئینجا زانی بویان من هاتومەتە خواری و لە گوندی «قەوپلە» م.

ئەم نامە نوسینە، بی خۆ ئامادەکردنی پیشمەرگەیی پیشەکی، هەلەیەکی گەورە و کوشندە بو کردم، لە باتی ئەوە ئەبو دەسبەجی هەمو هیزەکانی یەکیتی لە ناوچەکەدا کۆ بکەمەوە ئینجا نامەیان بۆ بنوسم، بەلام من ئەوەندەم لە خۆم رائەدی و بە خۆما رائەپەرموم کە بی چەکدار و هیز بچمە ناویان و قسەیان لە گەل بکەم، بە تایبەتی هەمو‌ی چەند حەفتەیەک لەوەو پیش چەند ئەندامی سەرکردایەتی حسکم بینی بو.

دەمەو بەیانی کەمال وەلامی نامەکەمی بۆ ناردمەوە کە ملازم تاهیر نوسی بوی. لە نامەکەی دا: پیخۆشحالی خۆی دەربری بو لە بونی من لە ناوچەکەدا و، گلەییەکانی خوی لە یەکیتی نوسی بو، ئامادەیی خۆیشی پیشان دا بو بۆ یەکتر بینین.

رۆژی ٥ ی کانونی دوەمی ٨١ ، تازە نانی بەیانی مان خوارد بو، هەر لە ناو مالەکەدا دانیشت بوین، خاوەن مالەکە هات وتی: «ئاوایی پر بو لە حسک!» هەرچەندە حسک هەمویان مەسئول بون، ناردم بپرسن مەسئولەکەیان کی یە. قادر چاوشین هات. دەمیک بو قادرم ئەناسی. قادر لە پیشمەرگە کونەکانی یەکیتی و، خوشکەزای عەبدولقادر هەلەدنی بو، لە جیابونەوەکەدا دابویە پال حسک. من پەلەی گەرانەوەم بو. هەوالی ملازم

تاهیر و هێزەکەیانم پرسی، وتی: «لە هۆزخواجان.» پێم وت: «با بچین بۆ لای!» بە کۆمەڵ بە ڕێ کەوتین.

لە هۆزخواجا مولازم تاهیر و لێپرسراوەکانی تریان بە پیرمانەوە هاتن و ناردیان هەندێ مریشکیان بۆ نانی نیوەڕۆ کڕی. دانیشتین بۆ قسە کردن. باسی تێکچوونی هەلومەرجی ناوچەکەمان کرد. مولازم تاهیر باسی ئەوەی کرد کە مەلا بەختیار هێزێکی گەورەی کۆ کردوەتەوە. چەند جار ڕێگای پێ گرتون و، بۆسەی بۆ ناونەتەوە. مەفرەزەکانی یەکێتی چەند جار تفەنگیان بەوان هەڵچنیوە و، پێشمەرگەیان گرتون و چەک کردون. قسەو باسی لەم بابەتەمان زور کرد و، باسی ئەوەمان کرد کە چون باری ناوچەکە ئاسایی بکەینەوە و، گرژی نێوان چەکدارەکانی هەردولا خاو بکەینەوە. پەشۆکاوییان پێوە دیار بو بە یەکا ئەهاتن و ئەچون. دوای نان خواردن ویستم ئیزنیان لێ بخوازم بڕوم. مولازم تاهیر وتی نەختێکی تر ڕاوەستە خۆی چوە دەرەوە. خولەی حەمە تاتە هاتە ژورەوە تفەنگەکەی من، بە دیوارەکەدا هەڵپەسێردرا بو، دەستی دایە و بردی، ئیتر تێگەیشتم. مولازم تاهیر پیاوێکی بە ئەدەب بو، شەرمی ئەکرد ڕاست و ڕەوان پێم بڵێ تۆ گیراوی، هەندێ منجە منجی کرد، بە گیرم هێنا ئاخرییەکەی وتی: «برادەران حەز ئەکەن لە گەڵیان بمێنیتەوە، چونکە لە خۆیان ئەمین نین و ئەترسن برادەرانی ئێوە بێنە سەریان!»

وتم: «گلدانەوەی من لە لای خۆتان کارێکی خراپە، ڕەنگە ئەوە هێزەکانی یەکێتی بورووژێنێ و بێنە سەرتان، ڕێگەم بدەن بڕوم بۆ ئەوەی وەکو خۆتان ئەڵێن گرژییەکە نەهێڵم!»

وتی: «تۆ میوانی لای ئێمە و زور موحتەرەمی و...» هەندێ ڕاوە ڕێوی هێنایەوە.

منیش وتم: «کاک تاهیر لەم موجامەلە ناڕاستانە گەڕێ، من نە میوانم و نە موحتەرەمم، بەڵکو گیراوم و، بەم کارە ئاوێکی خراپ ئەڕێژن و سابیقەیەکی خەتەر لە جوڵانەوەی کوردا دائەنێن، ئیتر هیچ لایەک باوەڕ بەوی تر نەکات»

وەکو دوایی بیستمەوە، ئەو ماوەیەی من لە ژورەوە لە گەڵ مولازم تاهیر و قادر جەباری خەریکی گفتوگۆ بوم، لە دەرەوە هەندێ لە وردە مەسئولەکانیان لە ناو خۆیان دا مشتومڕێکیان بوە لە سەر ئەوەی ئیزنم بدەن بڕوم یان گلم بدەنەوە. ڕەوفی خەلیفە سەعیدی ئامۆزای حەمەی حاجی مەحمود، کە تازە چو بوە ناو حسک و ببو بە دوژمنی خوێنخۆری یەکێتی، کەریمی دادە مینە و خولەی حەمە تاتە و، چەند کەسێکی تری لەم بابەتانە وت بویان: «ئەمە فرسەتێکی باشە فلانمان کەوتوتە بەردەس لای خۆمان گلی بدەینەوە بۆ ئەوەی هێزەکانی یەکێتی ئیتر نەیەنە سەرمان و، مەرجەکانی خۆمانیان بە سەردا بسەپێنین» هەرەشەی ئەوەیشیان کرد بو کە ئەگەر ئیزنم بدەن، ئەوان تەقەم لێ بکەن بمکوژن و تەسلیمی حکومەت ببنەوە. مولازم تاهیر و قادر و ئەوانی تر لە ژێر ئەم گوشارەدا بڕیاری گرتنیان دابوم.

من ئیتر ناامێد بوم لێیان و، زور ئەترسام ئەم گەوجێتییەی ئەمانە کرد بویان، ببێ بە هۆی شەڕێکی خوێناوی سەرانسەری لە نێوان ئەوان و یەکێتی دا، سەدان کەسی تێ دا بکوژرێ و، هەموشیان جنێو بە گۆڕەکەی من بدەن.

لە هۆز خواجاوە کەوتنە گەڕان بۆ دۆڵە چەوت، زەردویی، کەولوس، قەوێلە.. دێ بە دێ منیشیان لە گەڵ خۆیان ئەسوڕاندەوە. لە قەوێلە بوین لە پڕ وتیان با بڕوین بۆ

شاخەکە. هەندێ چەکداری یەکێتیان لە نزیک قەڵای سەروچک دێ بو. کردیان بە هەللا وتیان: «فەرمو ئەوە سەعاتێ ئەوە وازمان لێ ناهێنن!» بو بە شەڕ. گەمارۆی چەند پێشمەرگەیەکیان دا گرتیانن. دەرکەوت مەفرەزەیەک بون لە گەڵ مەحمود گەرمیانی لە شارەزور بون، ئاگایان لە بەزم و رەزمی گرتنی من نەبو، بۆ حەوانەوە و پشودان ئەچون بۆ شارباژێر و، بە ڕێکەوت بە سەر ئەم شەڕەدا کەوت بون.

*

مامجەلال لە دەرەوە بو، عومەر شێخ موس، عومەر مستەفا، کەمال خۆشناو، جەمال حەکیم، جەعفەر، ملازم عومەر، فەرەیدون.. لە بارەگاکانی سەرکردایەتی بون.

مەکتەبی سیاسی بەیانێکی لە سەر گرتنی من دەرکرد بو بە رادیو خوێند بویانەوە، هەڕەشەی قورسیان لە حسک کرد بو و، لە هەمان کات دا داوایان لە حشع کرد بو، بە تایبەتی لەو کاتەدا عەزیز محەمەدیش لە کوردستان بو، هەوڵی بەردانم بدەن. جەمال تاهیر، کە ئەوسا بەرپرسی رێکخستنە نهێنییەکانی ناوشارەکان بو، نامەیەکی بۆ عەلی بەگی باوکی تاهیر نوسی بو، هەڕەشەی لێ کرد بون کە ئەگەر من شتێکم لێ بێ، بنەماڵەکەیان لە رەگوریشە دەرئەهێنێ. عەلی بەگ ماوەیەکی درێژ ئەفسەری شورطە بو. هەڕەشەکەی بە جیددی وەرگرت بو. نامەکەی برد بو بۆ کاربەدەستانی «ئەمن» ی سلێمانی. مەلا بەختیار و سالاریش زۆری هێزەکانی شارباژێر، هەورامان، شارەزور، گەرمیانیان کۆ کردبوەوە لە نامەنوسین دا بون لە گەڵ ملازم تاهیر و، هەڕەشە و گورەشەیان بۆ ئەناردن.

*

هێزەکەی حسک و لێپرسراوەکانیان سەریان لێ شێوا بو نەیانئەزانی چی بکەن و، چی لە من بکەن، لە تاو هێزەکانی یەکێتی بش جێیان بە خۆیان نەئەگرت. چونە دولە سور و بە ناو ئوردوگای شانەدەری دا چون بۆ کێوی سورێن. لە شانەدەری لایان دابە ماڵی جەلالی حاجی کاکەلی. جەلال هاوڕێ ی کومەڵە بو، زۆری پێ ناخۆش بو منی بەو حاڵە دی، هیچیشی پێ نەئەکرا. چونە ئەشکەوتی دەرە گولان لە شاخی سورێن.

سورێن دیوێکی ئێران و دیوێکی عێراق بو. بە پێ ی پەیمانی زەهاوی ئێرانی - عوسمانی ئەم کێوە کرا بو بە سنوری هەردو دەوڵەت و، لە پەیمانەکەدا ناوی قەڵای زەڵم و گەردنەی چەقان هاتوە، وەکو ناوچەی سنور، هەردوکیان لەم سەر و ئەوسەری کێوی سورێن دان.

چەند سەرچاوەیەکی ئاو لە بناری سورێن دایە لەوانە: چەمی چەقان، کە لە یەکگرتنی چەمەکانی جوەمەرسی، عەرەبسوار، کەوڵزس دروست ئەبێ و، چەمی شەڵم، چەمی رێشێن، چەمی شیرەمەر. ئەم چەمانە ئەرژێنە شارەزورەوە. قسەیەکی کۆن هەیە، بۆ ئەوەی منال دەمی تەتەڵە بکا پێ ی دوبارە ئەکەنەوە، ئەڵێ: «چومە چەمی چەقان، چەقەڵ چەڵتوکی ئەچەقان!» سەرچاوەی شەڵم ئاوەکەی گەرمە وەکو ئەیانوت ماسیەکانی کوێر بون.

سورێن چەندین ئەشکەوت و کەورگی لێ یە، لەوانە: دەرە گولان، هەزار ئەستون، قوچی سولتان، دەرە کۆزە. لە دوڵی خورنەوەزان و وشکەناویش چەند ئەشکەوتێکی تری لێ یە. کانی و ئاو لە هیچیان نزیک نەبو. دەرە گولان بەرامبەر سەید صادق بو.

ئاوایییەکانی سورێن و بنارەکەی: چەوتان، کولبتان، زەنگیسەر، خرنوک، سیامیرە، کانی سێف، وەلسەت، بەرئەشکەوتان، تونەقاج، قەڵبەزە، تازە دێ، بەردەبەڵ، جوەمەرەسی،

بوریدەر، نەوی، بانی بنوک، چنارە، دەرەگولان، میری سور، رێشەن، عامورە، بانی شار، قایمبجە.. هەمو راگوێزرا بون. گوندی «دزلی» کە لە دیوی ئێران بە سوورێنەوە بو، بنکەی سەرەکی پارتی لی بو. نادر هەورامی بەرپرسی بنکەکە بو. هەندێ لە پێشمەرگەکانی حسک هاتوچۆیان ئەکردن.

ئەو ماوەیە منیان بە مەحمودی حەمە تاتە سپارد بو ئیشکم لی بگری. غەفور (دەرسیم) پاریدەری مەحمود بو. مەحمود برایەکی خوی لە گەل بو، گاڵتەی بە حسک ئەکرد، هەمیشە شەرە دەنوکیان بو. بەفر سوورێنی گرت بو. هەوا زور سارد بو. رایەخ و پێخەفیان نەبو. لە بن تاشە بەردێک دا لە سەر ئەرز بە دیار ئاگری دوکەڵاوییەوە هەڵتروشکا بوین.

زورجار غەفور و کەریم ئەیانداپەوە بە چاوما کە ئەوان پەرەوازەی دەستی منن و، من وام لی کردون ناچارین تەسلیمی رژیم ببنەوە و، دوایی ببنەوە شاخ و لە داخی من ببن بە حسک و، لە ژیانی سیاسی و پێشمەرگایەتی دوا بکەون. هەردوکیان راستیان ئەکرد، بەلام من هیچ دوژمنایەتییەکی تایبەتیم لە گەل کەسیان نەبو، حەزم ئەکرد ئەمانیش پێش بکەون و، ببن بە کادری خوشناو و سەرکەوتو. لە بەر ئەوەی ئاموژگاری سودی نەبو لیم پرسی بونەوە و، بەلام ئەوان بەرگەی لێپرسینەوەیان نەگرت بو .

*

ئەو کاتەی لە شارباژێر بوم جارێک بە دو قزلی لە گەل کەریم دانیشتم هەندێ ئاموژگاری بکەم. پیم وت: «تو لە سایەی شورشەوە لە کەریمی دادەمەنەوە بوی بە دکتور چالاک، لە کاتێکا نە دکتوری و نە چالاکی. هیچ کلیە یا مەعهەدێکی طبیت نەخوێندوە و، هەمو بەیانییەکیش بە زلر لە خەو هەلت ئەستان. هیچ نەبی شورش ئەو چاکەیەی بە سەر تو و غەفور لگاو و خولەی جگەرەوە هەیە کردونی بە د. چالاک و دەرسیم و نەبەز. لە بەر ئەوە حورمەتی شورشەکە بگرن، ئەگەر باکی ناوبانگی کزمەلە و یەکێتیتان نیە، باکی ناوبانگی ناوەکانی خوتان هەبی!»

کەریم کورێکی وریا و لەهلەبان بو. هەرگیز بو قسە دانەئەما. دوای ئەوە بە ماوەیەک تەسلیم بوەوە. پاش ماوەیەک نامەی ستاری سەعید خەلەفی بو هێنایین. لای ئیمە نەمایەوە چو بو لای حسک. ئیتر نەمبینیەوە تا لیرە یەکمان گرتەوە.

*

کەریم بە ناوی گەیاندنی بەریدی سیزەوە لە سورینەوە بە ناو ئیران دا گەرایەوە بو دەراوی دولەتو. غەفور جارو بار قسەی خوشی ئەکرد. لە ناو خویان دا باسی زەلامێکیان ئەکرد بە خراپە. یەکێکیان وتی: «حیزب دەری کردوە». غەفور هەلی دایە، وتی: «بوچی ئەم حیزبەی ئیمەش خەلک دەرئەکات؟»

*

عەلی بەگی باوکی تایەر هات بو دەرە گولان. راسپاردەی د. فاضل بەرواک ی پی بو، کە ئەوسا بەربوەبەری «ئەمنی عام» بو. بە باوکی تایەردا جوابی بو نارد بون کە منیان تەسلیم بکەن، یان ئەگەر ئەوە بە باش نازانن کارێکی وا بکەن بکەومە کەمینێکی ئەوانەوە و، بە زیندویەتی بمگرن، بەرامبەر بەوە بەلێنیان دابوتی چەردەیەکی باش پارەیان بدەنی. شتی وەها لە مەلازم تایەر نەئەوەشایەوە. قادر جەباری مەسەلەکەی بو باس کردم. کردم بە

گاڵتە لە گەڵی وتم: «تا چەند ساڵی تر خزمەتی یەکێتی بکەم بایی ئەو پارەیە خزمەتم پێ ناکرێ. منیان تەسلیم بکەن و پارەکە وەربگرن و بیکەن بە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ خۆتان و بەشێکی بۆ یەکێتی!»

شەولناو ئاریەجیەکیان نا بوو بە ماڵی عەلی یەگەوە لە سلێمانی. تایەر بە گلەییەوە رووداوەکەی بۆ گێڕاسەوە. ئەو بە هاوڕێکانی منی ئەزانی. بەڵام بە ڕاستی ئەوان نەبوون، «ئەمنی سلێمانی» بۆ خۆشکردنی ئاگری ئاکۆکییەکە، ئەمەیان کرد بوو.

چەند جاری مەحموود باسی ڕاکردنی لە گەڵ کردم. ئەیوت: «ئەگەر بەلێنم پەدەیتی شتی کۆنم لە گەڵ حساب نەکەن و ڕێزم بگرن و، بکەن بە فەرماندەی کەرت، لە گەڵت دێم.» لەو کاتەدا کەولی من پارەی زۆری ئەکرد باوەڕم پێ نەئەکرد لە گەڵی بڕوم، گوێم نەئەدایە قسەکانی. خەلیفەی عەبدوللا مارف، کە خۆی بە یەکێتیەکی تۆزاو دائەنا، ئەویش چەند جاری ئەو باسەی لە گەڵ کردم، هەلێکی لە بارمان بۆ هەڵ نەئەکەوت. ڕۆژێکیان دابەزی بووین بۆ ناو کەلاوەکانی قایتەجە. قادر جەباری مان لە گەڵ بوو، دنیا تەمومژێکی چڕ بوو چاو چاوی نەئەبینی. بە خەلیفەم وت: «ئەمڕۆ فرسەتە با بڕۆین!» خەلیفە ملی نەدا وتی: «ئەترسم بگەینە سەر جادەکە و تەمومژ بڕەوێتەوە و بگیرێین. خەلک وا ئەزانێ بە ئەنقەست تەسلیمم کردوی» هەلەکەمان لە دەس چوو.

چەند ئێوارەیەک بۆ شەو دایان بەزاندم بۆ گیلەک، شەرەمەر.. دوای ئەوە تێتر بردمیانە ئەشکەوتی «هەزار ئەستوون». حشع لەم ئەشکەوتەدا بنکەیەکیان دانا بوو. لە گەڵ ئەوان بوون بە یەک ماڵ.

*

دانیشتوانی ئەشکەوتەکە تێکەڵاو بوو لە: مەفرەزەیەکی حشع، کابرایەکی گیراو بە تاوانی جاسوسی، مەفرەزەیەکی حسک کە پاسەوانییان لە من و حەمەی حاجی سابیر و فەرەح ئەکرد، هەروەها یەکدوو عەرەبی عێراقی کە لەو هەرایەدا لە گەڵ حسک بوون. پاشماوەی هێزەکەی حسک لە ناو دۆڵەکەدا بەرامبەر بە شارەزوور دامەزرا بوون. فەرەح، نامەی مەلا بەختیاری بۆ هێنا بوون، ڕێگەیان نەدا بوو بگەڕێتەوە گرتبوویان.

پاش چەند ڕۆژێ حەمەیان بەر دا. من و فەرەح مابووین.

*

کاوەی شێخ لەتیف و ناسر حەفید «نالە» هاتن بۆ ئەشکەوتەکە. لە گەڵ بەرپرسەکانی حسک قسەیان کرد بوو، قسەکانیان جێگەی نەگرت بوو، ئیزنیان لێ وەرگرت بوو بێن لە لای من بێننەوە تا چارەنوسی من بە لایەک دا ئەکەوێ. کاوە پیاوێکی قسە خۆش و نوکتەباز بوو. زۆری حەز لە ڕاگرتنی کەو و ڕاو ئەکرد و، نیشانچییەکی دەسڕاست بوو. بەڵام نەخۆش بوو، بە شرینقە خەوی لێ ئەکەوت، زۆر کەم ئەنوست و، زۆر کەم خواردنی ئەخوارد. هەلومەرجی ژیان لە ئەشکەوتەکەدا ناخۆش بوو. زۆری لە گەڵ خەریک بووم بگەڕێتەوە، بە قسەی نەکردم و بۆ پارێزگاری من مایەوە. مەترسی هەبوو یەکێ لە پێشمەرگەکانی حسک، بۆ پارە، تفەنگێکم پێوە بنێ و بڕوا تەسلیم بێتەوە.

چەند جاری هەلم بۆ هەلکەوت هەلێم لە بەر ئەو دوام خست پێم جوان نەبوو توشی گێچەڵی بکەم. لە گەڵ خۆی باسم کرد پێکەوە بڕۆین ئەیوت لە گەڵتان دەرناچم، ڕاستیشی نەکرد نەیئەتوانی بە پێ بڕوا بە وڵاخ هاتوچۆی ئەکرد.

*

حشع، بە تایبەتی عەزیز محەمەد، لە سەر داوای سەرکردایەتی یەکیتی، هەولی
زوریان لە گەل سەرکردایەتی حسیک دابو بۆ بەردانم. سەرکردایەتی حسیک لە سەرەتادا
هەندی بڕوبیانوویان هێنا بووەوە و، هەندی مەرجی سیاسییان دانا بو. سەرەنجام لە ڕۆژی
٨١/١/٢٢ دا بڕیاریان دا بو من بەر بدەن. بە نامە ئاگاداری حشعیان کرد بو، نامەیشیان
بۆ هاوڕێکانی خۆیان نوسی بو داوایان لی کرد بون: «بە بی قەید و شەرت» بەرم بدەن و،
تەسلیمی نوێنەری حشعم بکەن. مەکتەبی سیاسی یەکیتی جەمال حەکیم و، حشع قادر
ڕشید و عەلی کلاشینکوف یان لە ناوزەنگەوە نارد بو بۆ ئەم مەبەستە.

ڕۆژێکیان لە ئەشکەوتەکە دایانبەزاندین بۆ دەشتاییەکەی بەردەمی. جەمال حەکیم،
کە ئەوسا ئەندامی م س - یەکیتی و، دارای شێخ جەلالی حەفید، کە فەرمانەدەی هەریم
بو، لە گەل تاقمی پێشمەرگە لەوانە: شێخ عومەری حاجی شێخ کەریم، هات بون. نامەی
سەرکردایەتی حسکیان بۆ تایەر و هاوڕێکانی هێنا بو من تەسلیمی ئەوان بکەن.

لێپرسراوەکانی حسک ئامادە نەبون بڕیارەکەی مەکتەبی سیاسی حیزبەکەیان
جیبەجی بکەن. داوایان لە جەمال ئاغا کرد بو: بۆ ئەوەی من بەر بدەن ١٠٠ تفەنگیان
بداتی. چەندی لە گەلیان ئەلین، کەلکی نابی. جەمال ئاغا بە ناچاری داواکەی قەبوڵ کرد
بون، وت بوی: «نیوەی تفەنگی کەلەکە کراومان نیە لە عەمبار دا، نەبی بچین لە ناو
هیزەکان دا کۆی بکەینەوە»

ئەم داوایەی حسکم پی سوکایەتیەکی زور گەورە بو، خۆمم لە بەر چاو کەوت بو،
چونکە یەکی بو لە نزمترین شێوەکانی «نیپتیزاز». ئەم داوایەی ئەوان زیاتر لەوەی لە هی
حیزبی سیاسی بچی، لە هی باندی مافیا ئەچو.

*

ئێوەڕۆیەکیان ملازم تایەر هاتە لام. چەند سەعاتی مایەوە قسە و باسی گشتی مان
ئەکرد. پیش ئەوەی هەستی بڕوا، وتی: «ئەو برادەرانەی ئیوە ئەوەندە هاتوچوی ئەم ناوانەیان
کردوە هەمو شتیکمان ئەزانن، هیزیکی گەورەیان لە چەمی گەلال کۆ کردوتەوە، ڕەنگە
پەلامارمان بدەن لە بەر ئەوە بڕیارمان داوە بگوێزینەوە بۆ جیگایەکی تر، سبەینی دێن بە
دواتا». لە ناو هیزەکەی حسک دا چەند کەسیک هەبون بەردەوام هەواڵ و دەنگوباسیان بۆ
ئەهینام. یەکیکیان خەبەری بۆ هینا بوم کە لەگەل نالە هەورامی ڕیک کەوتون لە نزیک
بانی شار بنکەیەکی هاوبەشی پارتی و حسک دابنین و، منیش ببەن بۆ ئەوێ بۆ ئەوەی
هیزەکانی هەردو حیزب پیکەوە ئیشکم لی بگرن. کاوەش ئەم هەواڵەی بیست بو.
کە تایەر ڕۆیشت بە کاوەم وت: «گویت لە قسەکانی کاک تایەر بو؟»

وتی: «بەلی!»

وتم: «ئەلی ی چی؟»

وتی: «تۆ خۆت چی بە چاک ئەزانی بیکە!»

وتم: «ئەگەر ببەن بۆ لای پارتی، ئیتر هیچ هیوایەکم نامینی، لە بەر ئەوە پیم
باشە ئەمشەو فرسەت بهینین بڕۆین»

وتی: «تۆ بڕۆ، هەرچی چەکیشت ئەوی ببە! بەلام من بڕ ناکەم و نامەوی دوات
بخەم»

وتم: «ئەترسم تۆشی کێشە بێی لە گەڵ حسک»
وتی: «گوێ مەدەرێ، لام وایە تۆشی کێشە نابم، ئەگەر تۆشیش بوم، تۆ لەو لای مشورم بخۆ!»

ئیتر دڵنیا بوم شێخ کاوە لێم زیز نابێ ئەتوانم بە ئازادی بجولێم.

پێشتر لە بەردەمی ئەشکەوتەکەدا زۆر جار ڕاوەستا بوم، سەرنجی سەرەوەی و ڕێگاکانی ئەملا و ئەولایم دابو. زۆر جار بیرم لێ کرد بوەوە ئەگەر بڕوم لە کوێوە بڕوم. بڕیارم دا بە ڕێگا ئاساییەکان دا نەڕوم. شەوێ بە تاریکی بە لای ئەشکەوتەکەدا ڕاستە و ڕاست بە شاخەکەدا هەڵبگەڕێم و بە بناری سورێن دا بەرەو شانەدەری بڕوم.

فەرەجم ئاگادار کرد خۆی ئامادە بکا. کاوە وتی: «ئەوەکو تۆشی تەقە بێ چەکی پێشمەرگەکانی من بیەن» من نەمئەویست کاوە ئیحراج بکەم چەکم لێ وەرنەگرتن، بەڵام هەندێ نارنجۆکم لێ وەرگرتن. کاوە بە زۆر دەمانچەکەی خۆی دامێ. لە گەڵ فەرەج وا ڕێک کەوتم کە من دەرچوم ئەویش بە دوای من دا بێت بۆ شوێنی چاوەڕوانی. دەوروبەری سەعات ۱۰ ی شەو لە کاتی گۆڕینی ئیشککگرەکەدا بە ناوی مێزکردنەوە لە دەرگای ئەشکەوتەکە دەرچوم. دنیا زۆر تاریک بو. چاو چاوی نەئەبینی. بەردە قوتەکانی بەردەمی ئەشکەوتەکە لە زەلام ئەچون. پاسەوانەکە لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکەدا ڕاوەستا بو. چومە پەنا بەردێک و بە بێ ڕاوەستان ڕوم کردە لای سەرەوەی ئەشکەوتەکە. چاوەڕوانی فەرەج بوم دوای ئاوێ ئەویش هات و، دو چەکداری شێخ کاوەش بۆ پارێزگاری بە دوامان دا هاتن زۆر بە خێرایی بە شاخەکەدا هەڵگەڕاین، لە ماوەیەکی کورت دا ماوەیەکی باش دور کەوتینەوە. چەکدارەکانی شێخ کاوەمان ئیزن دا. دە دەقیقەیەکی پێ چو کابرای پاسەوان کە زانی ئیمە دیار نەماوین و، گومانی کرد بو ڕامان کردبێ، ڕیزێک تەقەی کرد بۆ هۆشیار کردنەوەی هاوڕێکانی. گوێ مان لە تەقەکان بو بەڵام ئیمە ئەوەندە دور کەوتبوینەوە مەترسی ئەوانمان لە سەر نەما بو.

بە بناری سورێن دا ڕویشتین بە سەرەوەی ئۆردوگای شانەدەری دا لە جادەمان دا و پەڕینەوە بەری چەمی گەڵاڵ. تاریکایی شەو و ماندویەتی سەری لێ تێکدا بوین شۆر بوینەوە بۆ لای کانی سپیکەی بەرخ، تاریک و ڕونی بەیانی ئاقاری ڕاستمان دۆزییەوە بە شاخەکەدا هەڵگەڕاینەوە بە لای مایندول دا بۆ چەمی گەڵاڵ.

ڕۆژ بوبوەوە، بەڵام ئیمە ئەوەندە خۆمان ڕەتاند بو هەردوکمان پرزەمان لێ بڕا بو، منیش ئەوەندە هەڵ ئەنگوت بوم و شەقم لە بەرد هەڵ دا بو، نینۆکەکانی هەردو کەلەموستی پێم شکا بون، ئەیشسانئەوبرا بۆ پشودان لا بدەین. بە نزیک هوزخواجادا دریژەمان بە ڕویشتن دا. ماوەیەکی باشمان لە دولەکە بڕی بو. فەرەج چو بۆ دێ یەکی ئەو نزیکانە ولاخ پەیدا بکا. منیش پاڵم دابو بە بەردێکەوە دانیشت بوم، لە دورەوە زەلامێکم بەدی کرد جلی پێشمەرگەی لە بەردا بو. چومە ئەدیو چاودێری بکەم، ڕوانیم ئەبەرد کەلاری بو. هەستام و بانگم کرد. بۆ ئەبەرد شتێکی چاوەڕێ نەکراو بو من لەو بن بەردەدا ببینێ. لە خۆشی دا پێ ی ئەرزی نەئەگرت. دوای ماچومۆچ بە ڕاکردن بەرەو بەرخ بە ڕێ کەوت مژدە بدا بە پێشمەرگەکان. پێشمەرگەکان بە بیستنی هەواڵەکە کردیان بە تەقەی خۆشی و زۆریان بەرەو پیرم هاتن. هەندێ لە دانیشتوانی ئاوایی نەیانئەزانی بۆ بۆچی کتوپڕ کردویانە بە تەقە. ژنێک لە ژنی دراوسێکەیانی پرسی بو: «ئەوانە بۆچی تەقە ئەکەن؟» لە وەڵام دا وت بوی:

«بەڕێز مەسئولێکی زلیان پەلەسە بوە!».
دوای ٣٢ رۆژ دەلی گەیشتمەوە ناو هاوڕێکانم.

*

حەمەی حاجی سابیر ماڵەکەی لە پەرخ بو، چومە ماڵی ئەوان. جەمال ئاغا خەریکی کۆکردنەوەی چەک بو بۆ حەسیک، ئەم ئەرکە زەحمەتەی لە کۆڵ بوەوە. پاش دانیشتن و گفتوگۆ، زۆری هێزەکەمان ڕێگە دا بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان و، نامەیەکیشم بۆ کاک تایەر و هاوڕێکانی نارد، دڵنیام کردن لەوەی یەکێتی نیازی شەڕی نیە و، ئەوان بە ئازادی و دڵنیایی ئەتوانن لە هەر جێیەکی خۆیان ئەیانەوێ جموجۆڵ بکەن. بەڵام ئەو کارەی ئەمان کرد بویان ئەوەندە دزێو بو، تا چەندین ساڵ زاتیان نەئەکرد بێنە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیەوە.

ئەگەر ئەم ڕوداوە نەبوایە لەوانە بو ڕەوتی ژیانی من بە جۆرێکی تر بڕوشتایە. چونکە دوای ئەمە ئیتر لە سەفەری ئەوروپا و لە ژنهێنان پەشیمان بومەوە. ئەمە جاری دوەم بو بە هۆی کێشەی سیاسیەوە هەلی ژنهێنانم لە کیس چو. جاری یەکەمیان بەر لە بەیانی ئازاری ۷۰ لە گەڵ کچێک، کە بە ئارەزوی دڵی خۆم هەڵبژارد بو، ڕێک کەوت بوم بیخوازم، بە هۆی ڕوداوەکانی دوای ئازارەوە وازم لێ هێنا. ئەمجارەیش بە هۆی ئەم ڕوداوەوە.
پاش چەند ڕۆژێ مانەوە لە شارباژێر گەڕامەوە ناوزەنگ.

*

## کاروباری کۆمەڵە

### ڕەوشتی هاوڕێ ی کۆمەڵە

لە خەباتی ژێر زەمینی سیاسی - چەکداردا هەندێ جار کەسانێ وا پێش ئەکەون کە لە ژیانی گشتی دا خاوەنی پایەی بەرزی کۆمەڵایەتی و دەسەڵاتی حوکمڕانی و سامان و دارایی نەبون، بەڵام بە هۆی خەباتەوە دەسەڵات و چەکدار و پارەیان ئەکەوێتە بەر دەست. بێگومان ئەمەیش «نەفسییەت» ئەگۆڕێ و، ئەگەر پێگەیاندنی ڕاست و پەروەردەکردنی دروست و، ئامۆژگاری و چاودێری بەردەوامی لە گەڵ نەبێ کابرا بەرەو گەندەڵی «فەساد» ئەخلیسکێنێ. ڕێکخراوە تێکۆشەرەکە ئەبێ بە جۆرێ لە باندی مافیا و، کابرای تێکۆشەر بە سەرۆکی باند یان بە «میری شۆڕش».
لە شۆڕشی کوردا نمونەی ئەمانە زۆرە.
کۆمەڵە ڕێکخراوێکی «عقائدی» بو. بیروباوەڕ ئەندامەکانی بە یەکەوە بەست بون. من و زۆری کە لە هاوڕێکانم لامان وابو کە تێکۆشەری کۆمەڵە ناتوانێ لە هەمان کات دا دو ژیانی هەبێ: ژیانێکی تایبەتی و ژیانێکی سیاسی. لامان وابو هەردوکی بە جۆرێک تێکەڵاون کە لە یەک جیا ناکرێنەوە.
یەکێ لە ژیانی تایبەتی دا دز بێ ناتوانێ لە ژیانی گشتی دا پاک بێ و، لە ژیانی تایبەتی دا درۆزن بەڵام لە ژیانی گشتی دا ڕاستگۆ بێ... بۆ پێگەیاندنی ئەندامەکانی کۆمەڵە:

١. چاودێری و ئامۆژگاری بەردەوام هەبوو. هەر یەکێکیان هەڵەیەک یان موخالەفەیەکی بکردایە بانگ ئەکرا بۆ لێپرسینەوە و سزادان.
٢. بەردەوام بڵاوکراوەی ناوخۆ بۆ ڕیزەکانی ڕێکخستن دەرئەچوو.
٣. دەورەی پێگەیاندنی کادر ئەکرایەوە.
یەکێ لەو بڵاوکراوانەی ئەبوو بە وردی پەیڕەوی بکرایە ئەمە بوو:

*

## ڕەوشتی هاوڕێ ی کۆمەڵە

هاوڕێ ی تێکۆشەر!

هاوڕێ ی کۆمەڵە بە چی لە خەڵکی جیا ئەکرێتەوە؟ بە چی دا ئەناسرێتەوە؟ ئەبێ جیاوازیی چی بێ لە گەڵ یەکێکی تر؟ ئاخۆ ڕەنگ و ڕووی جیاوازە؟ جلوبەرگێکی تر لە بەر ئەکا؟ شاخ و باڵی هەیە؟ باڵای بەرزە؟ یا چی..؟

هاوڕێ ی کۆمەڵە مرۆڤێکی نائاسایی نیە. هاوڕێ ی کۆمەڵە ئادەمیزادێکی ئاساییە وەکو هەموو خەڵکی تر، بەڵام ئەبێ بە کردار و ڕەفتار و وتاری لە خەڵکی کە جوێ بکرێتەوە.

هاوڕێ ی کۆمەڵە پەیوەستە لە کاری سیاسی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی دا نموونەی ئیلتیزام و گوێڕایەڵی بێ بەرامبەر بە لێپرسراو یا فەرماندەکەی و، لە جێبەجێ کردنی بێ قەید و شەرتی فرمان و بڕیار و ئامۆژگاری دەزگا دەسەڵاتدارەکانی سەرووی خۆی دا.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبێ لە ژیانی ڕۆژانەی دا نموونەی مرۆڤێکی نموونەیی بێ، لە قسە و گفتوگۆی دا، لە هەڵسوکەوت و کردەوەکانی دا، بە گوێرەی هەلومەرجی ئەو کات و شوێنە نوێنەرەوەی بیروباوەڕی بەرزی کۆمەڵە و ڕێباز و سیاسەتەکەی بێ.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبێ لە شەڕا نموونەی ئازایەتی و لە خۆ بوردن و لە خۆ بڕان بێ، لە حەسانەوە و پشوودان دا هاوڕێکانی لە بیر بێ و، بە پێشیان بخا، لە ناخۆشی دا بە تەنگیانەوە بێ و مشووریان بخوا، لە ڕاپەڕاندنی ئیشوکارەدا ڕوح سووک و لەش سووک بێ، لە گفتوگۆدا هێمن و لە سەر خۆ و بە ئەدەب بێ.

هاوڕێ ی کۆمەڵە لە کاتی دەزگیر بوون دا ئەبێ نموونەی خۆڕاگری و نەتەمی بێ و، لە ژێر باری ئەشکەنجە و ئازاردا نموونەی دان بە خۆدا گرتن بێ و، زیان بە هاوڕێکانی نەگەیەنێ.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبێ ئەمری ژیانی بە کۆمەڵ و کۆلێجان بێ، ئەبێ بزانێ چۆن لە گەڵ خەڵکی ترا ئەژی، لە مەقەڕەیەک یا لە کەرتێک دا، لە ماڵێک دا یان لە بارەگایەک دا لە گەڵ پێشمەرگە و خەڵکی ترا ئیش ئەکا و هەڵ ئەکا و ئەگونجێ و بناغەی دۆستایەتی و هاوخەباتی و هاوسەنگەرییان لە گەڵ دائەمەزرێنێ.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبێ لە شکان و تێکەوتن و تەنگانەدا ورە بەر نەدات، لە ماندوبوون و برسێتی و تینوێتی و بێ دەرامەتی و بێ پارەیی دا خۆگر بێ، لە بێ هێزی و بێ دەسەڵاتی دا بە زات بێ. لە سەرکەوتن دا بایی نەبێت و لە کاتی دەسەڵاتداری دا لە خۆی نەگۆڕێت و لە زاڵ بوون دا زوڵم نەکات.

هاوڕێ ی کۆمەڵە لە هەر ناوچەیەکا بوو ئەبێ حورمەتی عورف و عادەتی

دانیشتوانی ناوچەکە، حورمەتی خو و رەوشت و نەریتی دێرینەیان بگری، حورمەتی ڕیش سپی و پیاوماقوڵانی ناوچەکە بگری، حورمەتی دین و کەسانی دیندار بگری، حورمەتی مزگەوت و گۆڕستان و شوێنە پیرۆزەکانیان بگری.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی لە گەڵ خەڵکا ڕەفتاری باش بی، بە چاوی سوک تەماشایان نەکات. گوێ لە ڕەخنەکانیان بگری چەندە بی کەڵک و سادەش بن، گوێ شل بکا بۆ داوا و پێشنیارەکانیان، بە سنگێکی فراوانەوە ئامۆژگاریەیان لی قەبوڵ بکات، بە دەنگ داوا و گیروگرفتەکانیانەوە بچی، بەوپەری ژیری و هێمنی و پشوودرێژییەوە هەوڵی چارەسەرکردنیان بدا.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی لە بەرامبەر دوژمنانی گەلەکەمان دا ئازا و نەترس بی، دڵ ڕەق و بی بەزەیی بی، چاوپۆشییان لی نەکات. کۆمەڵانی خەڵکی خۆش بوێت و لە گەڵ مەینەتی و ئێش و ئازارەکانیان دا بژی.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی دەس پاک بی، هیچ بە زۆر لە کەس نەسێنی، چاو نەبڕێتە ماڵی خەڵک، ماڵی گەل و شۆڕش بە فیڕۆ نەدات.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی داوێن پاک بی، چاو نەبڕێتە ناموسی کەس و شەرەفی خەڵک بە هی خۆی بزانی، وەکو شەرەفی خۆی بیپارێزی.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی دەم پاک بی، جنێو بە کەس نەدا، بوختان و قسەی ناڕاست نەداتە پاڵ کەس، لە پاش ملە بە خراپی زەمی کەس نەکات.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی فەرق و جیاوازی لە بەینی هاوڕێکانیا بە هۆی خزمایەتی و ناسیاوی و برادەرایەتییەوە نەکات. مەگەر سەبارەت بە ئازایەتی زیاتر و گیرایەڵی و دڵسۆزی و لە خۆبرانی زیاترەوە.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی ڕاستگۆ و سەر ڕاست بی، هێمن و ژیر بی، ڕەوشت بەرز و بە وەفا بی، سادە و ڕوح سوک بی، ئەبی دژی خۆپەرستی و خۆهەڵکێشان بی، دژی خۆبادان و کەش و فش و خۆ بە زل زانین بی، دژی لە خۆبایی بوون و لوت بەرزی و بە خۆوە نازین بی، دژی درۆ و فشە و فیشاڵ بی، دژی لە خۆرازی بون و کەس بە هیچ نەزانین بی.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی هەمیشە ئەوەی لە بیر بی کە خەباتی کۆمەڵە لە ناوەرۆک دا خەباتێکی سیاسی چینایەتی و نیشتمانییە، ئەبی بی وەڕس بون و ماندو بون کاری سیاسی لە هیچ بوار و کاتێک دا پشت گوێ نەخات، بە کردار و ڕەفتار و وتاری چاک نەک بە زۆر و بە ترساندن جی ی خۆی لە ناو دەوروپشتەکەی دا بکاتەوە و حورمەتی خۆیان بە سەرا بسەپێنی و هەوڵی دۆزینەوەی ناسیاو و دۆست و هاوڕێ ی نوێ بدات.

هاوڕێ ی کۆمەڵە ئەبی ئەخلاقی بەوجۆرە بی، پەیڕەوی ئەم سەرەتایانە بکات، بەم گیانە خۆی و هاوڕێکانی پەروەردە بکات، بەم شێوەیە بژی و کار بکات.

ئەوانەی وەها نین هاوڕێ ی ڕاستەقینەی کۆمەڵە نین.

*

ئەم ئامۆژگاریانە بۆ ئەوەی لە گەرمەیان دا جێگەی بیستمەوە لە قەوارەی پاکەتی جگەرەدا چاپ کرا بو. هەمو هاوڕێیەکی کۆمەڵە دانەیەکی ئەدرایە و، ئەبو جێبەجێ ی بکا. ئەگەر جێبەجێ ی نەکردایە یا لی ی دەرچوایە بە گوێرەی سەرپێچییەکەی سزا ئەدرا.

سزادان: چەک کردن، لابردن لە سەر کار، گرتن و دەس بەسەر دانان و، لە هەندێ حالەت دا ئیعدام.

ئەوانەی موخالەفەیان ئەکرد هەتا پلەیان بەرزتر بوایە سزاکەیان قورستر ئەبو. ئەو کاتە وشەی «ترۆ» بلاو بوەوە. ئەم وشەیەمان لە شیعرەکەی «مەحوی» وەرگرت بو کە ئەلێ:

دنیا تیاترۆیە مەوستە تیا بڕۆا
کێ مابەوە هەتا سەر نەبوبێ تیا ترۆ؟

نمونەیەکی ئیعدام، ئیعدامی ڕیبوار چاوشین بو.

ڕیبوار، فەرماندەی مەفرەزە بو لە تیپی قەرەداخ. هاتوچۆی مالی کابرایەکی کرد بو. ئەو سەردەمە پیشمەرگە گەڕۆک بون. بۆ خواردن و نوستن لە مالان دائەمەزران. ئەم کابرایە مالەکەی کرد بو بە بنکەی پیشمەرگە. بە دلسۆزی و دلپاکی خزمەتی ئەکردن. ڕیبوار ژنەکەی لی هەلگیرا بوەوە و هەلی گرت بو بیبا بۆ تیران. ژنەکە ٣ منالی بە جی هیشت بو. ئەم ڕوداوە لەو کاتەدا زۆر بە خراپی دەنگی دایەوە. دوای گەرانێکی زۆر ژنەکە و پیشمەرگەکە لە دێیەکی دۆلی جافەتی دۆزرانەوە. بۆ ئەوەی بەدگومانی لە نێوان پیشمەرگە و مالی جوتیاران دا دروست نەبی و، بۆ ئەوەی جارێکی کە هیچ پیشمەرگەیەک زات نەکا بەدرەوشتی وەها دوبارە بکاتەوە، م س بڕیاری ئیعدامی کورەکەی دا و، ئیعدام کرا.

یەکەمین کۆنفرەنس

ئەو ماوەیەی من گیرا بوم، کادرەکانی کۆمەلە لە بارەگاکانی سەرکردایەتی زنجیرەیەک سیمیناری فیکری و سیاسییان گرت بو. ناکۆکییەکانی ناو ڕیزەکانیان قولتر و ئاشکراتر ببو. ئەمەیش زۆری کادرەکانی تورە کرد بو. بیری گرتنی کۆنفرەنسیان لە لا گەلالە بو. کە گەیشتمەوە ناوزەنگ چەند کۆبونەوەیەکمان کرد و بڕیارمان دا کۆنفرەنس ببەستین. کەوتینە خۆ ئامادە کردن. لە مانگی مایس دا نوینەرەکان تاقم تاقم گەیشتن.

*

سرودی ئینتەرناسیونال

لە ناو ئیمەدا ئازاد هەورامی دەستی مۆسیقای هەبو. هەندی ئالەتی موسیقای ئەزانی و، سەری لە دانانی ئاواز دەرئەچو. لە هەمان کات دا لەوانە بو باوەڕێکی قولی بە مارکسیزم هەبو، ڕوالەتە ئاشکراکانی لە بابەتی «چەکوش و داس» و «ئەستیرە» و «سرودی ئینتەرناسیونال» ی.. بە لاوە زۆر گرنگ بو. ئەیویست کۆنفرەنسەکە بەم سرودە دەس پی بکا و، لی برا بو تاقمێک فیر بکا بیلین. تاقمی لە پیشمەرگە کونەکانی هەلبژارد بو، هەندێکیان سەریان لی ی دەرنەئەچو، لە بەر خاتری ئازادیش دلیان نەئەهات بو داواکەی ڕەت بکەنەوە.

ئازاد سرودەکەی بۆ چاپ کرد بون و، یەکی دانەیەکی دابونی بۆ ئەوەی لە بەری بکەن. خۆیشی ڕۆژانە لە گەلیان دائەنیشت و لە گەلی ئەوتن. ئاخر ڕۆژ کە ڕۆستەم ئەبینی لی ی ئەپرسی: «سرودەکەت لە بەر کردوە؟» ئەلی: «بەلی!» ئەلی: «ئادەی بۆم بلی!» ڕوستەم دەس ئەنیتە بنا گوی ی لە سەر ئاوازی یەکی لە گۆرانیەکانی سەید محەمەدی سەفایی ئەلی: ئەری ئینتەرناسیونال.. وەی وەی ئینتەرناسیونال...

ئازاد زۆری پی ناخۆش ئەبی و زۆر تورە ئەبی.

یەکەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە

لە ژێر دروشمی: لە پێناوی پتەوکردنی ڕیزەکانی کۆمەڵە و ڕاپەڕاندنی جەماوەری
گەلەکەمان دا ، لە مانگی ئاباری ساڵی ١٩٨١ دا لە ماڵیەرس یەکەمین کۆنفرەنس بە
ئامادەبوونی ١٨٥ ئەندام، بەسترا. ئەندامانی کۆنفرەنس نوێنەرایەتی نزیکەی ٨ هەزار ئەندام
و لایەنگری ڕێکخراوەیان ئەکرد، لە ناو پێشمەرگە و لە ناو شارەکان و لە دەرەوەی وڵات.
ئەندامانی کۆنفرەنس خەڵکی بەشی هەرەزۆری شار و شارۆچکە و ئۆردوگا و ناوچە
دێهاتییەکانی کوردستانیان تێ دا بوو.

لە ڕووی تەمەنیانەوە: ٤٩ ئەندامی لە بەینی ۲۰ - ۲٤ و، ٧٤ ئەندامی لە بەینی
۲٥ - ۳۰ ساڵ و، ١١ ئەندامی لە بەینی ۳١ - ۳٥ ساڵ و، ٤١ ئەندامی لە بەینی ۳٦
- ٤٠ ساڵ و، ١٠ ئەندامیشی بەرەوژووری ٤٠ ساڵ بوون.

لە ڕووی کار و پیشەوە: ٤٤ ئەندامی کرێکار و، ١٧ ئەندامی پیشەگەر و، ٦٥
ئەندامی موچەخۆری بچووک و فەرمانبەر و، ٩ ئەندامی پیشەگەری گەورە و، ٥٠ ئەندامی
خوێندکاری زانکۆ و پێشمەرگە بوون. لەوانە ٥ یان ئافرەت بوون.

لە سەرەتادا من ڕاپۆرتێکی درێژم خوێندەوە باسی دامەزرانی کۆمەڵە و،
قۆناغەکانی گۆڕان و گەشەکردنیم کرد لە سەرەتاوە تا ئەو کاتە. کۆمیتەی سەرکردایەتی
ڕێکخستنی ناوخۆ و، کومیتەی ڕاپەڕین و، ڕێکخراوی شەهید جوامێر (بەغداد) و،
ڕێکخراوی شەهید لەیلا (ئافرەتان) و، ڕێکخراوی بادینان، ڕاپۆرتی درێژیان ئامادە کرد
بوو. خوێندرانەوە و گفتوگۆیان لە سەر کرا.

بەشێکی کاتی کۆنفرەنس بۆ پیاچوونەوەی ڕابووردووی کۆمەڵە و، بەشێکی بۆ دانانی
ڕێبازی کاری قۆناغی داهاتوو تەرخان کرا بوو. یەکێ لە کارە گرنگەکانی ئەم کۆنفرەنسە
دانانی «پەیڕەوی ناوخۆ» بوو. گفتوگۆ و باسەکان تێکرا ٨٠ سەعاتیان خایاند و، بە
هەڵبژاردنی سەرکردایەتی تازەی کۆمەڵە کۆتایی هات.

*

ئەوانەی ناودێر کرا بوون بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ۲۰ کەس زیاتر بوون. بۆ ئەوەی
ئەندامانی کۆنفرەنس، پێش دەنگدان، بە چاکی بیانناسن: دوو کەس ڕەخنەیان لێ ئەگرت و،
یەک کەس پەسنی ئەدا. بۆ ئەوەی بێن بە ئەندامی سەرکردایەتی بڕیار درا ئەبێ لە نیوەی
دەنگەکانی ئەندامانی کۆنفرەنس زیاتر بهێنن. بۆ ئەوەی کاروباری کۆنفرەنس بە ڕێکوپێکی
بڕوا، من خۆم دەنگم نەدا، ستایشی کەسم نەکرد و ڕەخنەیشم لە هیچ کەس نەگرت، هیچ
لیستەیەکیشم ئامادە نەکرد بوو.

ئەندامانی کۆمەڵە، لە هەندێ لەو هاوڕێیانە بە داخ بوون، چونکە:

١. ململانێیەکی نالەباریان دەس پێ کرد بوو لە سەر پلە و پایە بە تایبەتی لە گەڵ
ئەوانەی لە زیندان بەر بووبوون، ئاژاوەیەکی زۆر و پشێوییەکی قوڵیان خستبووە ناو
ڕیزەکانی ڕێکخستنەوە، دەستەگەرییان تێ دا دروست ئەکردن.

٢. لە بیروباوەڕدا توندڕەو بوون و، ئەیانویست کۆمەڵە بە لای توندوتیژی دا ببەن.

٣. ڕەفتاریان لە گەڵ پێشمەرگە و کادرەکان باش نەبوو، هەندێکیان بە لووتبەرزی و
غەرابیەوە لە گەڵیان ئەجوڵانەوە.

لە ئەنجامی دەنگدان دا ساڵار و جەعفەر دەرنەچوون و، عومەر و مەلا بەختیار بە

دەنگێکی کەم دەرچوون. دوای بڵاوکردنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردن بە ڕیز، سالار، مەلا بەختیار، جەعفەر، «لازم عومەر».. قسەیان کرد و، هێرشیان کردە سەر ئەندامانی کۆنفرەنسەکە. لێ گەڕاین قسەی خۆیان بکەن، چەند کەسی لێیان ڕاپەڕین ویستیان بە توندی وەڵامیان بدەنەوە، بەڵام بۆ ئەوەی وەزعەکە نەشێوێ، من ڕێگەم نەدان.

*

دوای کۆنفرەنس ئەم هاوڕێیانە تووڕە بوون و، هەڕەشەیان کرد کە شۆڕش و کۆمەڵە بە جێ ئەهێڵن و، ئەچن بۆ دەرەوە. من چەند جاری سەردانم کردن و، زۆرم لە گەڵ وتن بۆ ئەوەی دڵیان بهێنمەوە جێگەی خۆی و، بێنەوە کار بکەن. بەڵێنم بە سالار و جەعفەر دا کە هەر لە م س یەکێتی دا بیانهێڵینەوە. قسەکانم سوودی نەبوو. سوور بوون لە سەر هەڵوێستی خۆیان. مەلا بەختیار لە هەموویان زیاتر خۆی بە دڵشکاو ئەزانی و، نارەزایی دەرئەبڕی. گەیشتە تینم بە مەلا بەختیارم وت: «کاتێ خۆی کە من بووم بە کۆمەڵە و، دوایێتر بە یەکێتی و، دەستمان کردەوە بە شۆڕش، نەمبیست بۆ کابرایەک هەیە ناوی مەلا بەختیارە، ئێستایش ئەگەر ئەمێنیتەوە زۆر باشە، ئەیشڕۆی خواحافیزت بێ، بە بێ تۆیش کۆمەڵە و یەکێتی و شۆڕش بەردەوام ئەبێ!»
بە کۆمەڵ چوون بۆ تاران. لەو ڕۆژانەدا مامجەلال گەڕابووە تاران. قسەی لە گەڵ کرد بوون بگەڕێنەوە کوردستان و قانیعی کرد بوون. بەڵام ئەمان لە هەولی ئەو بە ژێری خۆیان نەکەوتن و، ئەو داخەیان لە دڵ دەرنەچوو. جەعفەر نامیلکەیەکی چاپ کرد بوو بە ناوی «مانگ گیران»ەوە. دەرنەچوونی خۆی و هاوڕێکانی بە گیرانی مانگ شوبهاند بوو.

*

حدک و پدک
نوێنەرانی شورای شارەکان لە مەهاباد کۆبوونەوەیەکیان کرد بۆ گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی ڕژێمی نوێ. داواکانیان لە ٨ ماددەدا کۆ کرد بووەوە. لە ماددەی یەکەمین دا داوای سەلماندنی مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنووسی کوردیان کرد بوو، لە ماددەی هەشتەمین دا داوای دەرکردنی سەرانی قیادە موەقەتەیان کرد بوو لە ئێران. لەم کۆبوونەوانەدا نوێنەرانی زۆر لە ڕێکخراوە سیاسییەکانی کوردستانی ئێران بەشدار بوون. هەموویان، جگە لە نوێنەرانی دیموکرات، سوور بوون لە سەر ئەوەی حکومەتی ئێران ئەم دەربکا لە ئێران.
لەو نامیلکەیەدا کە سەبارەت بە قیادەی موەقەتە دەریان کرد هەڵوێستی خۆیان بەم جۆرە ئەگێڕنەوە:
«پاش زیاتر لە یەک ساڵ ڕاپەڕین و قوربانی دانی گەلانی ئێران لە ٢٦ ی ڕێبەندانی ١٣٥٧ دا شۆڕشی خەڵکی ئێران یەکەم قۆناغی سەرکەوتنی بڕی و یەکێک لە کۆنەپەرستترین و درندەترین ڕژێمەکانی سەر بە ئیمپریالیزمی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا تێکەوە پێچا. ئەو سەرکەوتنە ئەگەر بۆ خەڵکی ئێران مایەی جەژن و شادمانی بوو، بۆ بەڕێوەبەرانی دەزگای یەکڕێکخراوی بنەماڵەی بارزانی زەبەیەکی گورچوبڕ و دڵ تەزێن بوو. چونکە ئەوانە هیچ پەیوەندیەکی دوستانەیان لە گەڵ گەلانی ئێران دا نەبوو و، جاری نەشیان توانی بوو لە گەڵ کاربەدەستانی تازە بە سەرداکەوتوی حکومەتی خومەینی ڕێک کەون. شەپۆلی ڕق و تووڕەیی و نارەزایی بەرامبەر بە قیادەی موەقەت سەرتاپای ئێرانی داگرت

بو، زوربەی حیزب و ریکخراوەکانی کوردستان و سەرتاسەری ئیران داوایان دەکرد تەواوی ئەفرادی قیادەی موەقەت لە ئیران دەربکرین. سەرەبەند و بی بەندی هەمو باس و خواستیکی سیاسی دەهاتە سەر قیادە و ئەو تاقمەیان لە زوربەی جینایەتەکانی کۆن و تازەی کاربەدەستانی ئیران دەرهەق بە کومەلانی خەلک دا بە بەشدار دەزانی.

ئەگەرچی حیزبی دیموکراتی کوردستان زیاتر لە تەواوی ریکخراوە ئیرانیەکان شارەزای ئاکار و کردەوەی دژی گەلی سەروکایەتی ئەو تاقمە بو، هەرچەند حیزبی ئیمە پتر لە هەموان کوتەکی خوفروشی و بەکریگیراوی ئەوانەی وی کەوت بو، بەلام لە بەر هەستی مەسئولیەت بەرامبەر بە چارەنوسی گەلی کورد و هەزاران مالی لیقەوماوی کوردی عیراقی کە لە ئیران دا ئاوارە و سەرگەردان بون هیچ کاتیک فیکری تولە ئەستاندنەوەی نەبوو هەمو کاتیک لەو باوەرەدا بو کە پاداشی جینایەت و خەیانەتی ئەو تاقمە دەبی بە رەفتاری باش لە گەل کوردە عیراقیە دەربەدەرەکان بداتەوە. هەر بویەش لە هەمو جیگایەک دژی ئەو داوایە راوەستا کە کوردە پەنابەرە عیراقیەکان لە ئیران دەربکرین.

بە دوای سەرکەوتنی شورش دا کاتیک نوینەرانی دەولەتی کاتیی موهەندیس بازرگان هاتنە مەهاباد تاقە نوینەری حیزبی ئیمە لەو کوبونەوەدا زور دژی بەندی هەشتی داخوازەکان بو کە داوای دەکرد ئەفرادی قیادەی موەقەت لە ئیران دەربکرین، دوایەش کە ئەو بەندە بە زوربەی دەنگ پەسند کرا حیزبی ئیمە چەندین جار بە رەسمی ئەو داخوازەی بە شتیکی غەیرە ئوسولی دانا و رەتی کردەوە. کومەلانی خەلکی کوردستانی ئیران شاهیدیکی زیندون کە حیزبی ئیمە لە سەر ئەو سیاسەتە چەندی قسە پی گوترا و چۆن لە لایەن زوربەی ریکخراوە سیاسیەکانی ئیرانەوە پەلاماری توندی تەبلیغاتی کرایە سەر.

بەلام حیزبی ئیمە دیسان لە سەر ئەو سیاسەتە مەسئولانەیەی خوی رویشت و ئەوەندەی لە توانایی دا هەبو خەلکی کوردستانی بو کومەگ بە پەنابەرانی کوردی عیراق هان دا. هەزاران مالی عیراقی کە لە ناوچەکانی دوورەدەستی ئیران سەرگەردان بون بە موافەقەتی حیزبی ئیمە گەرانەوە کوردستان و بە تەشویقی ئیمە لە کوردستان دا جیگا و ریگایان بو دابین کرا و حاوانەوە.

لە کونفرانسی گەلان لە تارانیش کە نوینەری زور لە حیزب و ریکخراوە سیاسیە ناوچەیی و سەرتاسەرییەکانی ئیرانی تی دا بو، تەنیا ریکخراویک کە دژی هیرش کردن بو سەر قیادەی موەقەت راوەستا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران بو، لە بریارنامەی کونفرانس دا بە زوربەی دەنگ بریاریک لە دژی قیادەی موەقەت پەسند کرا، بەلام هەر لەوی دا بە سەراحەت گوتراوە کە حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران موخالیف بوە.

بە کورتی لە گەل ئەوەی زوربەی هیزە سیاسیەکانی ئیران و بە تایبەتی کوردستان بە توندی لە دژی قیادەی موەقەت کاریان دەکرد، حیزبی ئیمە هیچ وەخت هەلویستی دوژمنانەی بەرامبەریان نەگرت و هەر لەو باوەرەدا بو کە ئەوانە وەک میوانیک دەبی چاویان لی بکری و بە پی ی توانا یارمەتی خیزانە لیقەوماوەکانیان بدری.»

سەرکردایەتی حدکا لەم راپورتەدا دەوری خویان باس ئەکا لە چەند مەسەلەی گرنگ دا بەرامبەر قم:

- رازی نەبون بە تاوانبار کردنی سیاسی قم.
- رازی نەبون بە دەرکردنی سەرکردەکانیان.

- هێنانەوەی هەزاران خێزانی ئەندامەکانی قم بۆ کوردستان، کە دواییتر بون بە چەکهەڵگری لەشکری بارزانی بۆ شەڕی حدکا و، یەکێتی.

بێگومان ئەم هەڵوێستەی حدکا سەبارەت بە هەست کردن ئەبو بە مەسئولیەت، وەکو لەم راپۆرتەدا بۆ پاساودانی ئەم هەڵوێستەیان نوسیویانە، بەڵکو بۆ هێشتنەوەی قم بو وەکو ملوزمی گیانی یەکێتی. حدکا ئەیئەویست یەکێتی لە پەژارەی قم ئاسودە بێ. بەلام قم بونە بە هێزی پارمەتیدەری ئێران بۆ تێکشکاندنی حدکا و دەرکردنی لە زۆری ناوچەکانی کوردستانی ئێران.

قم لە حدکا بون بە مارەکەی شیخ هورمەز!

*

لە فۆلکلۆری کوردی دا ئەگێڕنەوە: شیخ هورمەز بە لای شەخەڵێکی چڕ و پڕدا رائەبوری. شەخەڵەکە ئاگری گرت بو دوکەڵی لی بەرز ئەبوەوە. شیخ هورمەز ئەروانی ئاگر زۆری بۆ مارێک هێناوە کە لە ناو تورتکێک دا گیری خواردوە، خەریکە لە گەڵ پوش و پاوانی شەخەڵەکەدا بسوتێ. مار لە ناو گڕ و دوکەڵ ئەفیشکێنی و، هەڵئەبەزێتەوە، بەلام هیچ ڕێگایەکی نابێ دەرباز بێ. شیخ هورمەز بەزەیی بە مارەکەدا دێتەوە. گالۆکێکی درێژی پێ ئەبێ بە سەر ئاگرەکەدا بۆی رائەڵ ئەکا. مارەکە خۆی لە گالۆکەوە ئەپێچێ و لە ئاگرەکە تێ ئەپەڕێ، بەلام هەرکە ئەگاتە شیخ هورمەز خۆی لە ملی ئەئاڵێنی و تەبەوێ پاداشتی چاکەی شیخ هورمەز بە گەستنی بداتەوە.

*

## لاک

لە سەرەتای شوباتی ١٩٨١ دا لە تاران رێکخراوێکی تازە بە ناوی: «لەشکری ئیسلامی کورد» کە بۆ گاڵتە پێ کردن ناویان لێ نا بو: «لاک» دامەزرا.

ئەم رێکخراوە تازەیە هیچ بەرنامەیەکی سیاسی نەبو، دامەزرێنەرەکانی: مەلا حسێن ماریونسی، شیخ قادری سوتکە، عەبباس شاهین، کە لە تاران دائەنیشتن لە ناو خۆیان دا کۆک نەبون.

مەلا حسێنی ماریونس و شیخ قادری سوتکە لە دوای ئاشبەتاڵەوە لە ئێران دانیشت بون. مەلا حسێن، خەڵکی ناوچەی تەلعەفەر، کابرایەکی کۆنەپەرست و دواکەوتوی لە کوردستان دابڕاو و، شیخ قادریش، خەڵکی گوندی سوتکەی ناوچەی قەلاسیوکە، قولە دەربەگێکی زاڵم و نەخوێندەوار بو. بەلام عەبباس شاهین، کابرایەکی زیرەک و لێزان بێ، سەردەمێک لە گەڵ «حرکە اخوان المسلمین» لە موسڵ کاری کرد بو، لە ٧٤ دا بوبو بە پێشمەرگە و، لە سەرەتای دامەزراندنی یەکێتی دا هاتە قامیشلی لە گەڵ یەکێتی کاری ئەکرد. خۆی وا دەرئەخست رێکخراوێکی لە ناو ئەفسەرانی جەیش دا هەیە. بەم تیدبهانایانە ماوەیەک دەستی مامجەلالی بری هەندی پارەی لی کیشایەوە و، سەردانی سعودیەی کرد و، دواییتر کە وازی لە یەکێتی هێنا هاوکاری لە گەڵ دەزگای موخابەراتی سوری و لیبی ئەکرد و، خۆی گەیاندە کاربەدەستانی ئێرانی.. ئەمانە هەر یەکەیان بۆ مەبەستی، بەلام هەموویان لە ژێر چەتری ئێران دا و، بە ئامۆژگاری ئەوان یەک کەوت بون.

*

لەشکرەکەیان نمونەی لەشکری بەکرێگیراو بو. ئێران چەک و پارە و پەناگای، وەک

بەشێک لە سپای پاسداران، بۆ دابین کرد بوون. هەرکەس ئەبو بە چەکهەڵگری ئەوان:

١. پارەی مانگانەیان بە ڕێکوپێکی ئەدایە.

٢. چەکی جوان و تازەیان ئەدایە.

٣. ئەیتوانی ماڵ و خێزانەکەی بهێنێت بۆ ئێران و، خۆیشی بە ئازادی بە سەرانسەری ئێران دا بگەڕێ و بسووڕێتەوە.

٤. شەڕی ڕژێم ئەکا.

*

ئەم «ئیمتیاز» انە لەو کاتەدا کە بە هەزاران کەس لە جەبهەی عێراق هەڵات بوون، لە دێهاتەکان دا بێ دەرامەت و بێ ئیشوکار دانیشت بوون، هەروەها بۆ هەندێ لە دانیشتوانی دێهات کە ئەیتوانی لە گوندەکەی خۆی دا بمێنێتەوە و، هەمو ئەو دەسکەوتانەیشی هەبێ و، بە ناو خزمەتی دین و نیشتمان ئەکا. وای کرد لە ماوەیەکی کورت دا پەرە بسێنن و، هێزێکی زۆر پێکەوە بنێن. هیچ بیروباوەڕێکی دینیی یا نەدینیی نەبو کە ئەمانە پێکەوە کۆ بکاتەوە، ئەوەی کۆی کرد بونەوە دەسکەوتی ماددی و، مەبەستی تایبەتی بو. لە ناو هێزەکەیان دا کەسانی جۆراوجۆر کۆ ببووەوە. پارتی یش دەستی تێ خست بون و، هەندێ کەسی خۆی نارد بوە ناویانەوە. یەکیتی یش هەندێ لە کادرەکانی خۆی نارد، ناویانەوە.

گۆرانیبێژێکی سووری هەبو ناوی محەممەد شێخۆ بو. لە گەڵ ئاشبەتاڵ دا ئەویش چو بو بۆ ئێران. لەم بەزمەدا ئەویش چو بوە ناو لاکەوە. مەلا حسێن دژی گۆرانی و مۆسیقا بو. ئەویش بە چاولێکەری ئیمام خومەینی لای وابو حەرامە، نابێ کەس گۆرانی بلێ یا گوێ ی لێ بگرێ. ڕۆژێکیان لە بارەگای لاک لە تاران لە سەر ئەم کێشەیە مەلا حسێن و محەممەد شێخۆ ئەبێ بە مشتومڕیان. محەممەد ئەڵێ: «تۆ قورئانی خۆت بخوێنە، منیش تەنبووری خۆم لێ ئەدەم، بزانە خەڵک لە کامیان کۆ ئەبێتەوە؟» مەلا حسێن ئەڵێ: «ئەڵێی ئەم زەمانە تایبەی فسق و فجوورن، دیارە لە تۆ کۆ ئەبنەوە!»

*

سەرەتا کە ویستیان دەس بکەن بە کارکردن خۆیان چەند کەسێکیان نارد بۆ ناوزەنگ بۆ گفتوگۆ لە گەڵ مەکتەبی سیاسی و، لە سەر چەند مەسەلەیەک پێک هات بون. هەروەها ئێرانیش داوای لە یەکیتی کرد بو کارئاسانییان بۆ بکا. بەرامبەر بەوەی ئێران کارئاسانی بۆ یەکیتی بکا.

کە نێوانی ئێران و یەکیتی تێک چو، ئەمە کاری لە نێوانی لاک و یەکیتی یش کرد. لاک بەڵێنیان دابو:

١. دەس نەخەنە ناو کاروباری خەڵکەوە.

٢. دوژمنانی یەکیتی و کەسانی گومانلێکراو لە ڕیزەکانی خۆیان دا وەرنەگرن.

٣. یارمەتی یەکیتی بدەن بۆ گوێزانەوەی چەک.

*

## گەل

هەر لەو ماوەیەدا سامی سنجاری یش حیزبێکی تازەی دامەزراند بە ناوی: «حزب الشعب الدیمقراطی الکردستانی».

زۆری ئەم حیزبانە هیچ زەمینەیەکی فیکریی یا کۆمەڵایەتییان نەبو. لە سایەی

جەنگی عێراق - ئێران و، ناکۆکیی یەکێتی - پارتی دا دروست ئەکران.

سامی لە بنەماڵەیەکی دەسروێشتوی سنجارە. بە ڕەچەڵەک یەزیدی بوون و موسوڵمان بوون. لە سەردەمی پاشایەتی دا بە «بەعسە» نێردراوە بۆ بەریتانیا و، لەوێ هەندەسەی خوێندوە. هەر لەوێ ئێکەڵاوی حشع بو. دوای ١٤ تەمموزی ٥٨ یەکێ لە توندڕەوەکانی حشع بو. تاوانبار کرا بو بە هاوبەشی لە ڕوداوەکانی ١٩٥٩ ی موسڵ دا. کە ئینقیلابی ٨ ی شوباتی ٦٣ بو، وازی لە حشع هێنا و، هەڵات بۆ ماڵومە کە ئەوسا بارەگای مەکتەبی سیاسی پارتی لێ بو. لە ئێستگەکەی شۆڕش دا لە گردەڕەش کەوتە کار.

لە ناکۆکی نێوان بارزانی و مەکتەبی سیاسی دا، بە لای لای سەرکەوتودا دای شکاند و، لە هاوینی ٦٦ دا بو بە ئەندامی مەکتەبی تەنفیزی و، لە کۆنگرەی حەوتەم دا هەڵبژێردرا بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی. دوای خوێندنەوەی بەیانی ئازاری ٧٠ بو بە وەزیری ئیعماری شیماڵ.

سامی ئەو کاتەی وەزیر بو هەوڵی دابو دەستەیەک ڕوشنبیر و خوێندەوار بە تایبەتی ئەوانەی خۆیان بە چەپ دائەنا و، ئەوانەی لە ناو حیزبی شیوعیەوە هات بون، لە خۆی کۆ بکاتەوە. دوای هەڵگیرسانەوەی شەڕی کوردستانیش لە گەڵ ئەوانە پەیوەندی باش و نزیکی ڕاگرت بو.

دوای ئاشبەتاڵ سامی چو بۆ ئێران و، مانگی کانونی یەکەمی ١٩٧٥ بە ئاگاداری و یارمەتی ساواک ق م ی پێک هێنا و، خۆی بو بە سکرتێری و، بۆ ئەو مەبەستە سەفەری ئەوروپای کرد.

*

سامی لە ساڵانی ١٩٧٥ - ١٩٧٩ دا سکرتێری قیادە موەققەتەی پارتی بو، لە کۆنگرەی نۆهەمی پارتی دا خۆی هەڵنەبژاردەوە. ماوەیەک خۆی وا پیشان دا کە دەستی لە کاری سیاسی هەڵگرتوە. دوای ماوەیەک ئێران گرتی. قسەی جیاواز لە سەر گرتنەکەی هەبو. هەندێک ئەیانوت: بنەماڵەی بارزانی بە گرتنی داوە و، هەندێکی تر ئەیانوت: بە تۆمەتی جاسوسی گیراوە. دوای چەند مانگی بەربو ڕۆیشتە لەندەن. لەوێ کەوتەوە جموجوڵ. پەیوەندی لە گەڵ هەندێ لە هاوکارەکانی سەردەمی قیادە موەققەتە، بە تایبەتی ئەوانەی لە ئەوروپا بون، تازە کردەوە و، سەردانی سوریای کرد.

لە تەمموزی ٨١ دا سامی هاوڕێ و هاوکارەکانی خۆی کۆ کردەوە بۆ کۆنگرەی دامەزراندنی حیزبێکی تازە بە ناوی: «پارتی دیموکراتی گەلی کوردستان». سامی حیزبەکەی بە ژمارە کەم بو، بنکەی جەماوەری و هێزی پێشمەرگەی نەبو. تاقمی ڕۆشنبیری لێ کۆ بوبوەوە، لە گەڵ تاقمی سەربازی هەڵاتو. لەو زەمانەدا کە ژمارەیەکی زۆر گەنجی کورد لە سەربازی هەڵات بون، هەمو لایەک ئەیتوانی هەندێکیان بۆ لای خۆی ڕابکێشێ، بەڵام لە کاری خۆی دا بایەخی بە دو شت ئەدا: ڕاگەیاندن و، پەیوەندی دەرەوە.

لە شام جەریدەیەکی کوردی - عەرەبی لە ژێر ناوی: «گەل - الشعب» دا دەرئەکرد، لە چاو جەریدەی زۆر لە حیزبەکانی کەدا بە ڕواڵەت جوانتر و بە ناوەڕۆک دەوڵەمەندتر بو. چەند نامیلکەیەکیشی بڵاو کردەوە.

سامی دۆستایەتی لە گەڵ سوریا، لیبیا، ئێران دامەزراند. حیزبەکەی وەکو دوکانێکی سیاسی لێ کرد بو بۆ داوای یارمەتی لە دەوڵەتان. تەنانەت لە حیزبە

کوردیەکان. تەنیا یەک جار سامی یەک ملیون دۆلاری لە لیبیا بۆ یارمەتی حیزبەکەی وەرگرت. وەکو ئەیانوت لە ناو خۆیان دا لە سەر ئەم پارەیە تێکچوون و، هەندێکیان بە یەکجاری لێ ی دوور کەوتنەوە.

*

## تێکچوونی یەکێتی و ئێران

ململانێ ی دەسەڵات لە ئێران دا لە نێوان باڵی دینیی میزوربەسەر و باڵی دینیی پانتۆل لە پێ گەیشت بوە پۆپە. مامجەلال لە حوزەیرانی ۸۱ دا گەیشتەوە تاران. بەنی صەدر، سەرۆک کۆماری ئێران، مستەفا چەمران، وەزیری دیفاع، فەلاحی سەرۆکی ستادی ئەرتەشی بینی.

وەجبەیەکی گەورەی چەکی قورس، ئارپیجی و، سووک بە فڕۆکە و بە پاپۆر گەیشت بوە تهران بۆ یەکێتی. ئێران بەڵێنی پێشەکی بە سوریا و لیبیا دابو ئەم چەکانە تەسلیم بە یەکێتی بکا. دەستی بە سەردا گرت و، تەنیا پارچەیەکیشی ئەدا بە یەکێتی.

بەنی صەدر، بەڵێنی بە مامجەلال دابو، کە پەیوەندی ئێران لە گەڵ یەکێتی چاک بکا و، چەکە گیراوەکان بداتەوە و، هەوڵی چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەی کوردەکانی ئێران بدا. فەلاحی یش هەمان بەڵێنی دا بو. ۳۰۰۰ کلاشینکۆفیان دابویە لە گەڵ خۆی بیهێنێتەوە. گەیشتنەوەی مامجەلال و ئەو بەڵێنە خۆشانەی پێیان دابو، هەموومانی دڵخۆش کرد. لامان وابو «دەوری رەحمەت» مان لێ ئەکرێتەوە. بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ناکۆکیەکان تەقینەوە. بەنی صەدر بە سواری فڕۆکە هەڵات بۆ پاریس و، فەلاحی لە هالیکۆپتەردا تەقێنرایەوە و، ئەو باڵەی دەستی بە سەر کاروباردا گرت بە ئاشکرا کەوتە دوژمنایەتی یەکێتی.

*

باڵی دینیی کە بەرەو زاڵ بون ئەچو، هەڵوێستی بەرامبەر یەکێتی دوژمنانە بو. دەستیان بە سەر چەکەکان دا گرت. چەند جاری لەم بارەیەوە قسەیان لە گەڵ کرا بێ سود بو. کابرایەکی سەرهەنگ کرا بو بە فەرماندەی هێزەکانی «شمال غرب» ناوی صەبادی شیرازی بو. داوای وەفدێکی «نیزامی» و، لێپرسراوی ناوچەی پێنجوێنی یەکێتی کرد. ئێمەش، ملازم عومەر، ئازاد هەورامی، بەکری حاجی صەفەرمان نارد.

دوای ئەوەی قسە و گفتوگۆیان کرد بو، صەبادی شیرازی بە راشکاوی پێ ی وت بون: «ئازاد کردنی عیراق، لە پاککردنەوەی ئێرەوە دەس پێ ئەکات - کۆبونەوەکە لە ورمێ بو، مەبەستی پاککردنەوەی ناوچەی ورمێ بو - ئەبێ ئێوەش هێزەکانتان وەکو ئەفرادی بارزانی بهێنن بۆ ئێرە، پێکەوە تا سەر سنوری عیراق لە هێزەکانی ضیدی ئینقیلاب - مەبەستی هێزەکانی حدکا و سازکا بو - پاک بکەینەوە، کە گەیشتینە سەر سنوری عیراق، لەو چەکانەی هیناوتانە زۆر زیاترتان ئەدەمێ! تا ئەوە نەکەن جارێکی کە باسی چەک مەکەن»

هەر بەو تێگەیشتنە یەکێ لە دروشمەکانی ئێران لەو زەمانەدا: «راه قدس از کربلا میگذرد» بو. گوایە ئەگەر رژێمی عیراق بروخێنن و کەربەلا بگرن رێگەی رزگارکردنی

قودس له ئیسرائیل ئەکریتەوە.

وەفدەکەی بەرێزەوە بە هالیکۆپتەر ڕەوانە کرد بۆ بۆ مەهاباد. بە نائومێدی گەڕانەوە لامان. داواکانی سەرهەنگ صەیادی شیرازی ڕوون و ئاشکرا بو، بەلام بە تیمە جێبەجێ نەئەکرا.

*

سوریا وەفدێکی گەورەی بە سەرۆکایەتی عەبدولحەلیم خەددام نارد بۆ گفتوگۆ لە گەل کاربەدەستانی تەهران. یەکێ لەو باسانەی ئەم وەفدە لە گەل تیرانی کرد بۆ، چاککردنی پەیوەندی یەکێتی - تەهران و، ڕێگەدان بە ناردنی چەک بو. حازم (عەبدالجبار الکبیسی) پێش لە گەل ئەم وەفدە هات بو. ئێرانیەکان وت بویان: «ئێوە چۆن چەک ئەدەن بە ئەمانە ئەمانە هەم کوردن و هەم سوننەن بۆ هەردولامان خەتەرن!» نەیانزانی بو خەددام سوننەیە.

وەفدێکی ئێرانی لە گەل حازم هاتن بۆ ناوزەنگ بۆ هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، پەیوەندی یەکێتی و حدکا. ئەمانە لە سەردەشتەوە بە پێ هاتن بۆ ناوزەنگ، زۆربان جلی پاسدارییان لە بەر کرد بو، چەکیان پێ بو، بە درێژایی ڕێگا لە چەند جێگا بە بیانوی نوێژکردن و پشودانەوە بۆ چاو هەلسەتن خۆیان دوا خست بو، بۆ ئەوەی کێشەیەک لە گەل حدکا دروست بکەن. دوای گەڕانەوەی وەفدەکە ئێران بڕیاری دا پەیوەندی لە گەل یەکێتی ببڕی.

*

ڕاگرتنی هاوسەنگی لە دوستایەتی دا لە گەل حدکا و بزوتنەوەی کورد لە لایەک و، دوستایەتی لە گەل حکومەتی تەهران لە لایەکی تر کارێکی لە کردن نەهاتبو. مامجەلال ئەیویست ئەم هاوسەنگیە ڕابگری، بەلام زۆری نەئەخایاند ئاشکرا ئەبو. هەردولا ئێران و حدکا ئەکەوتنە تەنگ هەلچنین بە یەکێتی. ڕاستیەکەی زۆر جار پێشمەرگەی کوردستانی عێراق لە شەڕەکان دا بەشدار ئەبون بێ ئەوەی پێیان وترا بێ، خۆیان لە بەر سەختی هەلومەرجی کوردستانی عێراق بۆ پشودان و گەڕان و سوڕان ئەچونە دیوی ئێران و، تێکەلاوی ئەو شەڕانە ئەبون. لە لایەکەوە سەرکردایەتی حدکا و ڕێکخراوەکانی تر مەمنونیان نەبون، لە لایەکی ترەوە گیروگرفتی سیاسی گەورەیان بۆ یەکێتی لە لای حکومەتی ئێران دروست ئەکرد.

دوای هەلاتنی بەنی صەدر، ئێران لە پڕ پەلاماری هەمو ئەوانەی دا کە بە ئەندام و پێشمەرگەی یەکێتی ناسرا بون و گرتنی. موحسین عەلی ئەکبەر، عەبدورڕەزاق میرزا، عەلی حەویز، لاوکۆ و تاقمی پێشمەرگەی برینداز کە لە نەخۆشخانەکان دا بون و، هەندێ پێشمەرگە کە بۆ کڕینی کەلوپەل لە بازاڕی شارەکانی ئێران بون. ئەمانەی گیرا بون هەمویان ئیجازەی ڕەسمیی دەولەتیان پێ بو. موحسین نوێنەری یەکێتی بو لای ئێران و، عەبدوڕەزاق لە سەفارەتی سوری کاری ئەکرد. ئەم کارە لە کاری حکومەت ئەئەچو. بەلام ئەوان سەفارەتی ئەمریکایان داگیر و، هەمو دیپلومات و فەرمانبەرەکانیان گرت بو. شتی وا چاوەڕوان نەکراو نەبو. چەند مانگێ لە زیندان دا مانەوە، حکومەتی سوری لە سەری هەلدانی، ئینجا بەر دران. بەلام پەیوەندی نێوان یەکێتی و ئێران پچرا.

*

## پەشێوانی هەلومەرجی کوردستان

هاوینی ساڵی ١٩٨١ هەلومەرجی کوردستان ئاڵوزا بوو. جەبهەی عێراق زۆرتر خەریکی شەڕی ئێران بوو. دەسەڵاتی بە سەر زۆری دێهاتەکانی کوردستان دا نەما بوو. لاوانی کورد بە کۆمەڵ لە دەس سەربازی هەڵئەهاتن و، ڕوویان ئەکردە لادێکان. دەیان هەزار سەربازی هەڵاتوو لە دێهاتەکان دا کۆ بووبوونەوە و، هەر حیزبە هەوڵی ئەدا زۆرترین ژمارەیان بە لای خۆی دا ڕابکێشێ و، بیانهێنێتە ڕیزی پێشمەرگەکانیەوە. هەر حیزبە بەشێ خۆی گەنجی ڕاکێشا بوو، هێزی چەکداری لێ دروست کرد بوون. جود و جوقد، هیچکامیان کێشەی یەکخستنی میلیشیای حیزبەکانیان چارەسەر نەکرد بوو، هەر حیزبە هەوڵی ئەدا خۆی زۆرترین ژمارەی چەکداری هەبێ و، لەو ڕێگایەشەوە دەس بگرێ بە سەر مەیدانی کار و چالاکی دا.

هاوینی ساڵی ١٩٨١ پێنج هێزی چەکدار کە سەر بە پێنج حیزبی جیاواز بوون، بە ناوی پێشمەرگەوە لە دێهاتەکانی کوردستان دا، بە تایبەتی لە ناوچەکانی سلێمانی، هەولێر، گەرمیان.. دا تەراتێنیان ئەکرد. ئەگەرچی چوار لەم حیزبانە؛ پدک، حسک، حشع، پاسۆک، لە چوارچێوەی سیاسی «جود» ا کۆبووبوونەوە، بەڵام هێزەکانیان سەربەخۆ و لە یەکتری جیاواز بوون، هەریەکەیان سەرکردایەتی و، فەرماندەیەتی تایبەتی خۆیان هەبوو، کەسیان گوێ ی لە فەرمان و ئامۆژگاری ئەوی تریان نەئەگرت.

چەکداری حیزبەکان، بە ئارەزووی خۆیان و بێ هیچ لێپرسینەوەیەک، خەڵکیان ئەگرت و ئەکوشت و بەر ئەدا، پارەیان ئەسەند و، پارەیتییان کۆ ئەکردەوە، سەرانەیان وەرئەگرت. بێگاریان بە دانیشتوانی دێهاتەکان ئەکرد و، زۆر جار لێیان ئەدان و سوکایەتییان پێ ئەکردن. دانیشتوانی دێهات خەریک بوو پێشمەرگەیان لە بەر چاو ئەکەوت و، لە شۆڕش ئەبێزران. سەرکردایەتی هیچ لایەکیشیان مشوری چاکردنی ئەم بەرەڵڵایی و بێ سەروبەرییەی نەئەخوارد و، چاوپۆشی لە خراپەکانی چەکدارەکانی ئەکرد.

ئێمە لە سەرکردایەتی یەکێتی دا زۆر جار باسی ئەم هەلومەرجە ئاڵەبارەمان ئەکرد. یەکێ لە ژمارەکانی «ژیانی ڕێکخراوەیی» کۆمەڵەمان بۆ جۆری ڕەفتار لە گەڵ خەڵک تەرخان کرد و، هەوڵمان ئەدا کادر و پێشمەرگەکانمان بە جۆرێ پەروەردە بکەین، کە ڕەفتاریان جیاواز بێ لە هی حیزبەکانی تر، بە تایبەتی چونکە تا ئەوسایش یەکێتی هێزی هەرە گەورە و دەسەڵاتدار بوو. بڕیارمان دا لە ئاوایییەکانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی شۆڕش دا خەڵک هان بدەین بە هەڵبژاردنی ئازاد چەند کەسێ لە خۆیان بۆ «ئەنجومەنی ئاوایی» هەڵبژێرن. ئەنجومەنی ئاوایی، تا بۆی بکرێ خۆی کێشەکانی ناو ئاوایی چارەسەر بکا، ئەوان پێشوازی لە پێشمەرگە بکەن و، بۆ حەوانەوە و خواردن لە ماڵەکان دا دابانبەزێنن و، ئەگەر کارێکیان هەبوو بە خەڵکی ئاوایی لە ڕێگای ئەوانەوە جێبەجێ ی بکەن. لامان وابوو ئیتر کاتی ئەوە هاتووە خەڵک کەمێ کەلک لە کز بوونی دەسەڵاتی بەعس وەربگرێ بۆ حوکمڕانی خۆی و، لایەلا کردنی کێشە ناوخۆییەکانیان و، ڕێبگرن لە پێشمەرگە کە دەس وەربدەنە کاروباری ناوخۆ و ژیانی تایبەتییانەوە.

لە چەند جێگا دەسمان کرد بە جێبەجێ کردنی ئەم تەجروبەیە و، ئەنجامی باش و سەرکەوتووی هەبوو، خەڵک بە گەرمی پێشوازییان کرد و، بە چاکی جێبەجێیان کرد.

لایەنەکانی جود، هەریەکەیان، بە جۆرێ هەڵوێستی لەم تەجروبەیە گرت:

- حسک کە لە ناو لایەنەکانی جودا لە هەمویان زیاتر لە سەر ئەرزی کوردستان چەکداری هەبو، هەر لە سەرەتاوە کەوتە دوژمنایەتی ئەنجومەنی ئارایی. ئەوان نەک هەر ریزی ئەندامانی ئەنجومەنەکەیان نەئەگرت، بەلکو ئەنجومەنەکانیان هەلئەوەشاندنەوە و، لە ئەندامەکانیان ئەدان و، لە چەند جیگا بۆ ئەوەی سەرکیان بکەن لە حەوزی مزگەوتەکانیان هەل ئەکیشان و، چەکیان ئەکردن و، جەزایان لی ئەسەندن.

حسک بۆ ئەوەی بۆ خەلکی دەریخا کە یەکیتی تەنیا هیزی دەسەلاتدار و دەسرۆیشتوی کوردستان نیە، لە هەر جیگەیەکی بوی بکرایە بریارەکانی یەکیتی هەلئەوەشاندەوە، بۆ نمونە: کە یەکیتی راوی کەو و کیوی قەدەغە کرد، ئەو راوی ئازاد کرد و هانی خەلکی ئەدا گوی لە قسەی کادرەکانی یەکیتی نەگرن و، راو بکەن. کە یەکیتی داربرین و خەلوز کردنی قەدەغە کرد، ئەو هانی خەلکی ئەدا گوی لە قسەی کادرەکانی یەکیتی نەگرن، دار ببرن و خەلوز بکەن.

- حشع کە هیزی چەکداری لە حسک کەمتر و، لە ناو دیهاتەکان دا کەمتر گوییان لی ئەگیرا، لەو کوبونەوە دولەولیانەی لە نیوان سەرکردایەتی یەکیتی و ئەوان دا ئەکرا، وایان دەرئەخست کە ئەوان وەکو سەرەتا دژی ئەم تەجروبەیە نین، بەلام یەکیتی بۆ بەهیزکردنی خوی بە تەنیا کردویەتی بی ئەوەی حساب بۆ لایەنەکانی تر بکا. وایان پیشنیار ئەکرد لە هەمو ئاواییەک دا ئەنجومەن پیک بی لە نوینەرانی حیزبەکان؛ یەکیتی و، لایەنەکانی جود. چەندی بۆمان رون ئەکردنەوە کە «ئەنجومەنی ئاوایی» شتیکی جیاوازە لە «حکومەتی ئیئتیلافی» و «بەرەی یەکگرتوی حیزبەکان» و، ئەمە بۆ کەمکردنەوەی دەستیوەردانی چەکدار و کادری حیزبەکانە، لەوانە هی یەکیتی، لە کاروباری ناوخوی دیهاتەکان، نەیانئەویست بیسەلمینن. سور بون لە سەر هەلویستی خویان، ئەیانویست لەو ریگایەوە جیگا پیەک لە ناو دانیشتوانی دیهاتەکان دا بۆ خویان بکەنەوە، لە کاتیک دا لە زورایەتی دیهاتی کوردستان دا ئەندام یا دوستی حشع تی دا نەبو. ئەمەیان کرد بو بە بیانو ئەوانیش دانیان بە ئەنجومەنەکان دا نەئەنا و، ریزیان نەئەگرتن.

- پارتی لەو کاتەدا هیزیان لە ناو کوردستانی عیراق دا نەبو، بە تایبەتی لەو ناوچانەدا کە یەکیتی لی بو، هەندی مەفرەزەیان جارویار ئەگەیشتنە شارەزور، هەورامان، روستی.. پاش ماوەیەک ئەگەرانەوە بۆ ئیران.

- پاسوک، هیزیکی چەکدار یا سیاسی ئەوتوی نەبو، بتوانی کار لە رەوتی رووداوەکان بکا، بەلام ئەمیش وەکو حسک هەلویستی دوژمنانە بو لە ئەنجومەنی ئاوایی.

*

یەکەمین شەری جود - یەکیتی

هاوزەمان لە گەل گرژبونی پەیوەندی ئیران - یەکیتی دا، تا ئەهات گرژی و ئالوزان لە پەیوەندی نیوان چەکدارەکانی جود - یەکیتی دا لە سەرانسەری کوردستان دا زیادی ئەکرد. چوار براکەی جود لە ناو خویان دا ناکوک بون، بگرە لە سەر هیچ شتی ریک نەبون یەک مەسەلە نەبی، ئەویش: بەرەنگاربی مەترسی یەکیتی، بو.

لەو ماوەیە دا زیاتر لە ۱۰ جار پیکدادانی خویناوی بچوک و گەورە لە نیوان لایەنەکانی جود و، هیزەکانی یەکیتی دا روی دابو. زوربەشی لە سەر چەک فراندن لە ناو یەکیتییەوە بۆ لای ئەوان و بە پیچەوانەوە، پارە وەرگرتن، رەفتار لە گەل ئەنجومەنی

ئاوایی، خەڵک گرتن، بە واتەیەکی تر حوکمڕانی ناوچەکان، لە ناو ئەم ڕووداوانەدا هەندێکیان مەترسی دار بوون.

*

## پاسۆک و یەکێتی

پاش نیوەڕۆیەک، هەوا خۆش و، کۆمەڵێکی تێکەڵاو لە کوردی هەر چوار پارچەکە: محەممەدی موختەدی لە تاران، یوسف زۆزانی لە سووریا، خەجۆ و چەند کەسێکی تری کوردستانی تورکیا، لە سەربانی یەکێ لە خانووەکانی نارزەنگ لە بەر هەتاو دانیشتبوون دەمەتەقێ مان ئەکرد. ئازاد مستەفا پەیدا بوو، لای دایە لای ئێمە. بە خێرهاتنمان کرد و، لە گەڵ دانیشتووەکان بە یەکترم ناساندن. بە گاڵتەوەپێمان وت: «هەر ئێوە کوردستانیی نین، ئەمێنی کوردی چوار پارچە کۆبوونەتەوە!»

دانیشتووەکان شتێکی ئەوتۆیان لە سەر پاسۆک نەئەزانی. کەوتنە پرسیاری جۆراوجۆر لە ئازاد. یەکێ لەو پرسیارانەی محەممەدی موختەدی کردی ئەوە بوو: «لە ناو ڕێکخراوەکانی کوردستانی عێراق دا خۆتان لە کام ڕێکخراو لە هەمویان بە نزیکتر ئەزانن؟» ئازاد یەکسەر وتی: «کۆمەڵە!»

*

ڕۆژی ٢٢ ی خەزەڵوەرانی ٨١ چەند پێشمەرگەیەکی هەرێمی ٣ ی شارباژێڕ لە گوندی مامەخەلان لە گەڵ چەند پێشمەرگەیەکی پاسۆک دەمیان لە یەک ئەگیرێ و بە تفەنگ لە یەکتری ڕاسا بوون. لە پاسۆک دوو کەس: فارس و بێستون و، لە یەکێتی عومەری حاجی عەبدوڵلای گەنکی، کە فەرماندەی مەفرەزە بوو لە کەرتی ١ ی هەرێمی ٣ ئەکوژرێن.

بۆ ڕۆژی دوایی تاقمی پێشمەرگەی تێکەڵاوی یەکێتی، کە هەندێکیان تازە لە ناو شاری سلێمانی گەڕا بوونەوە و، هەندێکیان چوو بوون بۆ بەڕێ کردنەوەی کەسوکاریان بۆ سلێمانی، بە سواری ئۆتۆمۆبێلێک لە سیتەکەوە ئەچن بۆ گەڕەدێ، بێ ئەوەی ئاگایان لە ڕووداوەکەی ڕۆژی ڕابوردوو بێ. تومەز هەمو چەکدارەکانی پاسۆک لە گەڕەدێ کۆبوونەتەوە. پێشمەرگەکانی یەکێتی ئەچنە ناو پێشمەرگەکانی پاسۆکەوە. ئەوانەی پاسۆک ئەیانەوێ چەکیان بکەن و، ئەیانێدەنە بەر دەسڕێژ. هەندێکیان ئەکوژرێن و، هەندێکیان بریندار ئەبن. ئەچنە سەر بریندارەکان ئەوانیش تەواو ئەکەن.

لەم ڕووداوەدا شەش کەس کوژران لەوانە: جەمال عەزیز فەرماندەی کەرتی ٥ ی هەرێمی ٣ ی شارباژێڕ. وەستا فایەقی بەرگدروو. وەستا ڕەحیمی بەنا. هەرسێکیان ئەندامی کۆمەڵە و جەمال و فایەق ئەندامی یەکەم کونفرەنس بوون. جەمال مامۆستا و باوکی چەند منالی بوو، لە کارەساتی هەکاری دا لە سەر داوای ڕێکخستن هات بوە دەرەوە، بەشداری دەورەی کادران بوو لە قەندیل. تا ئەو کاتە پاسۆک هێشتا شەش کەسی لە هێزەکانی عێراق نەکوشت بوو، بە هەمو ڕێکخراوەکەیشیان لە شەڕی هێزەکانی عێراق دا هێشتا یەک کوژراوی نەبوو.

بۆ ئێمە ئەم ڕووداوە جێگای سەرسوڕمان بوو. چونکە هیچ کارێکی دوژمنانەمان بەرامبەر نەکرد بوون، بگرە بە ڕێزێکی تایبەتیەوە ڕەفتارمان لە گەڵ کرد بوون.

*

له سەرەتادا پاسۆک لە شاخ مەفرەزەیەک و، جەلالی حاجی حسێن مەسئولیان بو.
نەوانی لە گەڵ یەکێتی خۆش بو. پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆی حیزبەکەیان و هەمو
بڵاوکراوەکانیان ئێمە بۆ مان چاپ کرد بون و، بۆ ژیانی خۆیان و پێشمەرگەکانیان و چەک
و تفاقی شەر وەکو پێشمەرگەکانی یەکێتی رەفتارمان لە گەڵ ئەکردن. لە کاتی روداوەکانی
هەکاری دا جەلال لە گەڵ ئێمە لە قەندیل بو، دوایی کرا بە فەرماندەی پێشمەرگەکانی
پێنجوین. ئەگەرچی ئەمە نارەزایی لە ناو زۆری پێشمەرگەکانی ناوچەکەدا دروست کرد، بە
تایبەتی لای حەمەصدیق خانی مەشخاو کە تازە هات بوە شاخ و، لە سەر ئەمە وازی لە
یەکێتی هێنا. لە گەڵ ئەوەش دا بۆ ئەوەی جەلال وەکو تەجروبەیەکی تازەی دانانی
فەرماندەی پێشمەرگە لە حیزبێکی تر جێگیر بێ، گوێ نەدرایە گلەییەکانی حەمە صدیق
خان. لە جیابونەوەی رەسول مامەند و د. مەحمودا جەلال ماوەیەک لە گەڵیان رۆیشت، بەڵام
لە گەڵ ئەوان تێکەڵاو نەبو، زۆر زو خۆی لێ جیا کردنەوە.

دوای عەفوەکەی ۱۹۷۸ ئازاد مستەفا لە زیندان دەرچو. ئەویش هاتە شاخ. ئەو
کاتە لە شێنی بارەگایەکی پچوکیان هەبو. دوای ئەویش بە ماوەیەک، بە تایبەتی لە گەڵ
دەس پێ کردنی شەری عێراق - ئێران دا، چەند ئەفسەرێکی گەنج هاتنە دەری. پاسۆک لە
ناوخۆیان دا کێشەیان هەبو. حیزبەکەیان هێشتا کەسی یەکەمی ئەبو هەمویان گوێ ی لێ
بگرن. هەوڵێکی زۆریان لە گەڵ د. جەمال نەبەز دابو، ببێتە سکرتێریان قەبولی نەکرد بو.
هەروەها هەوڵێکی زۆریان لە گەڵ فەتاح ئاغا دابو، ئەویش بە دەنگیانەوە نەهات بو. جەلال
لە گەڵ ئازاد و هەندێکی کەیان ناکۆک بو. هەڵوێستێکی یەکگرتویان نەبو لە ناکۆکی
یەکێتی و پارتی. ناوچەی چالاکی و جموجوڵیان لە ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا بو، بەڵام
هەندێکیان بە دڵ لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی بون. ئێمە بەم کەین و بەینەمان نەئەزانی. تا
جارێک جەلال هات بۆ خواحافیزی لێمان. لە پاسۆک تۆرا بو. ئەو کاتە هۆکانی بۆ باس
نەکردین. هەرئەوەندەی درکاند وتی: «من لە گەڵ ئەو برادەرانە ئیتر ناتوانم کار بکەم ئەرۆم
بۆ دەرەوە دائەنیشم» چو بۆ شام و لەوێ دانیشت وازی لە پاسۆک هێنا.

*

چەند جارێک و لە چەند دانیشتنێک دا ئێمە پێشنیارمان بۆ کردن کە هەندی لە
ئەفسەرەکانیان لە باتی ئەوەی کاتی خۆیان بە مەفرەزەیەکی چەند کەسیەوە بە فیڕۆ بە سەر
بەرن، بێن بێ بە فەرماندەی هەرێمەکانی یەکێتی، لە سەر بیروباوەری پاسۆک بیننەوە و لە
ناو هەرێمەکەش دا چەند پێشمەرگەی تریان پێ راهێنەرێ بیکەن. لەو کاتەدا کۆمەڵە،
بزوتنەوە، خەتی گشتی لە ناو پێشمەرگەکانی یەکێتی دا بە تێکەڵاوی کاریان ئەکرد،
ئەیانتوانی ئەوانیش بێ بە لایەنی چوارەم. ئەمانویست لە دو لاوە کەڵکیان لێ وەربگرین:
یەکێکیان، وەکو تەجروبەی پێکەوە کارکردنی بیروباوەری سیاسی جیاجیا لە ناو یەک
هێزی چەکداری یەکگرتودا. دوەمیان، بۆ گەشە پێ دانی هێزەکانی پێشمەرگە. ئەمانە
گەنجی کوردپەروەر و، دەرچوی کوللیەی عەسکەری بون و، لە شەرەکانی ٧٤ دا بەشدار
بون. بەو پێیە شارەزای کاروباری عەسکەری و پێشمەرگایەتی بون. ئەوان گاڵتەیان بەم
قسانە ئەهات.

*

دوای روداوەکەی گەرەدی هێزەکەی پاسوک کشایەوە ناوچەیەکی دوری سنوری

نێران. له کوردستانی عێراق دا ئێران. ئازاد کەوتە نوسینی بەیان و وتار. لە بواری موهاتەراتی سیاسی دا، ڕۆڵی هەمو ئەوانەی پێش خۆی دا، هەژاری موکریانی بە تۆزی پێ یا نەئەگەیشت.

*

## حسک و یەکێتی

مەلا بەختیار چو بو بۆ ناوچەکانی دوڵی جافەتی بۆ گەڕان و بە سەر کردنەوەی پێشمەرگە. جەمال فەرماندەی هەرێمی ٤ ی یەکێتی و، شێرکۆی شێخ عەلیش فەرماندەی پێشمەرگەکانی حسک بو لە هەمان هەرێم. شێرکۆ لە شێخەکانی سەرگەڵو بو.

هەواڵمان بۆ هات کە ڕۆژی ٢٣ ی ئابی ٨١ لە بنکەی حسک لە کانیە ڕەشەی نزیک گوندی سێکانیان لە دۆڵی جافەتی شەڕێکی قورس ڕوی داوە. لە حسک ٦ کەس کوژراوە لەوانە: شێرکۆ و بیستونی برای و ٥ یش بریندار و، لە یەکێتی ٧ کوژراوە لەوانە: جەمالی عەلی باپیر و سمایل گەورەدێی و ٧ یش بریندار بوە.

جەمال وەرزشکار بو. لە ڕاکردنی ١٠٠ مەتری دا یەکەمی سلێمانی بو لە سەرەتای شۆرشی ئەیلول دا چوە ریزی پێشمەرگایەتیەوە. ماوەیەکی درێژ لە گەڵ عەریف مەجید شوان پێشمەرگە بو. پاشان چو بۆ هەمەدان و لە گەڵ ئەوان گەڕایەوە. ساڵی ٦٩ لە دەورەیەکی تایبەتی دا بو بە (مفوضی شرطە) و، بو بە یەکی لە یاریکەرەکانی تیپی پولیس. لە ٧٤ دا چوەوە ریزی پێشمەرگایەتی و کرایە سەرلق. جەمال هاوڕێی کۆمەڵە بو. لە دەسپێکردنەوەی شۆرشی حوزەیران دا چوە ناوچەی جافەتی و، یەکی لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگەی پێک هێنا. دوایی کرایە فەرماندەی کەرت و ئینجا فەرماندەی هەرێم. هەتا پێی ی لە ڕوێشتن دا گورجوگۆڵ و بە توانا بو. لە شەڕدا ئازا و وریا بو، یەکێ بو لەوانەی لە هەکاری گەڕایەوە.

بەم بۆنەیەوە حسک بەیانێکی دەرکرد هێرشێکی توندی کرد بوە سەر یەکێتی و، تاوانی هەڵگیرسانی شەڕی براکوژی و، غەدر و خیانەتی دایە پاڵی، یەکێتی یش بەیانێکی دەرکرد هێرشێکی توندی کرد بوە سەر حسک.

شێرکۆ و بیستونی برای بە دەستی یەکێتی کوژران، ئاراسی برایشی، کە پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە کارەساتی هەکاری دا بە دەستی پارتی کوژرا بو، جەمالیش بە دەستی شەهرزادی برای شێرکۆ کوژرا. ئەمە قوڵایی پڕ لە ناسۆری شەڕی ناوخۆی دەرئەخست.

ڕوداوەکەیان بە دو جۆری جیاواز ئەگێرایەوە:

– ئەوانەی حسک ئەیانوت: جەمال بە فیتی مەلا بەختیار بە ناوی میوانیەوە چوە بۆ سەردانی شێرکۆ بۆ ئەوەی لە پەنای دۆستایەتی دا بە فێڵ بیکوژێ.

– مەلا بەختیار ئەمەی ئینکار ئەکرد، ئەیوت: جەمال چوە بۆ سەردانی شێرکۆ بۆ ئەوەی هەندێ کێشەی نێوان حسک و یەکێتی بە لادا بخەن و، لەوێ بوە بە شەڕیان و ئەو کارەساتە قەوماوە.

جەمال پێشمەرگەیەکی وریا بو. ئەگەر لە کوشتنی شێرکۆ بوایە پێویستی بە فێڵ و میوانداری نەبو، ئەیتوانی بە جۆرێکی ڕەها شێرکۆ بکوژێ کە خۆی تی دا نەکوژرێ. ئیتیهامەکەی حسک و ئینکارەکەی مەلا بەختیار هەر کامێکیان ڕاست بێ، ئەم ڕوداوە

تاڵەبانی بوو بە هۆی شەڕێکی خوێناوی نێوخۆیی لە نێوان حسک - یەکێتی دا و، دوایی‌تر لە نێوان هەموو لایەنەکانی جود - یەکێتی دا.

پێشمەرگەکانی هەریمەکە دوای ئەم ڕووداوە کە فەرماندەکەیان و، هەندێ لە کادرەکانی هەریمەکەیانی تێ دا کوژرا بوو، وە شەڕێکی خوێناوییان لە گەڵ حسک دا بۆ بە جێ مابوو، خەمبار و سەر لێ شێواو بوون، مەلا بەختیاریش بە جێ ی هێشت بوون، گەڕابووەوە بارەگای سەرکردایەتی.

*

## حشع و یەکێتی

ئامێر مەفرەزەیەکی جاش بە ناوی عەبدوللا ماوەلی، هات بوو ڕیزی حشع. حشع وەری گرت و لە ناو هێزەکانی خۆی دا لە ناوچەی دەرگەلە کاری پێ سپارد. ئەم کارە بوو بە هۆی تووڕە بوونی پێشمەرگەکانی بالەکایەتی و، هەڕەشە لێ کردنی. گلەیی گەیشتەوە سەرکردایەتی کە حشع عەولا ماوەلی وەرگرتوە. عەولا ماوەلی، پێشتر پێشمەرگە بووبوو، لە کاتێک دا لە گەڵ تاقمی پێشمەرگەی یەکێتی پێکەوە ئەبن بۆ خۆپاراستن و حەوانە، پێشمەرگەکانی یەکێتی لە کاتی نوستن دا گرت بوو. دوای چەککردن و پەلبەستن تەسلیمی عێراقی کرد بوون. پاش ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر حوکمی ئیعدام دران و لە موسڵ هەڵیانواسین. ئەم پێشمەرگە گیراوانە لە «ڕەدهەی ئیعدام» ی زیندانی موسڵەوە، پێش ئەوەی لە سێدارە بدرێن، نامەیەکیان بۆ مامجەلال و سەرکردایەتی نوسی بوو. نامەکەمان بە لیدوانێکی مامجەلالەوە لە ژمارەی چوارەمی مارتی ١٩٧٩ ی «هەواڵنامە» دا بەمجۆرە بلاو کرد بووەوە:

سێ ئەستێرەی تری ئاسمانی خەباتمان ڕادەکشێن

ڕا لە خوارەوە نامەکەی هەڤاڵانی قارەمان: وەستا ڕەسوڵی خەیات و کاک حسەینی شێوەڵوکی و کاک ڕەئیسی ڕوستایی، کوتومت وەک خۆی بلاو دەکەینەوە کە نموونەیەکی گیانی فیداکاری و خۆبەخت کردن لە پێناوی کورد و کوردستان و ی ن ک دا خۆی تێدا دەنوێنێت. منیش بەڵێن ئەدەم کە لە ژمارەی داهاتودا ئاواتەکەیان بهێنمە دی و وتارێکی شایستەیان لە سەر بنوسم. هەروەک بە ناوی ی ن ک و هێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە بەڵێن بۆ ئەو ٣ قارەمانە و سەدان قارەمانی شەهیدی تری ئەدەینەوە کە تا سەرکەوتن یا مردن بۆ تۆڵەسەندنیان، بۆ هێنانەدی ئامانج و داخوازی یەکانی کۆمەلانی خەلکەکەیان کە گیانی پاکیان لە پێناودا بەخت کردوە، درێژە بە خەباتی پیرۆز بدەین و ئالا شەکاوەکەی شۆڕش و ی ن ک هەر لە سەر سەر ڕاگرین.

جەلال تاڵەبانی

*

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

یەکێتی نیشتمانی کوردستان

بۆ هەڤالانی سەرکردایەتی

سلاوێکی شۆڕشگێرانەی گەرم

لەو کاتەی کە لە ژێر پەتی سێدارە ڕاوەستاوین چاوەڕوانی مردن ئەکەین لە پێناوی مافی گەلی کوردمان، ئەو گەلەی کاروانی خەباتی سوورە بە خوێنی هەزاران شەهیدی قارەمان وە ئێمەش شانازی ئەکەین بەو ڕێگەیەی کە لە پێناوی شەهید بوین. بەلام ئێمە داوا

له ئێوه و هەموو پ م ئەکەین کەوا هەر کاتێک گەلی کورد گەیشتە ئاواتی خۆی لە بیرمان نەکەن وە منال و دایک و باوکی هیچ شەهیدێک لە بیر نەکەن وە خوێنی ئێمە ئەکەوێتە سەرشانی ئێوە بۆ تۆڵە سەندن لەو دوژمنانەی وەک سمکۆی حاجی خورشید، محەمەد ئەمین رەشاشچی، عەبدوللا ماوێلی، ئەنوەر شێخ ، مستەفا روستایی. پەیوستە ئێوە تۆلمان بسێنن. تکایە دەستی یارمەتی بۆ کەسوکارمان درێژ کەن. تکا ئەکەم مام جەلال مەقالەیەکمان دەربارە بنوسی بۆ ئەوەی کەسوکارمان زیاتر شانازی بە خۆیانەوە بکەن.

ئیتر بۆ پێشەوە لە ژێر ئالای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

سەرکەوتن بۆ کورد و کوردستان. مردن و سەرشۆری بۆ دوژمنانی گەلەکەمان

شەهیدان:

رەسول عومەر خەیات  حسێن عومەر شێوەلوکی  رەقیب عوسمان روستایی

رۆژی ١٩٧٩/٢/٢ .

*

ئەو کاتەی ئەم نامەیەمان بڵاو کردەوە، عەولا ماوێلی هێشتا ئامێر وەسفەرزە خاصە ی جاش بو. عەولا ماوێلی دوای ئەوەی بوبو بە جاش چەند پێشمەرگەی ترێشی راو کرد بو، وەکو ئەیانوت: هەندێ پێشمەرگەی گیراوی لە هالیکۆپتەرەوە فڕێ دابوە خوارێ.

هاتنی عەولا بۆ لای حشع و، سورانەوەی بە بەرچاوی پێشمەرگەکانی بالەکایەتی و، هاوڕێ و ئاسیاوەکانی وەستا رەسول و حسێن و رەقیب، تورە بونێکی زۆری لە ناودا دروست کرد بون. ئەم گلەیە گەیشتە سەرکردایەتی و، هەرەشەیان کرد بو کە ئەگەر لەو ناوچەیە دوری نەخەنەوە بۆ ناوچەیەکی تر، لە تۆلەی خوێنی هاوڕێکانیان دا، ئەیکوژن.

بۆ ئەوەی ئەم گرژیە بڕەوێتەوە، مامجەلال داوای لە حشع کرد بو لەو ناوچەیە دوری بخەنەوە و بیگوێزنەوە بۆ شوێنێکی تر. حشع بانگیان کرد بۆ لای خۆیان بۆ ناوزەنگ، بەلام دوای چەند رۆژێ رێگایان دا بو بڕواتەوە بۆ بارەگاکەی خۆیان لە وەرتێ. رۆژی ٤ ی ئەیلول پێشمەرگەکانی یەکێتی لە دەرگەلە تووشی ئەبن. کەوت بوتە دوای، خۆی لە مالێک دا قایم کرد بو، دەوری مالەکەیان دابو، داوایان لێ کرد بو بێتە دەرەوە. ترسا بو بیکوژن خۆی لە مالەکەدا عاسی کرد بو. بوبو بە تەقە. ئەم بەزمە ماوەیەکی خایاند بو سەرەنجام کوشت بویان.

لێپرسراوەکانی حشع لە ناوچەکەدا لەمە زۆر تورە ئەبن. یەکێتی کێ یە و ئەوان کێن، تا بتوانن دەستدرێژیان بکەنە سەر و، هاوڕێ ی حیزب بکوژن. ئەوانیش بیریان لە تۆلە کرد بوەوە، بەلام نەک لەوانەی کە ئەو کارەیان ئەنجام دابو، بەلکو وەکو خێلە دواکەوتوەکانی کورد، لە هەر یەکێتیەکی کە بەر دەستیان بکەوێ.

رۆژێک دوای ئەم رووداوە، فەرماندەی بەتالیونێکیان بە ناوی عەلی حەمە عەزیز، کە بە عەلی کلاشینکوف ناسرا بو، لە گوندی قەلبیان ئەبێ، چەند پێشمەرگەیەکی یەکێتی بش کە خەلکی ناوچەکە بون لە هەمان گوند ئەبن. بۆ گێتوگۆ ئەنێری بە دوایان. ئەوانیش: وەسمان بەگی گەروانی، فەرماندەی کەرت، لە گەل کادرێک بە ناوی حەمە لاو و چوار پێشمەرگەی کە، بێ سل کردنەوە ئەچن بۆ مزگەوتەکە کە عەلی لێ ئەبێ. عەلی لە ناو مزگەوتەکەدا دەسبەجێ هەر شەشی کوشت بون.

عوسمان بەگ، جوتیارێکی هەژاری خەڵکی گەرموان و، پیاوێکی بەڕێزی ناوچەکە بو. لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگە بو. لەم شۆڕشەیش دا هەر لە سەرەتاوە دەستی دابوەوە چەک و بوبو بە پێشمەرگە. کە یەکەم تاقمی حشع گەیشتە ناوزەنگ، ئەوساکە ئەم بارەگایەکی بچوکی لە کەورگێک دا بە وشکە کەڵەک لە ناوزەنگ دروست کرد بو، سەرکردایەتی یەکێتی ئەشکەوتەکەیان پێ چۆڵ کرد بۆ ئەوەی فاتیح ڕەسوڵ و مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی و شیوعیە تازە ڕاکردوەکان وەکو نوایەکی زستانە بچنە ناوی.

لەو کاتەدا کە عوسمان بەگ کوژرا بە ئیجازە بۆ سەردانی منداڵەکانی چوبوەوە ناوچەکە.

ئەم دەستدرێژییە نارەوایە پێشمەرگەکانی یەکێتی لە باڵەکایەتی وروژاند. ئەوانیش کۆبونەوە چونە سەر بارەگای بەتالیۆنەکەی حشع لە وەرتێ. شیوعیەکان دایانە چیای کارۆخ و، دامەزران. لە شاخەکە گەمارۆیان دان. حشع ئاگاداری مامجەلالیان کرد، ئەویش فەرمانی دا کە دەسبەجێ دەوری شیوعیەکان بەر بدەن و، هەر کەسە بچێتەوە جێگای پێشوی خۆی.

شەڕەکە کوژایەوە، بەڵام گرژی ئەرموی بوەوە.

*

وەکو ئەمان بیستمەوە لە ناو حشع دا لە سەرەتاوە دو بیروڕای جیاواز هەبو بەرامبەر ناکۆکی پارتی - یەکێتی، دوایێتریش لەو بەڵگانەدا کە دەس یەکێتی کەوتن، هەندێ لە مەحضەرەکانی کۆبونەوەکانیان ئەم هەواڵەیان سەلماند:

١. هەندێکیان لایان وابو کە پارتی خەتەر نیە بۆ سەر حشع، چونکە حیزبێکی خێڵەکی ناسراوە بە کۆنەپەرستی و نۆکەرایەتی ئێران و ئیمپریالیزم، بەڵام یەکێتی خەتەرە چونکە بە ناوی مارکسیزم و پێشکەوتنخوازیەوە لاوانی کورد فریو ئەدا و، لە جەماوەری حشع ئەخرا. لە بەر ئەوە لەو ناکۆکیەکەدا چاکتر وایە لایەنی پارتی بگرن.

٢. هەندێکی تریان لایان وابو ناکۆکیەکانی نێوان لایەنەکانی جود - یەکێتی ناکۆکی نێوان باڵەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی بورجوازی کوردە، چەندێ بە یەکەوە خەریک بن زورتر یەکتری لاواز ئەکەن و، هەڵوێستی حشعی پێ بەهێز ئەبێ، لە بەر ئەوە چاکتر وایە کە حشع خۆی لەو ناکۆکیانەوە نەگلێنێ و لێ بگەڕێ یەکتری بخۆن.

سەرەنجام بیروڕای ئەوانەی یەکەم سەری گرت کە بە لای پارتی دا دایشکێن، وەکو ئەیانوت: لە سەرەتاوە مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی لەم باوەڕەدا بو، دواتریش کەریم ئەحمەد چوە سەر باوەڕەکەی ئەو.

*

کە پێشمەرگەکانی حشع بارەگای بەتالیۆنەکەیان چۆڵ کرد بو، پێشمەرگەکانی یەکێتی هەندێ کاغەز و دەفتەریان لە ناو بارەگاکە دەرهێنابو دوایێتر بۆ منیان هێنا. یەکێکیان دەفتەرێک بو بە عەرەبی ناوی پێشمەرگەکانی بەتالیۆنەکە و، ساڵ و شوێنی لە دایکبون و پلەی پێشمەرگایەتیان و هەندێ زانیاری لەو بابەتانەی تێ دا نوسرا بو. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بو: لە تەنیشت ناوی زۆریانەوە لە خانەیەک دا نوسرا بو «متعهد». من وامزانی مەبەستیان لە «متعهد» قونتەراتچی و «مقاول»ە. سەرم سوڕما بو لەوەی ئەو هەمو قونتەراتچییە لە حشع کۆ بوبێتەوە. لە چەند کەسێکم پرسی. یەکێ لە هاوڕێکانم شارەزا بو وتی: «مەبەستیان لە - متعهد ئەوەیە کە پاکانەی بۆ بەعس نوسیوە و بەڵێنی

پی داون ریزی حشع به جی بهیلی!»

*

### لەشکرکێشیەکەی سەید کاکە

سەید کاکە زۆر جار لای سەرکردایەتی حزبەکەی خۆی هەلکیشا بو کە ئەگەر ئەوان لی ی بگەرین یەکیتی لە کوردەستان دا تەواو ئەکا. ئەوانیش باوەریان پی کرد بو. کە روداوەکەی شیرکۆ بو، فەرمانیان دا بە سەید کاکە، بچیتە سەر هیزەکانی یەکیتی. سەید کاکە، کە خوی هەمیشە بە دوای بیانودا ئەگەرا بو پەلاماردانی یەکیتی، هەلی بو هەلکەوت. لەو کاتەدا لە دەوروبەری وەرتی و مەسلەکان بو. کەوتە کوکردنەوەی پیشمەرگەکانی حسک. لە قسەکانی دا کە بو دانیشتوانی دیهاتەکانی کرد بو، وت بوی: «ئیمە چوار حیزبین و ئەوان تەنیا یەک حیزبن. بریارمان داوە جاشەکانی شەستوشەش بکەینەوە بە تەویلەکانی یەکرمجودا!»

سەید کاکە رۆژی ۲۳ ی ئابی ۸۱ لە خوشناوەتیەوە کەوتە کیومال بە دوای پیشمەرگە و کادرەکانی یەکیتی دا. هەر پیشمەرگەیەکی بەر دەس کەوت چەکی کرد و، هەر تاقمیکی بینی چوە سەریان. لە چیوە و دولی ئازەنین و دۆلی سماقولی زیاتر لە ۵۰ کادر و پیشمەرگەی بە تاک و بە کۆمەل چەک کرد و هەندیکی کوشت و هەندیکی زامار کرد.

*

### بۆلی و کۆمەلە

رۆژی ۲ ی ئەیلول سەید کاکە دەوری مەفرەزەیەکی یەکیتی گرت لە گوندی میوژەی بناری کوسرەت. پیشمەرگەیەکی کوشت و دوانی بریندار کرد. یەکیکیان فەقی بایزی لیپرسراوی مەفرەزەکە بو، ئەوانی تریشی گرت. یەکی لە گیراوەکان ئەنوەر بۆلی بو. سەید کاکە لی ی پرسی بو سەر بە چ ریکخستنیکە وت بوی: «کۆمەلە». سەید کاکە گوچان تی ی بەر بوبو. هەتا توانی بوی لی ی دابو. زۆریشی جنیو پی دا بو، وت بوی: «ئیوە هەمو شوانن، بۆلی و کۆمەلە کوجا مەرحەبا!». بۆلی تیرەیەکی بچوک بون لە بیتوین ئەژیان. خۆیان بە بەشی لە ئاکو دائەنا. ئاژەلدار و نیوە رەوەند بون. کاتی خۆی لە نیوان قەندیل و دەشتی کۆیەدا گەرمیان و کویستانیان کردوە.

هەرکەس ئەم قسەیەی بکردایە، تەنهو سەید کاکە قسەی وەها بکا، چونکە ئەویش بە هەرزەکاری شوان بوە و، پلەی خویندەواری خۆی و رادەی تیگەیشتنی لە هی ئەنوەر بەرزتر نەبو. لە کاتیک دا ئەم خۆی بە سەرکردەی حیزبیکی سوسیالیستی ئەزانی، ئەنوەر ئەندامیکی سادەی کۆمەلە بو. بو بەدبەختی کورد، بە هوی هەلومەرجی ناتایبەی جولانەوەی کوردەوە زور جار لە ناو هەمو حیزبەکان دا کەسانی لە بابەتی سەید کاکە ئەگەیشتنە ناوەندی بریاردانی سیاسی.

*

### فەخرەدین

لە مزگەوتەکەی گوندی ئارمالی دەشتی کۆیە دەوری چەند پیشمەرگەیەکی یەکیتی گرت. پیشمەرگەکان دەستیان کردەوە. یەکیکیان کوژرا ناوی فەخرەدین و، دەرچوی کلیەی علومی زانکوی موسل بو. کادری ریکخراوەیی کۆمەلە بو.

*

### حاجی قادری مالومە

سەید کاکە لە دۆڵی جافەتی چو بوە سەرگەڵو، هەڵەدن، یاخسەمەر، چۆخماخ مالومە.. لە چەند شوێنی تەق و تۆقی لە گەڵ پێشمەرگەکانی یەکێتی دامەزراند بو. ئازاری دۆستەکانی یەکێتی دابو. هێزەکانی یەکێتی لە وی کە تازە فەرماندەکەیان و، چەند فەرماندەی کەرتێکیان کوژرا بو. خەمبار و سەرگەردان بون، کە بیست بویان هێزەکانی حسک هاتوتە سەریان، پاش تەقوتۆقێکی کەم کشا بونەوە دۆلی سەفرە و زەروێن.

حاجی قادری مالومە کە بە ناوی: «دیگەڵ» ناویان ئەکرد، یەکێ بو لە پیاوە ناسراوەکانی ناوچەکە. پیاوێکی کوردپەروەر و بەرێز و، تەمەنی سەرو ٦٠ ساڵ و، لە شۆڕشی ئەیلول دا ماوەیەکی درێژ پێشمەرگایەتی کرد بو. مامە عەزەی برایشی سەرەتای دەس پێکردنەوەی شۆڕشی نوی پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە هێرشی جەیش دا کوژرا بو. حاجی قادر بە خوی دا رانەپەرمو لە روی هەمو کەسێک دا قسە بکا. هەندی مشتومڕی لە گەڵ سەید کاکە کرد بو. سەید کاکە بو شکاندنی حاجی قادر لە بەر چاوی خەڵک، لە حەوزی مزگەوتەکەی مالومەی هەڵکێشا بو.

*

### دلشاد توفیق

لە گوندی شارستێنی دۆڵی جافەتی، کە دوا قوناغی لەشکرکێشیەکەی بو دلشاد توفیق کوژرا. دلشاد نەوەی شاعیری کوردپەروەر: حاجی بالی بەنگینە و، خوێندکاری زانکۆ بو دەستی لە خوێندن هەڵگرتبو. ماوەیەک لە قەندیل و ماوەیەک لە ناوزەنگ لە گەڵ من پێشمەرگە بو. گەنجێکی ژیر و بێدەنگ و ئازا بو. کادری رێکخراوەیی کۆمەڵە بو.

*

### د. مەجید

هەر لە درێژەی ئەم لەشکرکێشیەدا رۆژی ٦ ی ئەیلول تاقمێکی تری هێزەکەی سەید کاکە جارێکی تر چونە سەر هێزێکی یەکێتی لە چیوەی سەرو پێشمەرگەیەکیان کوشت بە ناوی هاشم و دوانیشیان برینداركرد یەکێکیان د. مەجید عەبدوللا بو. د. مەجید تازە خوێندنی پزیشکی تەواو کرد بو. هاوڕێ ی کۆمەڵە و، گەنجێکی روح سوک و رۆشنبیر و روخۆش بو. بۆ خزمەتی پێشمەرگە و خەلک لە گەڵ پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر مابوەوە. گوللەیەک لە کەللەی سەری دابو توشی بێهۆشی و شەللەلی کرد. هاوڕێکانی بە برینداری دەربازیان کرد بو. ماوەیەک لە چیا و ماوەیەک لە گوندی وەری شارە بویانەوە. پاشان بۆ تەداوی نێردرا بۆ سوید. بەلام هەرگیز چاک نەبوەوە و ئیتر نەیتوانی پزیشکی بکا.

*

هێزەکەی سەید کاکە زورتر نەبو لە هێزەکانی یەکێتی، بەلام هێزەکانی یەکێتی وەکو جاران بە بی ترسی دەستدرێژی حسک بە تاقمی بچوک و لە یەک دابڕاو بە ناوچەکانی چالاکی خۆیان دا ئەسورانەوە. سەرکردایەتی یەکێتی هیچ جورە بڕیارێکی نەبو بۆ شەری حسک، حشع و پاسۆک. هەر لە بەر ئەوە ئاگاداری پێشمەرگەکانیش نەکرا بو

وریایی خۆیان بکەن و، کۆ ببنەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشەکانی سەید کاکە. سەید کاکە ئەیتوانی غافلگیریان بکا و، دەستی کتوپڕیان لێ بوەشێنی و، بە جێیان بهێلێ.

*

ئەم هەواڵانە کە گەیشتنەوە ئێمە زۆر نارەحەتی کردین. ئەم لەشکرکێشیە لە سنوری تۆژلە دەرچو بو، بوبو بە شەڕی دەربەراندن. سەید کاکە لە نامەیەکیش دا کە بۆ مەکتەبی سیاسی خۆیانی نارد بو، داوای لێ کرد بون هێزێک بنێرنە سەر مامەندە بۆ ئەوەی ئێمەش لە شێنێ، زەڵێ، ناوزەنگ، تۆژلە.. دەربکەن. وتبان: «ئەگەر وا بڕوا ئێمێ کوردستانی بۆ بە جێ بهێلین.» بۆ هەڵسەنگاندنی بار و دۆخەکە کۆبونەوەیەک کرا ئەندامانی م س و زۆری سەرکردایەتی بەشدار بون.

لە پێشەوە ڕەخنەی زۆرمان لە مەلا بەختیار گرت لە سەر کارەکانی ئەو دوایییەی و، لە سەر بە جێ هێشتنی پێشمەرگەکان و ناوچەکە. داوامان لێ کرد سەر لەنوێ بچێتەوە بۆ سەرپەرشتی و ڕێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمی چوار. هەرچی لە گەڵی مان وت، کەڵکی نەبو، ئامادە نەبو بچێتەوە بو ناوچەکە. بڕیارمان دا:

١. مستەفا چاورەش بچی بۆ کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەی هێزەکانی هەرێمەکانی ٣ و ٤ و، تێن بو سەید کاکە و هێزەکانی حسک بهێنی بەری مەرگە و دۆڵی جافەتی بە جێ بهێلن بەرەو کوێسرەت و، لەوێش گوشاریان بو بهێنن تا ئەیانکەنەوە بە خۆشناوەتی دا.

٢. من، هێزێک لە گەڵ خۆم ببەم بە ناوچەی سەنگوراپەتی دا بەرەو دۆڵی خانەقا و، دەس بگرین بە سەر ناوچەکانی وەرتێ، دۆڵی سەلەکان و، دۆڵی بالیسان دا. لەوێ لە گەڵ هێزەکەی مستەفا یەک بگرینەوە، هێزەکانی حسک بخەینە «ناو کەماشە» وە.

٣. مولازم عومەریش، ئەگەر پێویستی کرد، بە دوای من دا هێزێک بهێنی لە قەلاتوکان دابمەزری بۆ پاراستنی ڕێگاکانی پشتەوەمان لە کومتان - دۆڵی خانەقا.

لەو کاتەدا بەشێکی هێزەکانی هەرێمی ٧ ی بالەک و هەرێمی ١٤ ی ئاکۆ لە سەرکردایەتی بون. هەموویانم ئاگادار کرد خۆیان بۆ جوڵان کۆ بکەنەوە. سەید کەریم لە باتی م ع هات. چەند مەفرەزەیەکی گەرمیان لەوێ بون ئەوانیشمان ئاگادار کرد خۆیان ئامادە بکەن.

مستەفا لە سەردەشت بو ئاگادارمان کرد بە ڕێ بکەوێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی.

*

ڕوداوەکانی ئەقیان و کارۆخ، لە نێوان حشع و یەکێتی دا تازە قەوما بو. هەردولا بڕیاریان دابو کە پەیوەندییەکانیان لە ناوچەکەدا ئاسایی بکەنەوە. یەکێتی ئەم کارەی بە من و، حشع بە مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی سپارد بو.

بەیانی ڕۆژی ٨ ی ئەیلولی ٨١ هێزەکەمان کەوتە ڕێ، مەلا ئەحمەدیش لە گەڵ ئێمە هات، بەلام لە ڕێگا سڵی لێ ئەکردین. لە قەلاتوکان لامان دا. لە کاتی نان خواردن دا عەلی حەمەی شاسوار، کە ئەوسا گەنجێکی تازە پێگەیشتو بو، تفەنگەکەی لە سەر پێ ئەبێ، گوللەیەکی لە دەس دەرچو ڕانی پێشمەرگەیەکی مەفرەزەکەی خۆیانی پێکا. ناوی هیدایەت و خەڵکی ئاوایی بنەکەی گەرمیان بو. د. شالاو لە گەڵ هێزەکە بو. گەیشتە سەری. دەمارە گەورەکەی ڕانی توشی نەزیف ببو. چەندی خەریک بو نەزیفەکەی

بوەستینی و، چەند کەسێکیش خوێنیان دابە، کەڵکی نەبو، هەمان ڕۆژ مرد و، لەوێ ناشتمان. ئەمە ڕوداوێکی ناخۆش بو، هێشتا هیچمان نەکرد بو یەکێکمان بە خۆڕایی کوژرا.

گۆرستانێکی زۆر گەورە لە قەلاتۆکان بو. گەورەیی گۆرستانەکە لە گەڵ کەمیی ژمارەی دانیشتوانی قەلاتۆکان و ئاوایییەکانی دەوروبەری دا نەدەگونجا. هەندێ لە گۆڕەکان هەڵبەسترا بون. نیگاری گوڵ و خەنجەر و مەلێکی لە پاپەتی کەللەشێر لە سەر کێلەکانی هەڵکەنرا بو. نوسینیان لە سەر نەبو، یان من نەمبینی. نەمزانی هی چی سەردەمێکە.

ڕۆژی دوایی کەوتینە ڕێ گەیشتینە دۆڵی خانەقا. پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر و خۆشناوەتی کە لە ناوچەکەدا مابونەوە تا ئەو کاتە خۆیان حەشار دابو، بە هۆکی تۆزێ دۆزرانەوە و خۆیان دەرخست. د. مەجیدیش، کە چەند ڕۆژ بو بە بریندارێ حەشاریان دابو، لە دارەمەیتێک دا گەیشتە دۆڵی خانەقا. سەرەڕای سەختی برینەکەی و پەرێشانی حاڵی، ورەی زۆر بەرز بو. لە گەڵ مەلا ئەحمەد چەند جارێ دانیشتین و، نوێنەرانی هەردولامان دانا و، ئەو چەکانەی لە یەکتریان گرت بو وەرمانگرتەوە دامانەوە بە یەکتری. ئەبو نێوانی هێزەکانی هەردولا لە ناوچەکەدا بگەڕێتەوە دۆخی جارانی.

بەڵام وەکو دوایی بۆمان دەرکەوت ئەمە بۆ خاوکردنەوەی ئێمە بو، چونکە سەرکردایەتی جود بڕیاری دابو: یەکێتی تەمێ بکا.

*

هێزەکمان بە ڕێ کەوت بەرەو مەلەکان. بەیانی زو بو گەیشتین. پیاوەکانیان کە بە هاتنی ئێمەیان زانی بو هەمویان لە ترسان خۆیان لە چیا شارد بوەوە. ئەو ڕۆژە هەینی بو، لە بەر ئەوەی پیاوەکانیان ئاوایییەکەیان بە جێ هێشت بو، نوێژی هەینی تێ دا نەکرا. هێزەکمان زۆر بو هەموی لە مەلەکان جێیان نەدەبوەوە، لە بەر ئەوە دابەشمان کردن بە درێژایی دۆڵەکە لە گوندەکانی: کەندول، پلەی سەرو، پلەی خوارو، ئالانە.. دابەزرین.

کادرەکانی یەکێتی، هەواڵی ناراستیان لە سەر ژمارە و شوێنی هێزەکانی حسک هەبو. پێیان وت بوین کە دۆڵەکە چۆڵە و، هێزی حسکی تێ دا نەماوە. بەڵام کە هێزەکانی ئێمە چون بۆ بلێ، لە چیاکانی پشتەوە: سەری جوانەگا، دارە هەشک، گەلی بیجان، کە بەشێکی زنجیرەی چیای کورەکە.. بویان دامەزرا بون، دایاننە بەر دەسڕێژی گوللە. یەکێکیان لێ کوشتین و چەند کەسێکیشمان بریندار بون.

هێزێکمان نارده سەریان. شوێنەکانیان زۆر قایم بو. خەڵکی ناوچەکەش بە نهێنی هاوکارییان ئەکردن. بەرەنگارییەکی سەختیان کرد. سەرەنجام هەڵکەندران و بڵاوەیان لێ کرد و خۆیان شاردەوە. بۆ ئەوەی نەتوانن بێنەوە ناو گوندەکان بە درێژایی دۆڵەکە لە ناو هەمو گوندەکان دا بنکەمان دانا و، لەو شوێنانەش کە ئەیانتوانی هاتوچوی لێوە بکەن بۆسە و ڕەبیەمان دانا.

زنجیرەیەک چیای زۆر سەخت کەوتوتە نێوان دۆڵی شاور و دۆڵی مەلەکان و دۆڵی بالیسانەوە، چەند کوێرە ڕێگایەکی هەیە بۆ هاتوچۆ بارێک و بەرز و ڕک و ڕژدن، خۆیان پێیان ئەڵێن: «دەرە»، وەکو: دەرە هەرتەل، دەرە زێوە کە ڕێگایە بو دۆڵی شاور و، دەرە شێر کە ڕێگایە بو سەرچاوەی مەلەکان و، ڕێگای سەرباری خەتێ. هەمو ئەم شوێنانەمان بە پێشمەرگە تەنی، چونکە چاوەڕوانی گەڕانەوەی سەید کاکەمان ئەکرد کە لە دۆڵی جافەتیەوە

ڕاو نرا بۆ بەرەو کوسرەت و، ئێمە بە یەکێ لەم ڕێگایانە دا تێ پەڕی بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە بارەگای سەرکردایەتییان لە دەوری دۆڵەتوو.

ڕۆژانەیش مەفرەزەکانمان ئەچوون بۆ گەڕانی گوندەکانی دۆڵی بالیسان.

هەمان ڕۆژی گەیشتینە مەڵەکان، دوای ئەوەی تێگەیشتن نیازی هیچ دەستدرێژی و کارێکی خراپمان نیە بۆ ئیوارەکەی، هەمو ئەوانەی هەڵات بون هاتنەوە ناو ماڵەکانی خۆیان. دوا بە دوای یەک هەندێ لە پێشمەرگە و مەفرەزەکانی حسێک، کە خەڵکی ناوچەکە بون ئەوانیش لە مەکۆکانیان ئەهاتنە دەری و، ئەهاتنە ناو یەکێتیەوە. هەندێ لەوانە پێشمەرگەی باش و ڕێکوپێکیان لێ دەرچو، تا سەر لە گەڵ یەکێتی مانەوە.

*

## دیموکرات

یەکێ لە پێشمەرگەکانی دەستەکەی خۆم ناوی جەمال بو. هاوڕێ ی کۆمەڵە بو. بەرپرسی کاروباری لۆجستیکی مەفرەزەکەمان بو. سەرپەرشتی خواردن و دابەشکردنی ئەکرد. کابرایەکی مەڵەکی دارێکی هەرمێ و دو بن دار گوێزی بۆ خواردنی خۆمان بەرەو ڕو کرد بوینەوە. چاروبار گوێز و هەرمێیان لێ ئەکردە و ئەیانخوارد. جەمال سەرپەرشتی چنین و ڕنین و دابەشکردنی ئەکرد. لە باتی ئەوەی بڵێ: وەکو یەک بە سەرتان دا دابەش ئەکەم، ئەوەندە وت بوی: بە دیموکراتی دابەشی ئەکەین، ناویان نا: «جەمال دیموکرات» دوای ئەوە ئیتر ئەم ناوەی بە سەردا دابڕا و، هەتا ئیستایش هەروای پێ ئەڵێن.

*

## قەل

لەو سەردەمەدا دەزگای بێتەل مان نەبو، تەنیا هۆی پەیوەندی مان چەند دانەیەک هۆکی تۆکی بو. بۆ ئەوەی لە گــەڵ یەک پەیوەندی بکەین ئەبو بچــوینایەتە لوتکەی بەرزاییەکان. ئەو مەفرەزانەی لە بۆسەی سەر ڕێگاکان دا دامنابون هەمویان هۆکی تۆکییان پێ بو، بۆ ئەوەی ئەگەر شتێ هاتە پێشەوە بە تایبەتی شوێنەکانیان ئەپەڕوانی بە سەر دۆڵی بالیسـان دا ئاگادارم بکەن.

شاخەوان فەرماندەی ئەوانە بو کە لە سەر باری خەتێ و، فاروقی عەلی مەولودیش هی ئەوانـەی لە سـەر دەرە شـیر بون. بۆ ئەوەی بە ئاسانی لە پەیوەندییـەکانمان تێ نەگـەن، هەندێ لە ناوەکانمان گۆڕی بو، لەوانە: وشەی «قەل» مان بۆ حسک دانا بو.

لە پڕ شـاخــەوان بە هۆکی تۆکی هاواری کـرد: «ئەرێ وەڵلا ئەوە قـــەلەکـانن! ئەوە قەلەکان لە ئوتومبێل دابەزین. ئەوە قەلەکان خەریکن بە سەر باری خەتێ دا هەڵئەگەڕێن. ئەوە قەلەکان بەرەو لای ئێمە دێن...» بەمجۆرە، بە بێ پسانەوە، درێژەی ئەدا بە قسـەکانی ئەتوت مونەبەد بەدریە و لە سەر ڕوداوەکـانی توپتوپێن ئەدوێ. فاروقی عەلی مەولودیش هەمان قسـەی شاخەوانی بە هۆکی تۆکییـەکانی تر ئەگەیاند. چەندێ هەوڵم دا شـاخەوان بە بێدەنگی چاودێری قەلەکان بکا، تا ئەگەنە ژێر ئاگری ئەوان، کەڵکی نەبو.

تومەز قەلەکان سەید کاکە و هێزەکەی بون و، ئەیانویست لە ڕێگای سەرباری خەتێ بێنە دۆڵی مەڵەکان و بگەڕێنەوە بەرەو سەرکردایەتی، لەم هات و هاوارەی شاخەوان هۆشیار بونەوە. ئەوانیش بە هۆکی تۆکی قسەکانیان گوێ لێ بوبو، زانی بویان بۆسەیان بۆ دانراوە. بە هەمان ئۆتۆمۆبیلی پێ ی هات بون، سوار بون و گەڕانەوە بۆ دواوە بەرەو چیای هەورێ،

واتە بەرامبەر بەو چیایەی هێزەکانی ئێمە بوی دامەزرا بون.
ئیتر ئێمە لە گورلی نەبوینەوە. هێزەکانمان نیشتنە سەریان. لە لای چیوە و لە لای سەردۆلەوە بە هەوری دا بویان سەرکەوتن. سەید کاکە بە هوکی توکی قسەی لە گەڵ عەولا سور کرد بو داوای لی کرد بو دەربازی بکا. شوێنێکی بۆ دیاری کرد بو بچیتە ئەوی تا بە تراکتور بیگوێزێتەوە. سەید کاکە هەندی لەوانەی لە گەڵی بون خەریکی کردن بە شەری هێزەکانی یەکێتیەوە، خۆیشی بە دزییەوە مەیدانی بە جی هێشت بو بەرەو ئەو شوێنەی عەولا سور بۆی دیاری کرد بو.
هیچ کەسی لە فەرماندەکانی پێشمەرگە بە ئەندازەی سەید کاکە لە خو دەربازکردن دا زیرەک نەبو، شەرەکەی دائەمەزراند، گەرمی ئەکرد، تاقمی لە پێشمەرگەکانی تێوە ئەگلاند، خۆیشی بە بێدەنگی ئەکشایەوە بۆ شوێنێکی سەلامەت. لە چەندین شەردا ئەم تاکتیکەی بە کار هێنا بو. لە «شەری دەشتیو» یش دا وەها دەرباز بوبو.

*

شێر و ڕێوی
ئەم شەرە زیاتر لەوەی شەرە تفەنگ بی، شەرە قسە بو.
کە باسی ئازایەتیەکانی خۆی ئەکرد، سەید کاکە قولی هەڵئەمالی و، گێرانەوەکانی تێکەڵاو ئەکرد بە هاژەهوژ و فیشاڵ و خو هەڵکیشان، بەلام قسە و نشە و هەرەشەکانی خۆش بون، زۆر جار لە ناخۆشی دا پیاوی ئەهێنایە پێکەنین.
سەید کاکە هەمو فەرماندە ناسراوەکانی یەکێتی ئەناسی و، لە گەڵ هەندێکیان دوست و ناسیاو بو. لەم شەرەدا بە هوکی توکی قسەی لە گەڵ هەندێکیان ئەکرد، لە سەرەتادا کە هێشتا مەترسی لە سەر نەبو جنێوی پێ ئەدان و گەفی لی ئەکردن. قەنناسەیەکی پێ بو، هەرەشەی لی ئەکردن بە قەنناسەکەی، مێشکیان ئەپرژێنی! سەید کەریم و قادر خەیات و عەزیزی داود پیاوی زۆر ئازا بون هەرەشەکانی سەید کاکەیان بە نشە وەرئەگرت و گاڵتەیان پێ ئەکرد. خەریک بون ئەگەیشتنە سەری.
لە چەند لاوە بە هوکی توکی بانگیان ئەکرد: «سەید ڕێوی لە کوی ی؟»
سەید کاکە ئەیزانی ئیتر خەریکە مەترسی لی نزیک ئەبێتەوە وتی: «شێر کە پیر بو ئەبێتە مەسخەرەی سەگان!» یەکێکی کە پێ ی وت: «سەید ڕێوی! تۆ قەت شێر نەبوی، هەر ڕێوی بویت و، هەمو جار خەڵکی لە شەرەوە ئەگلێنی و خۆیشت هەڵدی ی!» قادر خەیات گورانیەکی خۆشی بە ناوی: «هۆ ڕێوی - ڕێوی...» بۆ ڕێکخست بو، بە ئاوازێکی خۆش لە هوکی توکیەکەدا بۆی ئەوت.
ماوەیەک سەید کاکە دەنگی نەما. زۆریان گاڵتە بە خۆی و بە قەنناسەکەی ئەکرد. ئەیانویست شوێنەکەی بدۆزنەوە بەلام ئەو دەنگی لە خۆی بری بو. تومەز خەریکی خۆدەربازکردن بو. سەید کەریم چەند جاری بانگی کرد: «سەید ڕێوی قەنناسەکەت دەنگی نەما چی لی هات؟»
سەید کاکە گەیشتە تینی، وتی: «چو بە .... دایکتا!»
سەیرە کورد لە ناو گیانداران دا، جگە لە شێر و پڵنگ، ئەوانی کەی بە لاوە سوکە. سەید کاکە بە ناوی ڕێوی زۆر توڕە ئەبو. ئەیئەزانی ڕۆمیل سەرکردەی هێزەکانی ئەلمانیا لە سەرەوی ئەفەریقا، کە هێزەکانی بەریتانیای بە سەرکردایەتی مۆنتوگۆمەری بە گیر هێنا

شەرەکەدا ناویان نا بو: ریوی بیابان.
بو، لە بەر زیرەکی لە بەربەرەبردنی
ئیتر بە یەکجاری نە دەنگی قەنناسەکەی و نە دەنگی خوی لە هوکی تورکی دا نەما.
بۆ روژی دوایی بیستمان کە عەولا سور لە ریگای سەرکەپکانەوە تی ی پەراند بو.

*

لە هەوری یەکی لە هیزەکەی سەید کاکە کوژرا، ناوی حەسەن وەرتی بو، تەرمەکەی
بە جی مابو. پیشمەرگەیەکیشیان بە بریندار گیرا ئازادمان کرد. بەلام سەید کاکە خوی
دەرباز بو و، ئەوانی تریشیان بە تاقمی پچوک بلاوەیان لی کرد.
جموجولی ئاشکرای چەکدارەکانی حسک نەما و، ناوچەکە کەوتە ژیر دەسەلاتی
هیزەکانی یەکیتییەوە.

*

بۆ روژی دوایی، بۆ هەلسەنگاندنی هەلومەرجی ناوچەکە و، دانانی بەرنامەی کاری
داهاتو، لە بیراوا کۆبوینەوە. پیویستی ئەوە نەمابو هیزەکان هەمویان لەو ناوچانەدا بە
کوکراوەیی بمیننەوە. هیزەکان ریگا دران هەریەکەیان بچیتەوە ناوچەی چالاکی خوی. لەوێوە
نامەیەکم بە ریگای ناوشار نارد بۆ فەرماندەی پیشمەرگەکانی بنکەی قەلاتوکان. ئاگادارم
کرد کە سەید کاکە لەو ریگایەوە ئەگەریتەوە بوسەیەکی باشی بۆ بنینەوە.-محەمەدی حاجی
عەبدوللا فەرماندەی پیشمەرگەکان بو، بە چاکی بوسەیان دامەزرا بون، بەلام کە سەید کاکە
گەیشت بوە نزیکی، بە هەندی قسەی لوس فریوی دابو، ریگەی پی دابون بە سەلامەتی
تی بپەرێ.
کوسرەت بوشایی تی دا دروست بو. ناوچەیەکی گرنگیش بو بۆ پیکەوە بەستنی
ناوچەکانی هەردو بەری زێ. شەمال کە ئەو کاتە فەرماندەی پیشمەرگەکانی دەستەکەی خوم
بو، حەزی کرد بچی بۆ کوسرەت. تاقمیک لە پیشمەرگەکانی خومم بۆ جیا کردەوە و، لە
گەل هەندی پیشمەرگەی تر بە ری مان کرد و، فەرماندەیی هیزەکەی ئەوی مان پی سپارد.

*

گەلەکۆمەکی ی چوار قزلی جود

پەیوەندی یەکیتی و لایەنەکانی جود چو بوە قوناغیکی ترسناکەوە. لە نیوان
یەکیتی و پارتی دا لە سەرەتاوە حالەتی شەر بەردەوام بو. دوای ئەو روداوانەش شەر لە
نیوان یەکیتی و حسک دا هەلگیرسا بو. بە هوی روداوەکانی دەرگەلە و قەنقیان و
کاروخەوە پەیوەندی یەکیتی لە گەل حشع یش گرژ بو بو، لە گەل پاسوکیش لە روداوەکەی
مامەخەلان و کەرمەدی تیکچو بو. بە واتەیەکی تر هەر چوار براکەی جود لە سەنگەردا بون
لە یەکیتی. سەرکردایەتی ئەم حیزبانە بە نهینی لە ناو خویان دا ریک کەوت بون
گەلەکۆمەکیێەکی پیشمەرگەیی بکەن، یەکیتی لە مەیدان دەربهەرێنن، یا هیچ نەبی تەنی
ی بکەن.
ئیمە هیشتا بەمەمان نەزانی بو. من بەرەو دوا گەرامەوە بۆ مەلەکان و، دوای چەند
روژی چومە دولی خانەقا بە نیازی ئەوەی بە یەکجاری بگەریمەوە بۆ ئاوزەنگ لە بەر ئەوە
هیزەکەم کەم کرد بوەوە. هەر ٤٠ کەسیکم لە گەل بو. چەند روژی لە گوندەکانی دولەکەدا
ماینەوە. روژانە شیوعیەکان تاقمیک و دوان و سیان بە ناوی کرینی ئازوقە و کەلوپەل و
پیویستی ترەوە بە لای ئیمەدا تەهاتن، وەکو پیشمەرگەکان چاودیریان کرد بون، لەم سەر

بە کەسی ئەرویشتن، بەلام لەو سەر بە زوری ئەهاتنەوە. گومانیان وابو هەزێکی بێگانە، وردە وردە و بە شینەیی، ئەگوێزنەوە بو شوێنەکانی پشتی ئێمە.

*

چارەش

مەکتەبی سیاسی چەند جارێ بە رادیو پەیامی مەجفورییان بۆ ئەناردم، کەوا عەولا سور ڕێگای کومتانی بەستوە، هەرکەس لەوێوە ئەڕوا، ڕێگای پێ ئەگرێ و لێکۆڵینەوەیان لە گەڵ ئەکا، چەند پێشمەرگەیەکیشی چەک کرد بو، داوایان لێ ئەکردم هەزێک بنێرمە سەری لە ڕێگاکە دوری بخەمەوە.

جارێکیان تالمی هونەرمەندی هەولێری لەوێوە تێ پەری بون. سەید کاکەش لەوێ ئەبێ. یەکێ لە هونەرمەندەکان کەمان، یا ئالەتێکی موسیقی تری، پێ ئەبێ. سەید کاکە لێ ی ئەپرسێ: «بۆ کوێ ئەچی!» ئەڵێ: «ئەچم بۆ ناوزەنگ» سەید کاکە ئەڵێ: «مامجەلال کەسی بە دەستەوە نەماوە خەریکە چارەش کۆ بکاتەوە!»

*

سوار ئاغا، عەولا سوری بانگ کرد بو لە سەر دەرباز کردنی سەید کاکە سەرزەنشتی کرد بو. بۆی باس کرد بو کە یەکێتی و حسک لە شەردان، بارمەتیدانی ئەوان واتە دوژمنایەتی یەکێتی. چەند جارێ قسەی لە گەڵ کرد بو کە یان بگەرێتەوە ناو یەکێتی یان ناوچەکە بە جێ بهێڵێ و بچێ بۆ سەرکردایەتی حسک. چەند ڕۆژێ ئەم مشتومڕەیان بەردەوام ئەبێ. مەلا عوسمانی پلنگان، عەزیز صدیق، ڕەئوف سلێمان و مامەندی حاجی صدیق لە هەندێ لەم دانیشتنانەدا بەشدار ئەبن. زۆر لە فەرماندەی کەرتەکانی هەریمەکەش کە خەلکی ناوچەکە و هەندێکیان خزمی خۆی بون هەر لە گەڵی خەریک ئەبن. ئەم هەولانە نەک هەر هیچی سودی نابێ، بەڵکو بەوپەری بێ باکی و بێ منەتیەوە سور ئەبێ لە سەر هەلویستی خۆی و، پێیان ئەڵێ: «چیتان پێ ئەکرێ بیکەن!» تومەز ئاگادار بو کە هێزێکی گەورەی جرد بە ڕێگاوەیە.

*

کزلانی فاتە

«خانەقا» گوندێکی بچوک بو، دولەکەیش بە ناوی ئەم گوندەوە ناو نرا بو دولی خانەقا. جادەیەکی قیری بە ناودا تێ ئەپەری سەنگسەری ئەبەست بە جادەی هامیلتونەوە. لەمبەر و ئەوبەری جادەکە گوندەکانی: بەرگردکە، سەرنەوس، بن نەوس، گوزجار، ڕۆژێکەریان، چۆم ڕێخن.. هەبو. ڕێگایەک لەم جادەیەوە ئەبوەوە ئەچو بۆ قەسری، یەکێ لە پیچەکانی ناوی: «کزلانی فاتە» بو.

لە گەڵ پێشمەرگەکانی بالەکایەتی ئەوانم زور خۆش بو هەندێ جار گالتەوگەپم لە گەڵ ئەکردن. عەزیزی داوە پیاوێکی لەزشە و قسە خۆش بو، لە لاسایی کردنەوەدا زور وریا بو. ئەگەر لە ولاتێکی کە بوایە ئەیتوانی بێ بە ئاکتەرێکی گەورە. ڕۆژێکیان وتم: «عەزە گیان ئەم فاتەیە چیتە؟» وتی: «فاتە خەلکی سلێمانی بوە. ئەو زەمانەی بارەگای بارزانی لێرە بو هاتوە لەو شوێنەدا کەتنێکی کردوە. لەوساوە ئەم ناوەیان لەم شوێنە ناوە!»

ئەوبەرمان چیای مامە روت و پشتمان چیای دڕە بێ بو. کاتی خوی «شیخ ئەبی ماویلیان» لەم خانەقایەدا ئیرشادی کردوە و، گورەکەیشی هەر لەو نزیکانە زیارەتگای ئەهلی

مراز بو. شێخ ئەبی زۆری ژن هێناوە. حاجی قادری کۆیی هێرشی زۆری کردوتە سەری و، لە چەندین شیعری دا ناوی هێناوە و هەجوی کردوە.

*

شەوەکەی ئێمە لە بەرگردکە لە مالی شێخ ئەوڕەحمان بوین. خێزانێکی هەژار بەلام تەبیعەت دەولەمەن بون، کوردپەروەر و تێگەیشتو بون. ژورێکی خۆشیان لە نهۆمی دوەمی خانوەکەیان دا بۆ میوان تەرخان کرد بو ئێمە لەوێ دا بوین. پێش ئەوەی دنیا تاریک بێ، هەرچی ڕێبوار و کاروانچیەک ئەگەیشت، ئەیوت هێزێکی زۆری پارتی لە سەر جادەکە کۆبونەتەوە. تا ئەوسا ئێمە نەمانزانی بو هێزی پارتی دابەزی بێ. کەوتینە پەیجوری ڕاستی هەوالەکە. دەرکەوت هەوالەکە ڕاست بو.

شەوەکەی بو بە وەیشومەیەکی زۆر بەهێز. ڕەشەبایەکی وا هەلی کرد مالەکەی ئەهەژاند و، بارانێکی بە خوڕەم دایکرد و، هەوا ساردی کرد بو. هەمومان چاوەڕێ بوین ها ئێستا ها تاوێکی تر خۆیان بکەن بە ناو گوندا و بێن بە شەڕی ئەنبەتەمن، چونکە باوەڕمان نەئەکرد لەو چۆلەدا بەرگەی ئەو وەیشومەیە بگرن، بەلام دیارە مرۆڤ هەندێ جار لە داروبەرد قایمترە.

*

بۆ ڕۆژی دوایی هەندێ لە هێزەکانی هەرێمی ٧ ی بالەکم کۆ کردەوە و، لە گوندی «کەلیت» ەوە بە بناری کاروخ دا بۆ سەرگەلی و ئینجا بۆ زارگەلی کەومالیکی وردەمان کرد. نە لە دور و نە لە نزیک هیچ نیشانەیەکی هەبونی هێزی پارتی مان هەست پێ نەکرد. هێزەکانیان شەوی پێشو پاشەکشەیان کرد بو بۆ دەوروبەری پشت ئاشان.

لە چەند سەرچاوەی جیاوازەوە هەوالم بۆ هات بو، ئیتر گومانم نەمابو لەوەی بەو نزیکانە هێزەکانی جود پەلامارمان ئەدەن. لە بەر ئەوە ئیتر مانەوەم لە دولی خاتەقا بە چاک نەزانی. پێشم باش ئەبو بگەڕێمەوە بۆ ناوزەنگ. بە ناو وەرتێ دا لە زێنی ئەستیروکانەوە چوم بۆ دولی شاوێر. لە وەرتێ بە دەم ڕێگاوە لە ناکاو بۆ چاکوچونی چوم بۆ سەردانی بارەگای حیزبی شیوعی. زۆر گیر نەبوین ڕۆیشتین. پێشمەرگەکانی لە گەلم بون چاویان هەلئەست بو. وتیان لە ژورەکانی کەدا خەلکی تری لێ بو کە نەیانئەویست ئێمە بیانبینین. دوایی دەرکەوت هەندێ لە هێزەکانی پارتی بون بە دزیەوە هێنا بویانن پشتمان لێ بگرن. بەلام هێشتا ژمارەیان بابی ئەوە نەبو پەلامارمان بدەن.

*

شەو گەیشتینە پلنگان. چوینە مالی مەلا عوسمان. مەلا عوسمان پیاوێکی کوردپەروەر بو لە کۆنەوە بەشداری جولانەوەی کورد و، دۆستی یەکێتی بو. هێشتا نەحەسابوینەوە هەوالیان بۆ هێنام کە ئەمرو عەبدوللا سور سەری سوارتاغا و هەندێ لە فەرماندەی کەرتەکانی هەرێمەکەی دابو، پێ ی وت بون کە: «هێزێکی گەورەی جود لەو ڕۆژانەدا دێتە خواری بۆ دەرکردنی یەکێتی لە ناوچەکە، ئەم چونکە خۆی بە خزمیان ئەزانی لە پێشەوە هاتوە پێیان بلێ: ئەگەر ئەمان هاوکاریان بکەن ئەوا باشە، ئەگینا ئەمانیش دەرئەکەن!» ترسی ئەوەم هەبو پێش وەخت و، پێش کۆبونەوەی هێزەکانی یەکێتی، دەسکێشیی هێزەکانی جود بکا بۆ ناوچەکە. لەو کاتەدا هێزێکی ئەوتۆم لە بەر دەس دا نەبو بەری هێرشی جودی پێ بگرم. هێزەکانم نارده چوار دەوری.

*

بەیانی ڕۆژی ۱۸/ ی تشرینی یەکەمی ۸۱ هەواڵم بۆ نارد کە: «یان بێتەوە ڕیزی یەکێتی، یان بیلایەن لە ماڵی خۆی دابنیشێ بەو مەرجەی هاوکاری جورد نەکا ئیمەش دەستی لێ نەدەین، یان دەسبەجێ ناوچەکە چۆڵ بکا» بەڵام ئەویش هەر کە بە هاتنی ئێمەی زانی بوو هەر شەوی چوو بوو شاخی بیرمکە لە پشتی دولە ڕەقە، هیزەکانی خوی بە چەند ڕیزی دامەزراند بوو.

*

قادر خەبات دۆستی عەولا سور بوو بەیانی زوو چوو قسەی لە گەڵ بکا. قسەکانی منی پێ بلی. تەقەیان لێ کرد گوللەیەک لە ڕانی دا و، لە شوێنێکی کراوەدا بە بریندراری تا بە لاداخستنی شەڕەکە کەوت بوو خوێنی لە بەر ئەڕۆیشت نەیئەتوانی سەر دەربێنێ.

دو لە خزمەکانی عەبدوللا سور، کە فەرماندەی کەرت بون لە هەریمەکەی: حاجی ئاغا حامید و خالصی حەقی ئاغا، هاتنە ناو یەکێتیەوە. هەمان پەیامەکەی بەیانیم بە سانیش دا بۆ نارد. بەڵام پێیم وتن ئەم پەیامە تا ئەو کاتە بڕ ئەکا کە لیمان نەکوژراوە، ئەگەر لیمان بکوژی ئیتر لە کوڵی نابینەوە.

خۆم لە گەڵ سوار ئاغا چومە بەرزاییەک بەرامبەر بیرمکە هەمو شاخەکەمان ئەبینی. شوانێک هاتە لای سوار ئاغا ڕاسپاردەی عەولا سوری بۆ هینا بو. بە شوانەم وت: «ئەتوانی نامە یا ڕاسپاردەی منی پێ بگەیەنی؟» وتی: «بەڵێ» وتم: «نامەیەکی بۆ ئەنوسم بۆی بیە!» نامەیەکی کورتم بۆ نوسی هەواڵەکەی بەیانیم تێ دا دوبارە کردەوە و بۆم نوسی: «تا شەر و پیکادان نەبوە لە یەک گەیشتن ئاسانە. ئەگەر بو بە شەر و لیمان کوژرا ئەوسا وازی لێ ناهێنین.» سوار ئاغاش نامەیەکی بۆ نوسی. شوانەکە نامەکانی برد و ڕویشت. نازانم پێ ی گەیاند یا نە. زووی نەخایاند لە بەردەمی دولە ڕەقە دا بو بە تەقە.

*

محەممەدی برای عەولا سور پیشمەرگە نەبو. تا ئەو کاتەش تێکەڵاوی شەر نەبو. کە تەقە گەرم بو کوژراو و بریندار کەوتن. یەکی لە هێزکی تورکیبەکان ئاگاداری کردم: «محەممەد تفەنگی پێ یە و، خەریکە بە بیرمکەدا هەڵئەگەرێ تەقەی لێ بکەین؟» وتم: «تەقەی لێ مەکەن!» لام وابو براکەی لە تەنگانەدایە ئەچێ بۆ یارمەتیدانی. ئەرکی برایەتی بە جێ ئەهێنێ. بەڵام محەممەد ترسابو داخی عەولا سور بەو بڕێژێن، دابویە شاخ خۆی دەرباز بکا نەک یارمەتی براکەی بدا. محەممەد بەشداری شەر نەبو. دوای ئەوە چوە لای حسک لە جیگەی براکەی بو بە فەرماندەی هەریم و، ماوەیەکیش لای هەباسی بایز بو بە جاش.

*

کابرایەکی مەردار لە دولە ڕەقە بو ناوی حاجی پلنگ بو. ئەوە یەکەم جار بو ناوی وەها بیبیستم. ئاژەڵەکەی گل دابوەوە نەی برد بو بۆ شاخ. لە گەرمەی شەڕەکە دا ئەیویست بەرەڵڵایان بکا بۆ ئەوەی لە گەڵ بەردانی ئەوان دا بۆ ئاو خواردنەوە، گەمارۆ دراوەکان خۆیان دەرباز بکەن. ئەمە تاکتیکێکی زیرەکانە بو.

*

دو کەس لە پیشمەرگەکانی ناوچەکە کوژرا بون: یەکیکیان، فەقێ مستەفای حاجی

خدری دوله رەقە، برازای عومەری حاجی برایم بو. کادریکی جوتیاری هەلکەوتوی کومەلە و، ئەندامی کونفرەنسی یەکەم بو، لە ناوچەکەدا زور خوشەویست بو، خەوی و مامی و کەسوکارەکانیشی لە شەوە کەدا بون. ئەوی تریان ناوی باپیر بو برازای کویخا مینەی ئوزە بو. جگە لەم دوانە پیشمەرگەیەکی گەرمیانیش کوژرا بو، لە بەر خوشەویستی هەر بە ئاموزا بانگیان ئەکرد.

۳ پیشمەرگە کوژرا بون و قادر خەیاتیش بریندار بو. ئاگاداری ئەو هێزەم کرد کە لە دەوری ئەوان دام نا بو، پەلاماری سەرچاوەی ئەو تەقانە بدەن. هەلمەتیکی کتوپریان بو بردن، زوری نەخایاند کپیان کرد. هەندیکیان کوژران، یەکیکیان مستەفا کەلەتەیی بو. ئەوانی تریان گیران. سامان کە بە بیرمکەدا هەلگەرا، بە هوکی ترکی ریگاکانمان بو دیاری ئەکرد، ئەویش پاشماوەی هێزەکەی دوزیەوە، عەولا سوریشیان لە گەل بو. ئەوانیش گیران.

کە چومە شوینی شەرەکە، خزمەکانی فەقی مستەفا بە ژن و پیاو و منالەوە وروژا بون، چەکدارەکانیان ئەم بەر و ئەوبەری تەنگەکەیان لە پیشمەرگەکانی یەکێتی گرت بو. ژن و منالیش لە گیراوەکان و حەرسەکانیان وروکا بون بە بەرد و تیلا تیبان بەربوبون. ئەیانویست هەمو گیراوەکان بکوژن. چەندی خەریک بوم خاویان بکەمەوە، کەلکی نەبو، کەوتنە جنیودان و سیل راکیشان لە منیش، خەریک بو ببی بە شەری خویەخو. لەم هەرایەدا عەولا سور کوژرا و ئاژاوەکە کوژایەوە. دیمەنیکی راستەقینەی شەری پشت شکینی براکوژی. زوری پیشمەرگەکانی هەردولا ئاکو و، خەلکی هەمان دوڵ و هەندیکیان خزمی یەکتری بون.

*

عەولا سور، رەنگی سور نەبو، بەلکو کابرایەکی رەشتالەی رەقەلە بو، وەکو ئەیانوت: شاخەوانیکی زور وریا و، تفەنگچییەکی دەسراست و، پیشمەرگەیەکی ئازا بو. لە ناخی دلەوە پیم ناخوش بو بکوژری، بەلام چون بو رزگارکردنی ژیانی مروڤێ لە مردن جاری وا هەیە دکتور خوشەویستترین ئەندامی لەشی نەخوشەکە ئەبری، نەخوشەکەیش خوی بە ناچاری رازی ئەبی، یان بو کوژاندنەوەی ئاژاوەی خوێناوی نیوان دو بنەمالە یەکی ئەکری بە قوربانی، کوشتنی ئەویش ناچارییەکی لەو بابەتە بو.

بیگومان عەولا سور وەکو هەمو شەهیدەکانی کەی شەری ناوخو قوربانیەکی بی گوناه بو.

*

## ئاکویەتی

ئاکویەتی بەو ناوچەیە ئەلین کە عەشیرەتی ئاکوی تی دا ئەژی. ئاکو لە لای روژهەلاتیەوە لە گەل مەنگور و، لە لای روژئاوایەوە لە گەل خوشناو و، لە لای سەرویەوە لە گەل بالەک و، لە لای خوارویەوە لە گەل سن، رەمەک و پیران (۳ تیرەن لە بلباس)، هاوسنورە. لە روی ئیداریەوە بەستراوە بە قەزاکانی رانیە و پشدەرەوە. لە قەزای رانیە بەشیکە لە ناحیەی مەرکەز و، لە قەزای پشدەریش بەشیکە لە ناحیەی ناودەشت کە مەرکەزەکەی سەنگەسەرە.

لە روی خیلەکیەوە لە چەند بەش پیک هاتون:

باشناغایی، بنەمالەی فەرمانرەوای عەشیرەتەکەن، لە گوندی سەرکەپکانی رانیە

دانیشتون.

ئاودەشتی، ئەوانەن کە لە ناوچەی ئاودەشتی پشدەر دا دانیشتون و، لە چەند تیرەیەک پێک هاتون: شاروشی، کە لە داوێنی قەندیل دا لە ٨ گوندا ئەژیان.

رەزیکەری، ئەوانیش ئەبن بە ٣ هۆزەوە: پاوەیی، خەیلە، مەندەمەرە، مەندەمەرە، لە چەند گوندێک دا: گرتک، دوکۆمان، جەلک، مەمک، پیرانە رەشە، ماخوێزنان.. ئەژیان لە نێوان چیای زەرتەکێو و ئاوی گارفین دا. بەم ناوچەیە ئەلێن پشدەرە رەقە و، بە ئاکۆی ئەم ناوچەیەشیان ئەوت: ئاکۆ رەشکە. ئاواییەکانیان کەم ئاو و کەم دەرامەتە و ناخۆشە. بە ئاژەڵداری ئەژیان و بە هاوینان ئەچون بۆ کوێستانەکانی قەندیل. عەباسی بایزی بالو سەرۆکایەتی ئەکردن. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەوە عەباس بوبو بە جاشێکی دڕ لە ناوچەکەدا.

ئاکۆی بەردەر، ئەوانەن کە لە دۆلەرەقە، دۆلی پلنگان، دۆلی شاوورد! ئەژیان.

بۆلی، لە دەشتی بیتوین و، بابۆلی، لە بناری کۆسرەت ئەژیان و، بۆ هاوین ئەچون بۆ حاجی هۆمەران

*

عەشیرەتی ئاکۆ لە سەردەمی شۆڕشەکانی شیخ مەحمودا دوبەش بون: بەشێکیان لایەنی شیخ مەحمودیان گرتوە و، بەشێکیان لایەنی ئینگلیزیان گرتوە لە دژی شیخ مەحمود و تورک بون.

عەباسی مامەند ئاغا، کە لە بەر خۆشەویستی پێیان وتوە کاکەباس، پیاوێکی کوردپەروەر بوە، لە سەردەمی پاشایەتی دا هاوکاری لە گەڵ سەرانی پارتی و حشع کردوە، دوای گەرانەوەی مەلا مستەفا بۆ عیراق یەکێ لە لایەنگرە نزیکەکانی بو، لە کۆکردنەوەی خێلەکانی ناوچەکە و، هەلگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول دا دەورێکی کاریگەری هەبو. جەماعەتی مەکتەبی سیاسی دوای گەرانەوەیان لە ئیران لە لای ئەم دەس بە سەر دانرا بون و، بە ئاگاداری ئەم هەلاتن. لە سالەکانی دوایی دا نێوانی لە گەڵ مەلا مستەفا خۆش نەبو. توشی نەخۆشیەکی سەخت بو، هەتا لی ی پێس نەکرد، مەلا مستەفا رێگەی نەدا بچێ بۆ تەداوی، کە گەیاندیانە نەخۆشخانە لە بەغداد مرد (١٩٦٦). لە پاش خۆی چەند کورێکی بە جێ هێشت بو: بایز، سوارە، مامەند، هەمزە، کوردە و ئاکۆ.. ئەم برایانە دایکیان و، عەشیرەتەکانی دایکیان جیاواز بو، لە بەر ئەوە لە ناو خۆیان دا کۆک نەبون.

مەلا مستەفا رێزی منالەکانی عەباس ئاغای نەئەگرت و، ئەوانیش وەکو باوکیان پێ نەئەکرا. لە ئاکۆکی مەلایی و جەلالی دا بە لای جەلالی دا داشکان و، بە هۆی ئەوەوە توشی تالانکران و دەربەدەری بون. لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشی حوزەیران دا بایزئاغا بو بە پێشمەرگە و، لە گەڵ ئەو ژمارەیەکی زوری خەلکی ناوچەکە بون بە پێشمەرگە. لە هێرشەکانی سەرەتای ٧٨ دا کە ناوچەکەیان داگیر کرا و، زوری خێزانەکانیان گیران، زوریان تەسلیم بونەوە. بایز ئاغایش رویشتەوە. پاش چەند روژێ لە روداوێکی ئوتومۆبیل دا مرد.

*

ناوچەکە، یەکێکە لە ناوچە شاخاویە هەرە عاسێیەکانی کوردستانی عیراق. شاخەکانی زیرنە کێو، مامەروت، دەرەبی، کاروخ، کورەک، هەندرین، کێوەرەش، ماکوک،

بیرمکه و، لایەکی گوندەکانی دۆلی خانەقا بو کە سەر بە قەزای چومان و، لایەکی گوندەکانی دوڵ ئاکۆ و دۆلی مەلەکان بو کە سەر بە قەزای رەواندز و، لایەکی گوندەکانی دۆلی شاور و دۆلە رەقە بو کە سەر بە قەزای رانیە بون.

دوای ئاشبەتال هەندێ جادەی قیر و هەندێکی خاکی تێ دا کراوەتەوە، بەلام هەر نەیتوانیوە شوێنەکانی بە تەواوی بە یەکەوە ببەستێ. لە لەشکرکێشییەکانی ۷۷ دا جەیش دەستی بە سەر شوێنە گرنگەکان دا گرت بو، «رەبیە» ی تێ دا دانا بو. دوای هەلگیرسانی جەنگی عێراق - ئێران زۆری چۆل کرد بو. دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی کوردپەروەر و دۆستی شۆرش بون و، یەکێتی نفوزی باش و بەهێزی هەبو لە ناویان دا. گەلێ پێشمەرگە و فەرماندەی لە ناو خەلکی ناوچەکەدا هەبو، دۆست و لایەنگریشی زۆر بو.

*

ناوچەکە وەکو مەنجەل کەوتوتە نێوان چەند چیایەکی بەرز و بە یەکەوە بەستراوەوە: کێوەرەش، بیرمکە، کارۆخ، ماکۆک و، ناو مەنجەلەکەیش چەند دۆلێکی تێ دایە: دۆلە رەقە، دۆلی پلنگان، دۆلی شاور و، لە ناو ئەم دۆلانەیش دا چەند گوندێکی تێ دا بو: سیدیرە، گوێچکەلان، شەکەلە، ناوەنێنان، گولان، کەرەک، بیردێ، بەردانگە، تورە، دێرە..

ناوچەکە شاخاوی و، زەویوزاری کشتوکالیان کەم بو، هەندێ باخی هەنار و مێوە، هەندێ دانەویلە و سەوزە و، بەرهەمی سەرەکییان ئاژەلداری و توتن بو. توتنی ئەم ناوچەیە پێ ی ئەلێن: «توتنی شاورە»، وەکو توتنی شوێنەکانی تر ناکرێ بە چەرداخ دا، بەلکو لە شیشی داری ئەدەن و، بۆ وشک بونەوە لە سەر ئەرز دایئەنێن. جۆری توتنەکەیان باش و بۆندارە. بە زۆری لە بازاری قاچاخ دا ئەفرۆشرێ و، تەسلیمی دائیرەی حکومەتی ناکەن.

*

من لە گولان دامەزرام. گولان: ناوە بو چەند گوند، بۆ چەند شاخ و، بۆ یەکێ لە مانگەکانی سالی کوردی و، بۆ ئەو شۆرشە «وەهمی» یەی پارتی دوای ئاشبەتال هەلی گیرساندوتەوە.

هەوالەکانی بۆم ئەهات وایان ئەگەیاند لەشکرکێشی جەود نزیک بوتەوە. نامەم بۆ م س نوسی، رووداوەکەم بۆ گێرانەوە و، هەندێ بانگەوازم نوسی بو کە بە مەجبوری لە رادیو بیخوێننەوە داوام لە هێزەکانی ناوچەکە کرد بو کۆ ببنەوە. داوام لە مولازم عومەر کرد هێزێک بهێنێتە قەلاتوکان و، نامەیەکیشم بۆ سەید کەریم نوسی، کە بە بێ دواکەوتن خۆی و هێزەکەی لە گەلێ بو بگەرێنەوە دۆلی شاور.

*

ئێمە لەم کەین و بەینەدا بوین بەیانیی رۆژی ۲۵ ی تشرینی دوەمی ۸۱ هێزی هاوبەشی جەود پەلاماری دۆلی خانەقا و وەرتی یان دا. ناوچەکەیان گرت. هێزەکانیان گەیشتنە زێنی ئەستێروکان و، لە لای رۆژهەلاتی سەری ئەحمەدە و، لە لای رۆژئاوای سەری هەلمەوتیان گرت و، رەبیەیان تێ دا دامەزراند.

نزیکەی ۵٠ پێشمەرگەی یەکێتییان بە تاک و بە کۆمەل چەک کرد بو، لەوانە: حاجی ئەحمەدی بۆلی، کە پیاوێکی بە سالاچو و، براگەورەی بولیەکان بو. چەند سالێ لەوەوبەر کوڕێکی پێشمەرگەی کوژرا بو، ئەمجارەش خۆی و کوڕەکەی و چەند خزمێکی

بەر چەک کردن کەوت بون. زۆری ئەم پێشمەرگانە بە ژمارەی کەم لە بارەگا پچوک و بڵاوەکانی ناو وەرتی دا بون. بارەگای حشع یش لە ناو وەرتی دا بو. پێشمەرگەکانی حشع چاوساغی هێزەکانی جودیان کرد بو بۆ سەر بارەگاکانی یەکێتی و، ئەوان داوایان لی کرد بون لە سەر شەرەفی حیزبی شیوعی چەک دانێن و تەسلیم بن. مستەفا ناوپردانی خۆی و کەرتەکەی کە لە مامەروت گیریان خوارد بو، لە ئیمە دابڕا بون، نائومێد بون بە کۆمەڵ تەسلیمی بەعس بونەوە.

بۆ ئەوەی هێزەکانی جود نەتوانن پێشڕەوی زیاتر بکەن، بە هاوکاری کەرتەکانی هەرێمی ٧ ی بالەک و ١٤ ی ئاکۆ هەندێ سەرشاخ و جێگای گرنگمان قایم کرد، بە هیوای گەیشتنی هێزەکانی یەکێتی. «گۆلان» م کرد بە بنکەی فەرماندەیی.

هەندێ وشەی جوگرافی

زین: ئەو ڕاڕەوەی کە بە بە بەرزایی دا بە نێوان دو ریزە شاخی بەرزدا تێ ئەپەڕێ، وەکو: زینی ماخوێزنان، زینی ئەستێروکان، زینی ڕات، زینی سەران. لە هەندێ شوێنی تر بۆتە زینو، زینۆ، وەکو: زینوی شێخ، زینوی خەلان. زین، لە زینی وڵاخ وەرگیراوە کە لە چەرم دروست ئەکرێ و، ئەخرێتە سەر پشتی وڵاخ، لە کاتی سواری دا لە سەری دائەنیشتن (لە پەهلەوی و لە فارسی دا: زین).

چەقەڵ: بەرزاییەکی قوتی بەردەلان، وەکو: چەقەڵی ڕێگران، چەقەڵی گزوانان. سەیر ئەوەیە لەم ناوچەیەدا «گزوان» بە واتای ڕێگر بە کار ئەهێنن.

ئەستێرۆک: پچوککراوەی: ئەستێر، ئەستێل، واتە حەوزی ئاو کە بۆ کۆکردنەوەی ئاوی کانیەکی پچوک دروست ئەکرێ.

گەلی، یان گەلێ: ئەو شوێنە تەسک و تەنگەبەرەی کەوتوتە نێوان دو چیای گەورەوە، وەکو: سەرگەلی، زارگەلی، گەلی بەدران، گەلی بیجان، گەلی عەلی بەگ. لە هەندێ شوێن بۆتە گەلو، وەکو: سەرگەلۆ، بەرگەلۆ. لە هەندێ شوێنی تر بە گەرو ماوەتەوە، وەکو: گەروی مەلەبەل، گەروی عومەرئاغا، گەروی بیشە، گەروان (گەرووان).

گەلی، گەلو، گەرو: هەرسێک لە یەک ڕیشەن، لە کوردی دا: گەرو، قورگ، ئەوگ (لە پەهلەوی دا: گەروک. لە فارسی دا: گلو).

ناوی هەندێ لە شاخەکانی

کاروخ: زەینەفۆن لە «ئاناباسیس» دا کە باسی گەڕانەوەی دەهەزار سەربازی یۆنانی ئەکا بە ناو کوردستان دا ناوی دانیشتوانی ئەوسای کوردستان بە کاردوخ ئەبا. بەڵێ ی لە نێوان ئەم دو ناوەدا هیچ پەیوەندییەک نییە.

هەڵمەوت: شوێنی سەخت و عاسی، یەکێکە لە لوتکەکانی کاروخ. ئەو شوێنە عاسیەی حەسەن صەباح کرد بوی بە مەڵبەندی خۆی ناوی «ئەڵەمرت» ە کە هەمان مەعنای هەڵمەرتی هەیە و، عەرەب بە هەڵە کردویانە بە «ئەلموت».

کزەک: کەچەڵ، سەری بێ مو.

بۆت (بۆتێ، گزرە بۆت، کانی بۆت): بەبەکە، هەروەها بودقە، ئەو گلێنەیەی زبر و زەوی تێ دا توێنراوەتەوە.

*

ڕادیۆی پارتی ئەم پێشڕەوییەی وەکو مژدەی سەرکەوتنێکی گەورە بڵاو کردەوە،

رادیۆی یەکیتی یش کەوتە بلاوکردنەوەی بانگەواز و ئاگاداری بۆ هێزەکانی خۆی. هێزەکانی دەشتی هەولێر، خۆشناوەتی، کۆسرەت کە لە گەڵ سەید کەریم چو بون بۆ «جەولە» گەیشتنەوە لای من لە گولان. لە گەڵ خۆیان دو کارکەری ئەڵمانیشیان هێنا بو کە تازە گیرا بون.

لەو ماوەیەدا چەند جاری کارکەری ئەڵمانی کە لە عیراق کاریان ئەکرد، گیرا بون. حکومەتی ئەڵمانی کەمال فۆنادیان هەڵپێچا بو، ئەویش سەرکردایەتی یەکیتی تەنگاو کرد بو. مامجەلال لە گەڵیان ریک کەوت بو کە ئیتر ئەڵمانی نەگیرین. ئەڵمانیەکان زور ماندو بون، هەندی قسەم لە گەڵ کردن و، وتم پیشمەرگەکان ئیوەیان بە هەڵە هاتیوە لە زمانی یەکتری تی نەگەیشتون، بۆ هەرجییەک ئەتانەوی برۆن ئازادن. ناردمن بۆ سەرکەیکان دوای پشودان نارد بریانەوە رانیە.

*

کەوتینە کۆکردنەوەی دەنگوباسی هێزەکانی جود و، نۆرینی شوینەکانیان. هێزیکی بی سەرو بەر و یەک نەگرتو بو. وەکو «مالی فرە ژن و، ئاشی فرە وەستا و، گوندی فرە کویخا» ئەوانیش «هێزیکی فرە سەرکردە» بون: محەممەدی مەلا قادر فەرماندەی هێزی پارتی و، سەید کاکە فەرماندەی هێزی حسک و، ئەبو عائید فەرماندەی هێزی حشع و، کەریم سەلام فەرماندەی مەفرەزەکەی پاسۆک. کەسیان کاغەزی ئەوی تریانی نەئەخویندەوە. شوینە لاوازەکانمان دوزینەوە. محەممەدی مەلا قادر، کە لیپرسراوی هێزەکەی پارتی و، وەکو سەرگەورەی هەمو هێزەکانی جود بو، کابرایەکی کویرموشەی چاو کتوکویر بو. ئەیە رۆژ و ئە یەشەو بە باشی بەرپی ی خۆی نەئەبینی. لە دوای ئاشبەتالەوە ئەوە یەکەم جار بو بگەریتەوە کوردستان. لە خۆی رائەئەدی پیشرەوی زیاتر بکا بۆ ناو قولایی کوردستان. ئەترسا ریگای گەرانەوەی ئیرانی لی ببەستری. هەمویان لە وەرتی دایان کوتا.

*

ئەخشەی دەرکردنی جودمان دانا. هەوا ساردی کرد بو. هێزەکانی جود بە شەو هەندی جیگای گرنگیان چول ئەکرد و، بەیانیان زو ئەیانگرتەوە. لەو شوینە گرنگانە: هەلمەوت لە چیای کاروخ و سەری ئەحمەدە لە چیای بیرمکە لەم بەر و ئەوبەری زێی ئەستیروکان.

هێزیک لە گەڵ حەسەن کویستانی و رەحمان سەیدە لە سا و سێوەکەوە بە کاروخ دا هەلبگەرین و شور ببنەوە بو ناو وەرتی و کەلەتە.

هێزیک لە گەڵ شەمال و ئەحمەد مەولود هەلمەوت بگرن و دابەزن بۆ مەکی.

هێزیک لە گەڵ سەید کەریم و عەلی ئەبی پەلاماری زێی ئەستیرۆکان بدەن.

هێزیکی هەریمی ١٤ ی ئاکۆ سەری ئەحمەدە بگرن.

ملازم عومەریش کە لە قەلاتوکان بو شەر بە هێزەکانی پشتەوەیان بفرۆشی.

سەرەتای مانگی کانونی یەکەم دەسمان کرد بە جیبەجی کردنی.

حەسەن و هێزەکەی لە کاروخ دابەزین بەرەو وەرتی. حاجی برای حەسەن کویستانی لە پشتی وەرتی کوژرا.

حاجی یەکی بو لە پیشمەرگە کۆنەکانی یەکیتی لە ناوچەی گەلالە. گەنجیکی تازە پیگەیشتوی زیرەک و وریا بو. لە پیشمەرگایەتیەوە پیگەیشت بو تا بویو بە فەرماندەی

کەرتی گەلالە لە هەریمی ٧ ی پالەک.

لەو قزڵەوە تەنگیان بە هیزەکانی جود هەلچنی بو. سەید کاکەی فەرمانەدەی ئەو قولە، کە زانی بوی تێنیان بۆ هاتوە و، مەترسیان کەوتوتە سەر، بە پیشمەرگەکانی وت بو: «بکشینەوە!» یەکیکیان وت بوی: «ئەگەر ئیرە چول بکەین ناوچەکەمان لی ئەگرن.» وت بوی: «جا با بیگرن ئیرە چی لی یە؟ نە بیرە نەفتی لی یە و، نە مارەیی دابکەم لە سەر داناوە، لەم شاخە تا لە شاخیکی ترا» قسەکەیشی راست بو، ئەمە یەکی بو لە سەرەتا بەرەتییەکانی جەنگی پارتیزانی کە بە سەلیقە فیری بوبو.

عەلی نەبی گەیشتە زینی ئەستیروکان. تەنیا ریگا لە رانیەوە بە دولی پلنگان دا بە زینی ئەستیروکان دا ئەچو بۆ سەرگەلو. یەکی لەو فەرمانداناەی گەیشت بوە سەر زینی ئەستیروکان وەکو مژدەی گەیشتنیان بە هوکی ترکی بە منی وت: «دەبابەکە گەیشتە سەر زینی ئەستیروکان» رادیوی پارتی بە درێ ئەوەندەی باسی هاوکاری یەکیتی و یەعس کرد بو، شیوعیەکان بە هوکی ترکی کە گوییان لە وە بوبو، دەبابە گەیشتە زینی ئەستیروکان، باوەریان کرد بو، ئەوەندەی تر وورەیان بەردا بو. یەکیکیان هاواری لی هەستا بە هوکی ترکی وتی: «شەرم ناکەن دەبابەتان هیناوە!» برادەرەکەی ئیمە لە «دەبابە» مەبەستی عەلی نەبی بو، کە پیاویکی کەتەی چوارشانە، بەلام لە سەرکەوتنی شاخ دا زور گورج و گزل و، لە هەلمەت دا ئازا و چاونەترس بو. دوای شەریکی کەم جود شکان. هیزەکانی جود کشانەوە ناو وەرتی. دەوری وەرتی مان دا.

ئیوارەی ٢ ی کانونی یەکەمی ٨١ بو، ئەمانویست بۆ بەسەربردنی شەو بچینە وەرتی. بە هوکی ترکی ویستمان قسە لە گەل لیپرسراویکی حشع بکەین. شەمال چەند جاری بانگی کردن، یەکیکیان وەلامی دایەوە. پیمان وتن: «ریگای سۆلەیمان بە چولی بۆ جی هیشتون، هەموتان ئەتوانن لەویوە برون و وەرتی بە جی بهیلن.» لە پیش دا وایان ئەزانی فیلیان لی ئەکەین، دوایی کە زانییان بە راستمانە هەمو هیزەکانی جود لە ریگای سۆلێەوە کشانەوە دولی خانەقا و، بەرەو پشتاشان بە ری کەوتن. ئیمەش دابەزین هەندیکمان بۆ ناو وەرتی و هەندیکمان بۆ دولی خانەقا.

توتیلی سیاحی

شیوعیەکان بە دەزگای بیتەل مەکتەبی ئیقلیمیان لە ناوزەنگ ئاگادار کرد بو، کە وەزعیان خراپە و، داوایان لی کرد بون: هەولی راگرتنی شەر بدەن لە گەل یەکیتی. مەلا ئەحمەدی بانیخیلانی و مامجەلال، پیکەوە بانگەوازیکی هاوبەشیان دەرکرد و، داوایان لە هیزەکانی هەردولا کرد بو دەستبەجی شەر رابگرن و، هەر لایە لە شوینی خوی دا هەلویستی دیفاعی وەربگری. هەمان ئیوارە چەند جاری لە رادیوی یەکیتی دا خوێندرایەوە. لە کاتی بیستنی ئەم بانگەوازەدا، شەر بە قازانجی ئیمە بە لادا کەوت بو، بەلام من هیشتا لە کویستانی مەکو بوم لە پشتی وەرتی. دنیا بەفر و هەوا زور سارد بو. حەمە سەعید کە گوی ی لە بانگەوازەکە بو، وتی: «ئەم کابرایە - مەبەستی مامجەلال بو - زور سەیرە وا ئەزانی لە توتیلی سیاحی دانیشتوین هەر کەس لە ژورەکەی خوی نەبەتە دەرەوە! ئیمە خەریکە رەق ئەبینەوە»

مەکو، کویستانیکی تەخت و بەرین و بەر کراوەیە کەوتوتە بناری کاروخ و روبەروی قەندیلە. دەیان کانی سارد و سازگاری لی هەلئەقولی و، سەدان دارگویزی گەورەی

لی بو. شوێنێکی خۆش و دڵرفێنە. بۆ گوندی تویەسنی لە بارە.

*

ئەمجارەش سەید کاکە لە پێش ئەوانی کەدا هەڵات بو. بە ڕێگاوە بوبو بەرەو پشتئاشان، هەندی کاروانچی پێی گەیشت بو. کاروانچیەکان سەید کاکەیان بە شەرزەیی دی بو لێیان پرسی بو: «خاڵە سەید چی قەوماوە؟» وت بوی: «چوزانم مامجەلال وا ئەزانی حوکمی زاتی لە گیرفانی من دایە، هەرچی منال و تالی سلێمانی هەیە ناردویەتیە سەرم!»

*

دەوروپشتی خۆمان قایم کرد. هێزێکمان نارد بو زارگەلی و هێزێک بۆ دوڵی خانەقا و، هێزێک بۆ سەران. «قوەتی مەرکە» مان نارد بچی بۆ سەران کە گەیشت بونە ئەوی بیست بویان هێزێکی جود گەیشتۆتە گەردوان. هێزەکەی یەکێتی زەروی عەبدوللا زیوی و، هێزەکەی جود عەریف عەلی فەرماندەیان بو. عەریف عەلی کە بیست بوی هێزێکی یەکێتی گەیشتۆتە سەران دەسبەجی کشا بوەوە وای زانی بو ئەچی بۆ سەر ئەو. زەروش کە زانی بوی هێزێکی جود گەیشتۆتە گەردوان دەسبەجی کشا بوەوە وای زانی بو ئەچی بۆ سەر ئەو. هەردوکیان وەکو ئەڵێن: «دزاودز کەوت بون» لە ترسی هێرشی یەکتری کشا بونەوە بۆ دواوە.

ماوەیەک لە وەرتی ماینەوە. ڕاگرتنی شەر هیچ جورە ڕێککەوتنێکی سیاسی بە دودا نەهات. بار و دوخی ژیانی هێزەکانی جود لە پشتئاشان و دەوروبەری زور ناخۆش بو. پشتئاشان هیچ ئاوەدانیەکی تی دا نەبو تیا بحەوێنەوە. هێزەکانی پارتی نەیانئەتوانی لە قەندیلەوە بگەڕێنەوە بۆ ئێران. شیوعیەکان، ئەیانویست هێزەکانی پارتی لە کوڵ خۆیان بکەنەوە، بۆ ئەوەی خۆیان ئازادی گەڕانەوەیان هەبێ بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی. بەڵام ڕێگاکانی قەندیلی بەست بو. داوایان لی کردین ڕێگا لە کشانەوەیان نەگرین. ڕێگامان دان. هێزەکانی پارتی لە کەلەکی بالەکیانەوە بەرەو ڕوژئاوای ڕێگای هاملتون و، لەوێوە چونەوە بۆ ئێران. بە ڕویشتنی ئەوان گرێیەکی کێشەکە کرایەوە. هێزەکانی حشع، حسک، پاسوک ئەیانتوانی بە ئازادی بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا هاتوچۆ بکەن.

شەری ئیستقلیمگیری ئەمجارەی جود - یەکێتی برایەوە، بەڵام هۆکانی هەڵگیرسانەوەی هەر ما بون.

*

لە گەڵ هێزەکەی قەڵاتوکان یەکمان گرتەوە. ملازم عومەر و هاوڕێکانی هاتن بۆ لامان لە وەرتی.

ئەبو عائیدی لێپرسراوی حشع داوای کرد بو بۆ ڕێکخستنی هەندی کاروبار یەکتری ببینین. لە سەر جادەی خانەقا لە گەڵ ئەبو عائید یەکتریمان بینی. هەندی قسە و باسمان کرد دەربارەی شەرەکان. وتی: «وەرتی، ورطە بو!» یەکی لە کارەکانی ئەوە بو ئەیویست هەندی لە هێزەکانیان بە ناو هێزەکانی یەکێتی دا بە سەلامەتی بنێری بۆ ڕوستی. هێزەکەیان بە ری کرد و، ئێمەش چی پێویست بو لە نامە و ڕاسپاردە بۆمان ئامادە کردن.

وەرتی

گەورەترین گوندی ناوچەکە وەرتی بو. بە هوی تەنگیی دوڵەکە و، قوڵی ڕوبارەکەوە گوندێکی درێژ بو، چەند گەڕەک: سۆڵتە، بەرۆژ، سرل و، پێنج بەرماب و، پێنج مزگەوتی

تی دا بو.

پیاوەکانی وەرتی نموونەی کوردی ڕەسەن بوون. هەمیشە پۆزەوانەیان هەڵکێشا بوو، خەنجەرەکیان بە قەدەوە و، تفەنگەکیان بە شانەوە بوو، ئەمانەش کە ئەچوون بۆ مزگەوتیش بەو جۆرە ئەچوون. یەکێ لە پێشمەرگەکان ئەیوت: «ئەمانە لە کوردی ئەتڵەس ئەچن» مەبەستی لە نیگاری ئەو کوردە بوو کە لە سەر پشتی ئەتڵەسی عێراق کرا بوو.

یەکێتی لە ناو وەرتییەکان دا بنکەیەکی جەماوەریی فراوانتری هەبوو لە چاو حیزبەکانی کەدا. زیاتر لە سەد کەسیان پێشمەرگە بوون. ئەندام و پێشمەرگەی حیزبەکانی تریشی تی دا بوو. هۆی ئەم دابەشبوونە سیاسییە لەم شوێنە شاخاوییە دابڕاوەدا پێڕەوبازیی سیاسی نەبوو، بەڵکو ناکۆکی شەخسی و ململانێی نێوان بنەماڵەکانی بوو. لەوەدا ڕەنگی دابوەوە.

### تەگبیرەکەی مام مۆزرتک

مام مۆزرتک لە لای وەرتییەکان کەسایەتییەکی زیرەک و زانا و، زۆر بەڕێز بوو. بە تەگبیر و ڕای ژیرانە ناوی دەرکردوە. زۆر نوکتە و قسە و تەگبیر لە زمانی ئەوەوە ئەگێڕنەوە. شانازیی ئەکەن کە پیاوێکی وایان تی دا هەڵکەوتوە. یەکێ لەو قسانەی ئەیگێڕنەوە ئەم تەگبیرە بوو:

مێری سۆزان چەند کەسی ئەکاتە سەر دانیشتوانی وەرتی بۆ مردوانە و باجی تری لەو بابەتە. پارەکەی داوای ئەکەن زۆر ئەبێ. خەریک ئەبێ مان بگرن لە دانی. پرس بە مام مۆزرتک ئەکەن کە چی بکەن. مام مۆزرتک ئەڵێ: «ئەگەر مان بگرن نێردراوەکانی مێر بە شکاتەوە ئەڕۆنەوە، مێر هێزێکی گەورە ئەنێرێتە سەرتان باجەکەتان لە سەر زیاد ئەکا و بە زۆریش لێتان ئەسێنێ و ئازاریشتان ئەدا. چاک وایە باجەکە کۆ بکەنەوە و بیاندەنێ و میوانداریەکی شاهانەشیان بۆ بکەن، بەڵام لە ڕێیشان دا چەند کەسی بنێرنە سەر ڕێگایان، ڕووتیان بکەنەوە و باجەکەیان لێ بسێننەوە و هەموویان بکوژن یەکێکیان نەبێ. ئەویش بە سەر و دەستی شکاوەوە بیزن بەدەن بڕوات هەواڵەکە بباتەوە بۆ مێر، بڵێ: وەرتییەکان زۆریان ڕێز لێ گرتین، میوانداری چاکیان کردین، باجەکەشیان کۆ کردەوە و دایانێنی، بەڵام لە ڕێگای گەڕانەوەدا جەردە هاتە سەرمان ڕووتیان کردینەوە و ئەوانیان کوشت و منیشیان ئازار لێ کرد!»

*

لەم گەڕانەدا (هاوین و پاییزی ٨١) وەرتی و، دانیشتوانی ئازاری زۆریان دی بوو. چەند کەسی لە گەنجە ئازاکانیان کوژرا بوو، چەند کەسێکیان لێ گیرا بوو. ئەرکێکی زۆریشمان بە سەریانەوە بوو. ویستم دڵیان بدەمەوە. بەر لە گەڕانەوەم نیوەڕۆیەک هەموو پیاو ماڵرولەکانیانم بانگهێشت بۆ نانخواردن، بۆ ئەوەی هەندێ قسەیان بۆ بکەم، ئینجا خوا حافیزییان لێ بکەم.

لە هۆڵی مزگەوت کۆ بوینەوە. هەندێ قسەی گشتییم بۆ کردن. لە ناو بانگراوەکان دا ئیبیان دا بوو سەر بە لایەنەکانی تر بوون. ئەمویست هەستی کەسیان بریندار بکەم. بە داخەوە باسی شەڕی ناوخۆم کرد و سپاسی هەموویانم کرد کە پەیمانەوە ماندو بوون. ئیتر کەوتینە قسە و باسی ئاسایی. گفتوگۆ لە گەڵ خەڵکی وەرتی زۆر خۆش بوو. یەکێکیان لێ ی پرسیم: «چەند منداڵت هەیە؟»

زۆر جار ئەم پرسیارەیان لێ کردبووم، لە ناو ئەو کۆمەڵانەدا بە گەلێ ژنیان ئەهێنا و، ئەگەر یەکێ لە تەمەنی من دا بوایە و هێشتا سەڵت بوایە پێیان سەیر بوو. ئەبوو ناتەواوییەکی هەبوایە، ئەگینا چۆن ئەبێ ژن و منداڵی نەبێ؟

وتم: «هیچ!»

بە سەر سوڕمانێکەوە وتی: «بۆچی هیچ منالت نیە»

وتم: «چونکە ژنم نەهێناوە»

وتی: «بۆچی ژنت نەهێناوە؟»

وتم: «کەسم پێ رازی نەبوە»

وتی: «چۆن کەست پێ رازی نەبوە؟»

وتم: «ئەوەی من پێ ی رازی ئەبم ئەو بە من رازی نابێ و، ئەوەیش کە بە من رازی ئەبێ، من پێ ی رازی نابم.»

کابرا هەر لە سەری رۆیشت. ئەیویست موجامەلەی من بکا و منیش ئەمویست ئەم باسە کۆتایی پێ بهێنم وتم: «مام کوێخا کچت هەیە؟»

وتی: «بەڵێ»

وتم: «باشە، کچەکەی خۆتم بدەرێ!»

وتی: «ئەو سەگە بە کەڵکی تۆ نایەت، بۆت ئەدەم بە خوێن»

وتم: «بۆچی بۆم ئەدەی بە خوێن، من بە خۆی رازیم»

وتی: «کچەکەی من مانگادۆشین ئەزانێ، تۆ پیاوێکی خوێندەواری ئەبێ ژنێکی خوێندەوار بهێنی!»

وتم: «ئەوەتا تۆیش پێم رازی نابی!»

زۆر جار ئەم پرسیارەیان لێ ئەکردم، نەمئەزانی چۆنیان وەلام بدەمەوە. بۆ ئەوەی لەم «محاکمە» بە ئەنجاتم بێ، لە بەهاری داهاتودا ژنم هێنا.

*

لە گەڵ مەلازم عومەر و عەبدولرەحیم و سامان .. بەرێ کەوتین بەرەو قوناغی داهاتومان لە قەلاتوکان. شەومان بە قسە و باس لە گەڵ کوێخاکانی مەنگور بە سەر برد. بەیانی بەرێ کەوتین، ئێوارەیەکی درەنگ گەیشتینەوە ناو زەنگ. برادەران بە بۆنەی سەری ساڵەوە لە «هێزی شەهید شەهاب» ئاهەنگێکیان رێک خست بوو.

*

# سالی ١٩٨٢

## شیرکۆ و چلورەفرۆشەکان

پنکەکسان تاقمیکی تیکەلی سەیری شاری و لادیی، گەنج و کاملی خوێندەوار و
نەخوێندەوار بو. جگە لەوانەی کە بە دایمی لەوێ بون، زۆرجار پێشمەرگەی خەلکی
سلیمانی ئەهاتن، چەند مانگ یان چەند حەفتە ئەمانەوە، تا چاویان ئەکرایەوە، ئینجا ئەچون
بۆ یەکی لە تیپەکان.

دو لە پێشمەرگەکان: مامە قالە و مام شێرکۆ. هەردوکیان لە ئەرکی رۆژانەی
بارەگاکە، وەکو چێشت لینان، قاپ شتن، نان هینان، بازار کردن، ئیشکگرتنی شەوانە..
بەخشرا بون. مامە قالە و مام شێرکۆ نمونەی دو کەسایەتی جیاواز و خۆش بون.

شێرکۆ، ناوی مام قادر و خەلکی گوندی بیموش و مالی لە ژاراوە بو. ژن و منالی
نەبو. لە شۆرشی ئەیلول دا لە لقی مامەرەزاییەکان پێشمەرگە بو. دوای ١١ ی ئازار بوبو
بە «حەرەس حدود». لە ئاشبەتال دا گەرابوەوە کوردستان و، لە گەل عەلی عەسکەری هات
بوە دەرەوە و، هەر لە گەل ئەو بو. کاک عەلی کە بە ری کەوت بەرەو برادۆست ٤ کەسی لە
پێشمەرگەکانی: مام قادری بیموشی، مام سالحی مالومەیی، مام ئەحمەدی سیکانیانی، خالە
حەمە.. لە بەر پیری لای ئیمە بە جی هیشت. هەر چواریان «حەقە» و «مامە رەزایی»
بون، زۆر بە دلسۆزی دوای کاک عەلی کەوت بون. بە دریژایی ماوەی قەندیل لە گەل ئیمە
مابونەوە و، هەر چواریان پیکەوە بون. پێشمەرگەکانی تر بۆ خۆشیی ناویان لی نابون:
«العصابە الاربعە». دوای ئەوتانی کاک عەلی ئیتر شتیک نەما بو پیکەوەیان کۆ بکاتەوە.
خالە حەمە و مام ئەحمەد تەسلیم بونەوە. مام سالح چوە لای مامجەلال و مام قادر هاتە لای
من. پێشمەرگەکانی لای من هەمو شاری و گەنج بون، ئەمیش بە هاندانی پێشمەرگەکان
ناوی خۆی گۆری بە شێرکۆ و، بۆ ئازداریش جاروبار پییان ئەوت: «شێرەدا».

شێرکۆ هەتا بلی ی پاک و خاوین و، ریشی تاشراو و سمیلیکی قنجی هەبو. سەر
و سمیلی بۆیە ئەکردەوە بەلام نەیئەهیشت کەس پی ی بزانی، دەمیشی تاقمی تی دا بو،
بەلام کەس نەی دی بو. کە خورما و رۆنیان دروست ئەکرد، شێرکۆ نەیئەخوارد ئەیوت:
«دانم دیشینی» هەمیشە خۆی بەست بو و تفەنگەکەی بە شانەوە بو. حەزی لە میوانداری و
هاتوچۆی مالەکانی شێنی ئەکرد. لە گەل مامە قالە ناکۆک و، زۆر جار شارییەکان تورەیان
ئەکرد. کە سیخورمەی تیوە بۆەنرایە یا کتوپر تەقەیان لە شتی هەلیسانایە، رانچلەکی و
یەکسەر جنیویکی ئەدا. زۆربەی حەقەکان وا بون.

کە تورەیان ئەکرد، زۆر جار قسەیەکی بە من ئەوت و، ئەیوت: «بە تەمایە بە
چلورەفرۆشەکانی سلیمانی کوردستانم بۆ رزگار بکا!» لای وابو گەنجەکانی سلیمانی هەمو
چلورە فرۆش بون و، چلورە فرۆشتنیش کاریکی ناشیرینە.

مامە قالەیش، خەلکی سەنگسەر بو. لە داربرین و دار شکاندن دا زۆر شارەزا و
بەکار بو، داری هەمو زستانەکەی بارەگاکەی ئیمە ئەم ئەیبری و ئەیشکاند. هەرچی ئاژەل و

ولاخێکیشمان هەبوایە ئەم خەمی جێگا و لەوەڕی ئەخواردن. هاوینانیش بیستانی تەماتە و سەوزەی بۆ ئەکردین. بەشێکی گرنگی پێویستیەکانی بنکەکەمان ئەم دابینی ئەکرد. شێرکۆ خوی لەم کارانە نەئەگەیاند، لە بەر ئەوە مامە قالە زۆر جار تانەی لێ ئەدا و ئەچوو بە گژی دا.

مەسئولی تەور

بەیانییەکیان شازاد لە بەزمێکی سەیر خەبەری بووبووەوە. ئەژدەر، لە سلێمانی زەرەنگەر بووبوو، ماوەیەک بوو لە بارەگەکەی ئێمە میوان بوو. ئەژدەر، بێ پرسی مامە قالە، ناشیبانە دەسکاری تەورێکی کرد بوو، دەمەکەی کول کرد بوو، ئەویش بە توندی پیا هەلشاخا بوو. ئەژدەریش پێ ی وت بوو: «بۆ تورە ئەبی خۆ تۆ مەسئول نیت؟» مامە قالە زیاتر هەلچوو بوو، تیروپڕ جنێوی بە ئەژدەر دابوو وت بووی: «چۆن مەسئول نیم من مەسئولی تەورم!»

شازاد ئەیوت دیارە وشەی مەسئول ئەوەندە خۆشە تەنانەت ئەگەر هی تەوریش بێ هەر خۆشە و گرنگە.

*

دەوەن بە ئاش

هەندێ لەو پێشمەرگانەی بۆ ئیشوکار ئەهاتن بۆ سەرکردایەتی زۆر جار میوانی من ئەبوون. جارێکیان غەفور دەرەشیشی و ئەبی چالاک میوانم بوون. هەردوکیان ئەندامی کۆمەلە و، فەرماندەی کەرت بوون. ئەویان خەلکی هەورامان و ئەمیان خەلکی بالەکایەتی بوو. هەر لەو کۆڕەدا: خەبی، ڕێبەری «ئالای ڕزگاری» و، یا حەلیم، ژنێکی بالەکایەتی، میوانم بوون.

غەفور شارەزای بنێشت کردن بوو، هەمو سالی خۆی و پێشمەرگەکانی کەرتەکەی لە لیرەوارەکانی هەورامان بنێشتیان ئەکرد. زۆرجار خەرجی چەند مانگێکی خۆیان و خێزانەکانیان دەرئەهێنا. هەندێ پرسیارم لێ کرد لە سەر جۆری بنێشت کردن و، کەرەستەکانی و، بەرهەمی ئەوسالەیان.

ئینجا لە ئەبی م پرسی: «ئەمسال لە هیچ لایەک چون بۆ کەوشان!» غەفور پیاوێکی قسەخۆش و زیرەک، بەلام لە ڕەوشت و خوی کۆمەلایەتی دا «محافظ» بوو، پرسی: «کەوشان چیە!» ئەبی وتی: «لە بەهاران دا کە گول ئەگەشێتەوە و، کوارگ و ڕیواس و کنگر و.. پەیدا ئەبێ، گەنجەکان: کوڕ و کچی گوند یا چەند گوندێ، بەیانییان کۆ ئەبنەوە، ئەیکەن بە شایی و ڕەشبەلەک، دوای ئەوە، بە کۆمەل و بە جووت، بۆ کۆ کردنەوەی گژ و گیا، بە دەشت و چیادا بلاو ئەبنەوە، عەسر بە چارۆکەی پڕ لە گیا و کوارگ و گولی بۆنخۆش و جوانەوە لە چیا دائەبەزن، دیسان کۆ ئەبنەوە شایەکی ڕەشبەلەک ئەکەن و، بلاوەی لێ ئەکەن هەر کەس بۆ مالی خۆی.»

ئەم سەیرانە بەهارەیە نەریتێکی باو و دێرینەی ناوچەی بالەکایەتیە. گۆرانیەکی بە ناوبانگی حەسەن زیرەک لە سەر «کەوشان»، کە ئەلێ:

کیژان دەچنە میرگولان،
بە عام دەچن هەلالان
عارەق لە هەنیەی دەتکی، تەر دەکا وردە خالان

کیژان دەچنە مێرگولان،
بە عام دەچن بەنەوشان
عارەقی سنگ و مەمکی، تەر دەکا پاژنەی کەوشان
نەبی زۆر بە گەرمی و خۆشییەوە باسی ئەکرد. غەفور تورە بو، وتی: «چۆن ریگە ئەدەن خوشک و دایکتان شتی وەها بکەن..؟» نەبی چوەوە بە گژی دا، وتی: «خوشک و دایکی تۆیش لەوی بونایە ئەچونا» خەریک بو دەمیان لە یەک بگیری. مشتومرەکەیان چیرۆکی «دەوەن بە ئاش» ی بیر هینامەوە.
ئەگیرنەوە: دو ریبوار لە ریگا بە یەک ئەگەن. یەکەمیان لە ئاش ئەهاتەوە و دوەمیان ئەچو بۆ ئاش. هەردوکیان باراشیان پی بو. دوەم لە یەکەم ئەپرسی: « «ئاشەکە چۆل بو یا قەلەبالغ بو؟»
یەکەم ئەلی: «زۆر قەرەبالغە، ئەبی سەرە بگری، رەنگە بە ٣ رۆژی تر سەرەت نەگاتی»
دوەم ئەلی: «دەمـا من لەوی بومـایە سـەرەم نەئەگرت و، لە پیش هەمـوتانەوە باراشەکەم ئەهاری»
یەکەم ئەلی: «نەتئەتوانی!»
دوەم ئەلی: «ئەمتوانی!»
را ریک ئەکەون، دەوەنیک کە لە سەر ریگاکەیان دا ئەبی بکەن بە ئاش و، بزانن کامیان ئەتوانی نۆرەبری بکا و باراشەکەی لە پیش ئەوی کەدا لی بکا. لە ئەنجامی ئەم مشتومرەدا باراشەکانیان ئەریژن بە سەر دەوەنەکەدا و یەکتریش ئەدەنە بەر خەنجەر.
هەمو ناوچەی بالەکایەتی راگویزرا بو، جەیش لوتکەی شاخەکانی بە «رەبیە» تەنی بو، کی ئەیتوانی بچی بۆ «کەوشان»؟ کەچی ئەمان خەریک بون لەم زۆرەدا هەمان بەزمی «دەوەن بە ئاش» دوبارە بکەنەوە. بە ناچاری هەردوکیانم بیدەنگ کرد و، باسیکی ترم لە گەل دامەزراندن.
غەفور لە سەر «ورەی مرۆڤ» قسەیەکی نەستەقی هەبو: «ئەبوت ئەگەر کیوی شنروی بروخی بە زەلام ئەگیریتەوە، بەلام ئەگەر زەلام بروخی بە هیچ شتی ناگیریتەوە!»

*

میتەرولوجی
شینی بیەکان لایان وابو: هەر هاوینی زەردەزیرە زۆر بی، ئەوساڵە زستانەکەی سەخت ئەبی. ساڵی ١٩٨١ هاوینەکەی زەردەزیرە زۆر و، زستانەکەی سەخت بو. بەفریکی زۆر باری. سەیر ئەوەبو لە گەل کرێوەی بەفردا هەورە تریشقە و هەورە گرمەی زۆری لە گەل بو. ئەم دیاردە سروشتییەم هەر لەوی دی بو. ئەو زستانە کەوتمە کۆکردنەوەی هەندی لەو وشانەی پەیوەندییان بە دۆخی ئاسمان و گۆرانی کەش و هەواوە هەبو. وشەکان هەمویان ئاشنا و ناسراون، بەلام کۆکردنەوە و لە یەک دانیان وەکو ریزە زاراویکی میتەرولوجی رەنگە بی کەلک نەبی، بە تایبەتی کورد هیشتا هیچ دەزگایەکی تایبەتی بۆ لیکۆلینەوەی لەم بابەتەی نیە.

*

هەوا کە سارد ئەکا، تا ئەندازەی ژیر سفر، ئەرز و ئاو ئەیبەستی( :رچبان،

چەمەدین). توێژی سەرووی ئاوی گۆم و زەلکاو ئەبێ بە سەهۆڵ (:بەستەڵەک، شەختە، چەمەد، بوز) و، ئاوی سەر ئەرز ئەبێ بە زووقم(: خوسار، سیخوار) و، چۆڕاوگە ئەبێ بە چلوورە.

هەوا کە گەرم ئەبێ، هەڵم لە ئاو، هالاو (:بۆق) لە ناو کشتوکاڵ و، گڕە و سەبوون لە دەشت هەڵئەکا.

ئەگەر هەور ئاسمانی گرت، هەورەکە گەواڵ گەواڵ (:پەڵە پەڵە) ئەوەستێ، یا هەموی دائەگرێ، هەور تیرە و تاریک، چڵکن، سپی ئەبێ.

ئەگەر هەور لە ئاسمان ڕەوییەوە (:هەڵی ڕوونگاند)، بە ڕۆژ شینایی ئاسمان و، بە شەو ئەستێرەکانی دەرکەوتن، بە ڕۆژ ساماڵ یا هەساو و، بە شەو سایەقە ئەبێ. شەوی سایەقە لە زستان دا سارد ئەبێ ئەرز و ئاو ئەیبەستێ.

ئەگەر هەور لە ئاسمان دا بەستی لە شێوەی باران، بەفر، تەرزەدا ئەباری.

باران نم نم، یا بە تاو، یا بە خوڕ، یا بە خوڕەم ئەباری. بارانی بە خوڕ، ڕەهێڵە، لێزمە، لەنگێزە ئەکا. زۆرجار برووسکە (:هەورە تریشقە، چەخماخە) و، هەورە گرمەی لە گەڵ ئەبێ.

کە باران بباری و، لە هەمان کات دا هەتاو بێ، کۆڕگەزێ بە و، کە ماوەیەک بە خوڕ بباری و خۆش بکاتەوە تاوە، کە سەرانسەری وڵات بگرێتەوە ئەیقلیمگیرە. کە لە گەڵ بەفر بباری شڵێوەیە.

لە سەرەتای پایزدا پەڵە ئەدا. پەڵە بارانێکی نەرمە چەند شەو و ڕۆژ لە سەر یەک خۆش ناکاتەوە تا ئەرز تێرئاو ئەبێ، ئاوی لە سەر ڕائەوەستێ.

دوای بارانی پەڵە چەن ڕۆژی هاوینە پچکۆلەیە، هەوا خۆش و دنیا گەرم ئەبێ.

بەفر (:بەرف، بەور) ئەگەر زۆر بباری کەپەوە و، ئەگەر کەم بباری پرۆشە ئەکا. بستێک، قولاچێک، ئەژنۆیەک یا گەزێک و زیاتری تێ ئەکا. لە شوێنێکی بەرزەوە کە با بەفر ئەیبا بۆ شوێنێکی قوڵتر و پڕی ئەکاتەوە باپێزە. لە لێژایی چیا بەرزەکانەوە هەرەس (:ڕنو) دێ. لە کۆتایی بەهار دا بەفر ئەچێتەوە، کوێستان خاڵ خاڵ ئەبێ.

بەفرەلوکە، بەفرێکی خاوە کلۆەکانی بە تەواوی ئەیبەستوە زوو ئەتوێتەوە.

بەفرخۆرکە، بەفرێکی نەرم و وردە لە کۆتایی بەهاردا بە سەر بەفری زستان دا ئەباری و، ئەیتوێنێتەوە.

تەرزە (: تەزرە، گلێرە، تەگەرەگ، تەورگ) بە دەنکی ڕەقی گەورە یا پچووک ئەباری، گەڵا و گوڵ ئەکوتێ.

تەرزەلوکە، نەوەکو تەرزە ڕەقە و نەوەکو بەفر نەرمە زوو ئەتوێتەوە.

بارانی زۆر ئەتوانێ لافاو (:سێلاو، لێشەت، لێشاو، لەهی)ی لێ هەڵبستێ.

لە کۆتایی زستان دا ئەرز تێر ئەبێتەوە، کە باران ئەباری نایەڵێ بە قوڕ و لیتە.

لە کۆتایی بەهار و لە هاوین دا شەو دڵۆپی ئاو لە سەر گژوگیا و گەڵا شەونم (:ئاونگ، خوناو) دروست ئەکا.

لە ناوەڕاستی تەمموزدا تاوێک باران ئەباری بۆنێکی خۆش لە ئەرز هەڵئەستێ.

بە درێژایی ساڵ و، لە هەموو وەرز و لە هەموو ڕۆژێک دا با ئەتوانێ بوەزێ (:هەڵ بکا). بای وەشت بارانی بە دوادا ئەباری، بای دارئاوس لە کۆتایی زستان دا هەڵئەکا و دار

و دره‌خت گۆپکه و چرۆ ئه‌کا. بای خه‌زان کۆتایی پایز هه‌ڵئه‌کا گه‌ڵای زه‌ردی دره‌خت هه‌ڵئه‌وه‌رێنێ.

بای شه‌ماڵ له لای سه‌ره‌وه‌وه ئه‌وزێ و، فێنک و نه‌رمه، بارێش یا ره‌شه‌با له لای خواره‌وه هه‌ڵئه‌کات توند، له هاوین دا گه‌رمه دوای نیوه‌ڕۆیان ئه‌بێ به گڕه و شه‌ڕا و، له زستان دا سارده ئه‌بێ به کزه، که له گه‌ڵ به‌فر و باران بێ، یا له گه‌ڵ یه‌کێکیان به پێی توندی و نه‌رمی ئه‌بێ به زریان، زه‌لان، وه‌یشومه، نه‌رته‌نه، پاسرێشک، تۆفان.

هه‌ندێ رۆژی زستان هه‌ور دائه‌به‌زێ، سه‌ر ئه‌رز ئه‌بێ به ته‌م (:ته‌مومژ، ته‌متومان).

هه‌ندێ رۆژی هاوین هه‌ور ته‌پوتۆزی بیابان ئه‌بینێ، ئه‌بێته خۆڵ بارین.

تێکچونی دۆخی هه‌وا، ناوچه‌ی گوشاری به‌رز و نزم دروست ئه‌کا، گێژه‌ڵوکه له ئاســـمانه‌وه به‌ره‌و زه‌مـــین و گـــه‌رده‌لول له زه‌مـــینه‌وه به‌ره‌و ئاســـمـــان (:گـــه‌ره‌پێچ، باهۆز، باپێلیــسک) ی لێ په‌یدا ئه‌بێ.

*

کورد ناوی مانگه‌کانی ساڵی به گوێره‌ی که‌شی ئه‌و مانگه ناو ناوه: خاکه لێوه، بانه مه‌ر، جۆزه‌ردان، پوشپه‌ر، گه‌لاوێژ، خه‌رمانان، ره‌زبه‌ر، خه‌زه‌ڵوه‌ر، سه‌رماوه‌ز، به‌فرانبار، رێبه‌ندان، ره‌شه‌مه.

له هه‌ندێ شـــوێنی کـــه به مـــانگی مـــارت ئه‌ڵێن: هه‌رمێ پشکوان و، به نیـــســـان: شه‌سته و، به مایس: به‌ختباران و، به حوزه‌یران: بارانبڕان و، به تشرینی یه‌که‌م: گه‌ڵاڕێزان و، به تشرینی دوه‌م: سه‌ربه‌ڵه.

*

هه‌مـــو ناوچه‌یه‌ک کـــۆمـــه‌ڵێ له‌م زاراوانه‌یان هه‌یه، هه‌ندێکیـــان له گـــه‌ڵ ئه‌مـــانه‌دا هـــاوبه‌شن، به‌لام هه‌ندێکیـــان ناوی دیارده‌یه‌کی سروشتـــه له‌وانه‌یه له ناوچه‌کانی ترا نه‌بێ، نوسینه‌وه و به‌کارهێنانی ئه‌م وشانه زمان ده‌وڵه‌مه‌ن ئه‌که‌ن.

*

پێشینان وتویانه: «ئه‌گه‌ر با بێ و ئه‌گه‌ر باران، له عومری زستان کـه‌م ئه‌بێتـه‌وه»، هه‌روه‌ها: «له زســتان شـه‌وێ، له پیران ئه‌وێ»، هه‌روه‌ها: «له هه‌مـو هـه‌وری باران نابارێ»، هه‌روه‌ها: «باران بهـاری ئاشی ئه‌گـه‌رێ، باران ئه‌هاری جـوتی ئه‌گـه‌رێ»، هه‌روه‌ها: «به‌فـری به‌هارێ، تا پۆپه‌ی دارێ، ناگـــاته ئێـــوارێ»، بۆ یه‌کێ کـــه ته‌مێ خـــواردو ئه‌بوبێ له ته‌جروبه‌کـانی رابوردو ئه‌ڵێن: «نه بای دیوه و، نه باران»، بۆ مـشـور خـواردنی بێ سـودی دوای لێقه‌ومان، ئه‌ڵێن: «له پاش باران که‌په‌نک».

*

## هه‌وڵی ئاشتبونه‌وه

دوای ئه‌و شـه‌ڕانه هه‌مـوومـان هه‌ســـتـمـان به‌وه ئه‌کـرد، کـه له‌م شـه‌ڕانه‌دا هێـزو توانای گه‌له‌که‌مـان دائه‌چۆڕێ. له زۆر لاوه به هه‌مان مه‌عنا نامه‌مان بۆ ئه‌هات به تایبه‌تی له ئه‌دیب و نوســه‌ر و پیـاوه ناسراوه‌کـانی شـاره‌وه. له ناو خۆمـان دا به دوقـۆڵی و سێ قـۆڵی و، له چه‌ندین کۆبونه‌وه‌ی مـه‌کته‌بی سیاسی و کۆمیته‌ی سه‌رکردایه‌تی دا باسی چاره‌سه‌ری ئه‌م به‌لا کوشنده‌یه‌مان ئه‌کرد و، ئه‌گه‌ڕاین چاره‌یه‌کی بۆ بدۆزینه‌وه. بڕیارمان دا هه‌وڵێکی زۆر بده‌ین

بۆ ئەوەی کۆتایی پێ بهێنین. یەکەمیان لە ڕێگای دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە: وتارەکانی ڕادیۆ و بڵاو کراوەکان، زەمینەی بۆ خۆش بکەین. دوەمیشیان بکەوینە پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە گەڵ هەمو لایەنەکانی پەیوەندیدار.

*

من و شەڕی ناوخۆ!

ئەوسایش و، هەتا ئێستایش هەندێ لە سەرانی پارتی و حشع و لایەنەکانی تر لە ناو هاوڕێکانم دا من بە یەکێ لە توندڕەوەکان دائەنێن، بەشێکی شەڕی پروپاگاندەیان لە دژی من بوە. ڕاستییەکەیشی چەند جارێ من سەرکردایەتی لەشکرکێشییەکانی یەکێتیم کردوە. لێرەدا چەند وتارێ دەقاودەق دوبارە ئەنوسمەوە کە لە کاتی خۆی دا دەربارەی شەڕی ناوخۆ، دوای گەڕانەوەم لە شەڕەکان، وەکو سەروتاری کۆمەڵە لە ژمارەکانی کانونی دوەم و شوباتی ١٩٨٢ دا بە ناوی ناوەندەوە نوسیومە. ڕەنگە خوێنەوار تا ئەندازەیەک لە بیروبۆچونەکانم بگا.

*

وتاری یەکەم:

گەلەکۆمەکێ ی چەکدار - سیاسی لە خزمەتی کێ دایە؟

هاوین و پاییزی ساڵی پار، هەندێ شوێنی پارێزگاکانی هەولێر و سلێمانی بون بە مەیدانی زۆرانبازییەکی چەکدار - سیاسی توندوتیژی خویناوی لە بەینی پێشمەرگەکانی ی ن ک و چەکدارەکانی هەندێ حیزبی تردا.

زۆرانبازی چەند مانگی ڕابوردو، درێژە کێشانی ڕوداوە پچڕپچڕەکانی چەند مانگ و بگرە ساڵی پێشوتر بو، بەڵام ئەمجارەیان چەشنێکی بەرینتر، فراوانتر، توندوتیژتر و نەخشە کێشراوی بە خۆیەوە گرت بو، کە خۆی نواند لە گەلەکۆمەکی ی چەکدار - سیاسی ٤ قۆڵی چەند حیزب و ڕێکخراوی جۆراوجۆری جیاواز لە ڕوی ڕێبازی ئایدیۆلۆجی و سیاسییەوە. وە پێشتریش بە ژاوەژاوێکی پروپاگاندەیی خەست و فراوانی ئاراست، لە بارەی «ڕێککەوتنی نهێنی» ی ن ک لە گەڵ ڕژێمی صەددام بۆ لێدانی «هێزە نیشتمانییەکان» و ڕێگرتن لە «چالاکی شۆڕشگێرانەیان دژی ڕژێم» زەمینەی بۆ خۆش کرا بو.

ڕوداوەکانی ئەم دواییەیش، وەکو هی جارەکانی تر، مایەی پەژارە و جێگەی پرسیاری کۆمەڵانی خەلک بون، چونکە ڕەوتی بەرەو پێشەوە چونی شۆڕشی کوردستان و ئاقاری خەباتی سیاسی و پێشمەرگەیی لە شا ڕێ ی ئاسایی خۆی لا ئەدا و، لە شەڕی کوردەوە دژی هێزی حکومەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، ئەیگۆڕی بە شەڕی هێزەکانی کورد لە گەڵ یەکتری ڕو بە «کورداندنی شەڕەکە»، بە تایبەتی لە کاتێک دا کە لە ئەنجامی گەرمبونی ئەبەردەکانی جەنگی عێراق - ئێران دا لە بارترین هەلی مێژویی، لە دو دیوی نیشتمانەکەی دا، بۆ بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کوردستان - لە سەر ئاستی ستراتیجی بۆ جولانی سیاسی، وە بۆ دەسوەشاندنی کاریگەر و کوشندەی هێزە شۆڕشگێڕەکان لە دوژمنانی داگیرکەر - لە سەر ئاستی تاکتیکی، هەلکەوت بو.

*

لە گەڵ کۆمەڵانی خەلکی کوردستان دا، ئێمەش لە پەژارەدا بوین، چونکە هەفتە نەبو بە ناڕەوا چەن هاوڵاتییەکی کوردستان لە شەڕی ناوخۆدا، لەوانە چەندین هاوڕێ ی

هەلکەوتو و هەڤالی دلری ئیمە، ئەکوژرین..

لە گەل کۆمەلانی خەلکی کوردستان دا، ئیمەش ئەمانپرسی: بۆ؟ ئەم شەرە لە پای چی؟ بۆ سودی کی؟ قوربانیەکانی ئەم شەرە کێن؟ بۆچی و لە بەر چی.. هەرچەند هەلومەرجی دەسپیکردنی کاریکی جیددی یا کاتی وەشاندنی گورزیکی کوشندە لە دوژمن نەگات؟ تەقاندنەوەی ناکۆکی لاوەکی و هەلگیرساندنی شەری ناوخۆ و کوردانەنی شەر و خەریک کردنی هیزی پیشمەرگەی ی ن ک کە بە دریژایی شەش سالی رابوردو هەر ئەو هیزی سەرەکی و کاریگەری بە گژا چونەوەی رژیمی عیراق و دەزگا دامرکینەرەو چەمەنەمیەکانی بوە لە کوردستان دا، لە دوا شیکردنەوەدا بە قازانجی کی یە؟

گوایە دنیای کورد ئەوەندە بە خیرایی لە گوران دایە، کە تەرازوی هیزەکانی ناوی و سروشتی سیاسی و چینایەتییان و، بیروباوەر و بۆچون و ریباز و، ئوسلوبی کار.. یان وەها زو بگۆری؟

- ئەوانەی کە ئاشبەتالیان رەفز کرد و بە چەکی شر و توانایەکی کەمەوە ریگەو چیاکانی کوردستانیان گرت و لە ناخۆشترین هەلومەرجی نابەرامبەری تەرازوی هیزەکانی رژیم و هیزەکانی سەرجەم ئۆپۆزیسیونی عیراق دا، بە توانایەکی کەمەوە، دژی دوژمنیکی بەهیز و در، خەباتی چەکدارانەیان دەس پی کردەوە..

- ئەوانەی ئالای چەسپاندنی گیانی پیکەوەژیانی دیموکراتی بیروباوەر و حیزب و ریکخراوی جیاجیایان هەلکرد، بە جۆریک کە بۆ گالتە پی کردن، بە یارەگاکانی سەرکردایەتییان ئەگوتن: دۆلی ئەحزاب!

- ئەوانەی کە ئالای روخاندنی رژیمی صەددام و دامەزراندنی رژیمیکی دیموکراتییان لە عیراق دا هەلکرد و، نەک جاری بەلکو سەدان جار، بانگی هەمو هیز و حیزبەکانی عیراقیان ئەکرد، کە هیز و توانای خۆیان لە بەرەیەکی یەکگرتودا دژی رژیمی صەددام یەک بخەن و خەباتی چەکدار لە روی سەرکردایەتی کردنی و پیکهاتنی هیزەکانی و مەیدانی چالاکیەوە بکەنە شورشی هەمو عیراق..

بەلی ئەوانەی کە بە رەنج و ماندوبونی چەند سال و بە خوینی سەدان شەهید راستیی ئەم دروشمانەیان سەلماند و بناغەکەیان دارشت، لە کاتیک دا کە زۆر کەس و زۆر لای تر ئەمەیان بە خەیال و سەرەرویی و پیلانگیران و نۆکەرایەتی ئەم و ئەو لە قەلەم ئەدا..

تۆ بلی ی دنیای کورد ئەوەندە زو بگۆری؟. ئەمانە هەمو بونە نۆکەری هەمان رژیم کە لە ماوەی شەش سالی خەباتی پر کویرەوەری و مەینەت و تالی دا، زیاتر لە هەزار هەڤال و هاوری ی بە ناوەوا لە شەری نابەرامبەر و، لە ژیر ئازار و ئەشکەنجە و، لە پای قەنارە کوشتون و، دەیان هەزار کەس لە خوشک و برا و دایک و باوک و خزم و خیزانی ئیهان کردون و ئازار داون و لە زیندان و گرتوخانە و سەربازگەکان دا توند کردون و، زیاتر لە هەزار گوند و دیبان کاول و لە گەل خاک دا یەکسان کردون؟

کورد گوتەنی: سەیرە لە کوێیە!

تۆ بلی ی ئەوانەی لە سەردەمی ئەو تراجیدیە سامناکە ناخۆشەدا خۆیان لە جەنگەی تراجیدیاکەدا ژیاون و بەرگەیان گرت و هیچ نەبی ئەوساکە لە کوردستان دا هەر ئەوان بون کە هیزی سەرەکی سیاسی و چەکداری بە گژا چونی رژیم بون، ئیستا بونە نۆکەری رژیم

پاریزەری سەددام و هێزە داگیرکەرەکانی، وە ئەوانەش کە ئەوسا تەماشاچی و رەخنەگر و سەیرکەر و تۆمەت بە پالدەر و گیرەشێوێن و ریز تێکدەر.. بون، بونە پاریزەری شۆرش و قازانجەکانی جەماوەری کوردستان و رێبازی شۆرشگێرانە؟

لە گەل کۆمەلانی خەلکی کوردستان دا، ئێمەش ئەپرسین بۆ؟

ئاخۆ ئەو گەلە کۆمەکی یەی لیمان کردبن و ئەو شەرەی پەیمان فرۆشتنێن لە سەر ئەوە بو کەوا ئێمە لە بیروباوەری خۆمان هەلگەراوینەتەوە و لە دروشمەکانی خۆمان پەشیمان بوینەتەوە و «ئەمانەوی چارەنوسی خۆمان ببەستینەوە بە چارەنوسی رەشی رژێمە خوێنرێژە رزیوەکەی سەددام» و، ئەمانەش گەرەکیان بو بە رێگەی گەلەکۆمەکی ی چەکدار - سیاسی، لە مەیدان دەرمان بکەن و پانکەنەوە بە ناو رژێم دا، یان بە زۆر پاتهێننەوە سەر رێگای راستی شۆرش و قازانجی جەماوەرا

*

هەمو زۆرانبازیەکی سیاسی بێگومان زەمینەیەکی مادی هەیە و لە راستی دا نواندنەوەی ململانی ی چینایەتی بەینی چین و توێژە کۆمەلایەتیە جیاوازەکانی ناو کۆمەلە، کە هەر یەکەیان بە پێ ی دەسکەوت و قازانجی چینایەتی خۆی، لە روانگەی تایبەتی خۆیەوە سەیری رووداوەکان ئەکا، هۆکانی دەس نیشان ئەکا، رێگەی چارەسەر کردن و ئوسلوبی کار بۆ کردنی دیاری ئەکات.

لە دۆخێکی وەکو ئێستای رۆژهەلاتی ناوەراست دا، کە یەکێکە لە ناوچە هەرە گرنگەکانی دنیا، وە یەکێکە لە ناوچە هەرە ئالوزەکانی دنیا و، شوێنی پەنگ خواردنەوەی چەندین کێشە و گیروگرفت و ناکۆکی قول و گرنگ و کاریگەرە - لە ناو هەر دەولەتێکیان دا، لە بەینی دەولەتانی ناوچەکەدا، لە بەینی گەلانی ناوچەکە و هێز و دەولەتە گەورەکانی دنیادا.. بەمجۆرە رووداوەکانی هیچ قوژبنێکی ئەم ناوچە ئالوزاوە گرنگە، چەن پچوک و چەپەک و پشت گوێ خراویش بی، ناتوانی رەوتی ئاسایی خۆی بگری بە دابراوی و دور لە دەستێوەردان و گوشاری ئەم و ئەو، ناکۆکیەکانی ناوی لە ئەنجامی کامل بونی هەلومەرجی مێژویی خۆی دا، لە لایەن خودی خاوەن مەسەلەکەوە، لایەلا بکری.

جا مەسەلەی نەتەوەی کوردیش، وەکو یەکێک لە گیروگرفتە هەرە ئالوز و گرنگ و بریاردەرەکانی ناوچەکە، دەمێکە سەرنجی بایەخی هێزە کۆنەپەرست و دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان و دەولەت و هێزە زلەکانی دنیای راکێشاوە و، هەر یەکەیان لە لای خۆیەوە، بە جۆرێک، چاوی تی بریوە و هەولی داوە جی پی ی خۆی بکاتەوە و پایەی کۆمەلایەتی لە ناو چین و توێژەکانی کۆمەلی کورد و نوێنەرە سیاسیەکانی دا بدۆزێتەوە و قورسایی خۆی بخاتە سەری. لە ناو بزوتنەوەی کوردیش دا لە مێژە دو جۆرە بۆچون هەیە بۆ لێکدانەوەی رەگی گیروگرفتەکانی گەلی کورد و دۆزینەوەی چارەسەر کردنی، کە لە دو سەرچاوەی ئایدیولوجی جیاواز، بەلکو لە دو جیهانبینی جیاوازەوە دەردەبن:

یەکێکیان - لای وایە کە بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان ئەبی پشت بە هێزی لە بن نەهاتوی کۆمەلانی خەلک ببەستی و، کۆمەلانی خەلک خۆیان خاوەنی مەسەلەکەی خۆیان بن و چارەنوسی خۆیان بریار بدەن بە بی دەستێوەردانی بیگانە، بناغەی ستراتیجی گشتی جولانەوەکەی لە سەر بنچینەی دابین کردنی پێویستیەکانی گۆران و گەشە کردنی کۆمەلایەتی، ئابوری، سیاسی و فەرهەنگی.. کۆمەلی کوردستان

داپڕێژی، نەک بە پێی ی قازانجەکانی هێزەکانی دەرەوە و ململانێ و زۆرانبازیەکانی بەینی
ئەوان.
ئەوی تریان - هەوڵ ئەدا جێگە بۆ جوڵانەوەی کورد بدۆزێتەوە لە ناو چوارچێوەی
ستراتیجی زلهێزەکان و لە ناو کون و کەلەبەری ناکۆکیەکانی بەینی دەوڵەتەکانی ناوچەکەدا،
هەر لە بەر ئەوە پشت بە دەرەوە ئەبەستێ و هەوڵ ئەدا بە هێزی دەرەکی و ناکۆکیەکانی
ئەوانەوە بیبەستێتەوە، وە بە گوێرەی هەڵکەوتنی هەلومەرجی چاک و خراپی «دەولی»
مەسەلەی کورد بجوڵێنێ و بڕێنێ، وە بیخاتەوە مەیدانی وازی ناو دەوڵەتانەوە.
هەوڵدان بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکیەکانی هێزەکانی دەرەوە جارێک لە
گۆشەی ڕاست و جارێکی کە لە گۆشەی چەپەوە، وە خەبات کردن بۆ ڕێ بڕین لەم پیلانە،
خۆی لە خۆی دا زۆرانبازیەکی سیاسیە. ناودانەوەی ململانێ ی چینایەتی چین و توێژە
کۆمەلایەتیە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵە، هەریەکەیان لە ڕوانگەی قازانجی چینایەتی خۆیەوە،
بەلام بە گوێرەی گۆڕانی هەلومەرجی خاوبونەوە و توندوتیژبونی ناکۆکیەکان، ئەمیش
ئەگۆڕێ: چەک دائەنێ یا چەک هەڵئەگرێ.
سەر بونی هەندێ هێز لە وەرزی سارد بونی مەناخی ناکۆکیەکانی بەینی عیراق و
ئێران دا، پاشان زیندو بونەوە و سەردەرهێناتەوەیان سەرلەنوێ لە وەرزی گەرمبونەوەی
مەناخی ناکۆکیەکان دا وێنەیەکی دزێوی بۆچونی دوەمە. لە کاتێک دا کە مەسەلەی کورد
لە حاڵەتی ڕێکی و ناڕێکی، ئاشتی و شەڕ، کزکی و ناکۆکی دەوڵەتانی ئێران و عیراق دا،
وەکو مەسەلەیەکی بابەتیی مێژوکرد هەر هەبوە.
هەڵگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران هەلومەرجێکی نوێ ی لە سەرانسەری
ناوچەکەدا خولقاند، لە لایەکەوە - هەلی بۆ هێزە شۆڕشگێڕەکان هەڵخست کە سود لە شەڕی
ئەم دو دەوڵەتە داگیرکەرە وەربگرن، بۆ زیادکردنی ڕادەی چالاکی و جەربەزەیی پێشمەرگەیی
و بە دەستهێنانی سەرکەوتنی گەورە و کارێگەر لە چوارچێوەی ستراتیجیەکانی خۆیان دا.
بەلام لە لایەکی تریشەوە، هەلی بۆ هێزەکانی تریش ڕەخساند کە سەرلەنوێ بێنەوە مەیدان
بۆ بەستنەوەی مەسەلەی کورد بە ناکۆکیەکانی ئەو دو دەوڵەتەوە.
بەو پێ یە، لە سەر ئەرزی کوردستان ڕیزبونێکی نوێ ی حیزب و هێزە سیاسیەکان
هاتەوە گۆڕێ. لایەکیان ئەیویست و هەوڵی ئەدا سەربەخۆیی ڕێبازی شۆڕشگێرانەی
بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان، لە گەمە و پیلانی دەوڵەتەکانی عیراق و
ئێران بپارێزێ و لە هەمان کات دا کەڵک لە هەڵگیرسانی جەنگ وەربگرێ، بۆ زیادکردنی
هەرچی زۆرتری چالاکی شۆڕشگێڕانەی سیاسی و چەکدار و ڕاپەڕاندنی کۆمەڵانی خەڵک.
لایەکەی تریش ئەیویست و هەوڵی ئەدا کە خەباتی ڕەوای گەلی کورد لە عیراق دا بکات بە
بەشێک لە ئەبەردەکانی جەنگی دەوڵەتی ئێران دژی دەوڵەتی عیراق و، لە چوارچێوەی ئەو
نەخشەیەدا ئەیزوت، کە بەشێکی لەو گەلە کۆمەکی چەکدارە سیاسیە ٤ قۆڵیدا خۆی
ئەنواند، کە لە چەند مانگی ڕابردودا دژی پێشمەرگەکانی ی ن ک کرا.

*
گەلەکۆمەکی کەی ئەمجارە، ئەگەرچی لەو دیو سنورەوە، بە توانایەکی زۆرەوە
نەخشەی بۆ کێشرا بو، وەکو هەمو جارەکانی تر ئەمیش لە بەرامبەر باوەڕی پتەو و
خۆڕاگریی دلێرانەی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا شکا و سەری نەگرت. بەلام هەر وەکو

هێرشەکەی ئەمجارە، لە هەموو ئەوانی پێشو، بەربلاوتر و توندتر و ڕێکخراوتر بو، هەروەها شکاندنەکەشی بە هەمان ئەندازە گەورە بو، بگرە لە ئەوارەی هێرشەکەش زلتر بو، چونکە سەرلەنوێ چەند ڕاستیەکی بە زەقی ساخ کردەوە، لەوانە:

- دەرکەوت کە پێشمەرگەکانی ی ن ک لە ماوەی چەن سالی ڕابوردودا، لە سەختترین هەلومەرجی خەبات دا، چۆن بەرگەی هێرش و پەلاماری دڕندانەی هێزی داگیرکەری ڕژێمی فاشیستی عێراقیان گرتوە و، چونکە لە ناو باوەشی کۆمەلانی خەلک و لە گەلْ ئێش و ئازارەکانی ئەوان دا ژیاون، لە گەشە کردنێکی چوناپەتی و چەندایەتی شێنەیی و بەردەوام دا بون، لە بۆتەی خەباتی شۆرشگێرانەی خوێناوی و سەخت و دژواردا قال و پەروەردە بون، بۆیە بە هیچ هێزێکی خۆمالی و خۆولاتیش لە شکاندن و بەزاندن نایەن و بە ئاسانی لە مەیدان دەرناکرێن، بگرە هەروەکو چۆن بە درێژایی سالانی پێشو، هێزی سەرەکی و کارێگەری بەربەرەکانی ی ڕژێم بون لە کوردستان دا، هەر بەو جۆرە پارێزگاری هەمان ئاستی بلند و شوێنی بەرز و سەربەرزانەی خۆیان کرد چ لە بەرامبەر هێرشەکانی ڕژێم دا و، چ لە بەرامبەر پەلاماری نارەوای هێزی چەکداری حیزبەکانی تردا.

- دەرکەوت هەر ئەو سیاسەتە سەرنەکەوێت و لە وێژدانی خەلک دا جێگیر ئەبێت و سەرنج و بروای خەلک بە دەس ئەهێنی، کە لە سەر بناغەی ڕاستی و ڕوداو بنیات نراوە، نەک ئەوەی لە سەر بناغەی پیلانگێران و پروپاگاندەی ناراست و ژاوەژاوی دروستکراو و هاشە و هوشەی درۆ و هەلگێرانەوەی ڕوداوەکان و چەواشە کردنی گەلْ و تەفرەدانی خەلک و فێل و تەلەکەبازی.

ئەوانەی پەنایان بردە بەر شەری پروپاگاندەی درۆ، زۆری نەخایاند، درۆکانیان ئاشکرا بو، بوختانەکانیان دەرکەوت، دەستەکەیان کەوتە ڕو.. خۆیانی پێ سوک و ڕیسواتر بون.

- دەرکەوت کێ لە خزمەتی پیلانەکانی داگیرکەرانی کوردستان دایە و بە کردەوە، بە نهێنی و بە ئاشکرا، نەخشەکانی ئەوان جێبەجێ ئەکات، لە پەنای ئەودا و بە بەرماوەی ئەوان ئەژی و بە پێ ی قازانج و دەسکەوتەکانی ئەوان ئەجولێتەوە و، بە فەرمانی ئەوان پێشرەوی و پاشەکشە ئەکا، سەر دەرئەهێنی و سەر ئەباتەوە کون. ئەگینا ئەوی بەهوی شەری ڕژێمی عێراق بکات، ئەگەر لە بیانو نەبی، مەیدانێکی بەرین و فراوانی نەبەردی چەکدار و چالاکیی سیاسی لە بەردەم دایە، سەدان سەربازگەی گەورە و بچوک و ڕەبیەی هێزی داگیرکەری دوژمنی لە بەر چاو و لولەی تفەنگ دایە و ڕێگەی لێدانی هێزەکانی ڕژێمیش هەر بە سەر سنگی پێشمەرگەکانی ی ن ک دا تێ ناپەری.

- دەرکەوت کێ لە هەمو لایەک زیاتر بە تەنگ بەجێیهێنانی فرمانی نیشتمانی و لێپرسینەوەی مێژویی و جێبەجێ کردنی خواست و داواکانی جەماوەرەوەیە و سورە لە سەر شکاندنی پیلانی «کورداندنی شەر» و نەهێشتنی شەری ناوخۆ و، تەرخان کردنی هەمو وزە و تواناکان بۆ شەری ڕژێمی عێراق. ڕوداوەکان ئیسپاتیان کرد، کە لەم ڕوانگەیەوە ی ن ک هەر وەکو سەر بۆ «زۆری چەک» و گوشار و گەلەکومەکی داناەوێنی، بەلام ئەگەر ئازادی هەلبژاردنی شێوەی لابەلا کردنی گیروگرفتەکان بە ڕێگای سیاسی یا چەکدار، بەند بێ بە دەسەلات و ئارەزوی یەکێتیی نیشتمانییەوە، ئەوا ی ن ک مەگەر هیچ ڕێگایەکی تری خۆپاراستنی لە بەردەم دا نەمێنی، جگە لە بە کار هێنانی چەک، ئەگینا هەمیشە ڕێگەی گفتوگۆی هێمن و دیموکراتی ئەگری و، ڕێگەی سیاسی چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان

هەڵئەبژێرێ.

*

ڕووداوەکان کۆن ئەبن و لە بیر ئەچوونەتەوە، هۆکانی تەقینەوەی وەزعەکە هەر ماون، گیروگرفتەکان بە چارە نەکراوی هەڵپەسێردراون، کەواتە مەترسی هەڵگیرسانەوەی شەڕی ناوخۆ هێشتا لە گۆڕێ یە، بەڵام هێشتا هەلی بە لادا خستنی هێمنانە و سیاسی گیروگرفتەکان، لە هەلی لاپەلا کردنی چەکدارانەیان، زۆرترە.

هێشتا لە قۆڵی ی ن ک ەوە دەرگای چارەسەرکردنی سیاسی مەسەلەکان بە کراوەیی، لە سەر گازی پشتە. (کۆمەڵە، کانونی دووهەمی ۱۹۸۲)

*

وتاری دووەم:

شەڕی ناوخۆ یا شەڕی ڕزگاری نیشتمان؟

گەشەکردنی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دا دوابەدوای شۆڕشی ١٤ ی تەمووزی ١٩٥٨، پاشان دەستپێکردنی خەباتی چەکدار و هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول و وەرگرتنی چەند ساڵەی، کارێکی وەهای کرد کە کوردستانی عێراق ببێتە مەڵبەندێکی گرنگی بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا. بگرە ببێتە ناوەندێکی ئەوتۆ کە تێکڕای تێکۆشەرانی کورد لە پارچە جیا جیاکانی کوردستان دا چاوی هیوای تێ بڕن و پشتی پێ ببەستن و پشتیوانی لێ بکەن، خەباتی خۆیان و تێکۆشانی حیزب و ڕێکخراوەکانی خۆیانی پێوە گرێ بدەن، بەڵکو بیخەنە ژێر چەتری ڕابەریی سیاسی و ئایدیولوجی و ڕێکخراوەیی.. سەرکردایەتییەکەیەوە.

بارزانی کە سەرکردایەتی شۆڕش و پارتی لە ژێر دەس دا بوو، هەروەها جولانەوەی کوردیش لە سەرانسەری کوردستان دا کەوت بوە ژێر نفوز و دەسەڵاتی ئەوەوە ئەیتوانی دەوری سەلبی یا ئیجابی وازی بکا هەم لە جولانەوەی کورد لەو پارچانەدا و هەم لە ناو حیزب و ڕێکخراوەکانیان دا، بە تایبەتی لەو قۆناغەدا، کە سەرەڕای پەرەسەندن و بەهێز بونی شۆڕشەکە خۆی، لە ناو ڕۆشنبیران و تێکۆشەرانی کوردیش دا ئەو باوەڕە زاڵ بو: ئەگەر لە پارچەیەکی کوردستان دا شۆڕش هەڵگیرسا تا بە ئەنجام ئەگات، ئەبێ هەمو پارچەکانی تر لە خزمەتی ئەو شۆڕشەدا بن و لە سنوری دەسکەوت و قازانجەکانی ئەودا بجولێنەوە.

ئەم باوەڕە ئەگەر لە چوارچێوەی ستراتیجێکی گشتی دا دابڕێژرایە و پەیڕەوی بکرایە و کاری پێ بکرایە، لەوانە بو ئەنجامی کاریگەر و گەورەی هەبوایە، بەڵام بە شێوەیەکی خراپ لە لایەن سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلولەوە، بە تایبەتی لە لایەن بارزانییەوە، بە کار هێنرا، هەم بۆ کۆیخایەتییەکی ناڕاستی پارچەکانی تری کوردستان لە ڕوی سست کردنی جولانەوەکانیان و خۆ هەڵقورتاندن لە کاروباری ناوەکی حیزب و سەرکردایەتییەکانیان و تەرخان کردنیان بۆ خزمەتی جولانەوەی کوردستانی عێراق.. وە هەم بۆ پاساودانی دەستێکەڵاوکردن لە گەڵ دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان. ئەوەش لە ڕەفتاری هەردو باڵەکەی پ د ک دا دەرکەوت و بە کردەوە سەلما.

هەرەس هێنانی کتوپڕ و خێرای شۆڕشی ئەیلول لە کوردستانی عێراق دا لە ئەنجامی ڕێککەوتنی شا - سەددام ساڵی ١٩٧٥ لە جەزائیر دۆخێکی نوێ ی لە ناوچەکەدا

خەڵقاند. ئەو ناوەندەی لە کوردستانی عێراق دا بۆ جوڵانەوەی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا دروست ببوو هەرەسی هێنا. هەروەکو گەلی کوردی عێراق کەوتە گێژاوی مەینەتییەکی نەتەوایەتی دژوارەوە، هەروەها هەموو نەتەوەی کوردیش، لە ئەنجامی ئەوەدا، ڕەنجەڕۆ و دردۆنگ و بەدبین بو لە هەر ناوەندێکی تر لە بزوتنەوەی کوردا.
هەرچەندە خامۆشییەکی ترسناک، لە دوای ئاشبەتاڵ، باڵی بە سەر کوردستان دا کێشا بو بەڵام زۆری نەخایاند، جوڵە و بزوتن کەوتەوە سەرانسەری نیشتمانەکەمان.
- لە کوردستانی عێراق، واتە لە کەلاوەی ئاشبەتاڵ دا، خەباتی ژێرزەمینی دەستی پێ کردەوە و هەر زۆر زو چووە قۆناغی خەباتی سیاسی - چەکدار.
- لە کوردستانی تورکیا بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی پەرەی سەند.
- لە کوردستانی ئێرانیش جمەوجۆلی ڕێکخراو سەری هەڵدایەوە و لە گەڵ ڕوخانی شا بوە بزوتنەوەیەکی سیاسی - جەماوەریی فراوان و قوڵ و، زۆریشی پێ نەچو بوە جوڵانەوەیەکی سیاسی - چەکدار.
ئەگەر پێشتر کوردستانی عێراق ببوە ناوەندی بزوتنەوەی کورد و بەشی زۆری حیزب و ڕێکخراوەکانی سەرانسەری کوردستان خۆیان پێوە ئەبەست یا لێ ی نزیک ئەکەوتنەوە و پەیڕەوی ئامۆژگاری و ڕێنوێنییەکانیان ئەکرد، لە گەڵ تێکچونی شۆڕشی کوردستانی عێراق دا ئیتر نەک هەر ئەو ناوەندە تێکچو بو، بەڵکو ئەو تەجروبەیەش لە بەر چاوی زۆربەی حیزب و ڕێکخراوەکانی کوردستان دا شکا بو، ئیتر لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا ناوەندێک نەما بو لە ڕوی توانای سیاسی - تیوری یان لە ڕوی توانای چەکدار - ماددییەوە ئەو هێز و نفوز و دەسەڵاتەی هەبێ، حیزب و ڕێکخراو و تێکۆشەرانی کوردستان پەیرەوی لێ بکەن و لێ ی کۆ ببنەوە. ئەگەر پێشتر کوردستانی عێراق ببوە نمونەیەکی دیاری کۆکردنەوەی جەماوەری خەڵک لە ئاقە حیزبێک دا و سیستەمی ئاقە پارتی بە سەر خەڵکی دا سەپا بو، ئەم تەجروبەیەش لە گەڵ ئاشبەتاڵی سەرکردایەتی و داوودەزگاکانی پ د ک و تێکچونی شۆڕشە چەکدارەکەی کوردستانی عێراق، شکا و باوی نەما.
بەمجۆرە لە هەر پارچەیەکی کوردستان دا چەن حیزب و ڕێکخراو دەستیان کرد بە کارکردن و لە سەرانسەری کوردستان دا چەندین حیزب پەیدا بون. هی نوێ هاتنە مەیدانەوە و کۆنەکانیش بە خۆ کەوتنەوە.
دەرکەوتنی چەندین حیزب و ڕێکخراوی جۆراوجۆر، لە لایەکەوە ئەنجامی ئاسایی گۆڕان و گەشە کردنی کۆمەڵایەتی، ئابوری، سیاسی.. کۆمەڵی فرە چینی کوردستان و نیشانەی دەرکەوتنی سنوری چینایەتی بو لە بەینی چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان و ڕواندنەوەیان لە ڕێکخراوی سیاسی جۆراوجۆردا. لە لایەکی ترەوە دەرکەوتنی ئەم هەموو حیزب و ڕێکخراو و دەستە و ئاقمانە.. کە هەندێکی شوێنی چینایەتی خۆی پێ نەدۆزرا بوەوە، یا لەم لا و ئەو لاوە فڕیان پێ دا ئەکرا، نیشانەی ئاڵۆزیی و پەراگەندەیی سیاسی و پەرت بون و بە فیڕۆ چونی وزە و هێزی کۆمەڵانی خەڵک بو، بگرە سەرەتای سەرهەڵدانی تەنگوچەڵەمەیەکی قوڵ و ئاڵۆز بو لە بزوتنەوەی ڕزگاری نیشتمانیی گەلی کوردا، بە تایبەتی چونکە هەندێکیان بەرەو خۆ چەکدارکردنێکی لاسایی کەرانەوەی بێ بەرنامە ئەچون.

*

لەبەرئەوەی لە هیچ کام لەو دەوڵەت و وڵاتانەی کورد و کوردستانیان بە سەردا بەش کراوە ماوەی ژیانی دیموکراتی و خەباتی سیاسی هێنانە نەبوە، لەوەتەی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کورد، بە پێ ی تێگەیشتنی نوێ، پەیدا بوە، هەمیشە شێوەیەکی سەرەکی خەباتی چ بۆ مان و خۆپاراستنی وە چ بۆ دەربڕینی بیروڕا و داواکردن و سەندنی مافەکانی، بە ناچاری رێگەی خەباتی چەکدار و، هەڵپەی خۆ چەکدار کردن و بە کار هێنانی چەک بوە. هەر بۆیە زۆربەی حیزب و رێکخراوەکانی کوردستان هەوڵی پێکهێنانی هێزی چەکداریان داوە. جا لە بەر ئەوەی ئەمانیش لە پەیڕەوی کردنی رێوشوێنی پێکەوەژیانی دیموکراتییانە و لە نەریتی پێکەوە هەڵکردنی سیاسی دا کەم تەجروبە بون و، هەمیشە داگیرکەران و ئیمپریالیزمیش لوتیان ژەندۆتە مەسەلەی کوردەوە، بۆیە زۆرجار ناتەبایی و ناڕێکییەکانی بەینی ئەو هێز و تاقمانە، لە کاتێک دا کە ئەبێ بە رێگەی سیاسی لایەلا بکرێن، ئەتەقێتەوە و ئەگاتە پلەی پێکدادانی چەکدار و شەری خوێناوی، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە لە هەندێ قۆناغ و لە هەندێ کات و شوێن دا بزوتنەوەی کوردی توشی مەترسییەکی زل ئەکا، چونکە خەباتی هێزە کوردییەکانی لە شاری ی ئاسایی خۆی، واتە لە خەبات دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، لا ئەدا و ناکۆکی نێوان هێزە کوردییەکان ئەتەقێتەوە و ئەوەندە توند ئەبێ بە جۆرێک لە باتی ئەوەی شەری قورس و خوێناوی بکەوێتە مەیدانی هێزەکانی کورد و داگیرکەرانەوە، کەوتۆتە ناو ریزەکانی کورد خۆیەوە.

لە بە سەر کردنەوەی شریتی رووداوەکانی ماوەی چوار - پێنج ساڵی رابوردوی نیشتمانەکەمان دا ئەبینین:

- لە کوردستانی تورکیا ئەگەرچی شۆرشی چەکدار و لەشکری چەکداری تیا نەبوە و حیزب و رێکخراوەکانی ئەوێ لە خەباتی ژێرزەمینیی دا بون، کەچی لە گەڵ ئەوەش دا ناکۆکی ئایدیولۆجی و سیاسی لە بەینی هەندێ حیزب و رێکخراوی ئەوێ دا تەقیبەوە و کەوتنە کوشتن و تۆقاندنی کادر و ئەندام و دۆستی یەکتری، تا کودەتای سپایی و سەپاندنی حوکمی عورفی جێگەی بە هەمویان لێژ کرد و جموجوڵ و چالاکیی کەم کردەوە و سەرکردە و کادر و ئەندام و لایەنگرەکانی گرتن و راونان و دەربەدەر کردن.

- لە کوردستانی ئێران دا ئەگەرچی لە پاش روخانی شا جەوێکی ئازاد و دیموکراتی کەم وێنەی خەباتی سیاسی و ململانێ ی ئایدیولۆجی خولقا بو، بەڵام لە گەڵ ئەستور بونی باسکی چەکداری رێکخراوی ئەوێ و لە گەڵ قوڵ بونەوەی ناکوکییەکانی بەینیان، لەوێش هەندێ لە گیروگرفتەکانیان، کە ئەکرا بە رێگەی سیاسی چارەسەر بکرێن، جاروبار ئەتەقیبەوە و ئەگەیشتە پلەی پێکا هەڵپژانی چەکدار و خوێناوی.

هێشتا ئەم گیروگرفتانەی ناو خۆیان بە لایەک دا نەکەوت بو، هەمو هێزەکانی شۆرشی کوردستانی ئێران کەوتنە بەر پەلاماری چەکداری هێزێکی تر کە گوایە یەکێکە لە هێزەکانی کوردستانی عیراق.

- لە کوردستانی سوریاش ململانێ ی رێکخراوەیی و سیاسی لە بەینی حیزبەکان دا، هەندێ جار ئەوەندە توندوتیژ و قوڵ ئەبێ تا رادەی لە یەک دابڕان و بە گژ یەکا چونێکی وەها کە ئەگەر لەوێش خەباتی چەکدار لە گۆری بوایە لەوانە بو ئەوێش بگاتە رادەی شەری خوێناوی و چەکدار لە بەینیان دا.

– لە کوردستانی عیراقیش ئەوە چەند ساڵە شەری ناوخۆ بۆتە یەکێک لە گەورەترین کۆسپەکانی ریگەی بۆ پێشەوە چوونی جوڵانەوەکە. لێکدانەوەیەکی بابەتیی رەوتی رووداوەکان و نزیکبوونەوەیەکی گشت لایەنی دەری ئەخەن شەری ناوخۆی بەینی هێزە کوردییەکان و خەریک بوونیان بە یەکترییەوە لە سەرانسەری کوردستان دا دیاردەیەکی گشتییە، ئەگەرچی لە کوردستانی عیراق و لە کوردستانی ئیران دا لە چاو پارچەکانی تردا گەرمتر و خوێناویترە. لە راستی دا توێژینەوەی هۆ راستەقینەکانی شەری ناوخۆ دەری ئەخا کە جگە لە کەم ئەزموونیی ئەم حیزب و ریکخراوانە لە مەیدانی پێکەوە ژیانی دیموکراتییانە و، جگە لە ئاودانەوەی ململانێ ی بیرورای جیاواز و قازانج و دەسکەوتی چینایەتی جۆراوجۆر، قوڵکردنەوەی ئەم دیاردەیە و نانەوەی شەری ناوخۆ بە هیچ جۆر دوور نیە لە فیتی داگیرکەرانی نیشتمانەکەمان و ئیمپریالیزمی جیهانیی و نۆکەرەکانیان، وە لە نەخشە و پیلانەکانی ئەوان بۆ لادانی بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کوردستان لە شا ری ی مێژوویی خۆی واتە: شەری داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان، بەرەو شەری ناوخۆیی هێزە کوردییەکان لە گەڵ یەکتری واتە «کورداندنی شەرەکە» لە کاتێک دا کە هێشتا گەلی کورد لە قۆناغی شەری رزگاری نیشتمان دایە نەک لە قۆناغی شەری ناوخۆی چینە جیاوازەکانی.

لە قۆناغی ئێستای خەباتی رزگاریخوازانەی گەلەکەمان دا، شەری ناوخۆ، لە دوو دیوی کوردستان دا، لە دیوی عیراق و لە دیوی ئیران، خەتەرێکی گەورەی دروست کردووە بۆ سەر بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانیی گەلی کورد، بەشێکی گەورەی رەنج و فیداکاری هێزە کوردییەکان لە شەری یەکتری دا بە فیرۆ ئەچێ، هێزە کوردییەکان بە شەری سیاسی و چەکدار و ئیعلامی یەکترییەوە خەریک ئەکا و ناتوانن بە چاکی خەریکی دوژمنەکانی گەلەکەمان بن و گورزی کوشندەی تێ بسرەوێنن، کۆسپ و تەگەرەی زل لە بەردەمی رەوتی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردا دروست ئەبێ و ناتوانێ تەکانی بە تین و بە گوڕ بەرەو بەدیهێنانی ئامانجەکانی بدا، دڵی کۆمەڵانی خەڵک لە تێکۆشان سارد ئەبێتەوە..

بۆیە ئێمە لە روانگەیەکی زانستییەوە، سەیری هەلومەرجی نوێ ی کوردستان بکەین، ناکۆکییەکانی ئەم قۆناغە هەڵبسەنگێنین، سروشتەکانیان، ریگەی چارەسەر کردن و شێوەی لایەلا کردنیان دیاری بکەین، فرسانەکانی خۆمان، لەم قۆناغە گرنگەی خەباتی گەلەکەمان دا دیاری بکەین.

ئێمە زۆر بە وریایی و ژیری، زۆر بە هوشیاری و پەرۆشەوە، بە دڵسۆزی و تین و تاوی شۆرشگێرانەوە، بە لە خۆبردنێکی تەواو و هەست کردنێکی قووڵەوە بە لێپرسینەوەی مێژوویی، لە پلەی ئێستادا هەوڵ بدەین:

لە لایەکەوە - لە رووی سیاسی، ئایدیۆلۆجی، پێشمەرگەیی.. وە خۆمان تەیار و ئامادە بکەین بۆ پەکخستنی هەر پیلانێکی دوژمنانە و بۆ بەرەنگاریی هەر رووداوێکی ناڵەبار و نەویستراو و بۆ بەربەرچدانەوەی هەر پەلامار و هێرشێکی ئەکرێتە سەرمان.

وە لە لایەکی تریشەوە - بەوپەری تواناوە هەوڵ بدەین کە چارەیەکی سیاسی بۆ شەری ناوخۆ لە کوردستان دا بدۆزرێتەوە کە بزوتنەوەی رزگاری نیشتمانی گەلی کورد لە بەلای شەری لاوەکی لا بدا و نەهێڵێ لە شا ری ی مێژوویی خۆی، شا ری ی خەبات و شەر کردن دژی داگیرکەران و ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان لا بدا و بخرێتە سەر لاری ی شەری

هێزە کوردییەکان لە گەڵ یەکتری. (کۆمەڵە، شوباتی ١٩٨٢)

*

وتاری سێیەم:

(مساومە) لە گەڵ داگیرکەران یا لە گەڵ هێزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردستان؟
عێراق و ئێران وەکو دو دەوڵەت کە هەر یەکێکیان پارچەیەکی کوردستانی داگیر
کردوە و بەشێکی نەتەوەی کورد ئەچەوسێنێتەوە، لەوەتی دامەزراون، سەرەڕای ئەو ناتەبایی
و ناڕێکییەی بە درێژایی مێژو لە سەر سنور و مەزهەب و رەگەز و، لە سەر کاروباری
سیاسی و ئابوری.. هەیان بوە، هەمیشە لە کاتی مەترسی دا دژی بزوتنەوەی رزگاری
نیشتمانی گەلی کوردستان رێک کەوتون، پێکەوە نەخشە و پیلانی کوژاندنەوەیان داناوە و
تەقەلایان یەک خستوە. ئەگەر هەندێک جاریش، یەکێک لەم دو دەوڵەتە یارمەتی
جولانەوەیەکی کوردییان لە شوێنێک دا دابێت، لە چوارچێوەی وازیی تاکتیکی دەرنەچوە
بۆ بەکار هێنانی مەسەلەی رەوای کورد و خەبات و خۆ بەختکردنی، وەکو هێزی زۆر بۆ
بردن و گوشار و ئاژاوە نانەوە، بۆ بە دەستهێنانی مەبەستێکی سیاسی، یا سپایی، ئابوری..
دژی دەوڵەتەکەی تر.
پەنجا ساڵی رابوردو چەندین نمونەی هاوکاری ئەم دو دەوڵەتەی تیا ئەبینری دژی
گەلی کورد، کە دواییەکەیان ڕێککەوتنەکەی شا - صەددام بو لە جەزائیر.

*

ڕوخانی ڕژێمی شا لە ئێران، زۆر مەسەلەی لە ناوچەکەدا گۆڕی، یەکێک لەوانە
تێکچونەوەی پەیوەندی هاوکاری و تەبایی عێراق - ئێران بو، کە بە شەری پروپاگاندە و
دەستوەردانە کاروباری ناوخۆی یەکتری دەستی پێ کرد، تا گەیشتە وردەشەری سەر سنور و
لە دوایی دا هەڵگیرسانی جەنگ لە بەینیان دا.
هەڵگیرسانی جەنگ لە بەینی ئەم دو دەوڵەتەدا، کە بە هۆی زیاد بونی دەرامەتی
نەوتەوە لە حەفتاکان دا، ماکینەیەکی سوپایی و پولیسی گەورە و خورتیان دروست کرد بو
بۆ دامرکاندنەوە و داپلۆسینی گەلەکانی خۆیان و بزوتنەوە شۆڕشگێڕییەکانیان، هەلێکی
لەباری رەخساند بۆ گەلانی ئەو دو دەوڵەتە بە گشتی، بۆ ئەوەی لە باتی ئەوەی لە شەری دو
دەوڵەتی چەوسێنەردا، یەکتری شەق و پەق بکەن، هەوڵ بدەن بۆ ڕوخاندنی دەسەڵاتی
زۆردارانەی چینە حوکمڕانەکان و ڕوخاندنی بنچینەکانی «ئیستیبدادی شەرقی» کە بە
ناشیرینترین شێوەی لەم ساڵانەی دوایی دا هەم لە حوکمی صەددام و حیزبە فاشیستییەکەی
دا و هەم لە حوکمی خومەینی و دەسەڵاتی ئاخوندەکانی ئێران دا، بە دی ئەکری.
هەڵگیرسانی جەنگ ئەگەر بۆ گەلانی هەردو دەوڵەت هەلێکی لە بار بوبێ
بۆ چاکتر کامل کردنی هەلومەرجی دۆخی شۆڕشگێڕانە و گۆڕینی بنەرەتیی
خەریتەی دەسەڵاتی سیاسی چینەکانی هەردو کۆمەڵ، ئەوا بۆ گەلی کورد هەلێکی مێژویی
ئەوتۆ بو کە لە مێژوی نوێ ی دا بۆ یەکەمین جار بو شتی وای لی هەڵبکەوی، کە لە ناو
هەردو دەوڵەت دا دو بزوتنەوەی ئۆپۆزیسیونی خورت و دیموکرات و پێشکەوتنخواز، وە لە
ناو هەردو بەشەکەی کوردستان دا دو جولانەوەی سیاسی - چەکداری فراوانی خاوەن بنکەی
جەماوەریی تیدا بێ، کە هەر یەکەیان خاوەنی بەرنامە و سەرکردایەتی و ڕێکخراوی سیاسی

و چەکدار بێ، لە سەر خاکی خۆی.

هەرچەندە هاوکاری هێز و حیزبەکانی هەردوو دیو لە ئاستی پێویستییەکانی قۆناغەکەدا نەبوو، بۆ قۆستنەوەی ئەو هەلە مێژووییەی، کە دوو دوژمنی دێرینە و بە هێزی گەلی کورد، سەدان هەزار سەربازیان دژی یەکتری لە مەیدانی جەنگێکی قورس و درێژی مایەپووچ دا بەر دابوو گیانی یەکتری، بۆ ئەوەی بە پێ ی گۆڕانەکانی هەلومەرجی نوێ ی نەتەوەیی و ناوچەیی و جیهانی.. چاو بگێڕیتەوە بە بەرنامەکانیان دا، بگرە بە ستراتیجی گشتی جوڵانەوەی کوردا لە هەردوو دیو، بۆ دانانی ڕێوشوێنی ناوکۆیی کارکردن و، تەکاندانێکی نوێ بە خەباتی کورد، لە ڕووی دروشم و ڕێباز و شێوەی کارکردنی و هاوپەیمانێتییەوە.

لە کاتێک دا توانای ئەمە لە گۆڕێ بوو. بەڵام بۆچوونی زاڵ و ڕەوتی ڕووداوەکان وەها ڕۆیشت کە هێزە سیاسی - چەکدارەکانی کوردستان هەر لایەنە لە دیوی خۆی دا و لە سنووری بەرنامە و ستراتیجی خۆی دا کەلک وەربگری لە هەلی خەریک بوونی دەوڵەت و سوپای داگیرکەری وڵاتەکەی خۆی بە جەنگێکی دەرەکی قورسەوە، بۆ گەشە پێدانی جوڵانەوەکەی و بەدەسهێنانی سەرکەوتنی سیاسی و سپایی.

هەڵگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران هەلێکی لەبار بوو لێ تێکرای ئۆپۆزیسیۆنی عیراق و دوژمنەکانی ڕژێمی سەددام، وە بە تایبەتی بۆ گەلی کورد و هێزە سیاسی - چەکدارەکانی کوردستان چونکە ئەیانتوانی کەلکێکی گەورەی لێ وەربگرن بۆ هەڵگێڕانەوەی تای لاسەنگی تەرازووی هێزەکانی ڕژێم و گەلی کورد، بە تایبەتی کە سەددام و حیزبە فاشیستەکەی لە ئەنجامی جێگیربوونی دۆخی ناوەوەی دا و لە ئەنجامی زیادبوونی دەرامەتی نەوت و زیادبوونی ژمارەی هێزە چەکدارەکانی و تفاقی جەنگی و دەسگرتنی تەواوی بە سەر هەمو شوێنە گرنگەکانی کوردستانی عیراق دا، لە دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥، ناهاوتاییەکی سپایی گەورە و نابەرامبەرییەکی بێ وێنەی ئەوتۆ لە بەینی هێزی پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکانی ڕژێم دا دروست بوبوو، کە لە دابەشکردن و بەراوردکردنی ژمارەی هەردوولادا، یەک پێشمەرگە زیاتر لە دووسەد چەکداری ڕژێمی عیراقی بەرئەکەوت. تەنانەت هەندێ جار جگە لە هێزی پیادە و جاش کە هێرشیان سەر مەفرەزە یا کەرتێکی پێشمەرگە، ژمارەی ئەو هالیکۆپتەرانەی بەشداری هێرشەکە ئەبوون، لە ژمارەی پێشمەرگە پەلاماردراوەکان زۆرتر بوون.

لە باری نابەرامبەری ماددی و بەشەری دا، لە بەینی پێشمەرگە و ڕژێم دا، هەر هێزی مەعنەوی و باوەر بوو بە ڕەوایی و ڕاستی مەسەلەکە، کەموکوڕییەکانی پێشمەرگەی پڕ ئەکردەوە و لاسەنگییەکەی هەردوو تای تەرازووی هێزەکانی ڕاست ئەکردەوە. لە گەڵ ئەوەش دا بە درێژایی ساڵانی ٧٦ - ٨٠. ڕۆڵە دلێرەکانی کوردستان نەک هەر بەوپەڕی قارەمانانەتییەوە بەرگەی دژوارییەکانی هەلومەرجی خەبات و هێرش و پەلامارەکانی دوژمنیان گرت و بەس، بەڵکو لە زۆر مەیدان و شوێن دا جڵەوی دەسپێشکەرییان لە دەس دوژمن دەرهێنا و دەیان داستانی قارەمانێتییان نووسیەوە و سەدان سەرکەوتنی دیاریان لە شەڕگەکان دا بە دەس هێنا.

هەڵبەتە هەڵگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران بۆ پێشمەرگە شاییەکی خۆش بوو، چونکە سپا و هێزە چەکدارەکانی عیراق، ئیتر نەیانئەتوانی بەو خەستییە هێرش بهێنن و

بەو چریەیە لە کوردستان دا هێزەکانیان دابەش و جێگیر بکەن و بە گوێرەی توندبوونی شەڕ و پێکادان ئەیانەوێ تیتر هەندێ لە هێزە داگیرکەرەکانی کوردستان بکێشنەوە و بیبەن بۆ مەیدانی جەنگ لە گەڵ ئێران و لە هەندێ شوێنی تریش دا هێزەکانیان تەنک بکەن.

خەریک بوونی هێزەکانی دوژمن بە شەڕی سپایەکی نیزامی هاوتای خۆیەوە لە جەبهەیەکی ترەوە، دەسەڵاتی لە کوردستان دا لاواز ئەکرد و توانای شەڕکردنی کەم ئەکردەوە و نوقتەی زەعیفی لە ناوچەکان و بازێر و ئوردوگاکان دا ئەدا بە دەستەوە.. ئەمانەش هەموی زەمینەی لەباری بەرزکردنەوەی رادەی چالاکی و وەشاندنی دەستی کاریگەریان لە دوژمن خۆش ئەکرد. بەلام لە هەمان کات دا خەریک بوونی هێزی پێشمەرگەش بە شەڕی ناوخۆ و ناکۆکی دروستکراوی لاوەکیەوە، پەکی هێزەکانی پێشمەرگەی ئەخست بۆ قۆستنەوەی ئەم هەلە و بە کەم خستنی هەموو وزە و توانای دژی ڕژێم و هێزە داگیرکەرەکانی لە کوردستان دا.

تەرخانکردنی هەمو تەقەلا و توانای هێزی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی یەکێتیی نیشتمانی لە مەیدانی چەکدار، سیاسی، ئیعلامی.. دا بۆ ئەنجامدانی فرمانی سەرەکی لە بەگژاچوونی ڕژێم دا، لە هەلومەرجی ئەوسای کوردستان دا کە هۆکانی شەڕی لایەلا و تەقینەوەی ناکۆکی لاوەکی لە کایەدا بو، پێویستی بە چوارچێوەیەکی گشتی جولان و بزوتن بو لە سەر ئاستی کوردستان، عیراق و، ناوچەکە، بۆ کۆکردنەوەی هەمو هێز و تواناکان دژی ڕژێم، یا هیچ نەبی خاوکردنەوەی گرژی نێوانیان، بۆ ئەوەی لە باتی ئەوەی بە یەکتریەوە خەریک بن هەر یەکەیان لە تۆزلی خۆیەوە بە دوژمنەوە خەریک بی.

*

هەلگیرسانی جەنگی عیراق - ئێران دۆخێکی وەهای دروست کرد کە دەولەتەکانی عیراق و ئێران، وە هێزەکانی دژی عیراق و هێزەکانی دژی ئێران، هێز و دەولەتانی ناوچەکە تێکرا کەوتنە جولان و وەرگرتنی هەلوێست و، ناچاری کردن ڕیزبونێکی نوێ هەلبژێرن لە دۆستایەتی، دوژمایەتی، هاوکاری، نۆکەرایەتی، بیلایەنی..

لە لایەکەوە - دەولەتی عیراق و دەولەتی ئێران هەریەکەیان هەولی ئەدا بۆ ئەوەی سود لە خەباتی کورد وەربگری لە ململانی سپاییەکەی دا وەکو بەشێک لەو جەنگەی دژی ئەوی تر ئەیکرد، وە هەر یەکەیان بە پێ ی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆی، هەولی ئەدا دەس بخاتە ناو هێزە سیاسی و تەنانەت هێزە عەشایەری و دینیەکانی کوردیشەوە، وە لە روی سپایی و سیاسیەوە کەلک لە جولانەوەی کورد وەربگری بۆ قورسکردنی تای تەرازوی هێزەکانی خۆی لە شەڕدا.

لە لایەکی تریشەوە - حیزب و هێزەکانی کوردستان، ئەوانیش هەر یەکەیان بە پێ ی بۆچون و تێگەیشتنی خۆی، هەر یەکە لە لای خۆیەوە کەوتە وەرگرتنی هەلوێست و هەولدان بۆ وەرگرتنی کەلک لە تەقینەوەی ناکۆکییەکانی بەینی عیراق و ئێران و گەیشتنی بەرپەری توندوتیژی واتە پلەی جەنگ، چ بە دروستکردن یا بەهێزکردنی پەیوەندی لە گەل ئێران و چ بە دروستکردنی (محور) لە گەل هێزەکانی تردا دژی ڕژێمی عیراق.

بێگومان جەمەرجەول و هەولدانی هیچ کام لەو لایەنانەش، بە کارێکی سەیر و نائاسایی دانانری، بەلکو لە هەلومەرجێکی وەهادا شتێکی ئاساییە و چاوەڕوانکراوە.

حشیع و حسک و قم کە لە هێزەکانی کوردستانی عیراقن و ڕێگەی ململانی ی

چەکداریان گرتوە دژی رژێمی عێراق.. هەر یەکەیان بە جۆرێک و بە شێوەیەک
هەڵوێستی خۆی دیاری کرد لە جەنگی عێراق - تەهران، وە هەر یەکەیان بە جۆرێک
هەڵوێستەکەی خۆی هەم بە داودەزگا رەسمییەکانی ئێران راگەیاند و دایە دەزگاکانی
راگەیاندنی تەهرانی (رادیو، تەلەفزیون، رۆژنامە)، وە هەم لە بەیان و بڵاوکراوەکانی خۆیان
دا چەند بارەیان کردەوە. ئەگەرچی ئەمانە بە جیا هەڵوێستی خۆیان دەربڕی بو، بەڵام
ناوەرۆکی هەڵوێستی هەر ٣ لاکەیان چەن حەرکەیەکی لە یەکچوی تیا ئەخوێنرایەوە کە
بریتی بون لە:

أ. دەربڕینی نارەزایی توندوتیژ لە هەڵگیرساندنی شەڕ.
ب. توندکردنی مەسئولیەتی هەڵگیرساندنی شەڕەکە لە ملی عێراق.
ج. پشتیوانیکردنی تەواو لە حکومەتی ئێران دژی حکومەتی عێراق.

هێزەکانی ئێمە یەکێک بو لەو هێزانەی ئەتوانێ لە هەمو لایەک زیاتر سود لە
ناکۆکی ئێران - عێراق و جەنگەکەی بەینیان وەربگرێ، بە تایبەتی چونکە لە چاو
هێزەکانی تردا، ئەم گەورەترین هێزی شەڕکەر بو دژی عێراق لە سەر ئەرزی کوردستان.
جگە لەمەش هێز و رێکخراوەکانی ئێمە و جەماوەری خەڵک.. لە ماوەی چەن ساڵ شەڕی
نابەرابەر و خەباتی سەخت و دژواردا ئازارێکی زۆریان لە دەس حکومەتی عێراق و دەزگا
دامرکێنەرەوەکانی و هێزە داگیرکەرەکانی چەشت بو، کە لە هی ئەوانیتر زۆرتر بو. ئەمەش
هەمو جۆرە هەوڵدان و هاوکارییەکی حەلال ئەکرد دژی رژێمی عێراق بۆ «هەق» لێ کردنەوە
و «هەق» لێ سەندنی. لە مانەش هەموی گرنگتر: ئەو کاتە چەندین بەرژەوەندی و قازانجی
گرنگ و کاریگەری لە ناو ئێران و لە بەر دەسەڵاتی ئێرانییەکان دا بو، بە تایبەتی
وجبەیەکی گەورەی چەک، کە لە وڵاتێکی دۆستەوە، بنک لە سەر پەیمان و بەڵێنی
ئێرانییەکان، گواستبویەوە ناو ئێران بۆ ئەوەی لەوێوە بیگەیەنێتە کوردستانی عێراق.. لە
گەڵ ئەمانەش دا هەمو، ئێمە ئامادە نەبوین لەو هەلومەرجەدا بە پێچەوانەی هەڵسەنگاندن و
بۆچونەکانی خۆمانەوە هەلپەرستانە بجولێینەوە، یان هیچ مەرجێکی ئێرانییەکان قبوڵ
بکەین کە لە گەڵ سەرەتاکانی خۆمان یا قازانج و دەسکەوتە بنچینەییەکانی نەتەوەی کوردا
نەگونجێ.

هەر لەم روانگەیەوە هەم (عەرض) ی ئێرانی و مەرجەکانی ئەوانمان دایەوە دواوە و
پشتیوانیمان لە حکومەتی ئێران نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست، لەو شەڕەدا دژی
عێراق. هەم (عەرض) عێراقی و مەرجەکانی ئەوانیشمان رەت کردەوە و پشتیوانیمان لە
حکومەتی عێراق نەکرد، بەو جۆرەی ئەوان ئەیانویست لەو شەڕەدا دژی ئێران. بەڵکو لامان
وابو کە ئەبێ ئەو هەلە مێژوییە بقۆزرێتەوە و شەڕ توند بکرێ، نەک لە گێژاوی (مساومە)
ی سوک و پروپوچ و کاتی دا لە گەڵ دەوڵەتی ئێران یان لە گەڵ دەوڵەتی عێراق دا بزر
بکرێ و لە دەس بدرێ و، گەلی کورد بهاوێژرێتە داوی فرۆفێڵی تاکتیکی یەکێکیانەوە و
لە ئەنجام دا ببێتە قوربانیەکی سەربەراوی رێککەوتنەوەی ئەوان. وە ئەگەر (مساومە)ش
هەر پێویست بێ، ئەوا ئەبێ لە گەڵ هێزە ناکۆک و جیاوازەکانی کوردا بکرێ نەک لە گەڵ
داگیرکەرانی کوردستان. (کۆمەڵە، شوباتی ١٩٨٢)

*

## ئەنوەر حەسەن و قازان

ئەنوەر حەسەن گەنجێکی هەڵکەوتوی کەرکوک بو. کە دوای ئاشبەتاڵ گیرا خوێندکاری کلیەی هندسە بو لە بەغداد. ئەویش وەکو هاورێکانی حوکم درا و لە زیندانی ئەبو غرێب دا مایەوە تا لە عەفوی ٧٨ دا بەر بو. هەر ئەو کاتە هاتە ریزی پێشمەرگەوە. لە گەڵ ٩ کادری تر نێردران بۆ لوبنان بۆ مەشقی جەنگی دوای گەڕانەوەی کرا بە فەرماندەی هەرێمی ٢ ی کەرکوک.

لە ڕۆژی ٥ ی مارتی ٨٢ دا هێزێکی تێکەڵاوی جەیش و جاش بە پشتیوانی هاڵیکۆپتەر لە گوندی قازان هەڵی کوتایە سەر ئەنوەر و هاورێکانی کە بە هەمویان ٢٢ کەس بون. لەم شەڕە نابەرامبەرەدا ١١ کەس کوژرا: ئەنوەر حەسەن. رزگار جەلال (هێمن) مامۆستا عەبدولخالق صالح (ئاسۆ). مامۆستا عەبدوللا صالح (چیا). سوارە شێخ صدیق. کامەران مام عومەر. کەریم چەمچەماڵی (گۆران). نوعمان عەبدی. حەمە شوکر بلوکینی. نەجمەدین فاتیح (شەروان). موەفەق ئەغلی.

زۆری ئەم پێشمەرگانە کەرکوکی بون. ڕاستیەکەی ئەمە زەرەرێکی گەورە بو. چونکە پاشەرۆژێکی باش لە ئەنوەر و هەندێ لە کادرەکانی تر ئەکرا.

•

## یەکێتیی نوسەرانی کوردستان

حەمەی حەمە باقی لە زیندان بەربوبو، بەلام نەیئەویست خۆی پیشانی کەس بدات. حەمە پێش گرتنی لە چەند کۆڕێکی ئەدەبی دا شیعری خوێند بووە یەکێکیان بە ناونیشانی «بروخێ بێدەنگی» شیعرەکانی رەمزی بون، بەلام دژی زولموزۆری بەعس. یەکێ لەو برادەرانەی، لە ڕاگەیاندنی یەکێتی کاری ئەکرد. لە گەڵ هەندێ لە ئەدیبەکانی سلێمانی نیوانی خۆش بو. هات بۆ لام باسی حەمە و هەڵویستی ئازایانەی سیاسی بۆ کردم، داوای لی کردم نامەیەکی بۆ بنوسم. ئیمە پێشتر ئاشناییمان نەبو. نامەیەکم بۆ نوسی. برادەرەکە بۆی نارد و دوایتر خۆی بە نهێنی چووە بۆ سلێمانی. چەند نامەیەکم پی دا نارد بۆ چەند کەسێکی تریش. حەمە بڕیاری دابو بێتە شاخ و بێ بە پێشمەرگە. لە شۆرشی ئەیلول دا ماوەیەک لێپرسراوی ناوچە بو لە هێزی رزگاری.

حەمە هاتە دەرەوە قسە و باسی سیاسی و ئەدەبی زۆرمان کرد. بە لایەوە چاک بو لە گەڵ ئەدیبەکانی کورد لە ناو شارەکان دا پەیوەندی دۆستانە دابمەزرێنین. لە سەر داوای ئەو، مامجەلال و من، چەندین نامەمان نوسی بۆ زۆری ئەدیبە کوردەکان لە سلێمانی، هەولێر، بەغداد.. خۆی نامەکانی بۆ بردن. ئەمە کارێکی باشی تی کردن. کە هاتەوە بیری دامەزراندنی یەکێتی نوسەرانی لە لا گەڵاڵە ببو بە تایبەتی بەعس بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی نوسەرانی کوردی دابو.

تاقمی ئەدیب و نوسەر رویان کرد بوە شاخ، بەلام بە سەر حیزبەکان دا دابەش ببون، لە مانەش هەندێکیان خۆیان خۆیانیان بە ئەدیب و نوسەر ئەزانی، ئەگینا بە پێوانەی ئەدەبی بە «کۆلکە ئەدیب» یا بە «کۆلکە نوسەر» یش دائەنران.

هەڵوێستی یەکێتی لە یەکێتیی نوسەران بە مجۆرە بو: یەکێتیەکەیان دور بێ لە دەستێوەردانی حیزبەکان و، «نان و ئازادی» و پێویستیەکانی چاپ و بلاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان بۆ دابین بکرێ.

هەندێ لە نووسەرەکان چەند کۆبوونەوەیەکیان کرد و، بە هاودەنگی لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە نووسەرانی شار، «یەکێتی نووسەرانی کوردستان»یان پێک هێنا و، گۆڤاری «نووسەری کوردستان»یان بڵاو کردەوە.

لەم گۆڤارەدا بەرهەمی ئەدەبیی نووسەرانی شاخ و چەندین کەس لە نووسەرانی ناسراوی شار، وەکو: شێرکۆ بێکەس، حسێن عارف، مستەفا ساڵح کەریم، رەئوف بێگەرد، دلشاد مەریوانی، تایەر ساڵح سەعید.. لە ژێر ناوی نهێنی دا، بڵاو کرایەوە.

هەروەها چەندین کۆمەڵەی شیعر، لەوانە: کۆمەڵە شیعری حەمەی حەمە باقی، شێرکۆ بێکەس، حسێن مەولود، جەمیل رەنجبەر و، کۆمەڵە چیرۆک و بابەتی تر لە کتێبی سەربەخۆدا بڵاو کرایەوە.

*

## هەوڵێکی سەرنەکەوتو لە گەڵ حسک

حەمەی حەمە باقی کە هات بۆ شاخ، هەوڵی ئەدا بە هاوکاریی لە گەڵ نووسەرانی کە دابەش بوبوون بە سەر لایەنەکانی جودا، یەکێتیی نووسەرانی کوردستان گەشە پێ بدا. لە هەمان کات دا لەو ڕێگایەوە زەمینەی جۆرێ لە ئاشتبوونەوە خۆش بکا. حەمە و زۆر کەسی تریش زۆر جار باسی هەوڵی ئاشتبوونەوەیان لە گەڵ ئەکردین و، ئامادەیی خۆیان دەرئەبڕی بۆ ناوبژی و هێنان و بردنی نامە و پەیام.

حەمە لە گەڵ حاجی برایم دۆستایەتی کۆنیان هەبو. بە هەوڵی ئەو دانیشتنێکی لە شەینی ڕێک خست لە یەکێتی عومەری حاجی عەبدوللا و من و، لە حسیک تایەری عەلی والی و حاجی بەشدار بون.

پاش هەندێ قسە و باس هاتینە سەر باسەکان. حاجی لە میانەی قسەدا وتی: «مامجەلال برا گەورەی ئێمەشە..» من زۆ قسەکەم پێ بڕی، وتم: «کاک حاجی با واز لەم جۆرە موجامەلانە بهێنین. نە ئێوە مامجەلال بە براگەورەی خۆتان ئەزانن و، نە ئەویش خۆی بە براگەورەی ئێوە ئەزانێ. ئەوە چەند ساڵە ئێوە قسەی پێ ئەڵێن. چاکتر وایە بە ڕاشکاوی باسی هۆی ناکۆکییەکان بکەین.»

هەردو لامان ئارەزوییەکی قووڵمان بۆ ئاشتبوونەوە و ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکانمان دەربڕی. لە بەر ئەوەی لە دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەکەدا لە گەڵ ئەمان پێکەوە بوین و، ساڵانێکمان لە ناو یەکێتی دا پێکەوە بە سەر برد بو، لە ناو ڕێکخراوەکانی تردا ئەمانمان لە هەموویان بە نزیکتر دائەنا لە خۆمان. ئێمە باری سەرەکیی خۆمان بۆ ڕوون کردنەوە. زۆر لە مێژ بو ئێمە لامان وابو هۆکانی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان ڕێکخراوە کوردییەکان: فرە - لەشکری و، حوکمڕانی و، پارەیە.. پێشنیارمان بۆ کردن: هەر ڕێکخراوە لە کاروباری ئایدیۆلۆجی، سیاسی، ڕێکخراوەیی دا سەربەخۆ بێ، بەڵام داوودەزگاکانی جوڵانەوەکە، بە تایبەتی پێشمەرگە و ڕاگەیاندن و دەسکەوتی دارایی، وەکو نموونەیەک بۆ دەسەڵاتی پاشەڕۆژی کورد، یەک بخەین.

لەو کاتەدا توانای یەکێتی زۆر زیاتر بو لە هی ئەوان. ژمارەی پێشمەرگەی زۆرتر و، سەرچاوەی دەسکەوتی دارایی فراوانتر و، دەزگای ڕاگەیاندنی: ڕادیو و چاپخانە، گەورەتر بو. لە هەمو ئەو شتانەدا ئەبوین بە هاوبەش. ئەوان وەکو حیزب قازانجێکی زۆرتریان ئەکرد. بۆ ئەوەی دڵنیایان بکەین کە ئەوە بۆ هەڵلوشینی ئەوان نیە، پێشنیارمان

کرد فەرماندەی گشتی پێشمەرگە و زۆری فەرماندەی هەرێمەکان لەوان بێ، کەسێکی وەکو کاک تاهیر دابنێین، چ ڕیوشوێنێکی تریش بە (ضمان) ئەزانن بۆ دڵنیایی ئەوان ئێمە ئامادەین بیکەین.

نوێنەرەکانی حسک بیروکەیان لا پەسند بوو، داوایان لێ کردین بیروڕاکانی خۆمانیان بۆ بکەین بە پرۆژەیەکی نوسراو بۆ لێکۆڵینەوەی لە مەکتەبی سیاسی حیزب دا بۆیان بنێرین.

*

ئێمەش لە ڕۆژی ۹ ی مارتی ۱۹۸۲ دا پێشنیارەکانی خۆمان لەم پرۆژەیەدا بۆ ناردن:

*

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دوای هەڵسەنگاندنی باری سیاسی و هەلومەرجی کوردستان و عیراق و بە ڕەچاو کردنی دەسکەوتەکانی بنەڕەتیی خەلکی کوردستان و عیراق و دۆخی شۆڕشە عیراقییە دیموکراتییەکەمان بە چاکی زانی بەم یادداشتە هەوڵ و تەقەلای پاشکردنەوەی پەیوەندییەکانی هەردولامان و پێکهێنانی هاوخەباتییەکی چەسپاو لە نێوانمان دا بهێننە ئەنجام، پێویست، قۆناغی دارشتنی پەیوەندی و هاوخەباتیمان لە سەر چەند سەرەتایەکی چەسپاو کە بتوانێ تا سەر بێت و بە ڕاستی و بە جیددی برایەتی و هاوخەباتی نێوانمان پێک بێت و بچەسپێت.

بۆیە بە پێویستمان زانی پێشنیارەکانمان بۆ دوو قۆناغ کە پێکەوە بەستراوە بخەینە بەرچاوتان، بە هیوای ئەوەی ئێوەش بە چاوی پەرۆش و کەسانی هەست کردن بە بەرپرسیارێتی نیشتمانییەوە لێیان بڕوانن و لە ڕەئی و پێشنیارەکانی خۆتان بە نوسین ئاگادارمان بکەنەوە تا لە کۆبوونەوەی داهاتوی نوێنەرانی دەسەڵاتداری هەردولا گفتوگۆیان لە سەر بکرێت.

قۆناغی یەکەم:

یەک و حسک بەڵێن ئەدەن بە یەکتری کە:

۱. هیچ کامیان لە گەڵ حیزب و لایەنێکی دیکەدا هاوکاری سیاسی و ئیعلامی و سەربازی نەکات دژی ئەوی دیکەیان بێت.

۲. هیچ کامیان لە سەر حسابی ئەوی دیکەیان، یان بۆ دژایەتی سیاسی و سەربازی و ئیعلامی ئەوی دیکەیان داخلی هیچ جەبهە یان لیژنەی تەنسیق یا ڕێککەوتنێکی دوقولی نەبن لە گەڵ هیچ حیزب و لایەنێکی دیکە.

۳. هەردولا ئازادی کاری سیاسی و ئیعلامی و سەربازی دژی ڕژێم و داوودەزگاکانی و، ئازادی گەشەکردنی تەنزیمی و پێشمەرگەیی، بەو مەرجەی بۆ زەرەردان نەبێ لەوی دیکە، لە هەمو شوێنەکانی کوردستان بۆ یەکتری بسەلمێنن.

٤. هەردولا نابێ پەنا بەرنە بەر ڕێگەی هێرشی چەکدار یا هێرشی ئیعلامی دژی ئەوی دیکەیان بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکی و گیروگرفتەکانی بەینی هەردولا.

٥. هەردولا پەیڕەوی ڕێگەی سیاسی و گفتوگۆی دیموکراتی دەکەن بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفت و ناکۆکییەکانی بەینی هەردولایان.

٦. هەردولا حورمەتی بیروباوەر و ڕێکخستنی ڕێبازی یەکتری بگرن و، ئەندام و

پێشمەرگە و دەستەکانی خۆیان بە گیانی دۆستایەتی و هاوکاری و پەیوەستی بە دەنگەوەچوونی یەکتری ئامۆژگاری بکەن.

٧. هەردولا هێزەکانی پێشمەرگە و ڕێکخراوەکانی خۆیان هان ئەدەن بۆ تەرکیز کردنە سەر ڕژێم و داودەزگاکانی و بۆ کاری هاوبەش و بۆ داڕانانی نەخشە و پلانی هاوبەش.

٨. هەردولا هەول ئەدەن هەلویستە گشتیەکانیان لە ڕووداوە گرنگەکانی دێنە پێشەوە بە ڕێگەی گفتوگۆ یەک بخەن، لە کاتی پەلاماردانی لایەکیان دا لە لایەن لایەکی دیکەوە بە ناڕەوا، لایەکەی دیکە داکۆکی لی ئەکات.

٩. هەمو ئەو بریار و ئامۆژگاریانەی پێچەوانەی ئەم ڕێککەوتنەن و پێشتر لە سەرکردایەتی و دەزگاکانی هەر کام لەم دولایەنەوە بە نهێنی یا بە ئاشکرا دەرچوە، هەلئەوەشێتەوە ئیتر کاریان پێ ناکرێت.

قۆناغی دوەم:

١. یەک و حسکع پەیمان ئەدەن کە ئازادی ژیانی حیزبایەتی بۆ خۆیان و هەمو حیزب و ڕێکخراوە سیاسی و دیموکراتیەکانی کوردستان ئەسەلمێنن و، لە سنوری دەسەلاتی خۆیان دا ئەیپارێزن.

٢. یەک و حسکع پەیمان ئەدەن کە هەولی خۆیان یەک بخەن بۆ ئامادەکردنی هەلومەرجی یەکخستنی هەمو داودەزگا گرنگەکانی شۆڕش لە ڕوی سەرکردایەتی و بەرنامەی گشتی و هێزە چەکدارەکانی و شێوەی کارکردنی و بەڕێوەبردنی ناوچەکانەوە بە:

یەکەم: یەکخستنی هێزی پێشمەرگە لە ڕوی سەرکردایەتی و شێوەی ڕێکخستن و شێوەی شەرکردنیەوە، بە جۆرێک ببێتە سوپای یەکگرتوی هەمو گەلی کورد لە کوردستانی عێراق دا کە هەمو حیزب و ڕێکخراوەکان بە جیاوازی بیروباوەڕیان بەشداری تی دا بکەن.

دوەم: پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتی یەکگرتو لە ناوچەکان دا کە نوێنەری دەسەلاتی کۆمەلانی خەلک و شۆڕش بی لە ناوچەکان دا بۆ ڕێکخستنی پەیوەندیەکانی نێوان دانیشتوان.

سێیەم: یەکخستنی دەرامەتی مالی، چ ئەوەی لە ناوەوە دەس ئەکەوی و چ ئەوەی بە یارمەتی لە دۆستەکانی دەرەوە وەرئەگیری، بۆ سەرف کردنەوەی بە سەر داودەزگاکانی شۆڕش دا.

چوارەم: یەکخستنی سیاسەتی ئیعلامی شۆڕش و توانای لایەنە بەشدارەکانی لە داودەزگای ئیعلامی یەکگرتودا لە ناوەوە و دەرەوە.

*

مەیدانی ئازاد

لە کاتێک دا حشع لە ژێر سایەی بەعس دا سەرکردایەتیی حیزبی بەعسی لە ژیانی سیاسی عێراق دا لە حوکمڕانی و لە جەبهەدا سەلماند بو، ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی خۆی هەلوەشاند بووەوە، هیچ جۆرە چالاکیەکی لە ناو هێزە چەکدارەکانی عێراق دا نەنواند، لە کوردستان بە پێچەوانەوە ئەجولایەوە. ئامادە نەبو دەس لە بچوکترین دەسکەوتی حیزبی خۆی هەلبگری. ئەیویست ئەوەی لە لای بەعس دۆڕاند بوی لێرە مایەکەی دەر بهێنێتەوە. لە بەرامبەر ئەم بیرەی ئیمەدا: بیری یەکخستنی داودەزگاکانی شۆڕش، یەکخستنی پێشمەرگە

و دارایی و راگەیاندن. هەشتی لەوەتی گوێزایەوە بۆ شاخ یەرێکی پێچەوانەی هێنا بوە
کایە: کوردستان مەیدانێکی ئازاد بێ بۆ چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی هەمو حیزبەکان
بە بێ جیاوازی بەرپەرەو ریان. حیزبەکانی تریش ئەم بالزۆرەیەیان دوبارە ئەکردەوە.
مەبەستیان لە مەیدانە ئازادەکە، ناوچەکانی چالاکی یەکێتی بو، ئەگینا هیچ
لایەکیان باسی بادینانیان نەئەکرد کە پارتی پاوانی کرد بو بە تەنیا بۆ خۆی.
مەبەستیشیان لە چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی، حوکمرانی ناوچەکان و،
کۆکردنەوەی گومرگ و باج و سەرانە و، گرتن و بەردانی خەڵک بو، نەک شەڕ کردن لە
گەڵ هێزە چەکدارەکانی بەعس. لە ناو ئەو هێزانەدا زۆر کەس هەبون، دەیان ساڵ چەکیان بە
شانەوە بو، بەڵام تەنیا یەک جار توشی شەڕ نەبوبون لە گەڵ هێزەکانی حکومەت.
خۆپەرستی لە ناو سەرانی رێکخراوە کوردییەکان دا زۆر قوڵ بو، زۆربەیان ئەوەیان
پێ گەورەتر و خۆشتر بو، کە سەرکردەی حیزبێکی ۱۰ کەسی بێ، نەک ئەندامی
سەرکردایەتی یەکگرتوی جولانەوەیەکی ۱۰ هەزار کەسی. بۆ پاساودانی ئەمەش زۆرجار
«تەنگوچەڵەمەی باوەڕ» یان ئەکرد بە بیانوی یەک نەگرتن و، یەک نەخستنی
داوودەزگاکانی جولانەوەکە. تەنگوچەڵەمەی بێ باوەڕیان ئەوەندە قوڵ کردبو، هەر لایەک
هەمو قسە و پرۆژە و کرداری لاکەی تری، ئەگەر بە نیازی باشیش بوایە، بە جورێکی تر
لێک ئەدایەوە. لای وابو ئەو ماستە بێ مو نییە و، لە بن ئەو شتە باشەدا پیلانێک یا
نیازێکی خراپ و دوژمنانە حەشار دراوە.
هەر بۆ ئەو بێ باوەڕییە دروستکراوە، لێرەدا دو نمونە ئەهێنمەوە:
- ملازم محەممەد شەوقی، یەکێ لە سەرانی پاسۆک، لە هاورێکانی بزر بو. سەرانی
پاسۆک گومانیان لە یەکێتی بو لە پەناوە لە ناویان برد بێ. چەندی پاکانەمان بۆ ئەکردن
نەیانئەویست باوەڕ بکەن. تا خۆیان روداوەکەیان بۆ رون بوەوە. لە کاتی گەڕانەوەی دا لە
ناوچەی سلێمانی، بە ناو ئێران دا تێ پەڕی بو. لەو کاتەدا شەڕ لە کوردستانی ئێران گەرم
بو. ئەو ناوچەیەی ئەوی لێ تێ پەڕی بو، کەوت بوە بەر هێرشی هالیکۆپتەری ئێرانی و،
لەوێ کوژرا بو.
- عەلی هەژار و کوردو گەلالی، دو کادری سەرکردایەتی حسک، لە ناو شار بێ
سەر و شوێن بزر بون. لێپرسراوەکانی حسک ماوەی چەند ساڵ یەکێتییان تاوانبار ئەکرد بە
فراندنیان. چەندی پاکانەمان بۆ ئەکردن نەیانئەویست باوەڕ بکەن تا خۆیان دوای راپەڕین لە
ناو فایلەکانی «ئەمن» ی هەولێردا، چارەنوسی هاورێکانیان بۆ رون بوەوە.
سەرانی حسک ئەم پرۆژەیەیان وەکو پێشبینیمان کرد بو وا لێک دایەوە کە ئەوە
بۆ هەڵلوشینی ئەوان و، تێکدانی ریزەکانی جودە. لە چەند دانیشتنێک دا لە گەڵ سەرانی
پاسۆک، پێشنیارێکی لەو بابەتەمان بۆ ئەوانیش کرد، ئەوانیش قبوڵیان نەبو. بە دوای
ئەوانیش دا شێخ قادری سۆتکە «لەشکری ئیسلامی کورد» و سامی سنجاری «پارتی
دیموکراتی گەلی کوردستان» و شێخ محەممەد خالیدی بارزانی «حیزبوڵلا» یان دامەزراند.
کوردەکانی موکریان قسەیەکیان هەیە ئەڵێ: «شەندە لە مەندە کەمتر نییە!» ئەم
حیزب و رێکخراوانە هیچیان خۆی لەوی تر بە بچوکتر نەئەزانی. هەمو ئەمانە سور بون لە
سەر ئەوەی: هێزی چەکداری تایبەتی خۆیان، دەزگای راگەیاندنی خۆیان، پەیوەندی تایبەتی
خۆیان لە گەڵ دەوڵەتان، دەزگای تایبەتی پارە کۆکردنەوە و پارەسەندنی خۆیان، دادگا و

زینداني تایبەتي خۆیان هەبێ.. ئەوانەیان بە نیشانەی سەربەخۆیی حیزب و، گەورەیی سەرکردە و سەرکردەکانیان ئەزانی.

ساڵی ۱۹۸۲ سەرەرای هێزەکانی یەکێتی، ئەو هەمو لەشکرە بێ دیسپلینەی: پدک، حشع، حسک، لاک، گەل، حیزبوڵلا.. لە کوردستان دا تەراتێنیان ئەکرد. بە تارەزوی خۆیان پارەیان لە خەڵک ئەسەندو راورووتیان ئەکرد، بێگاریان بە لادێیی ئەکرد، خەڵکیان ئەترساند و ئەکوشت. لەیان ئەبو بە جاشی حکومەت و ئەهاتنەوە ئەبونەوە بە پێشمەرگە، دالدەی گومانلێکراو و نۆکەرانی بەعسیان ئەدا. حشع چونکە خۆی حیزبێکی پچوک بو، بە خۆشیەوە سەیری پارچە پارچە بونی جوڵانەوەی کوردی ئەکرد و، حەزی ئەکرد سەدان وردە حیزب و رێکخراو لە سەر ئەرزی کوردستان دا دروست بێ، بەڵکو ئەو خۆی بێ بە گەورەترینیان.

*

## خۆپیشاندانی شارەکان

ساڵی ٧٤ ژمارەیەکی زۆری مامۆستا و خوێندکارەکانی زانکۆی سلێمانی چونە ریزی شۆڕشەوە. سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاری دا زانکۆی سلێمانی لە قەڵادزێ دابمەزرێنێتەوە. مامۆستا و خوێندکارەکانی لەوێ کۆ کردەوە. هێزی ئاسمانیی عیراق لە رۆژی ٢٤ ی نیسانی ٧٤ دا شاری قەڵادزەی بۆردومان کرد. نزیکەی ۲۰۰ کەس کوژران. هەندێکیان خوێندکار بون. لە ناو خوێندکارەکان دا ۳ ئەندامی کۆمەڵە کوژران.

لە بەر ئەوەی تا ئەو کاتە بە کۆمەڵ لە یەک رۆژدا ئەوەندە نەکوژرا بو، سەرکردایەتی شۆرش بڕیاری دا ئەم رۆژە بکا بە «رۆژی شەهید».

بۆ زیندوکردنەوەی ئەم یادە دانیشتوانی قەڵادزە بە هاندانی رێکخراوەکانی یەکێتی لە بەهاری ٨٢ دا کەوتنە خۆسازدان. رۆژی ٢٤ ی نیسان ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی قەڵادزە لە سەرقەبران کۆبونەوە و، چەند لافیتەیەکیان بەرز کردەوە و کەوتنە رێپێوان بەرەو ناوشار. خۆپیشاندانەکە گەورە بو. هێزەکانی بەعس تەقەیان لێ کردن دو ئافرەت کوژرا: سنەوبەر مەحمود، مامۆستای سەرەتایی. ئامینە سور، کەیبانو. ٧٤ کور و ١١ کچ گیران. دانیشتوانی شار دوکان و بازاڕیان داخست و دائیرەکان مانیان گرت. پشێوی و نائارامی تا ۳۰ ی نیسانی خایاند.

رادیۆکەی یەکێتی رێپۆرتاجێکی دەنگداری لە سەر ئەم روداوە بڵاو کردەوە. هاوڕێیانی رێکخستن روداوەکەیان بە رێکوپێکی تۆمار کرد بو، وێنەی زۆریشیان لێ گرت بو. رادیۆکەمان کەوتە هاندانی خەڵک بۆ خۆپیشاندان دژی بەعس. داوا لە هەمو رێکخراوە نهێنییەکانی یەکێتی بش کرا خۆیان ساز بدەن بۆ خەبات و کاری جەماوەری.

کوژرانی ئەو دو ئافرەتە ئاوی بە ئاگردا نەکرد، بەڵکو زیاتر خەڵکی وروژاند. هەلومەرجی ناو شاری قەڵادزە ئاڵوزا بو. لە چلەی ئەو دو شەهیدەدا خۆپیشاندانێکی گەورەتر ساز کرا. ئەم جارەش هێزەکانی بەعس لەیان دا بەڵام پێیان سەرکەوت نەکرا و، نائارامی درێژەی کێشا و تەنییەوە.

بۆ هاودەنگی لە گەڵ خۆپیشاندەرانی قەڵادزێ ئوردوگاکان راپەڕین. جادەکانیان بە تایەی سوتاو داتەنخست و، کۆبونەوەی فراوان ئەکرا. هوتافیان بە ژیانی پێشمەرگە و روخانی بەعس ئەکێشا. رۆژانە رێپۆرتاجی دەنگدار و تۆمارکراوی ئەم روداوانە ئەگەیشتە

دەزگای ڕاگەیاندن و، ڕادیۆکەیش بۆ هاندانی زیاتری خەلک بە لێدوانەوە بلاوی ئەکردەوە. لە زۆر جێگا ڕادیۆکەی یەکێتییان ئەخستە سەر مایکرۆفۆنی مزگەوتەکان. ڕێکخراوەکانی سلێمانی کۆسرکاری شەدەیانیان لە گۆڕستانی شەهیدان سازدا و، بە ڕێپێوان لە گردەکەوە بەرەو ناوشار بە ڕێ کەوتن. خۆپیشاندانەکە گەورە بو. هێزەکانی بەعس تەقەیان لێ کردن و چەند کەسێکیان کوشت. ناو کۆلانەکانی سلێمانی بوبو بە جێگەی کۆبونەوەو خۆپیشاندانی بەردەوام. بە دەس پێشکەری ڕێکخراوەکانی هەولێر، خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست. لەوێش چەند کەسێ گیران و چەند کەسێ کوژران. بۆ پشتیوانی لە خۆپیشاندانی شار و ئوردوگاکان، جگە لەوەی بە ڕادیۆ ئەکرا، پێشمەرگەش ڕادەی چالاکیەکانی لە دژی هێزەکانی بەعس زۆر زیاد کرد و، چەندین جار چونە ناو سلێمانی و هەولێرەوە.

نائارامی سەرانسەری ناوچەکانی سۆرانی گرت بوەوە. بەردەوام لە شار و ئوردوگاکان دا خۆپیشاندان و کۆبونەوە بۆ دەربڕینی نارەزایی لە ڕژێم هەبو. بەلام ئەمە لە ناوچەیەکی دیاریکراودا قەتیس ما بو:

– ئیمە نەمانتوانی بادینان بجولێنین. پارتی و حشع یش کارێکیان نەکرد بۆ جولاندنی. لەو کاتەدا سەرکردایەتی پارتی لە ڕازان بون لە نزیک ورمێ ناگایان لەم رووداوانە نەبو، مەگەر لە ڕێگای ڕادیۆی لایەنەکانی ترەوە.

– لە بەغداد خوێندکارانی کورد لە چەند زانستگایەک کەوتنە مانگرتن و خۆپیشاندان، بەلام خوێندکارانی عەرەب بە دەنگیانەوە نەهاتن.

کاربەدەستانی بەعس لە زۆر جێگا لە دۆستەکانی خۆیان و لە پیاوماقولانی ناوچەکەیان ئەپرسی ئەمانە چییان ئەوێ؟

هەر لە سەرەتاوە بۆ ئەوەی باری ئەم کارە شۆرشگێرانەیە لە توانای خۆی زیاتر قورس نەکەین و، بە تەدریج لە گەل گەورەبون و تەنینەوەی ڕاپەڕین دا دروشمەکانی بگۆڕین، ئەمان هێشت داواکاری زل و قەبە بکەن بە درشمی خۆپیشاندانەکان. داواکارییەکان بریتی بون لە:

– بەردانی گیراوە سیاسییەکان،

– گێڕانەوەی جوتیارەکان بۆ دێهاتەکانی خۆیان.

– نەمانی تیرور تۆقاندن لە شارەکان دا.

لایەنەکانی جود، بە تایبەتی حشع، لە ڕادیۆکەیان دا داوایان لە خەلک ئەکرد، تا ڕوخاندنی ڕژێم بەردەوام بن. بەلام خەلک بایەخێکیان بە قسەکانی ئەوان نەئەدا.

لەو کاتەدا باروودۆخی عێراق لە مەیدانی جەنگ دا باش نەبو. تەرازوی شەر بە قازانجی ئێران داشکا بو. عێراق بۆ دامرکاندنەوەی ئەم نارەزاییە هەندێ لەو داوایانەی جێبەجێ کرد:

– زۆری گیراوەکانی بەردا.

– چاوپۆشی لە دانیشتوانی هەندێ ناوچە کرد بگەڕێنەوە سەر گوندەکانی خۆیان،

– زەبروزەنگ لە ناو شارەکان دا لە جاران کەمتر بوەوە و، هەندێ لە جەللادەکانی لە بابەتی مولازم موحسینەکەی سلێمانییان گوێزایەوە.

ئیتر ئێمەش هەم ئامۆژگاری ڕێکخراوە نهێنیەکانمان کرد بە شێنەیی کۆتایی پێ

بەهێن و. لە رادیۆکەیشمان دا زمانی هاندانمان گۆڕی.
کاکەمین قادر، کە یەکێ بو لە هاندەرە چالاکەکانی خۆپیشاندانەکانی قەلادزە، هەر
ئەو کاتە وتارێکی درێژی لە سەر خۆپیشاندانی قەلادزە بە ناوی «زەریا» وە بۆ گۆڤاری
کۆمەلە نوسی.

*

یەکەمین جار بو کوردستان بەو جۆرە بشڵەقێ. دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم زۆر
بە توندی کەوتنە دامرکاندنەوەی. د. فاضیل بەڕاک ئەوسا بەرپرسی «ئەمن» بو
راپۆرتێکی درێژی لە سەر روداوەکان بۆ صەددام نوسیوە. صەددامیش بە خەتی خۆی
هەندێ پەراوێزی لێ نوسیوە. بە پێ ی ئەو راپۆرتە ژمارەی کوژراو و گیراوەکانی
خۆپیشاندانەکان بەمجۆرە بو:

سلێمانی ١١ کوژراو ٢٣ بریندار ١٣١ گیراو
کەرکوک ٦ کوژراو ٩٥ بریندار ٢١٠ گیراو
هەولێر ٧ کوژراو ٢٠ برینداو ٤١٠ گیراو

دهۆک خۆپیشاندانی تێ دا نەبوبو، لە بەر ئەوە قوربانیشیان نەبوە.

*

قاسملو و ناوبژی

لە بەهاری ٨٢ دا لەو کوبونەوانەدا کە د. قاسملو لە گەڵ سەرکردایەتی یەکێتی
ئەکرد، چەند جارێ باسی گفتوگۆی لە گەڵ بەعس ئەهێنایە پێشەوە. هەمان باسی لە گەڵ
سەرانی حشع کرد بو.
ئیمە لە ناوخۆمان دا لەم باسەمان کۆڵیبوەوە. مامجەلال هیچ باوەڕێکی بە بەعس و بە
گفتوگۆ نەبو لە گەڵی. بەلام ئیمە هەمومان لامان وابو: ئەگەر بەعس لایەنی کەمی
مافەکانی کورد بسەلمێنی، بۆچی لە گەڵی رێک نەکەوین، بە تایبەتی لەو هەلومەرجە
ئالۆزەدا کە ئەوسا جوڵانەوەی کوردی تێ کەوت بو؟
ئەو کاتە هەلومەرجی سیاسی رۆژهەلاتی ناوەراست گۆڕانێکی قوڵی بە سەردا هات

بو:
یەکێتی و، رێکخراوە کوردییەکانی تر لە عیراق لە شۆڕش دا بون.
حدکا و، رێکخراوە کوردییەکانی تر لە ئێران لە شۆڕش دا بون.
هەمو حیزب و رێکخراوە کوردییەکان لە تورکیا دژی خونتا و کودەتاکەی راوەستا
بون و، پێ کا کا خەریکی خۆ ئامادە کردن بو بۆ کاری چەکدار.
عیراق لە جەنگ دا بو دژی ئیران، نیشانەی بە لاداکەوتنی بە شەر یا بە رێگای
سیاسی لە ئاسۆدا دیار نەبو. بەلکو ئیران هێزەکانی خۆی رێک خست بوەوە، لە چەند
شوێن جەبهەی عیراقی شکاند بو.
سوریا لولەی نەوتی عیراقی راگرت بو، لە هەولێکی جیددی دا بو بۆ روخاندنی
عیراق و، عیراق سوریای بە هاوکاری ئیران و بە خائینی نەتەوەی عەرەب دائەنا.
حوکمی عەسکەری خونتا لە تورکیا، ئیران و سوریای بە دەستێوەردان لە کاروباری
ناوخۆی تاوانبار ئەکرد.
هەلومەرجێکی کوردی و ناوچەیی ئالۆز و تێکەل و پێکەل خولقا بو. روداوەکانی

ئێران و جەنگی عێراق - ئێران هۆی سەرەکی ئەم ئالوزانە بو. حکومەتی عێراق، ئەگەر پێویستایە ئەیتوانی رۆلێکی گەورە لە ناو جولانەوەی نەتەوەیی کوردا بە قازانجی خۆی بگێری و، هەمو جولانەوەی نەتەوەیی کورد، لە سەرانسەری رۆژهەلاتی ناوەراست دا، بکاتە پشتیوانی خۆی. عێراق ئەیتوانی یارمەتی شۆرشی کوردەکانی ئێران بدا و، یارمەتی رێکخراوە کوردییەکانی سوریا و، یارمەتی کوردەکانی تورکیاش بدا. جولانەوەی کورد لەم پارچانەدا جولانەوەی رەسەن بون، حیزبی سیاسی و داوودەزگای تا ئەندازەیەک پێشکەوتویان هەبو. ئەم هێزە کوردییانە ئەیانتوانی لە ناکوکی عەرەبی - ئێرانی و، لە ناکۆکی عەرەبی - تورکی دا، قولایییەکی ستراتیجی بۆ عێراق و عەرەب دروست بکەن. ئەویش تەنیا بەوە ئەکرا کە مافی نەتەوەیی کورد لە عێراق دا بسەلمێنی و، کورد لە دەزگای بریاردانی سیاسی عێراق دا بکا بە هاوبەش. لەسە ئەگەر هیچی دەس نەکەوتایە کوردی عێراقی ئەکرد بە پشتیوان و یارمەتیدەرێکی بەهێز لە ململانێ ی خۆی و ئێران دا.

*

گفتوگۆ، بەلکو پێوەندی روت، لە نێوان یەکێتی و بەعس دا، لە سەر یەکێتی زۆر ئەکەوت:

– هەمو هێزە کوردییەکانی نەیار و ناحەزی یەکێتی، ئەیانکرد بە-کەرەستەیەکی بە پێزی شەری پروپاگاندە بۆ شکاندنی یەکێتی.

– هەمو هێزە عێراقییەکانی موعارەزەی عێراقی، ئەیانکرد بە بەهانەی پەلاماردانی یەکێتی.

– ئێران ئەیکرد بە بیانو بۆ زیاتر دوژمنایەتی کردنی یەکێتی و، سوریا و لیبیا ئەیانکرد بە بیانو بۆ تەنگ هەلچنینی زورتر بە یەکێتی و، برینی ئەو یارمەتیە کەمەی ئەیان دایە.

لە بەرامبەر ئەم هەمو زیانە سیاسی و مەعنەوییەی یەکێتی دا بەعس چی بۆ ئەکرد و، چۆن زەرەرەکانی بۆ ئەبژارد؟

رەنگە یەکی لەو لایەنانەی بەعس، وەکو بیروباوەر و حیزب و وەکو سەرکردە و زەلام، لە هەمو لایەن و کەسێکی تر باشتر بناسی یەکێتی و سەرکردەکانی بی. ئاشنایی لە گەل بیروباوەری بەعس و، ئاسیاوی لە گەل هەندی لە سەرکردەکانی ئەگەرایەوە بۆ ماوەیەکی درێژ پێش ئەوەی حوکمی عێراق بگرنە دەس.

*

خواستەکانی یەکێتی

هەر لە سەرەتای دەسپێکردنەوەی شۆرشەوە حکومەت هەرچەن یەکێکی ئەنارد بۆ گفتوگۆ، ئەیپرسی: چیتان ئەوێ؟

هەلبەتە کاربەدەستانی حکومەتی عێراق و حیزبی بەعس ئەیانزانی کە سەرکردایەتی یەکێتی هیچ داواکارییەکی عەشیرەتی، یا شەخسی، یا تەنانەت حیزبایەتیشی نیە و، ئەیزانی کە داواکانی، بریتیە لە داواکانی گەلەکەمان و مافە نەتەوایەتی و دیموکراتیەکانی. ئەم جارەیان کە حکومەت لە رێگەی د. قاسملووە لە ئێمەی پرسی: چیتان ئەوێ؟ داواکانی خۆمان بۆ چارەسەرکردنی(هەمیشەیی، قۆناغی، جوزئی) کێشەی نەتەوایەتی گەلی کورد لە عێراق دا لە ٣ چوارچێوەدا دارشت:

یەکەمیان - ڕێککەوتنێکی گشتی و ڕیشەیی بۆ ئێستا و پاشەڕۆژ لە چوارچێوەی هاوپەیمانییەکی ستراتیجی دا کە خۆی ئەنوێنێ لە پێکهاتن و ڕێککەوتنی نەتەوەی کورد و نەتەوەی عەرەب لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا لە سەر بنچینەی دانانان بە مافی یەکتری دا لە ئازادی بڕیارداتی چارەنوسی خۆی دا، کورد وەکو نەتەوەیەکی دابەشکراو و چەوساوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا و، عەرەبیش وەکو نەتەوەیەکی دابەشکراو و چەوساوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا، هەر یەکەیان ئامانجی خۆی هەیە لە یەکگرتنەوە و ڕزگاری دا وە لە پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی دا، کە ئەتوانن پێکەوە پەیمانی هاوکاری ستراتیجی ببەستن بۆ دانانی ڕێوشوێنی ناوچەکە و جۆری پێکەوە ژیانیان.

بەم پێ یە بەعس ئەبێ لە مەیدانی سەلماندنی مافی نەتەوەیی گەلی کوردا، نەک هەر مافی ئۆتۆنۆمی بسەلمێنێ، بەڵکو ئەبێ دان بە مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوسی دا بنێ.

دوەمیان - ڕێککەوتنێکی قۆناغیی سنووردار، لە چوارچێوەی دەوڵەتی عێراق دا لە سەر بنچینەی سەلماندنی ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە، بە چەشنێک کە تەنیا کاروباری: «دیفاع و مالیە و خارجیە» لە دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی بێ و کاروبارەکانی تر لە دەسەڵاتی حوکمی ئۆتۆنۆمی بێ.

لە گەڵ ئەوەش دا:

- ناوچە ڕاگوێزراوەکانی سنور بە گوێرەی پلانێکی گشت لایەنە (شامل) بگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان.

- ئەو شار و ناوچانەی کوردستان کە لە سنوری حوکمە زاتیەکەی ئێستا دەرهێنراون، بخرێنەوە سەر کوردستان.

- تۆقاندن و دەسەڵاتی دەزگا دامرکێنەرەوەکانی لە کوردستان دا نەمێنێ و ئازادی دیموکراتی بدرێ بە هەمو لایەنە جیاوازەکان.

سێیەمیان - ڕێککەوتنێکی جوزئی و وەقتی بۆ ڕاوەستاندنی تەقە لە بەینی هێزە چەکدارەکانی یەکێتی و هێزە چەکدارەکانی حکومەت دا بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، تا مەترسی جمهوریەتی ئیسلامی ئێران هەم لە سەر عێراق و هەم لە سەر هەردو دیوی کوردستان دور ئەخرێتەوە و لەو ماوەیەش دا هەلی گفتوگۆ لە سەر چارەسەرکردنی مەسەلەی کورد ئەڕەخسێ.

*

### شۆڕشی بێ موسیقا

ڕۆژێکیان خەریکی شتنی قەسەڵەکەم بوم. تەشتێکی گەورەم دانا بو قەسەڵەکەم تێ خست بو، خەریک شۆردنی بوم. حەمەی حەمە باقی بە هەڵە داوان هات کردی بە هەرا، وتی: «ئێوە ڕێزی هونەرمەند ناگرن! ئێوە ڕێزی نوسەر ناگرن! ئێوە هەر چەک و چەکدارتان بە لاوە گرنگە!..»

وتم: «کاکە حەمە هێواش! چیە؟»

وتی: «دلێریان نارد حەبسی بکەن!»

وتم: «دلێر کێ یە؟»

وتی: «دلێر موسیقارێکی گەورەی کوردە!»

وتم: «کێ ناردویەتی حەبسی بکا!؟»

وتی: «ئەرسەلان»

وتم: «دانیشە ئێستا ئەنێرم بە دوایا بیهێنن بۆ ئێرە، دڵی ئەدەمێنەوە و لە گەڵ ئەرسەلان ئاشتتان ئەکەمەوە!»

ئەرسەلان کاروباری ڕاگەیاندنی یەکێتی ئەکرد. ناردم بە دوای دلێر دا هات. چیرۆکەکەم لێ پرسی وتی: «من تازە هاتومەتە دەرەوە. لە شار لە ڕێکخستن دا بوم. ئەرسەلان ناردمی بۆ فلان بەش لە ڕاگەیاندن لە بەر ئەوەی لە گەڵ زەوقی من نەئەگونجا وتم ناچم. وتی ئەبێ هەربچی. وتم ناچم. وتی ئەگەر نەچی ئەتنێرم بۆ زیندان. وتم هەر ناچم. لە سەر ئەوە ناردمی حەبسم بکەن»

دیار بو دلێر چاوەڕوانی پێشوازی گەرم و نازکێشانی زۆری کرد بو، ئەم ڕەفتارەی ئەرسەلان پێچەوانەی چاوەڕوانییەکانی ئەو بو، زۆر دڵگیر ببو. من دڵم دایەوە و، ویستم تورەبونەکەی خاو بکەمەوە و تێ ی بگەیەنم کە یەکێ دێتە دەرەوە ئەبێ بە گوێرەی پێویستییەکانی جوڵانەوەکە لێرە یا لەوێ دابنرێ، نەک بە ئارەزوی خۆی، ئەگینا کارەکان ناڕۆن و، تۆ پیاوێکی تێکۆشەر و هونەرمەندی، ئەو شتانە لە خەڵکی تر باشتر ئەزانی، ئەرسەلانیش پیاوێکی تێکۆشەرە و، تازە لە زیندان هاتۆتە دەرێ و، شارەزای کاروباری ڕاگەیاندنە و، بۆ قازانجی ڕاگەیاندن ئەو داوایەی لێ کردوی، ئەبوایە قبوڵت بکردایە یان بە خۆشی و بێ تورە بون ڕەتت بکردایەتەوە. هەرچی لە گەڵم وت دڵی بهێنمەوە جێگای خۆی گەلێکی نەبو. ویستم لە گەڵ ئەرسەلان دایان بنێم و لە یەک نەگەیشتنەکەیان چارە بکەم دیسان گەلێکی نەبو، پێشتنازە لاسار بو، سور بو لە سەر ئەوەی ئیتر بە لای موسیقا دا ناچێ و، پێشمەرگایەتی ناکا، منیش گەیشتە تینم، وتم: «کاک دلێر عاجز مەبە، شۆڕش بە بێ موسیقایش ئەکرێ!»

دلێر ئەم قسەیەی منی لە دڵ گرت بو، هەرگیز لە بیری نەئەچووەوە، لای چەندین ڕۆشنبیر و موسیقار بە گلەییەوە باسی کرد بو.

دلێر لە گەڵ ئەرسەلان ئاشت بوەوە. تیپێکی موسیقای دامەزراند. تیپەکەی ناو نا بو: «تیپی موسیقای شەهید کارزان». لام وایە وشەی شەهید: کە نیشانەی مردنێکی پیرۆزە و لە کوردەواری دا شیوەن بە دوای خۆی دا ئەهێنێ، لە گەڵ تیپی موسیقا: کە خۆشی تێدا بە ژیان و لە کوردەواری دا شایی بە دوای خۆی دا ئەهێنێ، دو شتی نەگونجاو بن. هەر لە بەر ئەوەی لە سەرەتاوە بەم جۆرە تێگەیشتنە تیپەکەیان دامەزراند و بەرێوە برد، ئەگەرچی هەمو پێویستییەکانی کاری داهێنەرانەیان بۆ دابین کرا بو، لە ماوەی ٨ ساڵ دا نەیانتوانی تەنیا یەک سرود یان یەک گۆرانی داهێنن بکەوێتە سەر زمانی خەڵک و، لە موسیقای کوردی دا، لە پاڵ سرودەکانی: ئەی ڕەقیب، گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و، دەمی ڕاپەڕینە و، نەورۆز.. دا بهێنێتەوە.

*

## ڕێککەوتنی ینک - پدک

هەر لە مانگەکانی مارت و نیسان دا حەمەی حەمە باقی بە هۆی حشعەوە دو جار چو بۆ سەردانی پارتی لە تهران بۆ ئەوەی پەیام و نامەی یەکێتییان پێ بگەیەنێ سەبارەت بە ئارەزوی ئاشتبونەوە.

مەسعودی نەدی بو، لە راژان فەلەکەدینی دی بو، راسپارەکانی پێ گەیاند بو. وەلامێکی دیاریکراویان نەدابوەوە، پێیان وت بو وەلامی نامەکە بە هێزی حشعەوە ئەنێرنەوە. لە مانگی تەمموزدا لە بارەگای حشع لە پشتاشان نوێنەرانی یەکێتی و پارتی کۆبونەوە.

نوێنەرانی یەکێتی: فەرەیدون عەبدولقادر و د. خدر مەعصوم و، نوێنەرانی پارتی: محەممەدی مەلا قادر، مەغدید تەحمەد، رۆژی ٢٨ ی تەمموزی ١٩٨٢ لە بارەگای حشع لە پشت ئاشان دانیشتن. لەم دانیشتنەدا رێککەوتنێکیان ئیمزا کرد، نوقتە گرنگەکانی ئەوەبو:

– گیروگرفت و ناکۆکی نێوان هێزە سیاسیەکان بە گفتوگۆی سیاسی، بێ ئەوەی پەنا بەرنە بەر چەک، چارەسەر بکرێ.

– کوردستان لە خانەقینەوە تا زاخۆ مەیدانێکی ئازاد بێ بۆ چالاکی سیاسی و پێشمەرگەیی هەمو لایەنەکان.

– هێزەکانی پارتی و یەکێتی بە ئاگاداری و هاوئاهەنگی یەکتری ئەچنە ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکتری و، تا شێوەیەکی تر ئەدۆزرێتەوە جاری حوکمرانی ناوچەکان وەکو خۆی ئەمێنێتەوە.

ترخنی هیچ مەسەلەیەکی سیاسی نەکەوت بون. لەمەیش پارتی نیازی گێڕانەوەی هەندێ لە هێزەکانی هەبو بۆ کوردستان. گوشاری ئێرانییان لە سەر بو کاری چەکدار بکەن لە ناو کوردستانی عێراق دا، بە بێ رەزامەندی یەکێتی یش نەیانئەتوانی هێزەکانیان بنێرنەوە بۆ کوردستان.

پارتی هێزەکانی ناردەوە بۆ هەمو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکێتی. مەلا محەممەد بارەگای لە وەرتێ دانا و، نادر هەورامی، قادر هێزەکانیان هێنایەوە ناوچەکانی سلێمانی.

رۆژی ٢١ ی تشرینی دوەمی ٨٢ دەستەیەکی نوێنەرایەتی یەکێتی کە پێک هات بو لە: د. کەمال خۆشناو، د. خدر مەعصوم، ئازاد هەورامی لە بارەگای حشع لە پشتاشان لە گەڵ نوێنەرانی حشع: عومەری عەلی شێخ، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، فاتیح رەسول بۆ باسی کێشەکانی هەردولا دانیشتن لەو کۆبونەوەیەدا، حشع ئاگاداری یەکێتییان کرد کە پارتی قەبوڵ ناکا یەکێتی هێز بنێرێ بۆ بادینان چونکە (اتفاق) ەکەی پشتاشان (اتفاقیکی محلیە) بادینان ناگرێتەوە و، لە بادینان لە نێوان یەکێتی و پارتی دا (اتفاق) نیە.

پێشینان وتویانە: «بەشی خۆم بۆ خۆم، ئەوەی تۆش ئەخۆم!» پارتی وەهای ئەکرد، ئەمەیشیان بۆ ئەچوە سەر، چونکە کەس بە دەنگ نەئەهات. لەو رێککەوتنەدا حشع ناوبژیکەر و شایەت بون، لە بارەگاکەی ئەواندا ئیمزا کرا بو. لە سەر ئەم پەیمانشکێنییەی پارتی هیچ نارەزایییەکیان دەرنەبڕی. بەڵکو بە «روحی ریاضی» وەری گرت و داوای لە یەکێتی ئەکرد لە سەر ئەم وردە شتانە گیروگرفت دروست نەکا.

*

لاک هیچ کام لەو بەڵێنانەی بە یەکێتی دابو بە جێ نەهێنا. سەرەتا کە هێشتا لاواز و جێگەی خۆی نەگرت بو، بە نەرمی ئەجولایەوە، کە بە هێز بون و، زیادیان کرد ئیتر گوێیان نەئەدایە یەکێتی و، بەرەو ئەوە ئەچون خۆیان حوکمرانی ناوچەکان بکەن. چەند جاری قسەیان لە گەڵ کرا کەڵکی نەبو. پشت ئەستور بون بە ئێران و، ئێران هاتی

ئەوان لاملێ بکەن. ئەگەر لەوە زیاتر چاوپۆشییان لێ بکرایە ئەبوون بە هێزێکی ئەوتۆ چارەکردنیان دژوار ئەبوو. بڕیارمان دا تا مەترسییەکەیان زلتر نەبووە چارەیان بکەین. پلانی چەککردنیان دانرا. بۆ جێبەجێ کردنی مولازم عومەر چوو بۆ بەری مەرگە و، هێزەکانی کۆیە، کۆسرەت، گەرمیان، قەرەداغ و ناوچەکانیان لە سەر کۆ کرایەوە.

لە ۳ جێگا بارەگایان دانا بوو، هێزیان لێ کۆ کرد بووەوە: بەری مەرگە، سەرگەڵوی دوڵی جافەتی، حاجی مامەندی شارباژێر.

لە تەمووزی ۸۲ دا لە ماوەیەکی کورت دا هەمەو چەک کران. بەرگرییەکی کەمیان کرد. لە بەرگەڵو کوڕ و برازاکانی حاجی شێخ قادر هەندێ بەرگرییان کرد. چەند کەسی لەوان کوژرا و، لە یەکێتی یش سەلاحی حاجی رەفیق، فەرماندەی تیپی ٤٧ ی پیرەمەگروون کوژرا. سەلاح موهەندیس و هاوڕێ ی کۆمەڵە و، لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەن بوو. پیاوێکی ئازا و چاونەترس و، سەرکردایەتی دەیان شەڕ و بۆسەی کرد بوو. یەکێ بوو لە باشترین فەرماندەکانی پێشمەرگە.

لاک هەڵوەشا و ئیتر خۆی بۆ ڕێک نەخرایەوە.

*

دووەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە

لە مانگی ئابی ۸۲ دا دووەمین کۆنفرەنسی کۆمەڵە بە ئامادەبوونی ۲۲۲ نوێنەر لە هۆڵی شەهید شەهاب لە ناوزەنگ بەسترا. بەشداریی نوێنەرانی ڕێکخراوە نهێنییەکانی شارەکان لەم کۆنفرەنسەدا زۆرتر بوو لە چاو کۆنفرەنسی یەکەم دا.

بەشێکی کاتی کۆنفرەنس تەرخان کرا بۆ باسی ڕێکخستنەوەی کاروباری ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی یەکێتی و، بەشێکی تریشی تەرخان کرا بۆ دانانی بەرنامەی کۆمەڵە: بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و، چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی کورد.

کۆنفرەنس بە هەڵبژاردنەوەی سەرکردایەتی نوێ ی کۆمەڵە کۆتایی هات. مامۆستا جەمال تاهیر ئەگەرچی لە ناو شار بوو ئەویش هەڵبژێردرا بە ئەندامی سەرکردایەتی.

*

پێکهێنانی یەکێتیی شۆڕشگێڕان

لە ١٥ ی ئابی ١٩٨٣ کادرە پێشکەوتووەکانی ڕێکخستنەکانی خەتی گشتی و بزووتنەوە لە تۆزەڵە کۆبوونەوە و بڕیاریان دا: هەردوولا لە ڕێکخراوێکی تازەدا یەک بگرن و، هەمو ڕێکخستنەکانیان تێکەڵاوی یەکتری بکەن. پرۆگرامەکەی یەکێتیی نیشتمانی بکەن بە پرۆگرامی خۆیان. سەرکردایەتییەکی تێکەڵاویان هەڵبژارد و، مامجەلالیان کرد بە سکرتێری ڕێکخراوەکەیان.

ئێمە لە کۆمەڵەدا ئەم یەکگرتنەمان پێ هەنگاوێکی باش و بە کەڵک بوو. بەڵام بوونی مامجەلال بە سکرتێری ئەم ڕێکخراوە، کە ئەبوو هاوتای کۆمەڵە بێ لە ناو یەکێتی دا و، لە هەمان کاتا مونافیسی بێ، لە گەڵ ئەوەدا نەئەگونجا کە مامجەلال سکرتێری گشتی یەکێتی یش بێ. مامجەلال بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی نێوان کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان، وازی لە سکرتارییەتی شۆڕشگێڕان هێنا.

*

هیزی پشتیوان
د. قاسملو داوای کۆبونەوەیەکی بە پەلەی کرد بو لە گەڵ مامجەلال و عەزیز محەمەد. روژی ١٥ ی تەمولی ١٩٨٢ لە بارەگای هاوینەی مامجەلال لە سەرچاوەی توژلە کوبونەوەکە کرا. منیش بەشداری کۆبونەوەکە بوم. لە کوبونەوەکەدا د. قاسملو دەستی کرد بە قسە کردن، وتی: «ئیوە هەردولاتان دوستی حیزبی دیموکراتن، ئەمرو من هاتوم دوستەکانی دیموکرات تاقی ئەکەمەوە، پیویستیمان بە یارمەتی هەیە هاتوم داوای یارمەتیبان لی بکەم!»
لیمان پرسی: «پیویستیتان بە چ جورە یارمەتییەک هەیە؟»
وتی: «سوپای پاسداران هیرشیکی زور گەورەیان دەس پی کردوە بو سەر بارەگاکانمان. هیزەکانی دیموکرات بە تەنیا ناتوانن بەری ئەم هیرشە بگرن. هیزەکانمان زور ماندون و زەرەری زوریان لی کەوتوە. ئەگەر فریامان نەکەون دەفتەری سیاسی و بنکەکانی ترمان لە مەترسی گرتن دایە و، ئەبی رویکەینە قەلادزە. پیویستیمان بە پیشمەرگەکانی کوردستانی عیراق هەیە»
راستیەکیشی هیرشیکی گەورەیان لە سەر بو، هیزەکانی ئیران لە هەمو لایەکەوە لە پیشرەوی دا بون و، هیزەکانی دیموکراتیان تیشکاند و، شوینەکانیان لی ئەگرتن. پەشوکان بە د. قاسملوەوە دیار بو.
عەزیز محەمەد وتی: «ئیمە ئەبی ئەم داوایە دراسە بکەین، ئینجا ئەتوانم جوابت بدەمەوە!»
د. قاسملو وتی: «کاک عەزیز من خوم لە ولاتانی سوسیالیستی ژیاوم، شارەزای شیوەی کارکردنیان بوم، کە وتیان (دراسەی ئەکەین) یەعنی ئەو داوایە جیبەجی ناکەن. من ئیستا پیویستیم بە پیشمەرگەی حیزبەکەی ئیوە هەیە، تا کومیتەی ناوەندی حشع کۆ ئەبیتەوە و بریاریک ئەدا، شوینەکانی ئیمە ئەگیرین!»
کاک عەزیز نەچوە ژیر باری هیچ جورە بەلینیکی یارمەتیدانەوە. د. قاسملو لە حشع نائومید بو روی کردە مامجەلال وتی: «ئیوە ئەلین چی؟»
مامجەلال وتی: «ئیمە لە سەر بریاری پیشوی خومان ماوین، ئەوەی لە توانای ئیمەدا بی بو یارمەتیتان ئامادەین، تەنانەت ئەگەر لەو پیناوەدا شورشی کوردستانی عیراق شەهیدیش بی»
*
لە ماوەی ٣ سالی رابوردودا چەند جاری هەولمان دا بو دەمان بگا بە ئیمام خومەینی و سکالای خومانی لە لا بکەین. کاربەدەستانی ئیرانی ریگەیان لی ئەگرتین. لەو کاتەدا ئیمە هیچ پەیوەندییەکمان لە گەڵ ئیران نەمابو. هیچ هیوایەکیشمان بە یارمەتی و پشتیوانی ئیران بو یەکیتی یان بو موعارەزەی عیراقی نەبو. بەلکو گەیشت بوینە ئەو باوەرەی ئیران لە یارمەتیدانی موعارەزەدا بو روخاندنی ریژیمی بەعس نەک هەر جیدی نیە و بەس، بەلکو ئەیەوی عیراق بە دار و بەرد و، شیعە و سوننە و، کورد و عەرەب و، موعارەزە و ریژیمەوە.. ورد و خاش، یا هیچ نەبی لاواز و زەلیل بکا.
١. هیچ جیدیەتیک لە کاربەدەستانی ئیران دا نەئەبینرا بو یارمەتی موعارەزەی عیراقی، تەنانەت بو ئە ریکخراوانەش کە دینی بون و سەر بە ئیران بون. بو ئەوەی

ناکۆکییەکانیان لە ناودا قوڵتر بکا، بە جیا رەفتاری لە گەڵ ئەکردن و، لە چوارچێوەی ستراتیجی خۆی دا هەڵی ئەسوراندن.

٢. هەموو ئەو حیزب و لەشکرانەی لە کوردستانی عێراق دا ئەراتینیان ئەکرد لە ژێر سایەی ئێران دا دامەزرا بوون، یا بە یارمەتی ئەو بوژابوونەوە. بە چەک و پارەی ئەوان ئەژیان. بە کردەوە جوڵانەوەی کوردی لەت و پەت کرد بوو.

٣. وەجبەیەکی گەورە چەک و تفاقی جەنگ بۆ یەکێتی هات بوو، کە زیاتر لە ٥ هەزار کڵاشینکۆف و ١ هەزار ئاریپیجی و سەدان هاوەن و ساروخی تێ دا بوو. کاربەدەستانی تاران بەڵێنیان دابوو رێگە بدەن بە یەکێتی ئەم چەکانە بە ناو ئێران دا بگوێزێتەوە بەڵام کە گەیشتە ناو ئێران دەستیان بە سەرا گرت و، بردیان بۆ خۆیان.

لەو کاتەدا هەلومەرجی جەنگی عێراق باش نەبوو، جوڵانەوەی کورد ئەیتوانی بەم چەکانە تا رادەیەکی باش تەرازووی جەنگی لە کوردستان دا بە قازانجی خۆی بگۆڕێ. بەڵام ئەم رێ لێ گرتنە زەرەرێکی گەورەی لە یەکێتی دا.

*

د. قاسملو داوای هێزێکی بچووکی کرد مامجەلال بەڵێنی دایە هەر ئەو رۆژە مشووری ناردنیان بخوات. هێزێکی پشدەر لە رێ بوون، ئەوانەی لە گەڵ عەلی پچکۆل نارد.

د. قاسملو پێشنیاری کرد کە مولازم عومەر، بەو ئیعتیبارەی عەسکەرییە، سەردانێکی مەیدانەکانی شەر بکا و فەرماندەکانیان ببینێ بۆ ئەوەی بزانێ کەموکورییەکانیان چییە. رۆژی دوایی عومەریش چوو بۆ سەیری مەیدانەکانی شەر و هێزەکانیان. زۆری هێزەکانی دیموکرات هەڵوەشا بوون و، وورەی شەریان نەمابوو، تەنانەت لە هەندێ شوێن بەشێ شارەزایی و چاوساغی هێزەکانی یەکێتی پشیان نەما بوو. ناچار داوای هێزی مەلبەندەکانمان کرد. مامجەلال بۆ ئەوەی گوڕ و تین بخاتە بەر هێزەکانی یەکێتی خۆی چووە ساوین بارەگای دانا و، راستەوخۆ سەرکردایەتی هێزەکانی یەکێتی ئەکرد، کە ژمارەیان لە ٢ هەزار تێ پەڕی بوو.

حدکا ناویان لە هێزەکانی یەکێتی نابوو: «هێزی پشتیوان». هێزی پشتیوان لە چەند جێگا تووشی شەر بوو و، هێرشەکانیان دوا خست. چەکدارەکانی پارتی شان بە شانی هێزەکانی ئێران بەشداری شەر بوون و، چەند کەسێکیان لێ بە دیل گیرا. رادیۆی حدکا بە ستایش و شانازییەوە هەواڵی شەرەکانیانی بڵاو ئەکردەوە.

د. قاسملو ئومێدی بەوە نەمابوو کە ناوچەی ئازادکراو بپارێزن، هەوڵەکەی بۆ ئەوە بوو بە شێنەیی کەلوپەلی دەفتەری سیاسی و، بارەگاکانی تریان و، دەزگای رادیۆ و، دیلەکان، بە سەلامەتی بگوێزنەوە بۆ ناوچەی بیتوش لە سەر سنوور. لە ماوەی چەند حەفتەیەک دا ئەم کارەیان ئەنجام دا.

*

پارتی بە ئاشکرا شەری دژی حدکا راگەیاند بوو، لە لەشکرکێشییەکانی ئێران دا بەشدار ئەبوون. لایەنەکانی تر جود، ئەوانەی کە خۆیان بە دۆست و هاوپەیمانی حدکا ئەزانی وەکو: حشع، حسک، پاسوک، بۆ ئەوەی دڵی ئێرانیان لێ نەرەنجێ، ئامادە نەبوون هیچ یارمەتییەکی بدەن. بەڵکو هێرشێکی گەورەی پروپاگاندەیان لە دژی هاوبەشی یەکێتی دەس

پی کرد، بە بیانوی ئەوەی یەکێتی مەیدانی راستەقینەی خەباتی چۆڵ و، بۆ رازی کردنی دڵی کاربەدەستانی بەعس ئەم کارەی کردوە. دەزگای پروپاگاندەی حشع، لەم مەیدانەدا، لە هەموویان چالاکتر و دەم هەراشتر بو. لە ناو یەکێتی یش دا نارازییەکان، بە تایبەتی ئەوانەی دوایی تر «ئاش»یان پێک هێنا، بۆ دروستکردنی گومان لە سەرکردایەتی یەکێتی و، ساردکردنەوەی پێشمەرگە بە توندی کەوتنە پروپاگاندە.

کاربەدەستانی تەهران، ئەم هاوکارییەی یەکێتییان لە گەڵ حدکا، بە «کارێکی لە بەخشین نەهاتوو» دانا، چونکە لایان وابو ئەگەر ئەم پشتیوانییە نەبوایە ئەوان تەواویان ئەکردن و، ئەیانکردن بە دیوی عیراق دا.

ریزبەستنێکی تازە دروست بوبو لە لایەک تەهران و پارتی و لایەنەکانی جوە، لە لاکەی تر حدکا و یەکێتی. پارتی، لە ژێر گوشاری تەهران دا، شەری راگەیاندنیان دەس پی کردەوە، لە رادیۆکەیانەوە بە ئاشکرا کەوتنەوە هێرش بۆ سەر یەکێتی. بۆ وەلامدانەوەی ئەم هێرشانە زنجیرەیەک وتارمان بۆ رادیوی یەکێتی ئامادە کرد لە ژێر ناوی: «مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە، یا چەند مەسەلەیەکە؟»

سەرباسەکانی ئەمانە بون: ئەرک و فرمانی نیشتمانیی و سیاسەت و هەڵوێستی شۆرشگێرانە. چەند تێبینییەکی مێژویی دەربارەی مەسەلەی کورد. کێن دۆستەکانی کورد و کامانەن دوژمنەکانی؟ ئاڵۆزاندنی پەیوەندی بەینی لایەنە چەکدارەکانی کوردستانی عیراق بە قازانجی کێ یە؟ پەیوەندی ناوخۆیی جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانیی و پەیوەندی لە گەڵ خەباتی شۆرشگێرانەی گەلانی ناوچەکە. پروپاگاندەی درۆ دژی یەک خزمەتی داگیرکەرانی کوردستان ئەکا. دیسانەوە مەسەلەی دۆست و دوژمن و سۆشیال دیموکراتەکان. تاکرەوی نەتەوایەتی و سەربەخۆیی یا رەدوکەوتن. لە ناو بردنی جوڵانەوەی کورد لە بەشێکی تری کوردستان دا لە قازانجی کێ و لە زەرەری کێ یە؟

لە گەڵ فەرەیدون پێکەوە بیرەکانی وتارەکانمان گەڵاڵە کرد و، هەندێکی ئەو و هەندێکی من نوسیم. سەرەرای ئەوەی بە رادیۆ بڵاو کرایەوە، کرایە نامیلکەیەکی تایبەتی و چاپ کرا.

تا ئەو کاتە هەندێ لە لق و ناوچەکانی پارتی لە کوردستانی عیراق لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی دا مابون، ئەوانیش کەوتنە گێچەڵ بە هێزەکانی یەکێتی. روداوەکان وایان ئەگەیاند کە دیسان شەری پارتی – یەکێتی هەڵئەگیرسێتەوە، پارتی بۆ بیانویەک ئەگەرا.

*

هەڵوێست وەرئەگرن، بەڵام هەڵوێست دەرنابڕن!

لە هەمو ئەو کۆبونەوانەدا کە لە نێوان حشع و یەکێتی دا بە دو قۆڵی یان بە بەشداری لایەنەکانی تریش ئەکرا، یەکێ لە باسە سەرەکییەکانی، باسی دەسوەردانی پارتی بو لە کاروباری کوردستانی ئێران دا، یان وردتر باسی هاوکاری چەکدارەکانی پارتی بو لە گەڵ هێزە چەکدارەکانی تەهران دژی کوردەکانی ئێران، بە تایبەتی حدکا. لە هەمو کۆبونەوەیەک دا حشع نارەزایی خۆی دەرئەبڕی دژی ئەم هەڵوێستەی پدک. لە یەکێ لە کۆبونەوەکان دا بەڵێنیان دابو کە ئەگەر پدک جارێکی تر ئەو رەفتارەیان دوبارە کردەوە، هاوکاری ئێرانیان کرد دژی حدکا ئەوان بە ئاشکرا هەڵوێست وەرئەگرن لە دژی پدک.

یەک چەند جارێکی تریش، بەڵکو بە ئورساییەکی زۆرتر، لە شەڕەکان دا بەشدار بو. مامجەلال لە کۆبونەوەیەکدا بە گیری هێنا بون، کە بۆچی هەڵوێستی خۆیان بە ئاشکرا لەو روداوانە لە ناو دەزگاکانی راگەیاندنی خۆیان دا باس ناکەن. مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی وت بوی: «ئێمە وتومانە هەڵوێست وەرنەگرین، نەمانوتوە هەڵوێست دەرنەبڕین»

یەک لە دیوی ئێران پەلاماری حدکای ئەدا هیچ هەرگیز رەخنەیەکی بە ئاشکرای لێ نەگرت، کەچی کە یەکێتی چو بۆ یارمەتیدانی حدکا هەمو توانای پروپاگاندەیی خۆی لە دژی یەکێتی خستە کار.

*

ئەم بڕیارەی یەکێتی، کە منیش تیا بەشدار بوم، زۆرتر شتێکی «عاطیفی» بو تا لێکدانەوەی سیاسی و هەڵسەنگاندنی روداوەکان. هێزەکانی حدکا تێک شکا بون، هەر ناوچەیەکیان لێ ئەگیرا بە یەکجاری چۆڵیان ئەکرد. پێشمەرگەیان تێ دا نەئەهێشتەوە بۆ درێژەدان بە شەڕی پارتیزانی. یەکێتی بەم کارە نەیتوانی حدکا هەڵبسێنێتەوە، بەڵام ئێرانی لە خۆی وروژاند و، ئەو «ئاشتیە لەرزۆک»ەی لە نێوان پارتی و یەکێتی دا بو سەر لە نوێ تێک چوەوە. یەکێتی کەوتە ناو مەترسیەکی گەورەترەوە لەو مەترسیەی هەڕەشەی لە حدکا ئەکرد. مەترسی شەڕ لە ٣ مەیدانی جیاوازدا: عێراق کە شەڕی لە گەڵ رانەگیرا بو، ئێران کە لە بەر خاتری حدکا شەڕی لە گەڵ دەس پێ کرا بو، جود بە سەرکردایەتی پارتی کە لە ژێر گوشاری ئێران دا خەریکی خۆ سازدان بو بۆ پەلاماردانی یەکێتی.

## پێکهێنانی مەڵبەندەکان

دەیان هەزار لاو لە سەربازی هەڵات بون و، لە گوندەکان دا دانیشت بون، هەندێکیان ئەبون بە پێشمەرگە. هەرێمەکان زۆر قەبە بوبون، هەندێکیان بوبون بە ٤٥٠ تا ٥٠٠ پێشمەرگە. سەرکردایەتی هێزێکی وا گەورە لە توانای زۆر لە فەرماندەی هەرێمەکان دا نەبو. فەرماندەی هەرێم و فەرماندە و کادرەکانی تر دەستیان ئەخستە ناو کاروباری خەڵکەوە. گلەیی زۆرمان پێ ئەگەیشتەوە لە سەر رەفتاری هەندێ لە کاربەدەستەکانی پێشمەرگە. ئەندامەکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ کۆبوبونەوە، هەندێکیان کارێکی دیاریکراویان نەبو.

رێکخستنی هەرێم ئیتر لە چاو پێشکەوتن و پەرەسەندنی جوڵانەوەکەدا نەئەگونجا. ئەبو شێوەیەکی تر بۆ رێکخستنی پێشمەرگە و کاروباری خەڵک بدۆزینەوە. ماوەیەک بو لە ناو خۆمان دا ئەم باسەمان ئەکرد. هەندێکیان دژی هەمو جۆرە ئاڵوگۆڕی بون لە رێکخستنەوەی هەرێمەکان دا، هەندێکیان وا تێ گەیاند بو کە ئەمە بۆ لێدانی ئەوان و، کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئەوانە. راستیەکەی بۆ چاکتر رێکخستنەوەی کاروباری ناوچەکان و پێشمەرگە بو، نەک بۆ لێدانی کەس.

کاروباری جوڵانەوەکە هەر شەڕ نەبو لە گەڵ هێزەکانی بەعس، بەڵکو بوبو بە جۆرێک لە حوکمرانی، دەسەڵاتی حکومەت لە زۆر ناوچەدا نەما بو، یا کز بوبو، خەڵک بۆ بەلاداخستنی کێشەکانیان رویان لە داودەزگاکانی شۆڕش ئەکرد. بڕیارمان دا کە هەرێمەکان هەڵوەشێنینەوە و، تیپیان لێ دروست بکەین و، هەر چەند تیپێک بەرەو روی دەزگایەکی بالاتر بکرێتەوە، کە تێکەڵاو بێ لە چەند لێپرسراوێک و، هەریەکەیان کاری دیاریکراو و دەسەڵاتی دیاریکراوی هەبێ بە ناوی مەڵبەندەوە.

مەلبەند پێک ئەهات لە:
١. لێپرسراوی یەکەم، کە سەرپەرشتی هەمو کاروبارەکانی مەلبەندەکەی ئەکرد.
٢. لێپرسراوی کاروباری پێشمەرگە، سەرکردایەتی تیپەکانی ئەکرد.
٣. لێپرسراوی کاروباری کۆمەلایەتی، سەرپەرشتی ئەنجومەنی ئاواییەکان، قوتابخانە، نەخۆشخانە، دادگا و زیندان.. ی ئەکرد و، کێشەکانی ناو خەلکی چارەسەر ئەکرد.
٤. لێپرسراوی کاروباری سیاسی، سەرپەرشتی رابەرە سیاسیەکانی ئەکرد.
٥. لێپرسراوی کاروباری دارایی، سەرپەرشتی دوامەت و خەرجی مەلبەندەکەی ئەکرد و، موچەی پێشمەرگە و، مەسرەفی بارەگا و شەوەکانی رێک ئەخست.
٦. لێپرسراوی راگەیاندن، هەوالی پێشمەرگە و چالاکییەکانی و، دەنگوباسی ناوچەکەی ئەنارد بۆ دەزگای راگەیاندن، بە تایبەتی بۆ رادیو.
ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی یەکیتی، پاش لێکۆلینەوەی لایەنی جوگرافی، ئیداری، کۆمەلایەتی.. دابەش کرا بە سەر ٤ ناوچەدا و، ٤ مەلبەند بۆ سەرپەرشتی کردن و بەریوەبردنیان پێک هێنرا.

مەلبەندی یەک
بارەگای مەلبەند لە حاجی مامەند دانرا دوایی‌تر بە هۆی شەری ئیران - عیراقەوە برایە بەلەکەجار لە ناوچەی قەرەداخ.
تیپەکانی: ١٥ ی هەورامان، ١١ ی شارەزور، ٣١ ی بەرزنجە، ٣٣ ی سلێمانی، ٣٧ ی شاباژێر، بەستران بە مەلبەندی یەکەوە.

مەلبەندی دو
بارەگای مەلبەند لە سەرگەلو دانرا.
تیپەکانی: ٢١ ی کەرکوک، ٢٣ ی سورداش، ٤٧ ی پیرەمەگرون، ٥٧ ی سەگرمە، ٥١ ی گەرمیان، ٤٣ ی ئاسۆس، ٦٨ ی مامەندە، ٤٤ ی چەکوچ، ٦١ ی جوتیاران، بەستران بە مەلبەندی دوەوە.

مەلبەندی سێ
بارەگای مەلبەند لە وەرتێ دانرا.
تیپەکانی: ١٢ ی سۆران، ١٤ ی ئاکۆ، ٧٤ ی بالەک، ٧٧ ی کۆدۆ، ٧٨ ی کاروخ، تیپی کۆزەش، بەستران بە مەلبەندی سێ وە.

مەلبەندی چوار
بارەگای مەلبەند لە بالیسان دانرا.
تیپەکانی: ٨٦ ی دەشتی هەولێر، ٨٣ ی هەوری، ٩١ ی سەفین، ٩٣ ی کۆسرەت، ٩٩ ی بێتوێن، بەستران بە مەلبەندی چوارەوە

*

له پێکهاتنی مەڵبەندەکان دا هاوسەنگی کومەڵە و باڵەکانی تری یەکێتی لێک دەرابوەوە.

هەر مەڵبەندە نەخۆشخانەیەکی هەبو پزیشک سەرپەرشتی ئەکرد و، دادگایەکی هەبو چەند کەسێکی قانونی کاریان تی دا ئەکرد، دەزگای بێتەلی هەبو بۆ پەیوەندی لە گەڵ م س.

مەڵبەند لە راستی دا حکومەتێکی پچکولانە بو، لە ماوەیەکی کورت دا جێگیر بون و، بون بە جێگای باوەر و رێزی دانیشتوانی ناوچەکان.

ڕێکخراوەکانی کومەڵەیش سەربەخۆ کاریان ئەکرد. راستەوخۆ بەسترا بون بە دەزگای ناوەندی ڕێکخستنی کومەڵەوە.

بە گوێرەی پێویستی ئالوگۆر لە ئەندامانی مەڵبەند و، سەرتیپەکان دا ئەکرا.

*

یەکێتی و حکومەت

د. قاسملو پێشنیارەکانی ئێمەی گەیاند بە کاربەدەستانی عیراق. تا چەند مانگی هیچ هەواڵێکی نەبو. شەرەکانی کوردستانی ئیرانی بە سەردا هات. د. قاسملو لەو ماوەیەدا بەرزان تکریتی و صەددام حسێنی بینی بو. وەڵامی پێشنیارەکانی ئێمەیان دابوەوە:

پێشنیاری یەکەم - خرا بوە لاوە بە بیانوی ئەوەی هێشتا هەلومەرجی ڕێککەوتنێکی ستراتیجی لەو بابەتە، لە نێوان عەرەب و کوردا، نەگەیشتوە.

پێشنیاری دوەم - کە بریتی بو لە تۆتۆتۆمی، موافیق بون بۆ ئەوەی بکری بە بنچینەی دەسپێکردنی گفتوگۆ.

پێشنیاری سێیەم - کە بریتی بو لە راگرتنی شەر، ئامادە بون بۆ جێبەجێ کردنی دەسبەجێ.

کاربەدەستانی عیراق رێزێکی زۆریان لە د. قاسملو و بیروراکانی ئەگرت. لەو کاتەدا لە نێوان یەکێتی و حکومەت دا ئەو دەوری «وسیط» ی ئەبینی. کاربەدەستانی عیراق داوایان لی کرد بو کە کۆبونەوەیەک ڕێک بخا بۆ ئەوەی نوێنەرانی یەکێتی روبەرو ببین و، وەڵامەکانی بەعس بۆ پێشنیارەکانی یەکێتی بە دەمی خۆیان تەئکید بکەنەوە.

*

رۆژی ۱۳ ی تشرینی یەکەمی ۸۲ د. قاسملو لە گوزرە شەهر کۆبونەوەیەکی ڕێکخست بۆ یەکتر بینین. لە باتی یەکێتی: مامجەلال و من و، لە باتی حکومەتی عیراق: ئەبو ئەحمەد، ئەبو عودەی، ئەبو محەمەد، ئامادە بون. د. قاسملویش وەکو «وسیط» و میوانداریش بەشدار بو.

*

ئەبو ئەحمەد (عەقید روکن خەلیل محەمەد شاکیر)، ئەفسەرێکی موسڵاوی بو، یاریدەدەری سەرۆکی «جیهازی موخابەرات» و، ئەبو عودەی (عەقید ئیحسان) لێپرسراوی ناوچەی سەروی موخابەرات لە کەرکوک و، ئەبو محەمەد لێپرسراوی موخابەراتی هەولێر بو.

«جیهازی موخابەرات» یەکێ لەو دەزگایانە بو، بەعس دوای ئەوەی هاتە سەر کار دای مەزراند. حیزبی بەعس بەر لەوەی بێتە سەر کار ڕێکخراوێکی پچوکی بۆ گۆکردنەوەی

دەنگوباس و کوشتنی ناحەزەکانی، بە ناوی ڕێکخراوی «حنین» دروست کرد بو، سەددام خۆی سەرپەرشتی ئەکرد. کە هاتە سەر کار گەورەتری کرد و، بودجەیەکی زلی بۆ تەرخان کرد، ماوەیەک سەعدون شاکیر و، دوای ئەو تا ١٩٨٤ بەرزان تکریتی سەرۆکی بو. ئەم دەزگایە بە ناو بۆ کاروباری دەرەوە دامەزرێنرا بو، بەڵام دەستی وەر ئەدایە ناو هەمو کاروبارێکی ناوخۆی عیراقەوە و، لە گەڵ دەزگاکانی: ئەمن و ئیستیخبارات، لەم بارەیەوە بۆربۆرێنی ئەکرد. ئەمیش، وەکو دەزگاکانی کە، ڕاستەوخۆ بە دیوانی سەرۆکایەتی واتە بە سەددامەوە بەسترا بون. لە ناو هەر ٣ دەزگا ئەمنیەکان دا: ئەمن، ئیستیخبارات، موخابەرات دا، بەشێکیان بۆ مەسەلەی کورد تەرخان کرد بو. لە هەر سێکیان دا ناوی: «شوعبەی ٣» بو.

*

ئەبو ئەحمەد لە قسەکانی دا وتی: «ئێمە لە لایەن سەرۆکەوە نێردراوین. سەرۆک سڵاوتان لی ئەکا. ئێمە دەسەڵاتی گفتوگۆمان نیە، ئەرکی ئێمە ئەوەیە بیروڕاکانی سەرکردایەتی بۆ ئێوە بهێنین و، بیروڕاکانی ئێوەیان بۆ ببەینەوە. سەرکردایەتی ئامادەیە: بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە سەر بنچینەی بەیانی ١١ ی ئازار بە ڕێگەی گفتوگۆی هێمنانە و ڕێککەوتن لە گەڵ یەکێتی. هەروەها بۆ دانانی ڕێوشوێنی وەستاندنی شەر لە بەینی یەکێتی و حکومەت دا. ئێوە عیراقین، چاکتر وایە مامجەلال و نوێنەرانی یەکێتی بێن بۆ بەغداد بۆ ئەوەی سەرۆک ببینن و گفتوگۆی ڕاستەوخۆ دەس پێ بکا.»

مامجەلال بە گەرمی بە خێرهاتنی کردن. سوپاسی د. قاسملوی کرد بۆ هەوڵ و تەقەلاکانی. ئامادەیی یەکێتی دەربڕی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان بە ڕێگای سیاسی. بە درێژی باسی سیاسەتی چەوتی بەعسی کرد بەرامبەر گەلی عیراق بە گشتی و، گەلی کورد بە تایبەتی. تۆماری هەمو ڕوداوەکانی عیراقی خستە ئەستۆی بەعس. خواستەکانی بزوتنەوەی کوردی بۆ ڕون کردنەوە و، داوای لی کردن کە ئەگەر بە تەمای گفتوگۆیەکی ڕاستەقینە و سەرکەوتو بن پێویستە هەمو لایەنەکان بەشدار بن. مامجەلال لە قسەکانی دا توندوتیژ بو.

ئەبو ئەحمەدیش تۆماری هەمو ڕوداوەکانی خستە سەر کورد. وتی ئەگەر ئەتانەوی گفتوگۆ سەرکەوتو بێ سەرۆک ئەڵێ: «ئەبێ چارەی بنەڕەتی هەمو گیروگرفتەکان بکری و، ڕێککەوتنێکی ستراتیجی بێ نەک تاکتیکی، با مامجەلال زیاد تەکتەکە نەکا!»

«تەکتەکە»: وشەی بە عەرەبی کراوی «تاکتیک» ە. مەبەستی لە تەکتەکە فرو فێل بو. لای سەددام و سەرانی بەعس وا باو بو: مامجەلال، ستراتیج ئەکا بە قوربانی تاکتیک و، زورتر تاکتیکزانە وەک لەوەی شارەزای کاری ستراتیجی بێ. مامجەلال لەم قسەیە توندتر بو، وتی: «ئێمەی فەقیر لەم شاخ و داخە چوزانین تەکتەکە چیە؟ سەددام حسین خۆی خوای تەکتەکەیە!»

*

لە وەفدی حکومەت پرسرا: کە ئاخۆ حکومەت ئەیەوی چارەسەری گیروگرفتی کورد بکا، یاخود ئەیەوی یەکێتی بکا بە گژ لایەنەکانی ترا؟ هەڵبەتە وەفدەکە وتیان کە حکومەت ئەیەوی گیروگرفتی کورد بە جۆرێکی بنەڕەتی چارەسەر بکا و، ئەیەوی شەر لە کوردستان دا نەمێنی. لە بەر ئەوە ئێمەیش داوامان لی کردن کە هەوڵ بدەن پەیوەندی لە

گەل حشع و پارتی بەش بکەن بۆ هەمان مەبەست و هەوڵ بدەن کوردانی بەرزانی رازی بکەن.

لە وەڵام دا وتیان: «لە گەل پارتی گفتوگۆمان هەیە» بەڵام بۆ حشع وتیان: «ئێمە حشع لە چوارچێوەی جوڵانەوەی کوردا نابینین، هەوڵ ئەدەین لە شوێنی تروە قسەیان لە گەل بکرێ».

لە ناو قسەکان دا منیش هەندێ «موداخەلە» م کرد، بەڵام گفتوگۆی سەرەکی لە نێوان ئەبو ئەحمەد و مامجەلال دا بوو.

*

مامجەلال گفتوگۆکانی ناو کۆبوونەوەکەی بە نامە بۆ عەزیز محەممەد نوسی، داوای لێ کرد سەرانی پارتی بەش ئاگادار بکا، بۆ ئەوەی هیچ لایەک تووشی کاری یەکلاتە نەبێ و، هەڵوێستێکی یەکگرتوویان هەبێ، یا هیچ نەبێ خواستەکانیان لە یەک بچێ.

عەزیز محەممەد لەو کاتەدا بە ناو تەهران دا بە رێگاوە بوو بۆ سوریا. بەن بۆنەیەوە سەردانی پارتی کرد بوو لە رازان. لە پاش ماوەیەک وەڵامی مامجەلالی دابەوە، لە نامەکەی دا سوپاسی کرد بوو کە ئاگاداری کردوە و، ئەویش ئاگاداری پارتی کرد بوو، پێشنیاری بۆ کرد بوو لە سەری بڕوا و، ئەگەر شتێکی تازە هاتە پێشەوە ئاگاداری بکا.

*

وەفدی عێراقی لە دانیشتنەکە ئاسودە و خۆشحاڵ نەبوون، چاوەڕوانی شوکرانە بژاردنێکی زۆرتر بۆ سەددام و خواستی کەمتر و قسەی نەرمتر، بوون. وایان ئەزانی ئەم «عەرض» ، منەتێکی گەورەی سەددامە بە سەر یەکێتیەوە! ئەڵێن کابرایەکی لە خزیابی و لوتبەرز هەبوە، هەرکەسی، لە کاتی چاکوچۆنی دا بۆ پیشاندانی تەواضوع، پێ ی وت بێ: «ئاغا مخلیصم!» لەوەڵام دا وتویەتی: «واجیبی خۆتە!» سەددام، لە بابەتی ئەم کابرایە بوو، لای وابوو هەر کەسێ دڵسۆزی بێ، یا خزمەتی بکا، واجیبی خۆی بە جێ ئەهێنێ، نابێ چاوەڕوانی سوپاس و پاداش و دانەوەی چاکە بێ، چونکە «رسالە خالدە» ی «امە عربیە واحدە» بە مرۆڤایەتی رائەگەیەنێ. دوای ئەم دانیشتنە هیچ جۆرە پەیوەندیەک لە نێوان یەکێتی و بەعس دا نەما.

*

سوشیال دیموکرات

یەکێ لە هەوڵەکانی هەمو لایەنەکانی جود بۆ زڕاندنی ناوبانگی یەکێتی، بەشداری نوێنەرانی یەکێتی بوو لە کۆنگرەی حیزبی سۆسیالیستی فەرەنسی و، دەرچوونی بڕیارێک بوو بە قازانجی کورد. لایەنەکانی جود، بە تایبەتی حشع، ئەمەیان بە پیلانی ئیمپریالیزم دائەنا دژی جوڵانەوەی کورد. یەکێتی سۆڤیەت هێشتا هەرەسی نەهێنا بوو، شەڕی سارد هێشتا کۆتایی نەهات بوو، زۆر لە لایەنەکانی جوڵانەوەی کورد نەیانئەزانی سوشیال دیموکرات چیە و، هەندێکیان هەر ناویان نەبیست بوو.

جود ئەم مەسەلەیەی لە دەزگاکانی راگەیاندنی خۆی دا، لە وتارەکانی رادیو و، لە بڵاوکراوەکانیان دا، ئەوەندە گەورە کرد بوو لە ناو خۆیشمان دا خەریک بوو بە خراپ دەنگی ئەدایەوە. هەندێ لە ئەشارەزاکانی ناو کۆمەڵە بیست بوویان لینین، لە سەردەمی خۆی دا، دژی سوشیال دیموکرات راوەستاوە، لە بەر ئەوە ئەوانیش ئەمەیان بە کارێکی خراپ ئەزانی.

فەرەیدون کە وتارەکانی بۆ رادیۆ ئامادە ئەکرد زاتی نەئەکرد لەم مەسەلەیە بدوێ، نەوەکو لە تاو توندڕەوەکانی کۆمەڵەدا بە سۆشیال دیموکرات تاوانبار بکرێ. ناچار بووم خۆم ئەم ئەرکەم گرتە ئەستۆ. لە ریزی ئەو زنجیرە وتارەدا کە لە ژێر ناوی: «ئایا مەسەلەی کورد یەک مەسەلەیە یا چەند مەسەلەیەکە؟» وتارێکم بۆ ئەم باسە تەرخان کرد کە لێرەدا دووبارە کتومت ئەینووسمەوە:

## دیسانەوە مەسەلەی دۆست و دوژمن و سۆشیال دیموکراتەکان

چەند جارێکە لێرە و لەوێ، بە دزی و بە ئاشکرا، بە نووسین و ئیستگە هەندێ لایەن بۆ مەبەستێکی دیاریکراو باسی ئینتەرناسیۆنالی دوەلی یاخود سۆسیال دیموکراتەکان و مەسەلەی کورد دێننە ناوانەوە کە گوایە پیلانێکی ئیمپریالیستی لە کایەدایە بۆ تێکەڵاوکردنی مەسەلەی کورد بە نەخشەکانی ئیمپریالیزم بە هۆی سۆسیال دیموکراتەکانەوە، وە هەموو جارەکانیش بە چەشنێکی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆ پەنجەی تاوانبار کردن بۆ ئێمە درێژ ئەکرێ کە گوایە ئێمە ئەوە جێبەجێ ئەکەین..

جا با بزانین سۆسیال - دیموکراتەکان کێن و راستە پیلانێ وا لە کایەدایە و ئێمەیش بووین بە جێبەجێکەری؟ یاخود ئەم بوختانە لە کوێوە هاتووە؟

سۆسیال - دیموکراتەکان چەند حیزبێکی سیاسی گەورەی ئەورووپای غەربیین کە لە چوارچێوەی ئینتەرناسیۆنالی دوەلی دا پەیوەندییان لە گەڵ یەک هەیە. ئەمانە لە دەوروبەری جەنگی جیهانیی یەکەم دا لە گەڵ لینین و کۆمۆنیستەکانی ئەو سەردەمە تێکچوون لە سەر مەسەلەی شۆرشی چەکدار و دیکتاتۆریەتی پرولیتاریا و چەند مەسەلەیەکی بنچینەیی و گرنگی مارکسیزم - لینینیزم.

بێگومان لە ماوەی ٦٠ - ٧٠ ساڵی رابوردوودا دنیا تووشی گۆرانی زۆر گەورە و قووڵ بوە، نە حیزبەکەی لینین وەکو ساڵی ١٩١٨ ماوە و، نە سۆسیال - دیموکراتەکانیش حیزبەکانی ساڵی ١٩١٨ ن، ئێمە ئێستا لە کۆتایی ١٩٨٢ داین، کە نەخشەی دنیا و زۆر لە بۆچوون و تێگەیشتنەکانی ئەو زەمانە گۆرینیان بە سەردا هاتووە.

ئێستا لە ئەورووپای غەربی دا چینێکی کرێکاری بەهێز و پێشکەوتوو، گەشەکردوو لە رووی چۆنایەتی و چەندایەتییەوە هەیە کە قورساییەکی گەورەی هەیە لە ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەوێ دا. چینی کرێکاری ئەورووپای غەربی هەم لە رووی گەڵاڵە بوونی هەستی چینایەتی و هەم لە رووی مەبینی لە قاڵبی رێکخراوەیی دا چەندین هەنگاوی ناوە بۆ پێشەوە.. زۆر لەو گیروگرفتانەی کە بەر لە سەد ساڵ یا لە پەنجا ساڵا هەی بوە، ئێستا نەی ماوە و هەندێک لەو مافانەی بەدی هێناوە کە ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی تا ئەندازەیەکی زۆر تەئمین کردوە.

لە کوردستان دا گەشەکردنی ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، فەرهەنگی لە چاو ئەورووپادا زۆر بە هێواشی بۆ پێشەوە چوە، لە کاتێکا لەوێ زۆر بە خێرایی رۆیشتوە، لە گەڵ ئەوەش دا هەر کەسێ وا بزانێ وەزعی ئێستای کوردستان و چینە کۆمەڵایەتییەکانی و هێزە سیاسییەکانی وەکو پەنجا ساڵ لەمەوبەر وایە، بێگومان بە هەڵەدا ئەچێ و بە کابرایەکی بێ خەبەر لە دنیا لە قەڵەم ئەدرێ، هەڵبەتە ئەوێ لای وابێ وەزعی ئەورووپای ئێستاش و چینە کۆمەڵایەتییەکانی و هێزە سیاسییەکانی وەکو پەنجا ساڵ لەمەوبەرە، بێگومان کابرایەکی لە دنیا بێ خەبەرە.

سوسیال - دیموکراتەکانی ئەورووپا ئێستا بەشێکی گەورەی چینی کرێکار و نەقابەکانیان لە ژێر دەس دایە. لە سەرانسەری ئەورووپای غەربی دا: لە فەرەنسا، ئیسپانیا، ئەڵمانیا، نەمسە، سوید، نەرویج، هولاند، بەریتانیا، ئیتالیا.. تەنانەت لەم وڵاتانەدا حوکمیان گرتۆتە دەست هەڵبەتە نەک بە رێگەی ئینقیلابی عەسکەری یا بە زەبری لولەی تفەنگ، بەڵکو بە رێگەی هەڵبژاردنی ئازاد و ئەو ریفۆرمانەی لە بەرنامەکانیان دا هەیە.

سوسیال - دیموکراتەکان ئێستا لە فەرەنسا و سوید و نەمسا حوکمیان بە دەستەوەیە و تا چەند حەفتە لەمەوبەر حوکمی ئەڵمانیای فیدرالیشیان بە دەستەوە بو.

سوسیال - دیموکراتەکان ئێستا لە پەیوەندییەکانی ناو دەوڵەتان دا قورساییەکی ئەوتۆیان هەیە نە یەکیەتی سۆڤیەت و نە چین و نە دەوڵەتانی سوسیالیستی تر، وە نە ئەمەریکا و نە وڵاتانی دنیای سێیەم ناتوانن پشت گوێیان بخەن. بۆیە هەر هێزێکی کوردستانی بیەوێ مەسەلەی کورد، یا هەر مەسەلەیەکی تر بە بەرووای گشتی ئەورووپا بناسێنی و هەوڵ بدا پشتیوانی گەلانی ئەورووپی بە دەس بهێنی، ناتوانی سوسیال - دیموکراتەکان پشت گوێ بخا کە جگە لەوەی چەندین حیزبی گەورە و فراوانن، ملیۆنەها کرێکار و سەدان نەقابەی کرێکارییان لە گەڵە، سەدەها رۆژنامە و گۆڤار و ئیستگەی رادیۆ و تەلەفزیۆن و سینەما و نوسەر و فەیلەسوف و هونەرمەندیان هەیە.

حیزبی سوسیالیستی فەرەنسە کە ئێستا حوکمڕانە چەند ئەندامێکی حیزبی شیوعی وەزیرن لە وەزارەتەکەیان دا و نوێنەری چەن حیزبی شیوعی لە کۆنگرەکانیان دا بەشدار بون.

یەکێک لە دائیرەکانی چالاکیی رێکخراوی رزگاری فەلەستین ناو حیزبە سوسیال - دیموکراتەکانە و هەر کات بە میوانی بانگ کرا بن بۆ کۆنگرە یا کۆبونەوەیەکیان بە خۆشییەوە چون و لە کاتی ئابلوقەدانی فەلەستینییەکان دا لە بەیروتی غەربی، هەڵوێستی حیزبی سوسیالیستی فەرەنسی و حیزبە سوسیال - دیموکراتەکانی تری ئەورووپا مەعلوم بو کە چیە و لە چاو هەڵوێستی هەندێ دەوڵەتی عەرەبی دا چۆنە بەرامبەر بە مەسەلەی فەلەستین.

جا با لێرەدا بپرسین: ئەگەر بەشدار بونی نوێنەرانی حیزبی شیوعی لە کۆنگرەی سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ حیزبی شیوعی حەلال بی و، بەشدار بونی وەزیری شیوعی لە وەزارەتی سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ حیزبی شیوعی حەلال بی و، پەیوەندی و دۆستایەتی لە بەینی رێکخراوی رزگاری فەلەستین و سوسیال - دیموکراتەکان دا بۆ فەلەستینییەکان حەلال بی، ئەبێ بۆچی بۆ ئێمەی کوردی دابەشکراو و زۆرلێکراو، کە دوژمنەکانی دەستیان ناوەتە بینی بینەکێن، پەیوەندی کردن لە گەڵ سوسیال - دیموکراتەکان و پشتیوانی کردنی ئەوان لە مەسەلەی رەوای گەلەکەمان ئەبێ بۆچی تاوان و پیلانگێڕان بێ؟

یاخود پێشینان گوتەنی: یانێکە و دو هەوا؟

سوسیال - دیموکراتەکان، کە هەندێ لایەن بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆیان و بە درۆ کردویانە بە خوێنی سیارەش و، بە درۆ وای دەرئەخەن کە ئەوە پیلانێکی زلە لە مەسەلەی کورد، لە راستی یەکێکن لەو لایەنانەی کە جوڵانەوەی شۆڕشگێڕانەی کورد ئەبێ هەوڵ بدا کە پشتیوانی و لایەنگرییان بە دەس بهێنی و هەوڵی ئەوە بدا لە مەسەلەی رەوای

کورد بکەن و دژەستایەتی بکەن، بۆ ئەوەی جولانەوەی کورد و هێزە شۆڕشگێڕەکانی سەربەخۆیی سیاسی و ئایدیۆلۆجی خۆیان لە دەس بدەن.
ئەوی جێگەی سەرسوڕمانە ئەوەیە: هەر ئەو لایەنەی - مەبەست پارتی بو - کە ئێستا تاوانی دژستایەتی سوسیال - دیموکرات ئەدەنە پاڵ ئێمە، خۆیان لە ساڵانی ٧٤ و ٧٥ و ٧٦ ەوە تا ساڵی ٧٩ بە ئیمزای سەرۆکەکەیان چەندین عەرزوحالی پێشکەش بە ئێنتەرناسیۆناڵی سوسیالیستی کردووە و سەرۆکەکەی ئەوسایان پەیمانیان کردوە بۆ قوبوڵکردنیان بە ئەندام لە ئێنتەرناسیۆناڵی سوسیالیستی دا.
ئێمە هەرگیز ئەرزوحاڵمان نەداوە بە ئێنتەرناسیۆناڵی سوسیالیستی کە بەکەمتی بە ئەندام وەربگری.
ئەوەی ساڵی ٧٤ وەفدێکی رەسمیی ناردە ڤیەننا و داوایەکی رەسمیی پێشکەشی پەیمانی سەرۆکی ئێنتەرناسیۆناڵی سوسیالیستی کرد، ئەوە ئێمە نەبووین و حیزبێکی تر بو.
ئەوەی کە چەندین وتاری بە کوردی و بە عەرەبی بۆ ماستاوکردن لە گۆڤاری نەظەری حیزبەکەیان دا لە سەر ئێنتەرناسیۆناڵی سوسیالیستی نوسی ئێمە نەبووین، بەڵکو حیزبێکی تر بو.
ئەوەی داوای ئەندامەتی کرد و قبوڵ نەکرا و رەت کرایەوە، ئێمە نەبووین و حیزبێکی تر بو. هەر کەسێکیش ئەیەوێ بە چاوی خۆی ئەو بەڵگانە ببینێ، ئەتوانێ لە ئارشیفی مەرکەزیی ئێنتەرناسیۆناڵی سوسیالیستی تەماشایان بکا.
ئەوانەی دیواری ماڵەکەیان شوشەبەندە با بەرد لە خەڵکی تر نەگرن چونکە خۆیان زەرەر ئەکەن.
حیکایەتی ئەو درۆ زلەی هەندێ لەو تاقمانە بۆ سەر لێ شێواندن و ساختەچێتی ئەیکەن بە بەڵگە لە سەر پیلانگێڕانی سوسیال - دیموکراتەکان دژی جولانەوەی کورد و بەشدار بونی ئێمەش لەو پیلانەدا بەمجۆرەیە:
ئەمساڵ حیزبی سوسیالیستی فەرەنسی کۆنگرەی ئاسایی خۆی بەست. بە میوانیی کۆنگرە، دەیان حیزبی شیرعی و سوسیالیستی و دیموکراتی بانگ کرد بو، یەکێک لەو رێکخراوانە یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بو، کە هەڤاڵان عومەر شێخموس و ئەحمەد بامەرنی لە ناو وەفدێکی کوردیی نوێنەری پارچەکانی ئێران و تورکیا و سوریادا بەشداری کۆنگرەکە بون. جگە لە نوێنەرانی یەکێتیمان، نوێنەری چەند حیزبێکی کوردستانی و نوێنەری رێکخراوی رزگاریی فەلەستین و دەیان حیزب و رێکخراو و جولانەوەی رزگاریخواز، بەشدار بون.
لە ئەنجامی هەوڵدانی وەفدەکەی کوردستان لە کۆنگرەکەدا، کۆنگرە بڕیارێکی دەربارەی پشتیوانی کردن لە خەباتی میللەتانی فەلەستین و ئەریتیریا و پۆلیساریۆ و کوردستان لە پێناوی بەدیهێنانی مافی چارەنوس دا لە وڵاتەکانی خۆیان دا. مەسەلەی ئەم چوار میللەتە پێکەوە لە پڕۆژەی یەک بڕیاردا باس کراوە.
بێگومان میللەتی فەلەستین ئەمەی بە سەرکەوتن دانا بۆ خۆی کە گەورەترین حیزبی فەرەنسە ئەم مافەی پێ رەوا دیوە.
هەروەها میللەتی ئەریتیریا و پۆلیساریۆش ئەمەیان بە سەرکەوتن دانا بۆ خۆیان کە گەورەترین حیزبی فەرەنسە مافی چارەنوسی پێ رەوا دیون.

کەمێ هەندێ کوردی داخ لە دڵ بۆ مەبەستێکی دیاریکراو کەوتنە هات و هاوار و هێرش کردنە سەر ئەو بڕیارە و سەر ئەو وەفدەی بەشداری کۆنگرەکە بوە و، سەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ئەو وەفدەی ناردوە و، هەندێ کوردی نەزان پیاوەتی ئەو بڕیارەیان بە گرتنی هەندێ عالِمی فەرەنسی دایەوە و داربەرویان پێ ئەلقیشاندن.

ئێمە لە مەسەلەی ناسینی دۆست و دوژمن دا بەرچاومان روونە، نە لەبەلایی دەسکەوتی حیزبایەتی و عەشیرەتی و، نە تاریکایی تەعەسوبی کوێرانە و، نە بە هۆی خۆ هەڵواسینەوە بەم لا یا ئەولا دا بەری چاوی لێکدانەوەمان ناگیرێ. بەڵکو وەکو رێکخراوێکی سەربەخۆ، چەکدار بە تیۆری زانستی کە رێباز و سیاسەتی گشتی و هەڵوێستەکانی لە دۆست و دوژمن لە ئەنجامی شیکردنەوەی واقیعی بابەتی دا بە سەنگ و تەرازووی زانستی دیاری ئەکات.

ئێمە ناساندنی مەسەلەی کورد و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و دەنگوباسەکانی و سەلماندنی عەدالەت و رەوایی ئامانجەکانی بزوتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلی کورد لە سەر ئاستی جیهان، بە گەلانی دنیا و حیزب و رێکخراوە سیاسی و نەقابی و ئینسانییەکانی و، بە دەزگاکانی ئیعلام و بیروڕای گشتی، لە ناو ئەوانەدا بە سۆسیال - دیموکراتەکان بە یەکێک لە ئەرکەکانی هەڵاڵاتی دەرەوەی وڵاتمان ئەزانین، کە خۆشبەختانە تا ئێستا ئەنجامی باش و سەرکەوتنی باشمان تێ دا بە دەس هێناوە. ١٩٨٢/١١/٢

*

### تۆڕی پەیوەندی بێتەڵ

یەکێتی لە رووی پەیوەندییەوە زۆر دواکەوتوو بو. پەیوەندی نێوان دەزگا سەرکردەییەکانی و هێز و رێکخراوەکانی بە نامە و تەتەر بو. لە هەندێ شوێن هۆکی تۆکی بە کار ئەهێنرا، بەڵام بەمە نەئەتوانرا هەمو ناوچەکان بە یەکەوە ببەستێ. هەندێ جار کەڵک لە رادیو وەرئەگیرا.

بەختیاری برام چەند جارێ پێشنیاری بۆ کردم. هەوڵی دامەزراندنی تۆڕی پەیوەندی بدەین و، ئامادەیی خۆی دەربڕی بۆ ئەنجامدانی. من ئەمەم زۆر پێ باش و پێویست بو، بەڵام پێم وانەبو ئەکرێ.

هاوینی ٨١ هەوڵی دامەزراندنی تۆڕێکی ٣ لایی دا. بە دەزگای بێتەلی «پی ئار سی» ناوزەنگ و مەرگە و وەرتێ پێکەوە بەستران. بەڵام ئەمە لە زستان دا درێژەی پێ نەئەدرا چونکە ئەو بێتەڵەکە لە بەرزایی شاخەکان دائەنرێ. لە کۆتایی ٨١ دا داوا لە هەمو هێزەکان کرا هەرچی بێتەڵ و شتێک پەیوەندی بە بێتەڵەوە هەبێ بینێرن بۆ سەرکردایەتی. لە هەندێ شەڕدا بێتەڵ گیرا بون. بەختیار کەوتە پەیجووری. هەرچی هەبو ناردیان. هەندێکیان گوللەیان بەر کەوت بو. بە هەمووی دوانی لێ چاک کرایەوە. یەکێکیان لە سەرکردایەتی دانرا و یەکێکیان نێردرایە وەرتێ. دوای ئەوە تیپەکان هەندێ شەڕیان ئەکرد بە تایبەتی بۆ گرتنی دەزگای بێتەڵ. چەند دانەیەک گیرا و، خۆیشمان بە هۆی رێکخراوێکی ئێرانییەوە ٤ دانە بێتەڵی «کنود»مان لە ئەوروپا کری. لە پاییزی ٨٢ دا تۆڕێکی پەیوەندی باشمان دامەزراند. هەر چوار مەڵبەندەکە و زۆری تیپەکانی بە یەکەوە بەست بو. بەڵام بێتەڵەکان هەریەکەیان مارکەیەکی جیاواز بو: بیل، راکال، ترمسن، کنود. ئەم تۆڕە کەڵکی زۆری هەبو. هەواڵ و دەنگوباسەکان بە تازەیی ئەگەیشتن. ئاگامان لە هەمو

هێزەکان ئەبو. زۆرجار کە ئەمانتەتوانی کۆببینەوە بە بیتەل قسەمان لە گەڵ یەکتری ئەکرد و، بیروڕامان ئەگۆڕیەوە.

لە سەر هەمان مەسەلە کەریم ئەحمەد وتارێکی درێژی بە عەرەبی لە گۆڤاری «الثقافه الجدیده» دا نوسی.

دانانی سۆسیال دیموکرات بە دوژمنی کورد و، پشتیوانیمان لە کێشەی کورد بە پیلانی ئیمپریالیزم و، هاوکاری لە گەڵیان بە تاوان و خیانەت، بێگومان نیشانەی بەرچاوتەنگی حشع و، نزمی ئاستی تێگەیشتنی سەرکردایەتی حیزبە کوردییەکان بو.

*

## تەفسیری قورئان

من کە منداڵ بوم، بۆ ئەوەی بەرەڵلا نەبم، باوکم لە پشوی هاوینەدا ئەیبردم بۆ حوجرە، بە زۆر قورئانی پێ ئەخوێندم، بێ ئەوەی تێ ی بگەم. دوایی خۆم لە بەغدا کە بوم بە قوتابی زانستی سیاسی و، هەندێ لە بابەتەکانی خوێندنەکەمان پەیوەندی بە ئیسلامەوە هەبو وەکو: بیرکردنەوەی سیاسی عەرەبی - ئیسلامی، مێژوی سیاسی ئیسلام و، قانونە گشتییەکانی ناودەوڵەتان، ناچار بوم بە دوای هەندێ کتێبی تەفسیر و فیقهی ئیسلام دا بگەڕێم. بە کوردی هیچ سەرچاوەیەکم بەر دەس نەکەوت، بەلام بە عەرەبی ئەوەندە زۆر بو لە ژماردن نەئەهات. لە ناو تەفسیرەکان دا دوانم هەڵبژارد بۆ خوێندنەوە و پیاچونەوە، یەکێکی کۆن: «تەفسیری جەلالەین» و، یەکێکی نوێ: «فی ضلال القران» لە نوسینی سەید قوطب.

کورد یەکێکە لەو میللەتانەی زۆر لە زوەوە موسوڵمان بوە و، لە پێناوی ئیسلام دا شەڕی زۆری کردوە و، زانای گەورەی لە بواری نوسینی: فیقه، تەفسیر، کەلام، زمان.. تێ دا هەڵکەوتوە و، کەم دێ هەیە مزگەوتی تێ دا نەبێ، کەچی مەلاکانی کورد بە زمانی کوردی، جگە لە چەند «عەقیدەنامە» یەکی کورت و چەند «مەولودنامە» یەکی، شوێنەوارێکی ئەوتۆیان بە جێ نەهێشتوە. تەفسیری قورئان و لێکدانەوەی حەدیسەکانی پێغەمبەر و، دانانی کتێب لە سەر فیقهی ئیسلام، بە کوردی نەنوسراوە. تەنانەت دوعایەکیان بە کوردی نەخوێندوەتەوە. لە کاتێک دا لە ئیسلام دا شتێک نیە رێگەی لەمە گرتبێ.

قورئان، بە فارسی زۆر زو و، بە تورکی لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی دا تەفسیر و تەرجومە کراوە. بە کوردی ئەوەی من بیستومە و، دیومە تەنیا ٣ تەفسیرە: تەفسیری مەلا محەمەدی چەلی زادە کە لە چلەکان دا نوسیویەتی، تەفسیری نامی و، تەفسیری خاڵ، کە هەردوکیان لە حەفتاکان دا نوسیویانە.

هاوڕێکانی شارم، هەمو ئەو کتێبانەیان بۆ ئەناردم کە لە بەغدا بە کوردی و عەرەبی دەرئەچون، هەروەها حەفتەنامەی «هاوکاری» و مانگنامەی «بەیان» و وەرزنامەی «روشنبیری نوێ». هەندێ لە نوسەرەکان خۆیان کتێبەکانیان بە دیاری بۆ ئەناردم. رۆژێک لە گەڵ پەریدی شاردا، جزمی دوەمی «تەفسیری خاڵ» و «چاپی دوەمی «پەندی پێشینان» م پێگەیشت. مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ بە خەتی خۆی هەردوکیانی پێشکەش کرد بوم.

شێخی خاڵ و من، لە دو تەمەنی جیاواز و، لە دو شوێنی سیاسی جیاواز و، لە سەر دو بیروباوەری جیاواز بوین.. لە ژیانم دا زۆر جار دیاری جۆراوجۆرم لە بۆنەی جیا

جیا دا بۆ هات بو، بەڵام هیچیان ئەوەندەی ئەم دیارییە خۆشحاڵی نەکردم.

لە گەڵ شێخی خاڵ هەرگیز ڕووبەڕو دانەنیشتبووم، بەڵام دو ناسیاویی قوڵم لە گەڵی هەبو: یەکەمیان، وتارەکانی لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژ و ڕۆژی نوێ و، کتێبەکانی: فەرهەنگی خاڵ و، ژیننامەکانی: مەلا عەبدوللای بێتوشی، موفتی زەهاوی، شێخ مارفی نۆدێ، مەولودنامەی ئەوتەشر، تەفسیری جزمی عەمما.. دوەمیان، ئەختەری کچی و خەسرەوی برازای.. کە لە گەڵ هەر یەکەیان لە قۆناغێکی خوێندن دا و، لە کۆڕێکی خەباتی سیاسی دا ئاشنا و ناسیاو بوین. هەر بە هۆی د. خەسرەوی شێخ مستەفای برازای و زاوایەوە، لەو هەلومەرجە سەخت و نالەبارەدا منی خوێند بوەوە و کتێبەکانی بۆ نارد بوم.

ئەم پیاوە گەورەیە چەندین بەرهەمی بە نرخ و گرنگی پێشکەشی گەلەکەی کردبو، لە ناو بەرهەمەکانی دا دوانیان جێگای تایبەتییان هەیە: فەرهەنگی زمانی کوردی و، تەفسیری قورئان.

نامەیەکی کورتی پێزانینم بۆ نوسی، سپاسم کرد بۆ دیارییە بە نرخەکانی، لە خوای گەورە لەشساغی و تەمەنی درێژم بۆ بە ئاوات خواست... من زۆر جار لە ناو چاف دا «دەس مزچێنم» کرد بو و، دەستی زۆر ژنی لە خۆم گەورەتر و پچوکترم ماچ کرد بو، بەڵام لە هەمو ژیانم دا ئەوە یەکەمین جار بو بۆ کەسی بنوسم: «دەستە پیرۆزەکانت ماچ ئەکەم!».

لە ناو ئێمەدا حەسەن کوێستانی لە هەموومان زیاتر سۆراغی کتێبی کوردی ئەکرد، هەمو ئەو کتێبانەی بۆم ئەهات، بە وانەیشەوە کە نوسەرەکانی بۆیان ئەناردم، ئەم دا بەو لە کتێبخانەکەی دا هەڵیان بگری، یەکی لەو کتێبانە ئەم تەفسیرە بو.

ماوەیەک ئەمویست شارەزایی پەیدا بکەم لە سەر جۆری بیرکردنەوەی دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی.. هەندێ لە نوسەرە گەورەکانی کورد لەوانە: مەلا ئەبوبەکری موصەنیف. زۆری کتێبەکانی ئەم بیرکەرەوە گەورەیە لە کتێبخانەکەی خاڵ دا هەبو. جارێک بە هۆی د. خەسرەوەوە هەواڵی هەندێکیانم پرسی و، داوام لێ کرد بو ئەگەر ڕێگە بدا فۆتۆکۆپی هەندێکیانم بۆ بنێری. مامۆستا خاڵ ئەم هەواڵەی ئەوەندە پێ خۆش بو، دەسخەتی کتێبەکەی بۆ ناردم. کتێبەکە بە فارسی و بە خەتێکی ڕەوانی جوان نوسرا بوەوە. ویستم سەر لەنوێ بینوسمەوە. ماوەیەک خەریکی بوم، بەڵام کە لە شەڕەکانی جودەوە گلام ماوەی ئەو جۆرە کارانەم نەما و، ترسام خۆم شتێکم لێ بێ و کتێبەکە بفەوتێ، لە بەر ئەوە وازم لە پڕۆژەکەم هێنا و، بە سپاسەوە بۆم ناردەوە.

*

جیا دا بۆ هات بو، بەڵام هیچیان ئەوەندەی ئەم دیارییە خۆشحاڵی نەکردم.

لە گەڵ شێخی ەاڵ هەرگیز ڕووبەڕو دانەنیشت بوم، بەڵام دو ناسیاویی قوڵم لە گەڵی هەبو: یەکەمیان، وتارەکانی لە گۆڤارەکانی: گەلاوێژ و ڕۆژی نوێ و، کتێبەکانی: فەرهەنگی خاڵ و، ژیننامەکانی: مەلا عەبدوڵڵای بێتوشی، مەولەوی زەهاوی، شێخ مارفی نۆدێ، مەولودنامەی ئەوتەوەر، تەفسیری جزمی عەمما.. دوەمیان، ئەختەری کچی و خەسرەوی برازای.. کە لە گەڵ هەر یەکەیان لە قۆناغێکی خوێندن دا و، لە کۆڕێکی خەباتی سیاسی دا ئاشناو ناسیاو بوین. هەر بە هۆی د. خەسرەوی شێخ مستەفای برازای و زاوایەوە، لەو هەلومەرجە سەخت و ئاڵەبارەدا منی خوێند بووە و کتێبەکانی بۆ نارد بوم.

ئەم پیاوە گەورەیە چەندین بەرهەمی بە نرخ و گرنگی پێشکەشی گەلەکەی کردبو، لە ناو بەرهەمەکانی دا دوانیان جێگای تایبەتییان هەیە: فەرهەنگی زمانی کوردی و، تەفسیری قورئان.

نامەیەکی کورتی پێزانینم بۆ نوسی، سپاسم کرد بۆ دیارییە بە نرخەکانی، لە خوای گەورە لەشساغی و تەمەنی درێژم بۆ بە ئاوات خواست... من زۆر جار لە ناو جاف دا «دەس مۆچێنم» کرد بو و، دەستی زۆر ژنی لە خۆم گەورەتر و پچوکترم ماچ کرد بو، بەڵام لە هەمو ژیانم دا ئەوە یەکەمین جار بو بۆ کەسی بنوسم: «دەستە پیرۆزەکانت ماچ ئەکەم!».

لە ناو ئێمەدا حەسەن کوێستانی لە هەمومان زیاتر سۆراخی کتێبی کوردی ئەکرد، هەمو ئەو کتێبانەی بۆم ئەهات، بە وانەیشەوە کە نوسەرەکانی بۆیان ئەناردم، ئەم دا بەو لە کتێبخانەکەی دا هەڵیان بگرێ، یەکێ لەو کتێبانە ئەم تەفسیرە بو.

ماوەیەک ئەمویست شارەزایی پەیدا بکەم لە سەر جۆری بیرکردنەوەی دینی و سیاسی و کۆمەڵایەتی.. هەندێ لە نوسەرە گەورەکانی کورد لەوانە: مەلا ئەبوبەکری موصەنیف. زۆری کتێبەکانی ئەم بیرکەرەوە گەورەیە لە کتێبخانەکەی خاڵ دا هەبو. جارێک بە هۆی د. خەسرەوەوە هەواڵی هەندێکیانم پرسی و، داوام لێ کرد بو ئەگەر ڕێگە بدا فۆتۆکۆپی هەندێکیانم بۆ بنێرێ. مامۆستا خاڵ ئەم هەواڵەی ئەوەندە پێ خۆش بو، دەسخەتی کتێبەکەی بۆ ناردم. کتێبەکە بە فارسی و بە خەتێکی ڕەوانی جوان نوسرا بووەوە. ویستم سەر لەنوێ بینوسمەوە. ماوەیەک خەریکی بوم، بەڵام کە لە شەڕەکانی جودەوە گلام ماوەی ئەو جۆرە کارانەم نەما و، ترسام خۆم شتێکم لێ بێ و کتێبەکە بفەوتێ، لە بەر ئەوە وازم لە پرۆژەکەم هێنا و، بە سپاسەوە بۆم ناردەوە.

*

# سالی ١٩٨٣

**ڕێککەوتنی ١٩ قۆڵی**

سوریا و لیبیا هەوڵێکی زۆریان دا بۆ کۆکردنەوەی موعارەضەی عیراقی. جەنگی عیراق - ئێران هیوای لای هەموان دروست کرد بو کە ئەم شەڕە سەری صەددام بخوات. زۆر کۆسپ لە ڕێگای پێکهێنانی بەرەیەکی فراوان دا بو. یەکێکیان ناکۆکی نێوان پارتی و یەکێتی بو. چەند مانگی بو ئێمە بڕیارمان دابو ئەوپەری نەرمی بنوێنین و، هەوڵمان دابو لە گەڵ پارتی کۆتایی بە ناکۆکییەکانمان بهێنین. د. فوئاد مەعصوم بە نوێنەرایەتی یەکێتی و، ئیدریس بارزانی بە نوێنەرایەتی پارتی لە پەیوەندی و کۆبونەوەکان دا، لە شام و طەرابلوس بەشدار ئەبون.

ڕۆژی ٦ ی شوباتی ٨٣ لە طەرابلوسی لیبیا ١٩ ڕێکخراوی عیراقی لەوانە یەکێتی، پارتی، حسک، حشع، ڕێککەوتنێکی کورت و پوختیان ئیمزا کرد. بەندە سەرەکییەکانی بریتی بو لە:

١. پێکهێنانی بەرەیەکی فراوانی کراوە بۆ هەمو لایەنەکان.

٢. بەرنامەی سیاسی بەرە:

أ. ڕوخاندنی ڕژێمی عیراق.

ب. دامەزراندنی ڕژێمێکی دیموکراتی.

ج. جۆری هەڵبژاردنی ڕژێم ئەدرێتە دەس گەلی عیراق.

د. سەلماندنی ئۆتۆنۆمی کوردستانی عیراق و دابینکردنی مافی تورکومان.

هـ. ڕێکخستنی کۆبونەوەیەک لە ٢٥ ی شوبات دا بۆ دانانی بەرنامە و پەیڕەوی ناوخۆی بەرە.

٣. لە ماوەی مانگێک دا بەرە پێک بهێنرێ.

٤. لەمڕۆوە ئەبێ:

ا. دەسپێبێ شەڕی ڕاگەیاندن ڕابگیرێ.

ب. ناکۆکی چەکداری ناوخۆ ڕابگیرێ.

بڕیار درا بو کۆبونەوەی داهاتو لە شام بکرێ و، لەو کۆبونەوەیەدا چەوقەند و جەوەد یەک بخرێن. بەڵام پێش کۆبونەوەکە حشع لە ڕێکەوتنەکەی طەرابلوس پەشیمان بوەوە و، کۆبونەوەکەی شامی تێک دا.

*

هاوزەمان لە گەڵ ئەم کۆبونەوانە کۆبونەوەی دوقۆڵی یەکێتی و حشع لە ڕۆژانی ٥ - ٦ ی شوباتی ٨٣ لە ناوزەنگ کرا. ئەگەرچی لەم کۆبونەوانەدا ڕێککەوتنێکی سیاسی بۆ کۆتایی هێنان بە ناکۆکییەکانی ناوخۆ و پێکهێنانی بەرەی فراوان و، هاوکاری دوقۆڵی ئیمزا کرا، بەڵام چونکە هەلومەرجی کوردستان ئاڵوزاو و، لە چەند جێگایەک وردە شەڕ لە نێوان پێشمەرگەکانی یەکێتی و، لایەنەکانی جودا لەوما بو، زۆر بە ڕاشکاوی بە دەستەی

نوێنەرایەتی حشع: کەریم ئەحمەد، عەبدولرەزاق صافی، ئەحمەد بانیخێلانی، وترا: کە ئەگەر چود لە ناوچەکانی خوارەوە شەر بە هێزەکانی یەکێتی بفرۆشن، ناپەلین ئەوان لە سەرکردایەتی بە ئاسودەیی دابنیشن فەرمانی شەر دەریکەن.

*

لەو رۆژانەدا کە ئەم هەولانە لە شام، طەرابلوس، ناوزەنگ.. بۆ یەکخستنی تەقەلای سیاسی ئەپارەکانی بەعس و، کاری هاوبەش، ئەدرا، چەند رووداوی ئالەبار کە لەگەڵ ئەم هەولانە تێکدەرانە رویان ئەدا:

١. هێزەکانی پارتی لە شوباتی ٨٣ دا بە سەرکردایەتی حسو میرخان ژاژۆکی و، بە یارمەتی ئێران هاتنە نزیک بارەگاکانی سەرکردایەتی یەکێتی لە ناوزەنگ و، بەرزاییەکانی بەرامبەریان گرت و، هەرەشەی داگیرکردنی ناوچەکەیان ئەکرد. محەمەدی وەقان، فەرماندەی تیپی ٦١ ی کۆزوەش، نامەی دۆستانەی بۆ حسز نوسی و، بە نوێنەرایەتی یەکێتی محەمەدی وەقان و عەلی وەیس، لە گەڵ دو کەسی حشع رۆژی ١٣ ی شوبات چون بۆ بینینی، بۆ خاوکردنەوەی گرژی لە ناوچەکەدا. هەولەکە سەری نەگرت، وەکو دوایی لە نامە گیراوەکانی ناو هەگبەکەی حسز دا دەرکەوت مسعود نارازی بووە لە بینینی نوێنەری یەکێتی و، فەرمانی پێ کرد بو جاسوسان و ناوچەکە بەر ئەدا.

مسعود بەمجۆرە وەلامی حسزی داوەتەوە:

برای عەزیز حسز میرخان ژاژۆکی

پاشی سەلامان

کاغەزەکەت گەیشت و هەرچیەکی نوسی بوت زانیم. بە هیچ شێوەیەک هەق نەبو ئێوە لە گەڵ ئەوان دانیشن. قسەیەی ئەبو بۆ ئەبو شران و مەحمود، بەلام ئەوی تر – مەبەستی نوێنەرەکەی یەکێتی: محەمەدی وەقانە – ئێمە رازی نەبوین و بروسکەیشمان بۆ کردی کە نابی لە گەڵ ئەوان دابنیشن. ئایا ئەم دانیشتنە چۆن کراوە؟

من چاوەروانی کاک ئیدریس ئەکەم، ئەگینا من خۆم ئەهاتم بۆ ئەو ناوچەیە و، ئەو هێزەی لە گەڵ خۆمم هیناوە هەمویم ئەهینا، ئەمسال هەمو هێزەکانی خۆمان ئەخەینە ناوچەی قەلادزێ و رانیە. ئیستا گرنگ ئەوەیە حەراسەتێکی باشتان هەبی لە شوێنە حساسەکان و، بۆ عەملیات و پێشرەوی من خۆم دێم ئینشاللا.

گرتنی نوقتەی سەری جاسوسان پشتی دوژمنی شکاند – مەبەستی یەکێتیە – و من سوپاسی هەمو ئەوانە ئەکەم زەحمەتیان کێشاوە، ئینشاللا مشایەخ مەرتەبەیان بەرز ئەکا.

هەروەکو وتم باشترین هێزی خۆمان ئەخەینە ئەو ناوچەیەوە لە بەر ئەوە پێویست ناکات زیاتر بچمە ناو تەفصیلاتەوە.

دوعای خۆشیتان لە خوا ئەخوازم براتان مسعود بارزانی ٨٣/٢/٢٨

٢. حشع هەندێ بیانوی داتاشی و، پاش چەند رۆژێ لە ریککەوتنە ١٩ تۆزلیەکەی طەرابلوس پەشیمان بووەوە. لە ناو سەرکردایەتی ئەو بەرەیەدا هەمو لایەنەکان وەکو یەک یەک دەنگیان هەبو. حشع لە پێش دا ئەمەی قبوڵ کرد بو، بەلام لی ی پەشیمان بووەوە بە

بیانوی ئەوەی هەندێ لەو لایەنانەی ڕێککەوتنەکەیان ئیمزا کردوە هێزی پچوکن و، نابێ هێزە گەورەکان و هێزە پچوکەکان وەکو یەک بن.

۳. لە ڕۆژانی ۱۱ - ۱۲ ی شوباتی ۸۳ دا لە دەشتی هەولێر و دەشتی کۆیە هێزەکانی جود بە کۆمەڵ لە گەڵ هێزەکانی یەکێتی دا بە گژ یەکا چون و، جود ئەمەی کرد بە بیانو، لە ۱٦ ی شوبات دا بە ناوی لیژنەی هەولێریانەوە بەیانێکی توندوتیژی پڕ لە هێرشی دژی یەکێتی دەرکرد و، ڕادیوی پارتی چەند ڕۆژێ لە سەر یەک خوێندیەوە. قسەکەری یەکێتی یش ڕۆژی ۲۰ ی شوبات وەڵامی دایەوە.
ڕۆژی ۲٤ ی شوبات سکرتاریەتی جود بەیانێکی توندوتیژی دژی یەکێتی دەرکرد و، حشع یش یادداشتێکی توندی دا بە یەکێتی.

*

بە کردەوە ناوەرۆکی ڕێککەوتنەکەی طرابلوس پوکایەوە. هەلومەرجی کوردستان گەیشت بوە ئەوپەڕی ئالوزی. پێشمەرگەکانی یەکێتی و لایەنەکانی جود لە یەکتری ئەمین نەبون. وەکو ئەمان بیستەوە سەرانی جود، باسی «تأدیب» و «لوت شکاندن» ی یەکێتیمان ئەکرد.
پەلگە گێڕاوەکان دەریان خست: سەرکردایەتی جود، لە ناو خۆیان دا پێک هات بون گەلەکۆمەکێیەکی چوار قۆڵی سیاسی - چەکدار بکەن بۆ گرتنی بارەگای مەلبەندی ۱ لە حاجی مامەند و گرتنی بارەگای مەلبەندی ٤ لە بالیسان، ئینجا گرتنی جادەی کۆمتان - خانقا و، لە دوا قۆناغی لەشکرکێشیەکەدا بارەگاکانی سەرکردایەتی لە ناوزەنگ. دیارە لە هەلسەنگاندنی هێزەکانی خۆیان دا توشی زۆر - هەلسەنگاندن و لە هی هێزەکانی یەکێتی دا توشی ژێر - هەلسەنگاندن بوبون.

*

ئەندامەکانی لەش و شکان

مەسعود لە نامەکەی دا باسی «پشت شکاندن» و سەرانی تری جودیش لە هەمو جێگایەک باسی «لوت شکاندن» یان ئەکردین. من خۆم دو جار لوتم شکا بو جاریکیان بە منالی و جاریکیشیان بە گەورەیی. جاریکیش قاچم شکا بو. ئەو ماوەیش بڕبڕەی پشتم توشی دیسک بوبو، ئەویش جۆرێکە لە پشت شکان. ئەمزانی ئازاری پشت و لوت و قاچ شکان چیە!
شکان و شکاندن، بە ڕوتی چەند مەعنایان هەیە وەکو: وردکردن شتی ڕەق. دابەزینی نرخی پارە و کەلوپەل. ڕیسوا بون. بەلام لە گەڵ ئەندامەکانی لەش دا ڕیزی وشەگەلی نوێ ی لی ئەکەویتەوە هەم «مەعنای حەقیقیی» ان هەیە و هەم «مەعنای مەجازی» وەکو:
سەر شکان: ئیشکان، وەکو ئەلێن: «پەلاماری دا بەلام بە سەری شکاو و جلی دڕاوەوە گەڕایەوە»
زمان شکان: لە قسە کەوتنی کاتی سەرەمەرگ. یان وەکو دوعای شەڕ: «زمانت بشکێ!»
دەس شکان: دەستەخەرۆ کردن. یان وەکو ئەلێن: «دەستی شکاوم..» بۆ مردنی

کەسێکی خۆشەویست یا لە دەس دەرچوونی هەلێکی بە نرخ.

ئەژنۆ شکان: ئەو بڕی ورە بەردان و داروخانی دەروونیی.

ڕو شکاندن: تەریق کردنەوە.

لوت شکاندن: تەمی کردن، شکاندنی غرور و بایی بون.

چاو شکاندن: ترقاندن و ترساندن.

دەم شکاندن: وەلامدانەوەی قسەیەک بە قسەیەکی رەقتر. یان وەکو دوعای شەڕ: «دەمت بشکیا»

مل شکاندن: هەلنان بە فیل بۆ گلاندنی. یان وەکو دەرکردن بە سوکایەتییەوە: «ملت بشکێنە!»

پشت شکاندن: تێ سرەواندنی جەزرەبەیەکی کوشندە.

دڵ شکاندن: رەنجاندن.

قاچ شکاندن: هەرەشەیە، وەکو ئەلێن: «بێیت بەم ناوەدا قاچت ئەشکێنم!»

ئێوە بە خۆمان بکەوین بۆ ئەوەی توشی ئەم هەمو شکانە نەبین!

*

سەید صادق و بالاتەران

مانگی شوباتی ٨٣ جارێکی کە بەعس بە هۆی حدکاوە جوابیان بۆ ناردین کە هەمان وەفدی حکومەت ئەیانەوێ لە گەڵ مامجەلال و نوێنەرانی یەکێتی دابنیشن. داوای لێ کردن کە ئەگەر ئەیانەوێ بیبینن با خۆیان بێن بۆ ناوزەنگ. حەزیان ئەکرد لە جێگایەکی نزیک قەلادزە بێ، بەلام ئێمە پیمان داگرت کە بێنە ناوزەنگ. وەفدی عیراقی بە ئوتومبیل هەتا نزیک سونێ هاتن، ئێمەیش دەستەیەک پێشمەرگەمان نارد پێشوازییان بکا و بیانهێنێ بۆ ناوزەنگ. لە نزیک بارەگاکەی من لە زێنوی سور جێگا و ڕێگامان بۆ ئامادە کردن.

ڕۆژی ١٣ ی شوباتی ٨٣ نوێنەرەکانی حکومەت جارێکی تر هاتنەوە. وەفدی حکومەت، هەمان وەفدی پێشو: ئەبو ئەحمەد، ئەبو عودەی، ئەبو محەمەد بو. ڕێگای سونێ – ناوزەنگ بەفر گرت بوی، بەفرەکەیش بەست بوی، ولاخ نەیئەتوانی هاتوچۆی بە سەردا بکا. بۆ یەکێ ئەشارەزای رۆیشتنی سەر بەفر بوایە زۆر ناخۆش بو. بە پێ هات بون تا گەیشتن زۆر ماندو بون. بەرەوپیریان چوین و زۆر بە گەرمی پێشوازیمان کردن و، بردمانن بۆ ئەو شوێنەی بۆیان تەرخان کرا بو تا بحەسێنەوە. ئەبو ئەحمەد، دیار بو شەکەت بوبو، بە گلەییەوە بە منی وت: «کاکە ئەتانەوێ ئەشکەنجەمان بدەن وا ئێمەتان هێنا بۆ ئێرە!» وتم: «ئەبو ئەحمەد! ئێمە لێرە ئەژین و هیچ بە ئەشکەنجەیشی نازانین، تۆ عەسکەریت حەق نیە باسی ماندوبون بکەی. حەزمان کرد جێگاوڕێگاکەمان ببینن و ئێمە بناسن!»

راستیەکەی ئەمانویست ئەو قسانەی صەددام لە سەر دواکەوتویی و بێ ئاگایی ئێمە کردبوی بە درۆ بخەینەوە. جگە لەوەی میوانداری باش و، چەندین جۆر خواردن و خواردنەوەمان بۆ دانان، چەندین گۆڤار و رۆژنامەی نوێ و کتێبی تازە چاپکراومان بە زمانی جیاجیای عەرەبی، فارسی، ئینگلیزی، ئەلمانی،.. پیشان دان.

ئێوارەکەی مەشروباتیان پێشکەش کردن نەیان خواردەوە. لە بەر ماندوو بوون زۆر کەم نانیان بۆ خورا. داوایان کرد شەو دابنیشین بۆ ئەوەی ڕۆژی داهاتوو بگەڕێنەوە بۆ قەڵادزە. قسەکەی جاری پێشوویان وتەوە، کە ئەوان تەنیا قسە ئەهێنن و قسە ئەبەن، دەسەڵاتی گفتوگۆ و بڕیاردانیان نییە. باسەکانی جاری پێشوو دووبارە بوونەوە. نوێنەرەکانی حکومەت پێیان لە سەر ئەوە دائەگرت کە مام جەلال سەردانی بەغداد بکات و، ئەیانوت: یەک دانیشتنی مام جەلال لە گەڵ سەرۆک هەموو کێشەکان چارەسەر ئەکا. باسی ئەوەشیان کرد کە پەیوەندییان لە گەڵ پارتی پێش کردووە و، لە گەڵیان دانیشتوون و لە گفتوگۆکەدا چوونەتە پێشەوە. بەڵام نەیانوت باسی چییان لە گەڵ کردوون و بە چی گەیشتوون.

مام جەلال هەواڵی ئەم کۆبوونەوەیەشی بە نامەیەکی تایبەتی بۆ کەریم ئەحمەد نووسی.

*

شارەزوور لە زۆر کۆنەوە مەڵبەندی مەلاریا بووە. هەموو ساڵ زۆر کەس بە لەرز و تا مردوون. جارێک کابرایەکی شارەزووری کوڕەکەی لەرز و تا ئەیگرێ. زۆر نەخۆش ئەبێ. باوکی کوڕەکەی زۆر خۆش ئەوێ ئەترسێ بمرێ. بڕیار ئەدا خێر بۆ کوڕەکەی بکا بەڵکو لەو نەخۆشییە هەڵسێتەوە. سەید صادق و بالاتەڕان دوو شاخن بەرامبەر بە یەک، بە سەر لوتکەی هەر یەکێکیانەوە مەزاری پیاوچاکێکی لێیە. کابرا گیسکێک ئەکا بە خێری سەید صادق و تێچکە بەرامبەری، ئەڵێ: «بە گیسکی چاکی ئەکێشمەوە باشە، تاپکەی بالاتەڕان بە کەڵەشێری کرە ئەکا!»

ئێمە ئەمانتوانی ئەم دانیشتنە بە نهێنی بگرین، نەهێڵین کەس پێی بزانێ، بەڵام خۆمان بە ئەنقەست بە ئاشکرا بە جۆرێک ڕێکمان خست، کە هەموو لایەک: لایەنەکانی جود، حکومەتەکانی ئێران، سووریا و لیبیا پێی بزانن. لەوەش مەبەستمان ئەوەبوو، وەکوو چیرۆکی گیسک و کەڵەشێرەکەی کابرای شارەزووری تێیان بگەیەنین، کە ئەگەر ئێران و جود ئامادە نین شەڕمان لە گەڵ ڕابگرن، ئەوا بەعس مەمنونە شەڕمان لە گەڵ ڕابگرێ. ئەوسا هێزی سەرەکی لە سەر ئەرزی کوردستان کە تەنگی بە عیراق هەڵچنی بوو، هێزەکانی یەکێتی بوو، نەک هێزەکانی جود. بە ڕاگرتنی شەڕی یەکێتی - بەعس بەکردەوە شەڕ نەئەما، ئەوسا دەستی یەکێتی بەتاڵ ئەبوو بۆ ئەوان.

*

کەمینێکی کوێر

چوونی هێزەکانی یەکێتی بۆ یارمەتی دانی حدکا و، هاوبەشی هێزەکانی پارتی لە هێرشەکانی ئێران دا بۆ سەر بنکەکانی حدکا و هێزی پشتیوان، گرژی خستبووە پەیوەندییەکانی یەکێتی - پارتی و، چاوەڕوانی ئەوە ئەکرا ئەو ئاگربڕەی بێ ڕێککەوتنی سیاسی لە نێوان هەردوو حیزب دا ئیمزا کرا بوو، ئیتر بڕ نەکات. لە پڕ لە شارباژێڕ ڕووداوی لەوما، بە یەکجاری ئاگری شەڕی سەرانسەری هەڵگیرسانەوە.

جەزای عەلی کاتب ماوەیەک بوو هات بووە شاخ. بوو بە لێپرسراوی ناوچەی سلێمانی پارتی. جەزا هەواڵی بۆ من و عومەری حاجی عەبدوڵڵا نارد کە: «باوەڕی بە حیزبایەتی نەماوە، بۆیە هاتۆتە دەرەوە لە سلێمانی ترساوە یەکێتی لە پەناوە بیکوژێ، کاتی خۆی بە هۆی سیاسەتەوە دوژمنایەتی لە نێوان ئەو و کۆکۆییەکان دا دروست بوو، ئەگەر ئێمە لە گەڵ مەحموودی حاجی فەرەج کە ئەوکاتە سەرتیپی هەورامان بوو، ڕێکی بخەینەوە، باری

دارایی باشە، واز لە ناوچە و پارتی ئەهێنی، بە یەکجاری سەفەری ئەورووپا ئەکا.»
چەنزا لە کاتی شەڕی ناوخۆی جەلالی - مەلایی دا، لە کۆتایی شەستەکان دا لە سەر داوای عەبدولوەهاب ئەتروشی گەورە فەرماندەی پارتی لە ناوچەی هەلەبجە، خالیدی حاجی فەرەجی کۆکۆیی کوشت. خالید گەنجێکی ڕوشنبیر و بە نرخ و، لێپرسراوی ناوچەی هەلەبجەی باڵی جەلالی بو. لە تۆڵەی ئەمەدا کۆکۆییەکان لە سلێمانی برایەکی چەنزایان کوشتەوە. کوشتنی خالید، لە سەر شتی تایبەتی و ناکۆکی شەخسی نەبو، بەڵکو هۆی سیاسی بو. خالید هاوڕێیەکی نزیکی من بو. ناردم بە دوای مەحمودی حاجی فەرەج دا. قسەم لە گەڵ کرد و ڕاسپاردەکەی چەنزام بۆ باس کرد. مەحمود جوامێرانە هاتە پێشەوە یەکسەر وتی: «ئێمە لە گەڵ ئەوانە ناکۆکی خێڵەکی و تایبەتی مان نەبوە، ناکۆکی سیاسی مان لە سەر حیزبایەتی هەبوە، ئێوە چی بە چاک ئەزانن من پێ ی ڕازیم». داوامان لی کرد لە گەڵی دانیشی و ئاشت ببێتەوە. ڕازی بو. مەحمودمان ڕێگە دا بگەڕێتەوە هەورامان تا لە گەڵ چەنزایش قسە ئەکەین و، کات و شوێنی بە یەک گەیاندنی مەحمود و چەنزا دابنێین.
ئێمە لەم کەین و بەینەدا بوین بە بیستەل هەواڵمان بۆ هات ڕۆژی ١ ی نیسان پێشمەرگەی یەکێتی چەنزایان کوشتوە. بە ڕاستی هەمومان زورمان پێ ناخۆش بو. لامان وابو ئەمە تاوانێکە نابێ بێ سزادان تێ بپەڕێ. بە ڕادیۆ ڕونکردنەوەیەکمان بڵاو کردەوە، بە داخەوە ڕوداوەکەمان باس کرد و، سەرەخۆشیمان لە کەسوکار و هاوڕێکانی کرد، بەڵێنمان دا کە لێکۆڵینە لە گەڵ بکوژەکان بکەین و، سزای تاوانبارەکان بدەین. پارتی چونکە لە بیانو بون وا بە خێرایی دەستیان کردەوە و کەوتنە کوشتن، هەڵقەکەی خوێنیان لە ئەنجامی زنجیرەیەک تاوان دا فەوتان.

•

## دارەکەی حسک

حسک لە شارباژێر و شارەزور ناوبانگیان باش نەبو. بە ناڕەوا ئازاری خەڵکیان ئەدا و پارەیان ئەسەند و خەڵکیان ئەگرت. لە سەر ڕێگای سلێمانی - چوارتا لە نێوان ڕێڵەدەر و دوکانیان دا دارێکی لی بو، پێشمەرگەکانی حسک زۆر ڕۆژ لە بن ئەو دارەدا ڕائەوەستان و، هەر ئۆتۆمبێلێک ئەهات و ئەڕۆیشت ڕایان ئەگرت پارەیان لە ڕێبوارەکان و بەنزینیان لە شوفێرەکە وەرئەگرت. بەو هۆیەوە ئەم دارە ناو نرا بە دارەکەی حسک و، لە سەرانسەری ناوچەکەدا ناوی دەرکرد بو. لێپرسراوەکانی حسک هانی پێشمەرگەکانی یەکێتیان ئەدا چەک بفرێنن و بچنە ناو ئەوانەوە. هەندی جار پارەیان لە کەسوکاری پێشمەرگەکانی یەکێتی ئەسەند و، هەندی جار کادر و پێشمەرگەی یەکێتیشیان ئەگرت ئەگەر سەری خۆیان نەقەبلاندایە بەریان نەئەدان.
نێوانی مەلبەندی ١ و هەرێمەکانی حسک ناخۆش بو. حسک لە شارەزور چەند کادر و پێشمەرگەی یەکێتیان گرت بو. چەندی بە خۆشی هەوڵی بەردانیان درا گەڵکی نەبو، ئەیانویست بە پارە و چەک بیانفرۆشنەوە. هاورزەمان لە گەڵ ئەمەدا چەند پێشمەرگەیەکی هەرێمی ٣٧ ی شارباژێریش چەند پارچەیەک چەکیان فڕاند بو، چوبونە لای عوسمانی قالەی منەوەر. عوسمان فەرماندەی هەرێمی شارباژێری حسک بو.
کەرتەکانی تیپی ٣٧ کەوتبونە تەعقیبی عوسمان بۆ ئەوەی بیگرن. عوسمان

کابرایەکی وریا بو زلەر زو بۆنی مەترسی ئەکرد. ئیتر لە هاتوچۆ کەوت بو. ئەو رۆژە چەند پیشمەرگەیەکی یەکێتی لەو ناوەدا ئەبن. یەکێکیان تفەنگێکی لە دەس دەرئەچی چەند کەسی لە خۆیان بریندار ئەکا. جەزا ویست بوی پیاوەتییان لە گەڵ بکا بیانگەیەنێتە نەخۆشخانە لە چەنگنیان. عوسمان ئوتومبیلەکەی خۆی ئەدا بە جەزا. جەزا بریندارەکان و یەکدو پیشمەرگەی خۆی سوار ئەکا و، ئەکەویتە ڕێگا. کەمینەکەی تیپی ۳۷ کە لە دوورەوە ئوتومبیلەکەی عوسمان ئەبیان و، ئەبیان چەند چەکدارێکی تی دایە، بی چاوەری کردن دایان گرت بونەوە. هەر لەوێ دا جەزا و دو کەس لە پیشمەرگە بریندارەکان و ساختەکان کوژران. کە ئەچنە سەریان ئینجا ئەزانن چ کەتنێکیان کردوە.

*

ئاوات ئەیوت: «من مەلا بەختیار داوای لی کردوم عوسمان بگرم بۆ ئەوەی لە گەڵ گیراوەکانی هەورامان بیانگۆڕیتەوە. پیشمەرگەکان لە باتی ئەوەی بیگرن بە ئیازی کوشتنی تەقەیان لە ئوتومبیلەکەی کردوە وایان زانیوە عوسمانی تی دایە. بە هەلە جەزا بەر کەوتوە، دو پیشمەرگەی خۆیشمانی لە گەڵ کوژراوە.» پیشمەرگەکان هەمان قسەیان دوبارە ئەکردەوە.

مەلا بەختیار ئینکاری ئەکرد کە داوای گرتنی عوسمانی لە ئاوات کرد بی.

هەندی کەسی کە رووداوەکەیان بە جۆرێکی تر ئەگیرایەوە. چەند پیشمەرگەیەک چەند پارچە چەکێکی تیپی ۳۷ ئەفرینن و رائەکەن بۆ لای عوسمان. ئاوات نامەیەک بۆ عوسمان ئەنوسی داوای لی ئەکا دەسبەجی چەکەکانی بۆ بنێریتەوە. عوسمان بە شیوەیەکی ناشیرین وەلامی ئەداتەوە. لە سەر ئەوە ئاوات کەمینی بۆ عوسمان داناوە و، بۆ بەدبەختی جەزای تی کەوتوە.

رووداوەکە هەر چۆنی بی، بیانوی دا بە جود و، لە ناو جودا بە پارتی، شەری سەرانسەری دەس پی بکاتەوە.

*

لە پەیوەندی دا بوین لە گەڵ مەلبەند بۆ گرتن و لیکۆڵینەوەی بکوژەکان، پارتی چونکە لە بیانو ئەگەڕا، بی چاوەری کردنی ئەنجاماتی یەکێتی دو کاری تۆلەسەنانەیان کرد:

– رۆژێک دوای رووداوەکەی جەزا، ۲ ی نیسان، لە گوڕەدیم بۆسەیەکیان نایەوە لە ناو ئوتومبیلیک دا ۸ کادر و پیشمەرگەی یەکێتیان کوشت. ئەم پیشمەرگانە لەو رووداوەدا بەشدار نەبون و، نەیشیان بیست بو شتی وەها قەوماوە.

– لە کاتی شاردنەوەی تەرمی جەزا و هاورێکانی دا، هەڤالی ئەحمەد بەگ، کە خزمی جەزا بەلام پیشمەرگەی یەکێتی بو، بی چەک چو بو بەشداری مەراسیمی ناشتنی بکا، هەر لەوێ دا گرت بویان کوشت بویان.

ئیتر هەلومەرجی مەلبەندەکە وا تێکچو. هێزەکانی هەردولا کۆبونەوە و سەنگەریان لە یەک گرت. هەر لایەک هەولی ئەدا لایەکەی تر بە شکاوی لە ناوچەکە دەربکا. ژمارەیەکی زور لە پیاوماقوڵ و ریش سپی و مەلا کەوتنە خۆ بۆ ناوبژی مەلبەندی ۱ و لقی سلیمانی پارتی و، خاوکردنەوەی گرژی و، گیرانەوەی ئاشتی. لیپرسراوەکانی پارتی بە لاساری و کەللەرەقییەوە ناوبژییەکەیان رەت کردەوە.

*

لەو کاتەدا ئێمە ئابلوقە درا بووین لە هیچ لایەکەوە ڕێگای هاتوچوومان نەبوو بۆ دەرەوەی کوردستان. نەمانئەتوانی نامە و بڵاوکراوەکانی یەکێتی بە ڕێکوپێکی بگەیەنین بە هەڤاڵەکانی دەرەوەمان. جاروبار پەیامەکانمان بە کزی و بە ڕادیۆ ئەخوێندەوە، لە شام وەریان ئەگرت. هەلومەرجی کوردستان بە تەواوی شێوا بوو. شەڕی ناوخۆ خەریک بوو هەموو ناوچەکان و هەموو لایەنەکانی ئەگرتەوە.

من بە تەمای سەردانی ناوچەکانی سلێمانی و، کۆبوونەوە لە گەڵ مەڵبەندەکان، سەرتیپەکان، ڕێکخراوەکان، کەرتەکانی ڕێکخستن.. بووم. لە گەڵ ئازاد هەورامی، قادری حاجی عەلی بەگ، ڕەحمان سەیدە، سلێمی حەمە ئاغا، مەحموود (کە بە ملازم مەحموود ناسرا بوو)، بەنەخشیاری بووم... لە ناوزەنگەوە بە ڕێ کەوتین. بەفر ناوچەکانی سنوور و شاخەکانی گرت بوو. لە شاخی سەخت و بەفراوی هومل مان دا و چووینە بیتوش. لەم ناوچەیەدا بە ماسی گەورە ئەڵێن: «هومل».

دەفتەری سیاسی حدکا بارەگاکەیان لە بیتوش بوو. ئەوان تەلەفۆنی سەتەلایتیان هەبوو. ڕێگەیان دام بە تەلەفۆنەکەیان قسە لە گەڵ هەڤاڵانی ئەورووپا بکەم. ئەمویست سەرنجیان ڕابکێشم بۆ ئاڵۆزانی هەلومەرجی کوردستان و، هەندێ ڕاسپاردەی م.س هەبوو پێیان بڵێم، بە تایبەتی داوایان لێ بکەم داوا لە سووریا و لیبیا و فەلەستینیەکان بکەن، کە تەشەبوسیان لە سەر جود هەبوو، هەوڵ بدەن ڕێگەی تەنینەوەی ئاگری شەڕی ناوخۆ بگرن. عومەر شێخموس بەرپرسی کاروباری دەرەوە ئەو کاتە لە لەندەن ئەژیا. ژمارەکەی ئەومان لێ دا کەس هەڵی نەگرت. تەلەفۆنم بۆ ماڵی ئیبراهیم ئەحمەد کرد. هەلو هەڵیگرت. وتم: «من فلانم قەڵەم و کاغەزی بهێنە هەندێ شت بێ ئەڵێم بینووسە و بیدە کاک هۆمەر، چونکە کاک هۆمەرم دەس نەکەوتوە!» یەکسەر وتی: «موبارەک بێ تۆیش گەیشتیتە ئەوێ؟» جود، بە تایبەتی حشع، ئەوەندە بە درۆ باسی پەیوەندی نهێنی و ژێربەژێری یەکێتییان کرد بوو، ئەم جۆرە کەسانە باوەڕیان کرد بوو. وایئەزانی لە بەغدادەوە قسەی لە گەڵ ئەکەم. چی لە گەڵی خەریک بووم تێی بگەیەنم لە جێگایەکی ئەمینەوە لە کوردستانەوە قسە ئەکەم و، کارەکەم زۆر پەلە و پێویستە، ئەو هەر لە سەر ئەو قسە هەڵەی مەڵاقانەی ڕۆیشت. نائومێد بووم جنێوێکم پێ داو تەلەفۆنەکەم داخستەوە.

لەوێوە چووینەوە دیوی کوردستانی عێراق سەردانی کەلاوەکانی باوزی، ڕازان، ئەشکەنەمان کرد، کە تازە پێشمەرگە هەندێکیانی ئاوا کرد بووەوە و بارەگایان لێ دانا بوو. جەمال حەکیم، ناظم عومەر، ئەرسەلان بایز، یوسف زوزانی، ئەحمەدی دادێ.. لەوێ بوون. دەزگای ڕاگەیاندن گواستبوویانەوە ئەوێ، ڕادیۆکەیشیان لەوێ خست بووە کار. بە تەما بوون زۆری بارەگاکانی سەرکردایەتی بهێننە ئەو ناوچەیە.

بە گوریس لە ئاوی زێ پەڕینەوە بەری ئاسۆس. لامان دایە کەلاوەکانی سەرتەنگ. ناوچەکە نائەمین بوو. مەفرەزەیەکی حسک لە مەرگە پێشمەرگەیەکی یەکێتییان کوشت بوو. هێزێکی یەکێتی هات بوو بۆ ڕاونانی مەفرەزەکەی حسک. ڕۆژی ۱۰ ی نیسان شەڕێک لە بەینی مەفرەزەکەی حسک و هێزەکانی یەکێتی دا لە ئاسۆس قەوما بوو. مەفرەزەکەی حسک دەستیان وەشاند بوو پێشمەرگەیەکی یەکێتییان گرت بوو، ناوی سەید برایم و، فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ۲۱ ی کەرکوک. ئەوان شارەزای ناوچەکە بوون خۆیان حەشار دابوو. ڕۆژێ

دوایی چوینە ناوژێ. عەبدولرەحیم عەبدوللا فەرماندەی تیپی ٤٣ ی ئاسۆس بو. ماڵەکەی لەوێ بو. ڕوستەم و هەندێ لە پێشمەرگەکانی تیپی ٢١ ی کەرکوکیش لەو ناوە بون.

*

## شەماڵ و باداوان

شەو لە ناوژێ مابینەوە. بەیانی ١٦ ی نیسان لە ماڵەکەی عەبدولرەحیم نوستبوم، شەپەتی هەڵیان ساندم. عەبدولرەحیم نامەیەکی پیشان دام لە ڕێکخراوەکانی ناوشارەوە بۆیان هات بو. لە نامەکەدا نوسرا بو کە ڕۆژی ١٥ ی نیسان هێزێکی تێکەڵاوی حسک و حشع لە باداوان بۆسەیەکیان ناوەتەوە ٥ پێشمەرگەی یەکێتی تێ دا کوژراوە، لەوانە: شەماڵ فەرماندەی تیپی کۆسرەت و، سەرباز ئەحمەد جێگری فەرماندەی تیپەکە. هەردوکیان پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکان و دو پێشمەرگەی هەڵکەوتو بون. تومەز مەفرەزەکەی حسک کە لە ئاسۆس کشا بونەوە، چوبونە کۆسرەت، لە باداوان لە گەڵ مەفرەزەیەکی حشع یەکیان گرت بوەوە. شەماڵ نازانێ ئەوان لە باداوانن، لە گەڵ سەرباز و شۆڕش حاجی و چەند کەسی لە پێشمەرگەکانی تیپەکەی بە سواری ئۆتۆمبێل ئەچن بۆ باداوان. هەر کە دائەبەزن یەکسەر دایان ئەگرنەوە، هەر لەوێ دا پێنجیان لێ کوشت بون و، کەوت بونە ڕاوناني ئەوانی تر.

هەواڵم بۆ تیپی کۆسرەت نارد بێنە لای ئیمە لە مەرگە و هاتن.

*

## شەڕ لە شارباژێڕ

سەرکردایەتی جود فەرمانی دابو بە هێزەکانی هەمو لایەنەکانی جود پێکەوە پەلاماری بنکەکانی یەکێتی بدەن. بەهادین نوری، لێپرسراوی قاتیعی سلێمانی و کەرکوک، ئەم فەرمانەی جێبەجێ نەکرد. تەنانەت مەکتەبی سیاسی حشع پێش داوایان لێ کرد هاوکاری هێزەکانی جود بکا دژی یەکێتی، بە قسەی ئەوانیشی نەکرد.

بەهادین لە کۆنەوە لە گەڵ سەرانی حیزبەکەی لە سەر کۆمەڵێ مەسەلەی گرنگ ناکۆک بو. بەرامبەر ناکۆکی نێوان حیزبە کوردییەکان ڕەئی وابو، ئەوە ناکۆکیە لە ناو بازنە جیاوازەکانی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا، ئیبی حشع لەو ناکۆکیەدا بێلایەن بێ و، خۆی لەو شەڕەوە نەگلێنێ. جگە لەمەیش، بەهادین ئەیزانی تەرازوی هێز بە قازانجی یەکێتیە، لەو ناوچەیەدا هەر شەڕێ لە نێوان یەکێتی و لایەنەکانی جودا بێ، بە قازانجی یەکێتی یەلادا ئەکەوێ. ئیتر بوچی خۆی تێکەڵاوی شەڕێکی دۆڕاو بکا؟ هەڵوێستەکەی بەهادین هێزەکەی حشعی لەو ناوچەیەدا لە زەرەر و زیان پاراست.

*

ڕۆژی ١٩ ی نیسان شەڕ لە شارباژێڕ هەڵگیرسا. ڕۆژی ٢٠ ی نیسانی ٨٣ کۆتایی هات. هێزەکانی پارتی و حسک لە سورگێو ئاوا بون و بە شکاوی کشانەوە بۆ ئێران و، هێزەکەی حشع، بە سەلامەتی، کشایەوە بۆ بەری قەرەداغ. لەو کاتەدا من لە بەری مەرگە بوم.

*

هەواڵەکانی لە مەڵبەندی ٤ و تیپەکانی و ڕێکخراوەکانی ناوچەکەوە ئەهاتن و، نامەکانی لە دوستەکانمانەوە پیمان ئەگەیشتن، هەمویان وایان ئەگەیاند، هێزەکانی لایەنەکانی

جود: پارتی، حسک، حشع، پاسۆک، لە دەوروبەری بالیسان، کە بارەگای مەلبەندی ٤ ی لی بو، کۆ بونەتەوە و نیازی پەلاماردانیان هەیە.

بە بیستەل لسەم لە گەل ماسجەلال و مەکتەبی سیاسی کرد، ئەوانیش هەمان ئاگاداریان هەبو. وا ریک کەوتین:

١. هەمو هیزەکانی یەکیتی ساز بدەین بۆ بەربەرچدانەوەی هەر دەستدرێژییەکی بکریتە سەرمان.

٢. ئازاد هەورامی بچی بو سازدانی پاشماوەی هیزەکانی مەلبەندی ٣.

٣. منیش بەشی لە هیزەکانی مەلبەندی ١ و ٢ لە گەل خوم ببەم بۆ ناوزەنگ.

٤. ئەگەر لایەنەکانی جود پەلاماری مەلبەندی ٤ یان دا ئیمەش پەلاماری سەرکردایەتییان بدەین لە قرناقاو - پشتاشان.

*

ئازاد هەورامی کەوتە ری بەرەو بیتوین و لەوێوە بۆ وەرتی. رەحمان سەیدەیش لە گەلی گەرابوەوە. رەحمان حەزی ئەکرد ناوچەکانی سلیمانی ببینی، هەر بەو نیازە لە گەل من هات بو، ئارەزووەکەی نەهاتە دی. منیش ویستم لە دەشتی قەلادزەوە بە کورتترین ریگادا بگەریمەوە ناوزەنگ. بەلام هەوالیان بۆ هینابن جاش سەر ئاوی زی یان لی گرت بوبن. جاشەکان هەندیکیان سەر بە لایەنەکانی جود بون. لەبەر ئەوە چومە شارستین و لەوێوە بۆ سەرگەلو. هیزیکی چەند سەد کەسیم کۆ کردەوە و لە گەل خوم بردم بۆ چوخماخ و مالومە و بە دولی سفرە و زەرین دا چوینە هەرزنە بەرەو ناوزەنگ.

*

بە ریگاوە بوین بەرەو ناوزەنگ بیستمان هیزەکانی جود پەلاماری بالیسانیان داوە دولی بالیسان، دولی مەلەکان و، دول ئاکریان گرتوە و خەریکی گرتنی دولی خانەقا و دولی شەهیدانن بۆ ئەوەی ناوزنگ بە تەواوەتی لە ناوچەکانی هەولیر دابرن و، هیزەکانی یەکیتی کە لە دەرە شیرە - سەرچاوەی مەلەکان گەمارو درا بون بگرن.

لەم شەرانەدا ٧ پیشمەرگەی مەلبەندی ٤ کوژران، لەوانە: ئاسیق محەمەد شوکر (پیشرەو)، ئەحمەد قەمبەری و، چەند کەسی بریندار بون، لەوانە: عەلی نەبی، شاخەوان، دلزار حەویزی.

پیشرەو کادریکی هەلکەوتو و رۆشنبیری کۆمەلە، خەلکی کەرکوک و دەرچوی (اقتصاد) بو. ماوەیەک بەرپوبەری دەورەی پیگەیاندنی کادر بو. خۆی دەرسی ئابوری سیاسی ئەوتەوە. کتیبیکی گەورەیشی بە کوردی لە سەر ئابوری سیاسی نوسی بو. فریا نەکەوت چاپی بکا.

ئەحمەد قەمبەری یەکی لە پیشمەرگەکانی مەترەزە سەرەتاییەکانی دەشتی هەولیر و، هاوری ی کۆمەلە بو. لە بەر ئازایەتی و زیرەکی بو بو بە فەرماندەی کەرت.

دلزار کوری بەکرئاغای حەویزی بو. بەکرئاغا یەکی بو لەو ئەفسەرە شورشگیرانەی کورد کە لە جمهوریەتی مەهاباد و لە شورشی ئەیلول دا بەشدار بو. دلزار لاویکی بەنرخ و تیگەیشتو، دەرچوی (کلیەی ادارە) بو. گوللەیەک لە میژەلاکی سەری دابو، هەردو چاوی کویر کرد و، چاوەکانی هەرگیز روناکییان تی نەهاتەوە.

کەلوپەلی مەلبەند و مالی ئەندامەکانی تالان کرا. شتومەکی سەید کەریم گیرا بو.

پاسپورتەکەی کە سوری بو، لە گەڵ نامەیەکی کە من بۆم نوسی بو، لە ناو شتەکانی دا، گیرا بون. دەزگاکانی راگەیاندنی لایەنەکانی جود چەند جاری ئەم نامەیەیان بڵاو کردۆتەوە.
لە بەشێکی نامەکەدا بۆ سەید کەریمم نوسی بو:

«بە هۆی سوریا و لیبیاوە زەخیرەیەکی زۆرمان بۆ ق م و تیهران بردوە بۆ ئەوەی شەرمان پێ نەفرۆشن و پەلاماری مەقەڕەکانی ئێرە نەدەن، دواکەوتنی هێرشەکەیان بە رەئی من ئەگەڕێتەوە بە زۆری بۆ ئەو زەخیرە، چونکە هەڕەشەی ئەوەمان لێ کردن کە ئەگەر وازمان لێ نەهێنن ئەوا مەجبورین شەڕی ئەملا رابگرین و خۆمان بۆ ئەوان تەرخان بکەین و تۆبالی ئەو مەسەلەیەش ئەکەوێتە ئەستۆی ئەوان. ئێستا برادەران لەوێ خەریکن کە زۆر لە تیهران بکەن هەڵوێستی خۆی بگۆڕێ، هەرچەندە بڕوا ناکەم بە قەدەر مویەک هەڵوێست بگۆڕێ»

پێشتر چەند جاری لە کۆبونەوەی دوقۆڵی دا لە گەڵ حشع پێمان وت بون کە ئەگەر شەر لە خواری هەڵبگیرسێنن، لێیان ناگەڕێین ئەوانیش بە ئاسودەیی لە پشتاشان دابنیشن. شەر ئەخەینە ناو سەرکردایەتییانەوە.

*

بێگومان منیش وەکو هەمو کوردێکی تر لە ناخی دڵەوە ئەم شەڕەم پێ ناخۆش بو. رەنگە بۆ من، کە لە پلەیەکی بەرزتری لێپرسراوێتی دا بوم و، هەمو ژیانی خۆمم بۆ مەسەلەی گەلەکەم تەرخان کرد بو، ناخۆشتر بوبێ.

حشع و پارتی و، لایەنەکانی تری جود لە هێرشەکانیان دا بۆ سەر یەکێتی، پەنایان ئەبردە بەر موهاتەراتی زۆر نزم. بەو پێشمەرگە قارەمانانەی، کە رژێمی بەعسیان هێنا بوە لەرزە و، بەو پیاوە ئازایانەی جەلادەکانی موسڵ و ئەبو غرێبیان سەرسام کرد بو، ئەوت: جاشەکانی شەستوشەش و جاشەکانی بەعس. ئەم جۆرە پروپاگاندە ناراستە لە باتی ئەوەی بە قازانج بگەڕێتەوە بۆ جود، لە ناو پێشمەرگە و جەماوەری یەکێتی دا، بو بو بە هۆی خولقاندنی داخێکی قوڵ و رقێکی ئەستور لە جود.

– سەرکردایەتی حشع و کادرەکانی، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کە لە کوردستان بون، ئەوانی تریان لە سوریا و ئەوروپا نیشتەجێ بون.

– سەرکردایەتی پارتی و کادر و پێشمەرگەکانی، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ کە لە کوردستان بون، ئەوانی کەیان هەمو لە تیهران دانیشت بون.

– سەرکردایەتی و کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی، چەند کەسێکی کەمی سەرکردایەتی نەبێ کە لە سوریا و ئەوروپا بون، ئەوانی کەیان هەمویان بە خاووخێزانەوە لە کوردستان بون.

لەو کاتەوە کە یەکێتی چو بو بۆ بارمەتیدانی حدکا، تیهران غەزەبی لە یەکێتی گرت بو، نەیئەهێشت جود لە گەڵ یەکێتی ئاشتی بکا. دەرگای هەڵبژاردنی سیاسی، بۆ رێککەوتن لە گەڵ یەکێتی، لە ژێر گوشاری ئێرانی دا، لە لایەن جودەوە داخرا بو. ئێمە تەنیا دو هەڵبژاردنی سەختمان لە بەردەم دا بو، هەڵبژاردنی سێهەمان نەبو:

هەڵبژاردنی یەکەم، مەیدان چۆڵ بکەین بۆ جود، یان وەکو هەندێ لە لایەنەکانی جود ئەیانوت: بچینەوە بۆ ئەویلەکانی یەکرەجۆ.

هەڵبژاردنی دوەم، لە مەیدان دا بچەقین و، ئێمە ئەوان دەربکەین.

چوو ئێرانیان هەموو داڵدەیان بدا، ئەو کاتە ئێمە نە لە ئەرز و نە لە ئاسمان جێگەیەکمان نەبوو ڕووی تێ بکەین، ئەو ناوچە بچووکە نەبێ کە بارەگاکانی خۆمان و مەڵبەندەکان و ماڵ و خێزانەکانمانی لێ بوو، ئەویش کەوت بووە بەر مەترسی هێرشی جەود. هێزەکانی پارتی بە سەرکردایەتی حەسۆ میرخان ژاژۆکی و، بە یارمەتی ئێران چوبوونە سەر چیای جاسوسان، بەرامبەر بە ناوزەنگ، چاروبار هاوەنی بە بارەگا و ماڵەکانەوە ئەنا. ناوزەنگ کەوت بووە مەترسی گیرانەوە، نەبوو چۆڵی بکەین.

ناچار بووین شەڕ لە سەر مانی خۆمان بکەین.

*

هەموو گەنجێ لە سەرەتای ژیانی دا کە بیر لە پاشەڕۆژی ئەکاتەوە هیوای زۆر و ئاواتی جۆراوجۆر و ئارەزووی سوور و مۆری لە لا دروست ئەبێ.

منیش وەها بووم. بەڵام هەموو جارێ ژیان بەو ئاقارەدا ناڕوا کە بە تەمای بووی. ئاوات و ئارەزوو و هیواکان لە گەڵ ڕووداوەکانی ڕۆژگاردا ئەبن بە دالغەی ڕابووردوو و، خەیاڵی لە جێبەجێ کردن نەهاتوو و، خەونی بە دی نەهاتوو...

کە خوێندنی ساناویم تەواو کرد، زەمانی عەبدولکەریم قاسم بوو. لەو سەردەمەدا کورد بە ئاسانی ئەیتوانی بچێتە کلیەی عەسکری. ئەگەر بیوستایە لەوانە بوو ئەو زەمانە منیش لە کلیەی عەسکری وەربگیرامایە. بەڵام خۆم هیچ ئارەزوویەکم نەبوو ببم بە ئەفسەر و حەزم لە ژیانی عەسکەری نەئەکرد، ئەگەرچی ئەو زەمانە ئەفسەر پایەیەکی تایبەتیان هەبوو لە ناو کۆمەڵ دا، تەنانەت بە زەمانی کچانی خوازبێنی کراوی بەغداوە ئەیانوت: «لو ملازم لو ملازم». من حەزم لە ژیانێکی تر ئەکرد کە هێمن و ئاسوودە بێ.

کە بووم بە پێشمەرگە، لە هەموو ژیانم دا جگە لە چەند حەفتەیەک مەشقی «کتائب الشباب» هیچ دەورەیەکی تەدریبی عەسکەریم نەدی بوو، ئەویش لە بەرنامەی دوای جەنگی شەش ڕۆژەی عەرەب - ئیسرائیل، هەرکەسی لەوانەی خوێندنی جامیعەیان تەواو ئەکرد، ئەم مەشقەی نەکردایە شەهادەیان نەئەدایە. ئەگینا بۆ ئەمەش نەئەچووم.

لە ئەدەبی کۆنی عەرەبی و فارسی دا لە ستایشی هەندێ لە کاربەدەستەکان دا نووسیویانە: «صاحب السیف والقلم». من گاڵتەم بەم ستایشە ئەهات. لە ژیانی پێشمەرگایەتیم دا هەرگیز خۆمم بە «ئەهلی تفەنگ» دانەناوە و، حەزم ئەکرد لە ڕیزی «ئەهلی قەڵەم» دا حسابم بکەن. کە ئەو شەڕانە بوو. چەند نامەیەکم لە لێپرسراوەکانی ڕێکخراوە نهێنییەکان و، هەندێ لە ڕووناکبیرەکانی شارەوە بۆ هات. ناڕازی بوون لەوەی من سەرکردایەتی هیچ شەڕێک بکەم. هەندێکیان ئەترسان من لە شەڕێک دا بکوژرێم و، کۆمەڵەیش تووشی سەرگەردانی بێ. لەو کاتەدا سەرم زۆر قاڵ بوو، نەمتەبرژا بە نامەی درێژ وەڵامیان بدەمەوە. لە وەڵامی یەکێکیان دا نووسیم:

«هاوڕێ! پەژارەکەت لە جێگای خۆیەتی. بەڵام پرسیارە بە ناوبانگەکەی شکسپیر: «هەبێ یا نەبێ؟ ئەوە مەسەلەکەیە!» چارەنووسی یەکێتی و کۆمەڵە وەکوو ڕێکخراو و چارەنووسی خۆمان وەکوو تێکۆشەر، لە مەترسی دایە»

کە پەلاماری بالیسانیان دا و گرتیان، ئێمەیش بڕیارمان دا پەلاماری سەرکردایەتیان بدەین لە قەندیل. ئێتر چووم بۆ سەرکردایەتی شەڕەکان.

*

شەڕی یەکەمی جوڕە

ئازاد هەورامی کارەکەی خۆی بە باشی ئەنجام دا بوو. هێزەکانی وەرتی، دولە ڕەقە، دۆڵی خانەقای ساز دا بوو، ئامادەی کرد بوون بۆ خەریک کردنی لای چەپی مەیدانی شەڕەکە و، چاوەڕوانی ئەکرد بە ڕادیۆ ئاگادار بکرێ دەس پێ بکەن.

ئیمەیش هێزەکانمان لە زەلی کۆ کردەوە. مامجەلال هات بۆ خواحافیزی و، وتارێکی بە سۆزی بۆ دان و، داوای لێ کردن ئەرکەکەیان بە چاکی بە جێ بهێنن و، بە پەلە بە ڕێ بکەون بۆ ڕزگارکردنی هاوڕێکانیان لە مەلبەندی ٤ لە گەماڕۆی جوڕە.

ڕەمــزی دەس پێ کــردنی پەلامــاردان بانگەوازێ بوو، کــە ئەبوو لە ڕادیۆ وە بڵاو بکرێتەوە، پەندێکی کۆنی کوردی بوو: «تۆڵە بە سەبرە، ئەگا بە زەبرا» ڕادیۆ دەستی کرد بە خوێندنەوەی بانگەوازەکە.

ناوی خوامان لێ هێنا کەوتینە ڕێ. بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە بەستێ. داوام لێ کردن بۆ حەســانەوە لە بن دارەکانی چەمەکەدا لا بدەن و نانی نیوەڕۆ بخۆن. من مەفرەزەیەکی تێکەڵاوم لە پێشمەرگەکانی پارەگاکەی خۆم و هەندێ پێشمەرگەی گەرمیان پێک هێنا بوو، شاهۆ فەرماندەیان بوو. شاهۆ بەتانییەکی لە بن دارێک دا بۆ من داخست لە سەری دانیشتم. خواردنەکەمان سەفەری بوو: نان، هێلکەی کوڵاو، تەماتە، خەیار و تەروزە بوو. لە سەر دەسڕێک دام نا بوو. لەو کاتەدا فەقێ حەسەن پەیدا بوو. فەقێ حەسەن پارەگاکەی لەو ناوە بوو، خۆیشی خەڵکی ناوچەکە بوو. من بە دوام دا نارد بوو بۆ ئەوەی دەنگوباسی ناوچەکە و شوێنی سەنگەر و قایمکارییەکانی جوڕەی لێ بپرسم. چەند کەسێ لە گەڵ من لە سەر بەتانییەکە دانیشت بوون. من هەســتام بەرەو لای فەقێ حەســەن چووم و بانگم کرد بۆ بن دارێکی تر بۆ ئەوەی گوێیان لە قسەکانمان نەبێ. کە من ڕۆیشتم ئەوانی تریش چونکە خواردنەکەیان بە دڵ نەبوو لە سەر بەتانییەکە هەستا بوون و ڕۆیشت بوون. مام سالحی گورئەسپ گوێ ی لە دەنگی هەندێ هاوڕێی دوور بوو، هاواری لێ کرد بوون: «پێشمەرگە بڵاوەی لێ بکەن ڕوحە هات!» کەس گوێ ی نەدا بووە.

*

ڕوحە!

گورئەسپ گوندێکە لە گەرمیان. مام سالح فەرماندەی کەرت و، بە دەستی خۆی پیاوێکی ئازا و، هەتا بڵێی قسە خۆش و جوامێر و دڵپاک بوو. هەموو جار ئەیوت: «مامجەلالیش بە پێشمەرگە بڵێ: برا تێپەڵ مەبن، بڵاوەی لێ بکەن، پێشمەرگە دامەزرێن! بە قسەی ناکەن. بەڵام کە فڕەی کۆپتەر و هاشەی تۆپ هات، ئیتر هەموو بڵاوەی لێ ئەکەن و لە شوێنی قایم دا دائەمەزرێن! مامجەلالیش ئەو مەرکەزییەتەی نییە کە ڕوحە هەیەتی. مەرکەزییەت ها وەلای ڕوحەوە!» مەبەستی لە «ڕوحە» فڕەی هالیکۆپتەر و هاشەی تۆپ بوو. لەبەر ئەوە مام سالحمان ناو نابوو: «ڕوحە».

*

لە پڕ گوللە تۆپێکی گەورە هاشەی کرد و لە ناوی دابین بەر بەتانییەکەی من کەوت، هەر لەوێ دا ٤ لە پێشمەرگەکانی مەفرەزەکەی منی کوشت: کامیل وەستا ئەحمەد خەڵکی کرپچنە، یاسین عەبدولکەریم خەڵکی کفری، ئیبراهیم ئەحمەد خەڵکی عەزیز قادر، ئەمین فەتاح خەڵکی چامیرز. هەروەها بیستوون جێگری فەرماندەی تیپی ٢١ ی کەرکوک و،

بەدرخان صابیر پێشمەرگەی هەمان تیپ و، لەشکری چوارقورنەیی پێشمەرگەی تیپی ٩٩
ی کۆسرەت، کوژران. دەزگای بێتەلەکەمان پارچە پارچە بوو. من بە ڕێکەوت بەر نەکەوتم.
هەموومان هەستاین و بە ڕاکردن ڕوومان کردە بن شاخ و قوولایی دۆڵەکە تا گەیشتینە نەدیو
بە هیلاک چووین. تۆپباران بەردەوام بوو. دیدەوانەکە لە بەرزاییەکی بەرامبەر بە ئێمە چاوی
لێمان بوو چاودێریی ئەکردین. تا ئێوارەیەکی درەنگ نەمانتوانی سەر دەر بهێنین.

*

بیستوون (حەمید محەممەد) پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکان بوو. هاورێیەکی
کۆنی کۆمەڵە و، کادرێکی کرێکاریی ڕۆشنبیر و پێشمەرگەیەکی ئازا و دڵسۆز بوو. سەیر
ئەوەبوو ڕۆژێ پێشوتر کۆبوونەوەی بە پێشمەرگەکانی تیپەکەیان کرد بوو. یەکێ لە پێشمەرگە
توندڕەوەکانی محاسەبە کرد بوو، ئەویش بە ناڕەوا تانەی لێ دابوو، وت بووی: «ئەو هەموو ساڵە
تۆ پێشمەرگەیت، ئەگەر پێشمەرگەیەکی باش بوویتایە ئەکوژرای یا بریندار ئەبووی!»

*

٧ کوژراو و ٢٢ بریندارمان هەبوو. لاشەی کوژراو و بریندارەکان کۆ کرانەوە.
بەدرخان چەند پارچەیەکی کەمی لەشی مابوو. هەموومان ڕەوانەی ئاوزەنگ کردنەوە و
نامەیەکم بۆ نوسینی ڕووداوەکەم بۆ باس کردن و، داوای دەزگایەکی بێتەلم لێ کردن.
ئێوارەیەکی درەنگ بە تاریکی بە ڕێ کەوتین بەرەو قەڵاتوکان. پێشتر ئاگاداری
هێزێکی تیکەڵاوی تیپەکانی ئاسۆس و مامەندم کرد بوو لە مەرگەوە بە دەشتی قەڵادزەدا
بچن بۆ قەڵاتوکان و بچنە سەری مۆڵی گەورە لە زنجیرەی چیای قەندیل. سەری مۆڵ کەوت
بووە نێوان قەڵاتوکان و قرناقاو، بە سەر هەموو سەنگەرەکانی جوودا زاڵ بوو. من بە تەما بووم
خۆم سەر بکەوم بۆ سەری مۆڵ و شاخەو شاخ هێزێک بنێرم ڕێگاکانی قەندیل لە کشانەوەی
هێزەکانی جوود بەرەو ئێران بگرن و، لەوێوە کە هەموو ناوچەکە بە چاکی ئەبینری شەڕەکە
بەڕێوە ببەم. بەڵام تۆپباران دوای خستین و نەخشەکەی تێکداین.
بارەگایەکی حشع لە سەر ڕێگامان بوو. پێشمەرگەکانم ئاگادار کرد بوو خۆیان تێ
نەگەیەنن. ئەگەر ڕێگەیشیان پێ گرتن خۆیان پێوە خەریک نەکەن. بابی تێپەڕین
تەقوتۆقیان لە گەڵ بکەن. زۆری پێشمەرگەکان شەو لە سەر ڕێگاکە ئاگریان کردەوە و
خۆیان دا بە ئەرزدا بۆ نوستن. هێزەکانی جوود کە لە بەرزاییەکان بوون مەشخەڵاتی
ئاگرەکانیان ئەدی. خۆم چوومە قەڵاتوکان و فەرماندەکانم بانگ کرد. سەر لە نوێ هێزەکانمان
ڕێک خستەوە و ئەرک و فەرمانم بە سەردا دابەش کردن. هێزێکمان نارد بۆ بەهێزکردنی
ـە بری مۆل، بۆ ئەوەی هەندێکیان لەوێوە شۆڕ بنەوە بۆ سەر سەنگەرەکانی جوود. ٤ هێزی
تریشم ئامادە کرد بۆ سەر ٤ جێگا لە کانی گاتوان، گەری گازی، سەری ساوین.. هەموو
قۆڵەکان هۆکی تۆکیان پێ بوو.

*

پێش ئەوەی لە ئاوزەنگ بە ڕێ بکەوین ناردم چەند تۆپێک خاسی سپیبان کری و،
دام بە تاقمەکەی مامە ڕیشە هەڵی بکرن. شوانی ڕەئوف نوری جێگری ڕیشە بوو، کوڕێکی
قسە خۆش بوو، ڕووی تێ کردم وتی: «دیارە ئێمەت داناوە بۆ مردن، وا کفن تەسلیمی ئێمە
ئەکەی!» من لە سەری نە ڕۆیشتم. جلوبەرگی پێشمەرگەکانی جوود و یەکێتی، زمان و
سەروسیمایان و چەکەکانیان لە یەک ئەچوو، بۆ ئەوەی لە کاتی تێکەڵاو بوون دا لە یەکتری

جیا بکرێنەوە، پێش دەس پێ کردنی هێرشەکە، خامەکەمان لە شێوەی شریت دا بڕی و، هەر پێشمەرگەیەکی یەکێتی پارچەیەکمان دابە بیبەستێ بە بازووی چەپیەوە.

*

تا نیوەڕۆ لە خۆئامادەکردن بووینەوە. غەریب سەعید بە سواری گوێدرێژێک پەیدا بو. سەروگوێلاکی خوێناوی بو. هەندێ وردە پارچەی نارنجۆکێکی بەر کەوت بو. گالۆکێکی بە دەستەوە بو، لە بەردەمی دا درێژی کرد بو. شەو لە کاتی تێپەڕین دا ئێمان دوایین تاقمی کاروانە درێژەکەمان بون. کەوت بونە بەر شالاوی لە ناکاوی بارەگاکەی حشع لە رەزگە. وریای مام قادر کوژرا بو، ئەمیش بریندار ببو. یەکێ لە پێشمەرگەکان کە سەیری دیمەنی غەریبی کرد بە سەر کەرێکەوە، وتی: «سەیرا لە مەلا نەسرەدین ناچی!؟»

هەر تاقمە ئەرکەکانی خۆیمان بە وردی بۆ رون کرد بووە. لە سەعات ١٣ دا هەر ٤ هێزەکە بە ناو لێرەوارەکەدا بەرەو شوێنی دیاریکراو جولان. منیش، لە گەل کوێخا عەلی قەلاوی، بە شێنەیی دوایان کەوتم و، بەردەوام بە هۆکی تۆکی قسەم لە گەل فەرماندەی قۆلەکان ئەکرد. دەورووبەری سەعات ١٦ هەمو ئەو شوێنانەی دیاریمان کرد بو گیران. هێزەکانی جەرد هەندێکیان کوژران و هەندێکیان هەلاتن. هەمو شوێنە بەرزەکانیان لە دەس دا و خێوەت و کەلوپەل و خوراکیان بە جێ هێشت. عەلی مام رەسول، لێپرسراوی زیندانەکەی حسک بو، ئاگاداری کردین کە ئامادەیە: هەمو گیراوەکان لە گەل خۆی بهێنێ و، بیتە ریزی یەکێتیەوە. هەوالمان بۆ نارد بێت. یەکێ لە گیراوەکان سەید برایم بو، سەید برایم فەرماندەی کەرت بو لە تیپی ٢١ کەرکوک، لە تەقوتۆقەکەی ناسۆس دا گیرا بو، گەیاند بویانە ئەوێ.

ئازاد هەورامی بش هێزەکانی مەلبەندی سێ ی ساز دا بو لە قۆلی کۆزمەتانەوە هێرشی بۆ کرد بون، هەندێ پێشڕەوی کرد بو.

ئوناغی یەکەمی کارەکەمان ئێوارە تەواو بو، شەوەکەیمان دانا بۆ حەسانەوە. هەوا سارد بو، ئێمە بۆ حەسانەوە چوینە ناو خێوەتێکی ئەوانەوە. یەکێک رادیۆی حشعی کرد بووە، ژنێک بە دەنگێکی ناساز جنێوی پێ ئەداین و، هێرشەی لێ ئەکردین. پێشمەرگەیەکیش لە دابەزینی سەری مرل دا بریندار بو بو، گوللەیەک لە سمتی دابو، دیار بو ئازاری زۆری هەبو، زۆری هاوار ئەکرد، دو سێ کەسیش لەو لاوە گالتەیان لە گەل ئەکرد، ئەیانوت: «هاوار مەکە تۆ لە راکردن دا گوللەت بەر کەوتوە، بۆیە لە دوارەی داوی!»

بەیانی رۆژی داهاتو، ریکەوتی ٢ ی مایسی ٨٣ هێزەکەمان دەستی کردەوە بە هێرش. هەندێ کۆنە ربیەی جەیش بە بەرزاییەکەوە بو بەرامبەر قرناقاو و پشتاشان. لە گەل هەندێ لە فەرماندەکان من چومە ناو ربیەکەوە. حشع بە هاوەنی ١٢٠ ملیم دایان گرتینەوە و، بە دوربینە دور بە دور تەقەیان لێ ئەکردین. هێزەکانی ئێمە رژانە ناو قرناقاو و دەستیان بە سەر بارەگاکانی حسک و پاسۆک دا گرت. پێشمەرگەیەکی بالەک: عومەر عەلی دەربەندی کوژرا. لە گرتنی حانوتەکەی حسک دا چەند ساردییەکی ناوقوتوی لە دوای یەک خوارد بووە، لە کاتی خواردنەوەی کوکایەکی تردا گوللەیەک لە سەری دابو. لەو کاتەدا تاویک بارانی دەنک گەورە بە خورەم دەستی کرد بە بارین. سەرانی حسک و پێشمەرگەکانیان بە قەندیل دا هەلگەران. هێزەکانمان هەندێکیان کەوتنە راونانی ئەوان و

هەندێکیان هەڵیانکوتایە سەر بارەگاکانی حشع لە پشتاشان. منیش ئیتر دابەزیم بۆ دۆڵەکە.

*

**پی کا کا لە قەندیل**

لە بەردەمی پشتاشان دا راوەستا بووم تەقە گەرم بوو چەند کەسێکیان هێنا بۆ لام. بانگم کردن قسەیان لە گەڵ بکەم، بە کرمانجی ئەدوان، لێم پرسین: «ئێوە چین؟»

وتیان: «ئێمە پی کا کا ین؟»

وتم: «پی کا کا چی ئەکا لێرە؟»

وتی: «هات بووین بۆ ئاوەزی ئێوە و جودا»

وتم: «کاکی برا قسەیەکی پێشینان ئەڵێ: ئەگەر کەچەڵ حەکیم بوایە تەداوی سەری خۆی ئەکرد! ئێوەیش لە گەڵ هەمو گرووپ و حیزبەکانی کوردستانی تورکیا لە شەڕدان بۆچی ناچن لە گەڵ ئەوان ڕێک بکەون لە باتی خەریکی ئاوەزی ئێمە بن؟»

یەکێکیان زۆر بە داغ بوو، بە چەپۆک لە سەری خۆی ئەدا، هاورێیەکی کۆمیتەی ناوەندیان کوژرا بوو، لە لایان زۆر بەڕێز و خۆشەویست بوو، ئەیوت: «ئێوە هەڤاڵێکی ئێمەتان کوشتووە، تورکیا و ئەمەریکا و هەمو ئیمپریالیزمی جیهانی بە دوایەوە بوون، نەیانتوانی هیچی لێ بکەن، کەچی ئێوە لێرە کوشتتان»

داخی خۆم دەربڕی سەبارەت بە کوژرانی هاورێکەیان، وتم: «ئەوە لە ئەنجامی هەڵەی خۆتان دا بوو کە هاتوونەتە ناو ئەم شەڕەوە. ئێستایش بچن چەکەکانتان وەرگرنەوە و، بۆ کوێتان ئەوێ بە ڕێتان بکەم؟»

ئەمانە مەفرەزەیەک بوون لە گەڵ حشع لە نزیک کومتان بوون، کە شەڕ دامەزراوە بە شیوعیەکان زانی بوون. داوایان لێ کرد بوون تەسلیم بن. یەکێکیان جنێوی دابوو وت بووی: «ئێوە چین تەسلیمتان بین؟» گوللەیەکیان لە سنگی عەزیزی دارد دابوو خەریک بوو بمری. ئیتر ئەوانیش پەلاماریان دابوون، کوڕێکیان لێ کوژرا بوو بە ناوی خالید و، ئەوانی تریان گیرا بوون. کە زانی بوویان پێشمەرگەی پی کا کان نارد بوویانن بۆ لای من. منیش ناردمن بۆ لای ئازاد هەورامی چەکەکانیان بۆ وەربگرێتەوە و وەکو خۆیان ئەیانویست بە ڕێیان بکا بۆ ڕوستی.

*

عەسری هەمان ڕۆژ شەڕ بە قازانجی یەکێتی بە لادا کەوت. لە گەڵ ئازاد هەورامی و هێزەکانی مەڵبەندی سێ یەکمان گرتەوە. بنکە و بارەگاکانی حشع گیران. بۆ ئەوەی شتەکان بە ساغی نەکەوێتە دەس یەکێتی، خۆیان زۆر شتی نەخۆشخانە، چاپخانە، ڕادیۆکەیان، هاوەن و دوشکاکانیان خراپ کرد بوو. هەندێکیان بە قەندیل دا هەڵگەڕان بەرەو ئێران. بەفر قەندیلی بەر ئەدا بوو. لەم شەڕەدا دوو پێشمەرگەی یەکێتی کوژران: عوسمان کازاوی و، غەفور پشتاشانی. ئاگاداری هێزەکانی خۆمانم کرد کە ئیتر دوایان نەکەون و وازیان لێ بهێنن.

*

هێزەکانی یەکێتی لە جود بە داغ بوون، بەڵام تیپی کۆسرەت لەوان زیاتر، چونکە هەمووی چەند ڕۆژێ بوو فەرماندەی تیپەکەیان و جێگرەکەی و ۳ پێشمەرگەیان کوژرا بوو.

دوای بە لاداکەوتنی شەڕەکە لە کاتێک دا خەریکی کۆکردنەوەی بەڵگەکان بوین، شۆڕش حاجی کە ئەوسا رابەری سیاسی تیپی کوسرەت و، بە رێکەوت لە بۆسەکەی باداوان دا نەکوژرا بو، کەوت بوە تەماشا کردنی بەڵگەکان. بە تورەییەکی زۆرەوە هەندێ لەو بەڵگانەی بۆ من هێنا سەیریان بکەم. من لەو کاتەدا ئەندێشەم سەر ئەوەی سەیری شڕە و پڕە بکەم، ئەمویست هەرچی زوە بگەینە لای هێزە گەمارۆدراوەکەی مەلبەندی چوار. بەڵام شۆڕش پێ ی داگرت کە هەر ئەبێ سەیریان بکەم و سەرنجی بۆ دوانیان راکێشام:

یەکەمیان، راپۆرتێک بو دەربارەی روداوەکەی باداوان بۆ عەزیز محەممەد و مەکتەبی سیاسی حیزبەکەیان نوسی بو. لەم راپۆرتەدا نوسی بویان تاقمی چەکداری جەلالی لە گوندی باداوان کەمینێکیان بۆ هاورێیانی ئەوان و هەڤالاتی حیزبی هاوپەیمان: حسک دانا بو. بەڵام هاورێیانی ئەمان لێیان هاتنە دەست و کەمینەکەیان شکاند و، پێنجیان لە جەلالیەکان کوشت. ئەمەش بە تەواوی پێچەوانەی راستیی روداوەکەوە بو.

دوەمیان، دەفتەرێکی گەورە بو بە قەوارەی (ئەی چوار) تەرخان کرا بو بۆ لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی سەرکردایەتی و فەرماندە و هێزەکانی یەکێتی لە سەر شێوەی ئەو راپۆرتانەی دەزگاکانی ئەمن و ئیستیخبارات دەربارەی حیزبەکانی موعارەضە ئامادەیان ئەکرد. زۆر بە دریژی ژمارەی پێشمەرگە و ناوی فەرماندە و ئەندامانی سەرکردایەتی و کادرە پێشکەوتوەکانی و، رادەی دڵسۆزیی و تازایەتییان، تەنانەت ئەوەندەی بۆیان کۆ کرابوەوە، زانیارییان لە سەر پلەی خوێندەواری و پیشە و، ناوی ژن و منداڵ و خوشک و برا و کەس و کاریشیان نوسی بو.

سەیر ئەوە بو، شتێکی لە بابەتی ئەمەیان دەربارەی حیزبی بەعس و جەیشی عیراق و دەزگا سەرکوتکەرەکانی و، هیچ حیزبێکی تر نەکرد بو.

*

هەمو خەڵکی کوردستان بە پەژارەوە گوێ قوڵاغی هەواڵی ئەم شەڕانە بون. بە هاوردەردیەوە لە گەڵ یەکێتی، کە لە لایەکەوە عیراق و، لە لایەکەوە تیران و، لەم لایشەوە هێزەکانی جودی تی وەرکا بو. دوستانی یەکێتی، تەنانەت خەڵکی بێلایەن، خەمی چارەنوسی یەکێتییان بو، ئەترسان بفەوتێ. ئێوارەی هەمان رۆژ بە بیتێل قسەم لە گەڵ رادیۆ کرد و، هەواڵی سەرکەوتنی یەکێتی و شکانی هێزەکانی چوار پراکەی جودم راگەیاند.

مەبەستی سەرەکیم لەو قسانە روخاندنی وردی هێزەکانی جود و بەرزکردنەوەی وردی هێزەکانی یەکێتی بو، کە لەو کاتەدا لە دەرەشێر و سەرچاوەی مەلەکان گەمارۆ درا بون.

*

لە بنکەکەی حسک دا چەکێکی دژی فڕۆکە گیرا بو، بەڵام هەندێ پارچەیان لێ دەرهێنا بو. بە پێشمەرگەکانم وت: «بەو شوێنەدا برۆن کە ئەوانی پێ دا رۆیشتون بەڵکو بیاندۆزنەوە!» پاش ئەختێ هاتنەوە باچ و خاکەناز بەدەن وتیان چاڵێکمان دۆزیوەتەوە تازە هەڵکەنراوە رەنگە لە وێ دا شاردبێتیانەوە. چون چاڵەکە هەڵ بدەنەوە. برایم رەبەن، کاتێ خۆی پێشمەرگەی یەکێتی بو، لە قەرناقار دانیشت چاوی لێ بو، وتی: «بۆچی ئەو چاڵە هەڵئەدەنەوە!» وتیان: «بە دوای پارچەی دیمیترۆڤەکەدا ئەگەڕێین» برایم وتی: «ئەوە پارچەی دیمیترۆفی تێ دا نیە، بەڵکو لاشەی خولەی حەمە تاتەی تێ دایە!»

منیش هەلم دایە وتم: «خولە لە سوید»
وتی: «پێری گەیشتەوە و، «وێنیٚ کوژرا!»

*

ڕۆژی ڕابوردو هەندێ لە سەرکردە و کادرەکانی حشع ڕۆیشت بون. هەندێکیان دەرباز نەبوبون، لەوانە: کەریم ئەحمەد، مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، قادر ڕشید ناسک.. من لە دوڵی خانەقا بوم کە ئەماتەیان هێنا. هەندێ قسەم لە گەڵ کردن و سەفەرەیەکم جیا کردەوە بەریم کردن بۆ ناوزەنگ، بە سەفەرەکەم وت بو کە بە ڕێزەوە ڕەفتاریان لە گەڵ بکەن و، بە سەلامەتی بیانگەیەننە لای مامجەلال. گیراوەکانی تر نەیردران بۆ وەرتی. حشع سەرەتا هەمو گیراوەکانیان بە کوژراو دانا. لە دنیادا وایان بلاو کردەوە.

*

ئیتر ئەیو خومان ئامادە بکەین بۆ شکاندنی گەماروی مەلبەندی ٤. بلاو بونەوەی هەواڵی گیرانی سەرکردایەتی حسک و حشع، وورەی هێزەکانی جودی لە دوڵی بالیسان و ناوچەکانی تردا دابەزاند. چوینە وەرتی هێزەکانمان کردە دوبەش:

– بەشێکیان لە وەرتێوە بە سارسیوەک دا بو سەرچاوەی مەلەکان.
– بەشێکیان لە دەرگەڵەوە بو سەران و گەرەوان.

لیرە لە باتی خامی سپی، پەڕویەکی زەردمان کردە بازوی ڕاست.

هێزەکان بێ بەرگری گەیشتنە شوێنەکانی خۆیان. لە گەڵ کەمال خۆشناو و هێزەکەی مەلبەندی ٤ لە سەرچاوەی مەلەکان یەکمان گرتەوە. دوڵی مەلەکان و پشتی خەتی و پشتی شیخ وەسان کە ئەیروانی بە سەر مەلەکان دا، بە دەس هێزەکانی جودەوە بو، بە تەقە نەیانتەهێشت بە ئاسودەیی ئاو لە کانیەکە بهێنن بۆ خواردنەوە.

ئەو ڕوژە لەوێ مایەنەوە بۆ پشودان. بە تەما بوین ڕۆژی دوایی لە بەرە بەیان دا پەلاماریان بدەین. ئەوان لە ئیوارەوە دەستیان کرد بە کشانەوە. ناوچەکەیان بە تەواوی چوڵ کرد. ڕوژی دوەم کە چوینە بالیسان بە هەزاران کەس و بە سەدان ئوتومبیل لە هەولێر و شوێنەکانی ترەوە هات بون بە پیرمانەوە. تا ئەو کاتە ئەشەزانی حشع وا چارەڵوس و بیزراون لە ناو خەلک دا، زورایەتی خەلک ڕقیان لیان بو بە «مایەی فیتنە» و «هۆی ئاژاوە» یان ئەزانین.

*

### تەفسیری جود بۆ ڕوداوەکان

دوای ئەوەی سەرانی جود و هێزەکانیان کشانەوە بۆ تهران، سەرکردایەتی جود پیکەوە بەیانێکیان لە سەر ڕوداوەکان دەرکرد و، هەرلایەنەش بە جیا بەیانی خۆی دەرکرد.
جود لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«وکانت ذروة هذه الاعمال الاجرامیة، الهجوم الغادر المفاجئ الذی شنته قیادة (اوك) علی منطقة پشت آشان لتصفیة عدد من مقرات الحزب الشیوعی العراقی والحزب الاشتراکی الکردستانی و الحزب الاشتراکی الکردی (پاسوك)، هذا الهجوم الذی یمر عبر مرحلة جدیدة من الانحطاط والتدهور، وارتکاب ابشع المجازر الدمویة بدعم مفضوح من النظام الدکتاتوری الدموی...»

حشع لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«.. وهل يمكن لاى متتبع للاحداث ان لايربط بين سلوك قادة الاتحاد الوطني الكردستاني هذا والمفاوضات التي تجري بينهم وبين السلطة الدكتاتورية وصفقة المساومة والاتفاق مع صدام. ان كل ديماغوغية قادة الاتحاد الوطني وبراعتهم البهلوانية في الدعاية لايمكن ان تغطي تواطئهم المفضوح مع طغمة صدام حسين.. هذا التواطؤ الذي ظهر في تحضيرهم لهذه الحرب بالتعاون مع اجهزة السلطة ومخابراتها و مرتزقتها..»

پدک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«وان الطبخة التي ينفذها (اوك) ساهمت في الاعداد لها دوائر الامبريالية العالمية بزعامة الامبريالية الامريكية واقطاب الاشتراكية الدولية (سوسيال ديمكرات)، وكافة الانظمة والقوى الرجعية السوداء من اعداء الشعب العراقي والشعب الكردي..»

حسک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«لە رۆژی ١ - ٣ ئایاری ١٩٨٣ دا تاقمی سەوداکاری بە ناو (یەکێتی نیشتمانی کوردستان)، بە گوێرەی نەخشەیەکی گڵاوی تاوانکارانە، کە ماوەیەکی زۆرە ئیشی بۆ دەکەن، بە هاوکاری رژێمی فاشی بەغداد و ئاغاکانیان لە ئیمپریالیزم و هەندێ سەرکردایەتی سۆشیال دیموکراتەکانی رۆژئاوا، وەک ئەلقەیەک لە زنجیرەی نەخشە و پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و هێزی کۆنەپەرست بۆ ناو تێکردن و گەمارۆدانی بزوتنەوەی رزگاری خوازی لە ناوچەکەدا، هێرشێکی کتوپڕی ناجوامێرانەیان کردە سەر بارەگاکانی سەرکردایەتی حیزبمان.. و لایەنەکانی تری جود بە کەلک وەرگرتن لە کۆکردنەوەی چەکدارەکانیان بە ئاگاداری و لە بەرچاوی رژێمی فاشی بەغدا و بە پشتیوانی هەندێ لایەنی هاوپەیمانیان و بە هاوکاری و هاوئاهەنگی راستەوخۆی هێزە چەکدار و جاشە خۆفرۆشەکانی رژێم، بە نیازی قەلاچۆ کردن و لە ناوبردنی تەواوی سەرکردایەتی حیزبمان و حیزبی شیوعی عێراقی و پاسۆک وە بە مەبەستی ئەنجامدانی ئەرکی پێ سپێراویان و جێ بە جێ کردنی مەرجێکی تر لە مەرجەکانی دەست تێکەڵاو کردنە پیلانگێری یەکەیان لە گەڵ رژێم دا..»

پاسۆک لە بەیانەکەی دا نوسی بوی:

«پەردەیەک لە دواپەردەکانی ئەم شانۆ گاڵتەجاڕیە جاش موردیرندەی جەلالی ئەو هەمو کارەسات و مەینەتی و خەیانەت و خۆفرۆشی و کوردکوژی و ریزلێکەری و گەرەلاوژی و ئالۆزی و ناپاکیەی ئەم چەند ساڵەی دوایی جەلالیزمی بێ ئابروە، کە لە ژێر لافیتە و مانشێتی دیموکراسیی (یەکێتی نیشتمانفرۆشانی کوردستان)..»

پێش شەڕی یەکەمی قەندیلیش جود و لایەنەکانی لە شەڕی پروپاگاندەدا دژی یەکێتی زۆریان لەم قسانە کرد بو. ئەمە، یەکێ بو لەو هۆ بنەڕەتیانەی، زەمینەی پەلاماردانی سەرکردایەتی جودی ساز کرد.

*

## تضامنی امی، یان قیرەی قازا

حشع لە سەرانسەری دنیادا هێرشێکی پروپاگاندەیان دەس پێ کرد. شتێ وایان لە گەڵ حیزبی بەعسیش نەکرد بو. ئێمە بە هۆی دابڕاویمانەوە لە دنیا زۆر ئاگاداری ئەم بەزمە نەبوین و گوێمان نەئەدایە. بەڵام زۆری نامە و بروسکەکانیان ئەنارد بۆ بارەگاکەی شام و،

رادیۆی پارتی هەندێکیانی بڵاو ئەکردەوە. ئەوە یەکەم جار بو ناوی هەندێ لەو رێکخراوانە بیبیستین. قاز بە پۆل ئەگەڕێن. هەرچەند یەکێکیان بقیڕێنێ، بێ ئەوەی ئەوانی تر بزانن چی قەوماوە، هەموویان بە یەک دەنگ ئەقیڕێنن. پۆلە قازەکانی ئەم لا و ئەو لاش کە گوێیان لێ ی بێ بۆیان ئەسپێننەوە. ئەمجارەیان (تضامن) ، (الحمی) یەکێ حیزبە شیوعیەکان لە گەڵ حشع دژی یەکێتی دەریان بڕی، لە قیڕەی قازەکان ئەچو. چونکە بێ ئەوەی راستی رووداوەکان بزانن بۆ پشتیوانی لە حشع کەوتنە ناردنی بروسکەی نارەزایی بۆ یەکێتی و، پەلامارادانی. یەکێتی هێزێکی بێ پشتیوان و بێ کەس بو، نە پەیوەندی بازرگانی لە گەڵ ئەو وڵاتانە هەبو رایبگری، نە ئەوتیشی هەبو تا لێیان بپرێ. دوژمنایەتی یەکێتی، بۆ ئەوان، هیچی تێ نەئەچو.

مەکتەبی سیاسی یەکێتی یادداشتێکی دەربارەی رەوتی رووداوەکان ئامادە کرد و، ناردی بۆ حیزبە شیوعیەکان، ئامادەیی خۆی دەبڕی بۆ قبوڵکردنی لیژنەیەکی بێلایەن لەو حیزبانە کە لە رووداوەکان بکۆڵێتەوە بۆ ئەوەی لایەنی بەرپرسیار دیاری بکرێ.

*

نیتیهامەکانی حشع

حشع، شەری پشتاشانی کرد بو بە کەرستەی پروپاگاندە دژی یەکێتی. راستیەکەی زۆری ئەو قسانەی ئەیان کرد درۆی دروستکراو بون:

– ئەیانوت: «ئەم هێرشەی یەکێتی لە سەر داوای حکومەتی بەعس و، بە یارمەتی ئەوان و، بۆ رازی کردنی ئەوان بوە، وەکو بەشێ لە نرخی رێککەوتنی لە گەڵ یەکێتی»

لەو کاتەدا هێزی سەرەکی لە مەیدانی خەبات دا دژی رژێمی بەعس، هێزەکانی یەکێتی بو، هێزەکانی جوقە قورسایەکی سیاسی - چەکداری ئەوتۆیان نەبو. چالاکی گەورەیان خەریک کردنی هێزەکانی یەکێتی بو، بە ململانێ ی دەسەڵات و شەری لاپەلاوە. لە کاتی شەرەکانی قەندیل دا، هێزەکانی یەکێتی بەر هێرشی بەعس کەوت، نەک هێزەکانی ئەوان. گەورەترین چەکی دەستی پێشمەرگەکان: ئارپیجی و بیکەیسی بو.

– ئەیانوت: «هەمو دیلەکانیان کوشتوین»

لەو شەرەدا زۆریان کشانەوە بۆ ئێران، زیاتر لە ٥٠ کەسیان گیرا. لە ناو گیراوەکان دا: کەریم ئەحمەد، ئەندامی م س. مەلا ئەحمەدی بانیخێلانی، ئەندامی ک ن و مەکتەبی ئیقلیمی کوردستان. قادری رەشید ئاسک، ئەندامی مەکتەبی ئیقلیم. ئەمانە ٣ کەس بون لە سەرانی حشع، دەسبەجێ بە رێزەوە بە ڕێ کران بۆ ناوزەنگ. گیراوەکانی تریش نێردرانە وەرتێ. رێگایان درا بو بە ئارەزوی خۆیان کۆنبوونەوەی سیاسی بکەن، تەنانەت کۆبونەوەیەکیان بۆ چلەی کوژراوەکانیان کرد. کەس رێگەی لێ نەگرتن. پاش ماوەیەک هەموویان بەر دران.

– ئەیانوت: «ژنەکانیان کوشتوە و، دەستدرێژیان کردوتە سەر خێزانەکان»

دوای کشانەوەی سەرانی حسک و حشع و چەکدارەکانیان، هەمو خێزانەکانیان لە ناوچەکەدا بە جێ مابون. لە ناو ئەواندا خێزانی فاتیح رەسوڵ و فریشتەی خوشکی دلزار.. بە رێزێکی زۆرەوە رەفتاریان لە گەڵ کرا. هەر کەس ویستی ناوچەکە بە جێ بهێڵێ ولاخی بۆ دابین کرا و، ئەوەی پێویستی بە پارە بو یارمەتی درا و، ئەوەی مایەوە کەس زۆری لێ نەکرد بڕوا. تەنیا ١ ئافرەتی شیوعی کوژرا بو، ئەویش وەکو دوایی خۆیان لە ژننامەکەی

دا نوسی بویان، تا دوا فیشەک ئازایانە شەڕی کرد بو.

– ئەیانوت: «بارەگا و ماڵەکانیان تاڵان کردوین»

جیگەی داخە، تاڵان و ڕواندروت بەشیکە لە نەریتی کۆنی شەڕوشۆڕی کوردەواری. دوای کشانەوەیان هەمو کەلوپەلی بارەگاکانیان: بەڵگە و کتیب، چەکی قورس، بەتانی و خەیمەت، ئازوقە، دەرمان.. کەوتە دەس هیزەکانی یەکیتی. هەشتا زوری بارەگاکانی خوی تیک دابو. رادیو، کەلوپەلی نەخوشخانەکانیان خراپ کرد بو، پارچەی گرنگی هاوەن و دۆشکاکانیان دەرهینا بو بۆ ئەوەی یەکیتی کەلکیان لی وەرنەگری.

*

زوری بەڵگەکانی حسک، پاسوک، حشع کەوتە دەس و دەستبەجی نیردران بۆ ئاوزەنگ. لە سەر ئەم شەڕە نامیلکەیەکی تایبەتی پشت ئەستور بە بەڵگە گیراوەکان بڵاو کرایەوە. بەڵگەکان لە ئارشیفەکەی مامجەلال دا هەلگیراون.

*

## خۆشناوەتی

خۆشناوەتی بەو ناوچەیە ئەڵین کە شوینی ژیانی عەشیرەتی خۆشناوە. خوشناو پیک هاتوە لە تیرەکانی: میر مەحمەلی، میر وسوێی، پشت گەری (پشت گەلی) و، ئەوانیش ئەبن بە چەند بەرەبابەوە. لە لای سەرویەوە لەگەڵ عەشیرەتەکانی هەرکی و سورچی و، لە لای خوارویەوە لە گەڵ پیران (بلباس)، لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە لە گەڵ ئاکۆ و، لە لای ڕۆژئاوایەوە لە گەڵ گەردی و هەرکی هاوسنورە. لە ڕوی بەڕیوەبەرایەتیەوە دابەش بوە بە سەر ناحیەکانی مەرکەزی شەقلاوە، کۆیە، هیران، لە پاریزگای هەولیر و، ناحیەی بیتواتە لە پاریزگای سلیمانی.

عەشیرەتی خۆشناو سەرۆکایەتیەکی یەکگرتویان نەبوە. ڕیچ، لە گەشتەکەی دا بۆ کوردستان ساڵی ۱۸۲۰، لە دانیشتنیک دا لە گەڵ پیاوماقولەکانی بابان لە سلیمانی، کە باسی یەکیتی فیدراڵی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای بۆ کردون، یەکیکیان وتویەتی جۆری بەڕیوەبەریتییەکەیان لە هی خۆشناو ئەچی. مەبەستی ئەوە بوە کە سەرۆکایەتیەکی یەکگرتویان نەبوە کیشەکان بە لادا بخا، بەڵکو چەند کەسی لە سەرۆکەکانی تیرەکانیان ئەنجومەنیان گرتوە بۆ باس و بڕیاردانی.

سەرۆکەکانی خۆشناو نازناوی بەگیان هەیە، بەڵام عەشیرەتەکەیان پییان ئەڵین: میر و میران. میرەکانی خۆشناو رەفتاریان لە گەڵ جوتیارەکان زۆر خراپ بوە و، سزای قورسیان داون، وەکو دەماودەم ئەگیڕنەوە بۆ چاوترساندن و بۆ سزادان، تەماشی گوێیان لە سەر سەری زەلامی زیندو ناشتوە و، بە پێ ی پەتی بە سەر ستیری (درکە زی) دا گیزەیان پی کردون.

صدیق بەگ، یەکی لە سەرۆکە دەسرۆیشتوەکانی عەشیرەتی خۆشناو، یا وەکو خۆیان پییان ئەوت صدیق میران، لە گەڵ مەلا مستەفا ناکۆک بو. ئاقسی لە کارانیەکانی، کە خۆشناو و ئەندامی پارتی بون، ڕاسپارد یۆسفەکیان بۆ دانا کوشتیان. حکومەتی قاسم لە سەر ئەوە فەرمانی گرتنی ئیبراهیم ئەحمەد، کە ئەوسا سکرتیری پارتی بو، دەرکرد. دوای ئەم ڕوداوە ئەم بنەماڵەیە ئیتر بە لای حکومەت دا کەوت و، بو بە یەکی لە چەکهەڵگرە دلسۆزەکانی حکومەت و، بەشدار بو لە دروستکردنی فورسان صەلاحەدین، مەفرەزە خاصە،

فەوجی خەفیف...

ئەنوەر بەگ، یەکێکی کە لە سەرۆکەکانی خۆشناو، لە سەرەتای دەس پێ کردنی شۆرشی ئەیلول دا بەشداری کرد و، یەکێ لە بنکە سەرەکییەکانی لە بێتواتە دانرا. سەرەنجام لە گەڵ کاربەدەستەکانی بارزانی بە تایبەتی عەلی شەعبان، کە بێتواتەی کرد بو بە بارەگای خوی، تێکچو، ئەنوەر بەگ چوە پاڵ حکومەت و، بو بە یەکێ لە چەکهەڵگرە دڵسۆزەکانی حکومەت و، بەشدار بو لە دروستکردنی فەوجی سەلاحەدین، سەفەرزە خاصە، فەوجی خەفیف...

جیا لەمان هەزاران کەس لە روشنبیر و جوتیارانی خۆشناوەتی لە شۆرشی ئەیلول و، لە شورشی حوزەیران دا بەشدار بون.

خۆشناوەتی بە گشتی شاخاوییە. گوندەکانیان کەوتۆتە بناری شاخەکانی ماکۆک، شیشار، هەوری، سەفین، پیرمام، بنباوی. ئاووهەوای خۆش و کانی و ئاوی سازگار و دیمەنەکانی جوان و دلگیرن. ئاژەڵداری و، کشتوکاڵ: رەز و باخ، دانەویلە، توتن و سەوزە ئەکەن و، دۆشاوی ترێ ی خۆشناوەتی بە ناوبانگە. بزنی مەرەز رائەگرن و، بێتواتە جۆلای هونەرمەند و زانای لێ بو، «کۆ» ی تەنک و ئاپاییان دروست ئەکرد.

*

پەندێک لە خۆشناوەتی

ئافرەتێکی پیرەژن دو هێزە دۆشاو، هێزەیەک دۆشاوی رەش و هێزەیەک دۆشاوی سپی، ئەدا بە کولی دا بیبا بۆ فرۆشتن. لە رێگایەکی چۆڵ توشی کابرایەک ئەبی. کابرا لێ ی ئەپرسی: «ژنەکە کۆڵەکەت چییە؟»

ژنەکە ئەلی: «دۆشاو».

کابرا ئەپرسی: «ئەیفرۆشی؟»

ژنەکە ئەلی: «بەلی». ژنەکە لە دلی خۆی دا ئەلی ئەگەر لەم نیوەی رێگایە کریارێکم لێ پەیدا بی لەم بکری باشتر نیە لەوەی ئەو رێگا درێژە بپێوم؟

کابرا ئەپرسی: «ئەتوانم تامی بکەم؟»

ژنەکە ئەلی: «بەلی». کولەکەی دائەگری. دەمی هێزەیەکیان ئەکاتەوە.

کابرا پەنجەیەکی لێ ئەدا و تامی ئەکا. ئینجا ئەلی: «حەز ئەکەم ئەوی تریش تام بکەم».

ژنەکە ملی هێزە کراوەکەی بە دەستەوە ئەبی، دەمی هێزەکەی تریش ئەکاتەوە بە دەستەکەی تری ئەیگری. کابراکە دەس ئەکا بە یاری کردن لە گەڵ ژنەکە و دەس ئەبا بۆ ران و ناوگەلی. ژنەکە ئینجا تێ ئەگا مەبەستی کابرا چی بوە، بەلام کەوت بوە هەلوێستێکی دژوارەوە: دەس لە هێزەکان بەر بدا، بۆ ئەوەی خۆی لە کابرا بپارێزی، دۆشاوەکەی ئەرژی، دەس لە هێزەکان بەر نەدا کابرا سواری ئەبی. ژنە لە داماوی دا نازانێ کامیان هەلبژێری، ئەلی: «وای لە قونێ! وای لە دۆشاوێ!»

ئەمە نمونەی «ئیبتیزاز» و «حیز فرسەتی» ، لە زمانی کوردی دا.

*

چوینە بالیسان. دۆلی بالیسان بە ناوی گوندی بالیسانەوە ناو ئەبرا. کەوت بوە نێوان زنجیرەیەک چیاوە: ماکۆک – دەرە شیر – باری خەتی. زنجیرەی هەوری – کلاوقاسم

- بنی هەریر. چیای شیشار. رۆژهەلاتی سەر بە سلێمانی و، رۆژئاوای سەر بە هەولێر بوو. دۆڵێکی ئاوەدان و پڕ لە ئاوایی بوو. گوندەکانی: شیوە، دەراش، میرگەسەر، خەتی، لوقمی، زینی، چیوە، وەری، مەلۆک، بیراوە، کانی بەرد، ئەندێک، ئەنگوز، نواوە، دواوە، زیوە، هەرتەل، هەرمک، سویرە.. لە بناری ئەم شاخانەدا بوون. بارەگای مەلبەندی چواری یەکێتی لە بالیسان و، بارەگای لایەنەکانی جود: پارتی لە بالوکاوا و، حشع لە شێخ وەسان و، حسک لە . جادەیەکی لیری گرنگ بە ناوەراستی دۆڵەکەدا کرابووەوە رانیەی ئەبەست بە خەلیفان، واتە بە جادەی هەولێر - حاجی هۆمەرانەوە.
چەند رۆژێ لە بالیسان مابینەوە، خەلکێکی زۆر لە هەولێر و سلێمانیەوە هاتن بۆ لامان. مەلبەند چووە جێگای خۆی. سەرلەنوێ تیپەکانی: سەفین، هەوری، کۆسرەت، دەشتی هەولێرمان رێکخستەوە و، هەندێ ئالوگۆڕمان لە سەرتیپەکان دا کرد. هەندێ لە هێزەکانی حسک کشا بوونەوە ناوچەکانی نازەنین، سماقولییەکان، دەشتی هەولێر..

*

بەرەو سەفین
دوای چەند رۆژێ لە گەل تیپەکانی سەفین، کۆسرەت، دەشتی هەولێر، کەرکوک، گەرمیان، سەگرمە.. بە شاخی هەوری دا چووین بۆ نازەنین. نازەنین لە بناری سەفین دایە. کەوتۆتە ئەنیشت هیران کە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناحیەی خۆشناو بوو. گوندێکی ئاوەدان و خۆش و کانی زۆری تێ دا بوو رەز و باخی خۆشیان هەبوو. باخەکانیان زۆری هەنار بوو. هەناری نازەنین بە ناوبانگە. ترش و شیرین و میخۆشیان هەبوو. سرکەی ناپابیان لێ دروست ئەکرد. یەکێتی لە ناو خەلکی نازەنین دا ئەندام و لایەنگری زۆری هەبوو. کۆمەلەش رێکخستنێکی باشی هەبوو.

*

مەلای معاشخۆر
پێش چەند رۆژێ لە پێکدادانێک دا، لە نێوان مەفرەزەیەکی یەکێتی و مەفرەزەیەکی جودا، پێشمەرگەیەکی یەکێتی کوژرا بوو. تەرمەکەیان برد بوو نازەنین بینێژن. مەلای مزگەوتەکە سەر بە بەعس بوو، نەیهێشت بوو تەرمی پێشمەرگەکە بێنە مزگەوتەکەی و، لە گۆرستانی ئاوایی دا وەکو موسولمان کفن و دفنی بکەن، وت بووی: «ئەمانە کافرن!» پێشمەرگەکە خەلکی ئەو ناوچەیە نەبوو، مەلاکەیش نەیناسی بوو، تەنیا ئەوەندەی زانی بوو کە پێشمەرگەی یەکێتی بوە و، یەکێتی پێش لەو کاتەدا شکا بوو.
مەلاکەم بانگ کرد، هەندێ سەرزەنشتم کرد، وتم: «تۆ نوێژ بە پارە ئەکەی، هەر نوێژێ بە دیناری ئەکەیت، ئەگەر معاشەکەت بڕن، ئیتر مەلایەتی ناکەیت و، رەنگە واز لە نوێژکردنیش بهێنی، کێی حەقت بە خۆت داوە بێ ئەوەی ئیمە بناسی بە کافرمان ئدابنی ی و، ئەهیلی لە گۆرستانی ئیسلام دا بمانێژن. ئەی لیرە بڕۆ!» کابرا لە گیانی خۆی ئەترسا و، پەشیمانی لە قسەکانی دەربڕی، بەلام بایەخم بە قسەکانی نەدا داوام لێ کرد ناوچەکە بە جێ بهێلێ.

*

دوای چەند رۆژێ بە سەفین دا چووینە دۆلی سماقولی. خۆم لە سماقولی سەروچاوە و، هێزەکانی تریش لە قەلاسنج، زیارەت، سوسی، گرتک.. بلاو بوونەوە و، بارەگایان دانا.

مەفرەزەکانی حەسەک زیاتر لە ۲۰ ئوتومبیلیان لە دوای خۆیان بە شاردراوەیی بە جێ هێشت بو. ئوتومبیلەکان ئەوەی هی خەلک بو دامانەوە بە خاوەنەکانی و، ئەوەی هی حکومەت بو دابەش کران بە سەر تیپەکان دا. لەم میراتیە منیش پیکابێکی دەبل کابینم پی برا. تیپەکانی هەوری، سەفین، دەشتی هەولێر، کۆسرەت.. مان ناردەوە شوێنەکانی خۆیان.

*

سماقولیەکان

سماقولی چوار گوندن لە ریزی یەک: سەروچاوە، گرتک، سپنان، گەلی. هەرچواریان کەوت بونە بناری سەفین بەرامبەر شاخی بنەباوی.

«سماقولی» رەنگە کورتکراوەی ئیسماعیل قولی بی. قولی بە تورکی ئازەری واتە: بەندە، کۆیلە. هەتا ئیستایش لە ئیران دا عەلی قولی، حسەین قولی، رەزا قولی زۆرە کە لە جیگای عبدالعلی، عبد الحسین، عبدالرضای عەرەبی بە کاری ئەهێنن و، لە کوردی دا ئەبی بە بەندەی عەلی، بەندەی حسین و بەندەی رەزا. سماقولی واتە بەندەی سمایل.

«گرتک» وەکو لێرە ناوی گوندە لە پشدەر و بالەکایەتی یش هەمان ناو هەیە. گرتک، گردک، گردۆلکە. گردی بچوک.

سەروچاوە، سەرچاوەیەکی گەورەی ئاو و چەند کانیەکی لی بو. رەز و باخی خۆش و سپیداری راست و بالا بەرزیان هەبو. کویخا عەزیز و کویخا عەبدە هەردوکیان لە سەروچاوە دانیشتان دو پیاوی کوردپەروەر و بەریزی ناوچەکە بون. هەرچەندە خزمی یەکتری بون، بەلام لە گەل یەک ناکۆک بون. کویخا عەبدە بە منالی لە کویە خوێند بوی. خوێندەوار و تیگەیشتو بو.

دولی سماقولی بەستراوە بە دولیکی ترەوە پی ی ئەلین دۆلی تەسحابان لە سەر ئاوی هیزۆپ تەواو ئەبی. بە دریژایی دۆلەکە هەزاران گۆری لی یە. وەکو دانیشتوانی ناوچەکە ئەگیرنەوە لەم دۆلەدا شەریکی قورس لە نیوان ئەسحابە و کافرەکان دا بوە. ژمارەیەکی زۆر ئەسحابە کوژراون و، لەو شوینانەدا نێژراون. بەلام هیچ بەلگەیەکی میژوی پشتیوانی لەم قسانە ناکا. رەنگە ئەفسانە بی.

لە ناوی روباری هیزۆپ دا لە ئاستی جەلی کانیەک هەلئەقولی گەرماوە. ئاوەکەی گەرمە زۆرجار پیشمەرگە بە زستان خۆیان لی ئەشت.

شوینەواری هەندی قولله و قەلا لە ئاوەگرد مابو. ئاوەگرد بەشیکە لە زنجیرەی سەفین خەلک ئەیانوت هی سەردەمی میر محەمەدەدی میری سۆرانە. ئەبی پیش ئەویش ئاوەگرد قەلای لی بوبی، چونکە یەکی لە لەشکرکیشیەکانی والی بەغداد بۆ سەر میرەکانی بابان لەم دۆلەدا بە گرتنی ئاوەگرد تەواو بوە.

چەند وشەیەکم لەو ناوە بیست وابزانم وشەی تایبەتی خۆشناوەتی بن، چونکە لە شوینی تر باو نەبون، لەوانە:

ئەورک: ناو قورگ، گەرو.

خوزی: تەرایی ناو گەرو. وەکو: خوزی لە ئەورکدا هیشک بوە.

کەپک: تەپلە سەری شاخ. وەکو کەپکی خانزاد و کەپکی شەلانە لە سەفین و کەپکی حەمەداغا لە بنی هەریر. رەنگە ئەمیش لە کەپو، وەکو لوتکە لە لوتەوە داتاشرا

بی.

گەڵ: هەرشە.

شێلر: لێڵ بوێی ئاو.

زیندی: ئەسپی.

*

### فشە

کە گەیشتینە خۆشناوەتی، بە گاڵتەوە بە هەندێ لە فەرماندەکانی هێزەکەم وت: «لەم ناوچەیەدا سەید کاکە فشەی کردوە بە باو. ئەوەی فشەی زل و درێژی گەورە بکا دەربارەی ئازایەتی خۆی بە پیاوێکی رەشید ناو دەر ئەکا. ئێوەش تا لەم ناوچەیەداین بە ئارەزوی خۆتان فشە بکەن!»

لە گوندێکی خۆشناوەتی دو کوڕی خزمی نزیکی یەکتری، بەلام لە گەڵ یەک ناکوک بون. هەردولایان کوردپەروەر و دۆستی پێشمەرگە بون. ئەمویست ئاشتیان بکەمەوە. گوندەکەیان دوژمنایەتی تی دا نەشما و، ئێمەش لە یەکگرتنەوەی ئەوان قازانجمان ئەکرد. سامان و رویستەم راسپارد بو بکەونە پەیتیانەوە و، خەریکی ریکخستنەوەیان بن و منیش دوا قسەی تی دا بکەم. هەردولا رەقیان ئەنواند و ملیان نەئەدا و، مەرجەکانی یەکتریان قوبوڵ نەئەکرد.

یەکی لە ناوبژیکەرەکان سەیر ئەکا بە قسەی خۆش و ئامۆژگاری کەسیان نایەتە سەر ریگای ئاشتبونەوە و ریککەوتن، لە مزگەوتەکەدا کە ئەوان و، زۆری پێشمەرگە و فەرماندەکانیانی لی ئەبی، ئەلی: «ئەزانن لە دی یەکی گەرمیان لە گەڵ دو کەس زور خەریک بوین ریکیان بخەینەوە. کەلکی نەگرت بو ئەوەی ئاژاوەکە بکوژێنمەوە هەردوکیانم گرت. ئەوتم پی دا کردن و، هەردوکیانم سرتان. ئیتر ئاواییەکە رزگاری بو لە دەستیان..»

یەکێ لە برادەرەکانم هاتەوە بە پیکەنینەوە وتی: «تۆ بە ئیمەت وت فشە بکەن! مەبەستت ئەوە بو: فشە بو خومان بکەین یا بو خەلک!» وتم: «بو خەلک» وتی: «فلان فشە بو خومان ئەکا!» چیروکەکەی بو گیرامەوە کردمان بە پیکەنین.

*

### گردەسور و حەمامۆک

لەم ماوەیەدا دو چالاکی پێشمەرگەیی گەورە بو، لە سەرانسەری کوردستان دا دەنگیان دایەوە. یەکیکیان بۆسەیەک بو تیپی ۲۱ ی کەرکوک لە حەمامۆکی نزیک کۆیەوە بو هێزێکی هاوبەشی دەزگا سەرکوتکەرەکانی نایەوە. ۱۸ کەسی تی دا کوژرا. زۆریان تکریتی بون. ئەوی تریان، شەرێک بو لە گردەسور تیپی ۸٦ ی دەشتی هەولیر کردیان. هێزێکی گەورەی جەیش بە پشتیوانی کۆپتەر چو بوە سەریان. هێزەکەی حکومەتیان شکاند و کوشتارێکی زۆریان لی کردن و لاشەی کوژراوەکان لە شەرگەکەدا بە جی مان.

*

### شەهابە چەپڵ

لە سەرچاوە، لە زۆرەکەی بەرامبەرمان تاقمی لە پێشمەرگەکان بو پاریزگاری ئیمە ئەنوستن، روژێکیان یەکی لە پێشمەرگەکان هات وتی: «هەمومان توشی گەری بوین»

ورگ و ملی پیشان دام کرێشێکی زۆری کرد بۆ ئەبەنزانی لە چیمەوە توش بون. زیاتر لە ۲۰ پێشمەرگە نەخۆشیی پێستیان گرت بو. لەوانە بو بگاتە ئێمەش. پزیشک هات سەیری کردن. چارەی نەخۆشییەکەی دۆزییەوە. ئەبو هەمو ڕۆژێ بە ئاوی شلەتێن خۆیان بشۆن و، جۆری دەرمانی بۆ نوسین، خۆیاتی پێ بهێنن. فانێلە و کراسی تازە لە بەر بکەن. نوینەکانیان بگۆڕن یا هەمو ڕۆژێ لە بەر خۆر هەڵی بخەن. تا چاک ئەبنەوە. لەو هەلومەرجەدا کارێکی گران و، مەسرەفێکی زۆر بو. هەواڵمان نارد بۆ ڕێکخراوی هەولێر دەرمان و جلوبەرگ بنێرن.

ویستم هۆی بڵاو بونەوەی بدۆزمەوە. دوای تۆژینەوە دەرکەوت کوڕێکیان لە گەڵە لە مێژە ئەم نەخۆشییەی گرتوە و لی ی کۆن کردوە قسەی نەکردوە، بە ئەنقەست هەمو ڕۆژێ جلوبەرگی پێشمەرگەکانی تری لە بەر کردوە و، بە نوینەکانی ئەوان نوستوە. بەم شێوەیە هەمویان گرتویانە. ئەمە چەنابە (موظف صحی) هێزەکەیانە و، ناوی شەهابە و، خەڵکی خانەقینە.

ڕەوشتی ئەم کابرایەم بە لاوە سەیر بو، پێشمەرگە ئەبێ خۆی لە سەر هاوڕێکەی بە کوشت بدا، کەچی ئەم نەخۆشی تی دا بڵاو کرد بونەوە، لە کاتێک دا خۆی لە بواری تەندروستی دا کاری ئەکرد. بڕیارم دا لە پێشمەرگایەتی دەری بکەم، بەلام پێش ئەوە نیوە گیانی بکەم بۆ ئەوەی جارێکی تر تاوانی وا دوبارە نەکاتەوە. بانگم کرد زۆرم لۆمە کرد و، وتم: «لە بەر ئەوەی تۆ ئەم تاوانەت کردوە، لەوانەیە خەڵکی تریش توش بکەیت، بڕیارمان داوە بتسوتێنین!» بە تورەییەوە بە پێشمەرگەکانم وت: «بیبەن بیسوتێنن!»

کابرا تا ماوەیەک وایئەزانی بە ڕاستی ئەیسوتێنن. شەهاب لە پێشمەرگایەتی دەرکرا. بەلام مانگێ زیاتری پێ چو تا پێشمەرگە نەخۆشەکان چاک بونەوە.

*

مەفرەزەکانی جود، بە تایبەتی هی حسێک، کەوتنە هەلومەرین: هەندێکیان هاتنە ناو یەکێتییەوە، هەندێکیان چونە پاڵ ڕژێم و بون بە جاش و، هەندێکیشیان لە پەڕانەتیەوە چون بۆ برادوست و بارزان. چەکداری جود لە ناوچەکەدا نەما. دوای چەند هەفتەیەک منیش ئیتر ئیشم لە سماقولییەکان تەواو بو، گەڕامەوە دۆڵی بالیسان.

*

مەلای خەتی

ماوەیەک لە قوتابخانەکەی گوندی «خەتی» دابەزیم. خەڵکی خەتی و، دانیشتوانی ناوچەکە بە گشتی لە گەڵ ئێمە دوست و هاوکار بون. مەلای خەتی خەڵکی ئەم گوندە بوە. لە ناو مێژوی کوردا تاوانی خیانەتی گەورە لە نەتەوە و نیشتمان ئەدرێتە پاڵ دو مەلا: ئیدریسی بتلیسی و مەلای خەتی.

دوای شەڕی چالدێران، بەشی زۆری سەرزەمینی کوردستان و، میرایەتیەکانی کورد کەوتە ژێر دەستی عوسمانییەوە، هەندێ کەس تاوانی ئەمە ئەخەنە ملی مەلا ئیدریس. بە پی ی لێکۆلینەوەکانی من: مەلا ئیدریس مێژونوسێکی گەورە و ئاگادار و، دیپلۆماتێکی زانا و زیرەک و، کوردێکی دلسۆز بوە. ئەوانەی ئەم تاوانەی بە پاڵ ئەدەن هیچ بەلگەیەکی مێژوییان بە دەستەوە نیە. ئەوی ئوبالی داگیرکردنی کوردستانی لە مل دایە دوبەرەکی ناو میرەکانی کورد بوە، نەک ئیدریسی بتلیسی.

بە گوێرەی بەندوباوی ناو خەڵک و، گێڕانەوەی هەندێ لە مێژوونووسەکانی کورد، وەکو: حوزنی موکریانی لە «میرانی سۆران» و عەلادین سەجادی لە «شۆڕشەکانی کورد»، مەلا محەممەدی خەتی، یەکێ لە مەلا گەورەکانی سەردەمی خۆی و، موفتی میرایەتی سۆران بوو. کە لەشکری تورک هێرشی هێناوەتە سەر میر محەممەدی میری سۆران، مەلا محەممەد فتوای داوە: «بەرەنگاریی لەشکری خەلیفەی ئیسلام جائیز نیە و، هەرکەسی شەڕی لە گەڵ بکا تەڵاقی ئەکەوێ.» لە ئەنجامی ئەم فتوایەدا لەشکرەکەی میری سۆران بڵاوەیان لێ کردوە، میری سۆران خۆی داوە بە دەست لەشکری تورکەوە. بە گێڕاوی ڕەوانەی ئەستەمولیان کرد و، هەرگیز نەگەڕایەوە و، هەواڵی نەبوو. میرایەتی سۆران کۆتایی هات.

*

## مەلیخا

حوزنی لە کتێبەکەی دا: «میرانی سۆران» باسی کتێبێک ئەکا، وەکو سەرچاوەی سەرەکی بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکانی سەردەمی میر محەممەد بە ناوی «مەلیخا»، کە میرزا محەممەدی وەقائیع نیگار بە شیعر هەڵی بەستوە. جەلیلی جەلیلیش لە پێشەکی کتێبەکەی دا دەربارەی «میرایەتییە کوردیەکانی ناو ئیمپراتۆریی عوسمانی» باسی دەستنووسێکی ئەم کتێبە ئەکا، کە لەشکری ڕووسیای قەیسەری لە شەڕەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی دا لە داگیرکردنی ڕەواندزدا دەستی کەوتوە و، لە یەکێ لە کتێبخانەکانی یەکێتی سۆڤیێتی جاران دا بوە. لە زۆر مەلا و خوێندەواری ناوچەکەم پرسی و، چەندی سۆراخم کرد، نە لە لای کەس هەبوو و، نە هیچیان لێ ئەزانی.

حوزنی وا باس ئەکا میری سۆران کانی ئاسنی لە ڕووستی دۆزیوەتەوە، ئاسنی لەوێ دەرهێناوە بۆ دارشتنی چەکەکانی. ڕەنگە ئەمە وابێ، بەڵام دانیشتوانی ناوچەکە، وەکو لە زمانی باوو باپیرانیانەوە ئەیانگێڕایەوە: هەرچی پارچە ئاسنی شکاو و ناڵ و، هەوجەزش لە ناوچەکەدا هەبوە کۆیان کردۆتەوە، لولەی تۆپەکانیان لەوە دروست کردوە نەک لە کانە ئاسنی ڕووستی.

*

## حەسەن مارگر

یەکێ لەو پێشمەرگانەی شاهۆ هەڵی بژارد بوون، لە دەستەکەی من بێ، کوڕێکی گەرمیانی وریا بوو، ناوی حەسەن بوو. پێشمەرگەکان ناویان نابوو: حەسەن مارگر، چونکە مار و دووپشکی ئەگرت و، ترسی پێشمەرگەکانیشی لە گرتنیان ئەشکاند. حەسەن شارەزاییەکی زۆری پەیدا کرد بوو لە مار و دووپشک و جۆرەکانیان دا.

ئەوەندەی من گەڕاوم لە سەرانسەری کوردستان دا مار و دووپشک هەیە. مارەکان، هەندێکیان ژەهراوین و هەندێکیان ژەهراوی نین، بە گشتی گەورە نین، بە دەگمەن هەیە لە مەترێک درێژتر بێ. هەژدیها، کە لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن حەزیا یا شامار، لە فۆلکلۆردا باسی ئەکرێ، دەعبایەکی ئەفسانەییە، بە ڕاستی نەبوە، یا نەماوە.

لەو هەموو ساڵانەدا، ئەوەندەی من بیستومە، تەنها دوو جار ڕێکەوتی کردوە مار پێوەی بە پێشمەرگەیەوە داوە. ئەویش لە تاریکایی شەودا نەیان دی بوو پێیان پێ دا نابوو.

مار، چەند جۆری هەیە، وەکو: تیرە مار، ڕەشمار، زەردە مار، سجە مار، سفرە

مار، سپسپە مار، شلە مار، کوێرە مار، کولە وەپیاب، کولە کوێر.. هەندێ لە مانە لە هەندێ شوێن هەن و لە هەندێ شوێنی تر نین.

تولە مار، بەچکەی مارە.

مار لە زستان دا سڕ ئەبێ، لە بەهارا کاژ فڕێ ئەدا، ئەگەزێ یا پێوە ئەدا، کە ماندو یا تینوی ئەبێ ئەیهێشکێنێ، بۆ ڕاوشتن ئەکشێ و، بۆ پشودان پەپکە ئەخوا، ئەگەر ئازاری ئەدری بە زوری بێ وەزەن ئەبێ.

دوپشکیش چەند جوری گەورە و ناوەنجی و بچوک و، زەرد و رەش و کالی هەیە. جورەکانی و ناوەکانی بە گوێرەی ناوچەکان ئەگۆڕێن: چزەپیالە، کلاشدوم، سزلسزلە، جەرراحە، دمارەکۆڵ، دوپشکە رەشە.. هی هەندێ ناوچە کوشندەن، بە هەر کەسێکەوە بدەن بە دەگمەن لە مردن دەرباز ئەبێ.

حەسەن زۆر ڕۆژ ماوەیەکی باش خۆی ون ئەکرد، بە دوای مار و دوپشک دا ناو کەلەکی بەرد و چەم و پەرژین و کون و کەلەبەر ئەگەڕا.

کە ماری ئەدۆزییەوە بزقەتەی ملی ئەگرت و، پەتێک یا گوریسێکی پەنی لە داتی گیر ئەکرد. داتی هەڵ ئەکێشا ئەوسا یاری پێ ئەکرد. زۆر جار پەری ئەدان.

کە دوپشکی ئەدۆزییەوە چیلکەیەکی ئەخستە سەر پشتی. دوپشکەکە کلکی کلاتە ئەکرد بە چیلکەکەوە بدا، گسری ی پێش چزوەکەی ئەگرت و، بە شتێکی رەق نوکی چزوەکەی، کە زۆر کورت و لە مو باریکترە، ئەشکاند، ئەوسا ئەی خستە سەر دەستی یاری پێ ئەکرد».

تا چوینە بەری مەرگە حەسەن لە گەڵمان بو. ئیتر پێویستمان پێ ی نەما، ڕێگەم دا بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆیان، لە چالاکییەکی پێشمەرگەدا کوژرا.

*

چەند کەسێ لە کادرەکانی ناوچەی هەولێر لە ناو خۆیان دا کەوتبونە قسە و قسەلۆک کە گوایا من سلێمانچێتی ئەکەم، هەرچی خەڵکی سلێمانی نەبێ ڕێگای نادەم کاری بەرپێتی و باوەری پێ ناکەم.

ڕۆژێک لە بالیسان کۆبونەوەیەکم پێ کردن بۆ ئەوەی ئەم قسەیەیان لە گەڵ باس بکەم، بە ژمارە ئەندامانی م س، ک س، مەسئولی مەڵبەندەکان، ئەندامانی مەڵبەندەکان، لێپرسراوی ڕێکخراوەکانی کومەڵە، سەرتیپەکانی پێشمەرگەم.. بۆ باس کردن و یەک بە یەک شوێنی لە دایک بون و گەورەبونیانم بۆ ڕون کردنەوە. دەرکەوت ئەم قسەیە هیچ بناغەیەکی نەبو. ئینجا پێم وتن: «ئەم بیرکردنەوەیەی ئێوە سەیرە. ئێوە خۆتان بە ئینتەرناسیونالیست دائەنێن، هەندێکتان خۆی بە کۆزمۆپۆلیت ئەزانێ. ئەبو بە لاتانەوە گرنگ نەبێ مەسئول خەڵکی کوێ یە! بەڵکو چەندە خزمەتی شۆرش و کومەڵە و یەکێتی ئەکا» زۆرجار مرۆڤ چەندە ئیدیعای گەورە بێ، بەڵام دنیا هەر لە کونی قازانجەکانی خۆیەوە ئەبینێ.

*

بارەگاکەی من کە لە ئوتابخانەکەی خەتێ دا بو زۆر ئەوبالغ بو. جەنگی عێراق - ئێران لە ناوچەی حاجی ئومەران زۆر گەرم بو. هەمو ڕۆژێ چەند جارێ پۆلە فڕۆکە و هالیکۆپتەری عێراق بە سەر خۆشناوەتی دا ئەچون بۆ مەیدانی شەڕ. ترسام ڕۆژێک ئێمەش

بوردومان بکەن. گوێزاماتەوە سەر «کانی بەرد». شوێنەکەی قایم و، بو خۆپاراستن پیچ و پەنا و، تاشەبەردی زۆری لی بو.

*

رقی ئافرەت

خولی یەکەمی شەڕی جود تەواو بو. ئەو کاتە من ناوم کەوت بوە ناوان. دوستەکانی جود بە خراپ و، دوستەکانی یەکیتی بە چاک تێیان ئەڕوانیم.

ڕۆژێکیان پۆلە فڕوکەی عیراق وەکو شارە زەردەوالەی وروژاو ئەفڕین بەرەو ناوچەی حاجی ئومەران. ئیمە لە «کانی بەرد» دانیشت بوین، وەکو ڕۆژەکانی تر خەریکی کاری ڕۆژانەی پێشمەرگە بوم. عەلی پچکۆل لە خەتی بو، نامەیەکی بۆ ئاردم نوسی بوی: دو کچی ناسیاوم لە سلێمانیەوە هاتون ئەیانەوێ بێن بۆ سەردانت، ئەگەر ماوەت هەبی بیانبینی. زۆرم پی خۆش بو. حەزم ئەکرد ئەختی کەشی کۆڕی دانیشتنەکانم، کە بە زۆری لە گەل پێشمەرگە و لادێی بو، بگۆڕم. وەلامم دایەوە بیان نێری.

کچەکان گەیشتن بە گەرمی پێشوازیم کردن و بە خێر هاتنم کردن. پیکەوە دانیشتین. پێشمەرگەکان ئاو و چایان بۆ هینان. پرسیارم لی کردن: ناویان چیە و، ئیشیان چیە؟ هەردوکیان فەرمانبەر بون. یەکێکیان خەلکی لای کەرکوک و، ئەوی تریان خەلکی لای سلێمانی بو. کەرکوکیەکەیان جلوبەرگی ئاسایی لە بەردا بو، شوی کرد بو بەلام لە سەر جیاوازی بیروباوەڕی سیاسی لە گەل میردەکەی ناکوک بو، ئەم سەر بە جولانەوەی کورد و میردەکەی سەر بە حکومەت بو. سلێمانیەکەیان ئافرەتێکی بالابەرز و جلێکی کوردی ڕازاوەی تەنکی لە بەر کرد بو، هێشتا شوی نەکرد بو. بە دەم و دوانیان دا وریا و زیرەک و تێگەیشتو بون..

وتم: «هیچ کارێکی تایبەتیتان هەیە بە من بکری بۆتان بکەم؟»

وتیان: «هیچ کارێکمان نیە. هاتوین لە نزیکەوە تەعاروف و ئەگەر کاتت هەبی هەندی موناقەشەت لە گەل بکەین!»

وتم: «فەرمو! بە ئارەزوی خۆتان موناقەشە بکەن»

سلێمانیەکەیان پرسی: «باوەڕت بە خوا هەیە؟»

بە لامەوە سەیر بو موناقەشەکانی بەم پرسیارە دەس پی کرد، بەلام تێگەیشتم خۆی بە چەپێکی ئازادیخواز و سەربەست و کراوە ئەزانی. وتم: «ئەوە شتێکی تایبەتیە، پەیوەندی بە ویژدانی مرۆڤ خۆیەوە هەیە»

وتی: «تەما تۆ سکرتێری ڕێکخراوێکی مارکسیت ئەبی ڕەئی ئاشکرات هەبی!»

وتم: «ئەوە شتێکی تایبەتیە، کار لە باوەڕی سیاسی ناکا. لە ناو ئیمەدا زۆر کەس هەن باوەڕی قولیان بە خوا هەیە و، لە هەمان کات دا خۆیشیان بە مارکسی ئەزانن»

وتی: «ئەوە بە یەکەوە ناگونجین، یەکی کە مارکسی بی ئەبی مادی بی..» لە سەر ئەمە ڕۆیشت و، بەلگە و بیانوی مارکسیە کلاسیەکە توندڕەوەکانی دوبارە ئەکردەوە، زۆری لە گەل خەریک بوم تا باسەکەم پی گۆڕی.

هاتە سەر کێشەی ژن، پرسی: «ڕەئیت بەرامبەر بە ژن چیە؟»

کردم بە گاڵتە لە گەڵی، وتم: «ژن نیوەی کۆمەڵە و دایکی نیوەکەی تریشە»

وتی: «مەبەستم ئەوەیە: ڕەئیت بەرامبەر یەکسانی ژن و پیاو چیە؟»

وتم: «لە گۆڤاری کۆمەڵەدا وتارێکی درێژ لە سەر کێشەی ئافرەت بڵاو کراوەتەوە من نوسیومە، لەوێ دا باسی یەکسانی ژن و پیاوم کردوە.»

وتی: «ئەی بۆ ڕێگەتان نەداوە بە ژن، وەکو پیاو، لە شۆڕشەکەدا بەشدار بن. ئەوانەیش کە هاتون لە بەر ئەوەی ڕێگای کارکردنیان نەدراوەتی وازیان هێناوە؟»

وتم: «ئێمە بە هۆی جەنگی پارتیزانییەوە خزاوینەتە ناوچە شاخاوییە سەختەکانەوە، ئەو ناوچانەیش بە هۆی دابڕانیانەوە لە پێشکەوتنی شار و شارستانی لە ڕیزی ناوچە هەرە دواکەوتوەکانی دنیادان. ناتوانین بە پەلە و بە زۆر بیروبۆچون و ئارەزوەکانی خۆمان بخەینە جێگەی قانونەکانی ئەوان.. ناچارین ڕێزی نەریتە باوەکانیان بگرین، ئەگینا داتەپین و دەرمان ئەکەن.»

زۆر بابەتی جۆراوجۆری فەلسەفی، کۆمەلایەتی، سیاسی، ئەرەمەنگی.. باس کران، باسەکان سەرەتایان هەبو کۆتاییان نەبو. لە زۆری دا بیروڕامان جیاواز بو، بەلام بۆ هەردوکمان خۆش بون: بۆ من چونکە ماوەیەک بو مانەوی شەڕوشۆڕێکی بێهودە بوم و، زۆر لە مێژ بو گوێم لەو جۆرە باسانە نەبوبو. بۆ ئەو، چونکە ئەیتوانی بە ئازادی بیروڕاکانی خۆی بۆ یەکێ دەربڕی کە بە جیددی گوێ ی لێ ئەگری و، موناقەشەی لە گەڵ ئەکا.

نزیک عەسر گەڕاینەوە. گفتوگۆکانمان ئەوەندەیان لق و پۆپ لێ بوبوەوە، ئاسپاوەیەکەی ئەو تەنها چەند سەعاتەساتی وەها قوڵ کرد بو، ئەتوت زۆر لە مێژە یەکتری ئەناسین، بۆیە وەها بە ڕاشکاوی ئەدواین. ویستم بە ئۆتۆمۆبیل ڕەوانەیان بکەم بۆ خەتی بۆ لای عەتلی یا بۆ ئەو شوێنەی خۆیان ئەیانەوێ. ناردم بە شوێن شوفێرەکەدا و، وتم: «ئەتانەوێ بۆ کوێ بڕۆن؟»

لە ناو چەند تاشە بەردێکی قوچ دا لە سەر لیادێک دانیشت بوین، پشتمان دا بو بە ڕیزە چیای دەرە شەیر - یاری خەتی و، دۆڵی بالیسان و ڕیزە چیای هەوری - کلاو قاسم - زینەتیر بەرامبەرمان بو. شوێنێکی هەتا بڵێ خۆش بۆ سەیرانی خەلکی شار و، ڕۆمانسی بۆ دلدار و دلخواز و، قایم بۆ پێشمەرگە..

کچی تایەن پڕ بە دڵ حەزی ئەکرد بینیتەوە درێژە بە باسەکانی بدا، منیش پڕ بە دل، حەزم ئەکرد دلی ڕابگرم، بەلام نەمئەتوانی چونکە لە قسەو باسی ناو پێشمەرگە ئەترسام، ئەو قسە و باسانەی ئەو نرخی فلسیکی بۆ دانەئەنان و، لای وابو ئەبی لی ی یاخی بین.

پێشمەرگەکە ئۆتۆمۆبیلەکەی هێنا. داوام لی کردن سوار بن لە گەلی. کچە بە ڕوگۆژی و بە دلشکاوی هەستا ڕۆیشت. ئومەز لە دلی خۆی دا قینێکی قولی لی هەلگرت بوم، ئەوەندە دلگران بو بو: لە بەلێنەکەی پشیمان بوەوە کە دابوی لە نەخۆشخانەی ئاوەندی کار بکا. لە ڕێکخستن وازی هێنا و، لە هەر جێیەکی بۆی بکرایە منی تاوانبار ئەکرد بە دوژمنایەتی ژن و، ئەیوت: «باوەڕی بە یەکسانی ژن و پیاو نیە و، ڕقی لە ژنە!»

لە کاتی ڕاگرتنی شەڕی یەعس - یەکێتی دا سالی ٨٤ هاوسەرەکەم لە نەخۆشخانە بۆ عەملیاتی لە دایکبونی ئما کەوت بو. ئەم خانمە لە نەخۆشخانە چو بو بۆ لای، لی ی پرسی بو: «تۆ ژنی فلانی؟» وت بوی: «بەلی» لی ی پرسی بو: «چۆن ئەتوانی لە گەلی هەل بکەی؟» وت بوی: «بۆچی؟» وت بوی: «ڕقی لە ژنە!» ئەم بەندوباوە تا چەند سال بە

دوامەوە بو، گەیشت بوەوە دەم چەند ئافرەتێکی ناسیاوم. جاریکیان لە میوانەی قسەدا یەکێکیان لی ی پرسیم: «بۆچی رقت لە ژنە؟»
وتم: «یەکی لەو شتانەی لە ژیان دا حەزم لی بەتی ژندا کی ئەمەی پی وتوی؟»
وتی: «وام بیستوە»
سەرلەنوی چیروکەکەم هاتەوە بیر. بیگومان من ئەم ئەزانی ئەنجامەکەی وەها ئەشکێتەوە و ئەو جورە بە ری کردنە بە «تیهانە» دائەنی، ئەگینا بە جوریکی وەها رەفتارم لە گەل ئەکرد بە دلی خوش و خەیالی ئاسودەوە بگەریتەوە.

*

## ئاژاوەی ناو ئەدیبان

سالی ١٩٦٩ بە بریاریکی م ق ث ریگەی دامەزراندنی یەکیتیی نوسەرانی کورد درا: کاکە مەم بوتانی و تالیبی لە نوسەرانی کورد داوای ئیجازەیان کرد و، ئیجازەیان پی دان. زوری ئەخایاند بەهانی ئازار خوینرایەوە، ئەویش خرایە ناو دەسکەوتەکانی ئازارەوە. ئەم یەکیتییە، ئەگەرچی لە چاو تەمەنی دا بەرهەمی ئەدەبیی زوری لە دوای خوی بە جی نەهیشتوە، بەلام لە روی سیاسییەوە دوای ئاشبەتالیش خوی نەدوراند و، نەچوە ژیر باری زلر و گوشاری بەعسەوە.
بەعس کوری زانیاری کورد کە جاران دەزگایەکی سەربەخو بو، بەهانی ئازاریش سەلاند بوی، کرد بو بە بەشی لە «المجمع العلمی العراقی» بە ناوی «الهیئە الکردیە» وە، ئەیویست «یەکیتی نوسەرانی کورد» یش هەلبوەشینیتەوە و بیکا بە بەشی لە «اتحاد الادباء والکتاب». نوسەرانی کورد لە ناو خویان دا ناکوک بون لە سەر ئەوەی بچنە ناو یەکیتیە عیراقیەکەوە یا موقاطەعەی بکەن. (عبدالامیر معلە) چەند کوبونەوەیەکی لە گەل کرد بون. عەبدولئەمیر ئەوسا راویژکاری روژنامەوانی صەددام و نوسەری چیروکی «الایام الطویلە» بو. هەندی لە نوسەرانی پەیوەندیدار رەئی ئیمەیان پرسی. ئیمەش بومان نوسین چون نوسەرانی گەلەکەمان لە مەیدانی پیشمەرگەیی و سیاسی دا باوەریان بە ئیمە هەیە، ئاوەها ئیمەش لە مەیدانی نوسین و ئەدەبی دا باوەرمان بە نوسەرانی گەلەکەمان هەیە، بریاردان لەو بارەیەوە بو خویان بە جی ئەهیلین و، هەر بریاری بدەن، ئیمە ریزی بریارەکەیان ئەگرین و، بە هی خومانی ئەزانین.
ئەمان موقاطەعەیان بکردایە، یا بەشدار بونایە، بەعس ریکخراوەکەی هەر هەلئەوەشاندەوە. بو ئەوەی هەندی دەسکەوتی قانونی بە دەس بهیان کەوتنە کیشەکوز لە گەل (عبدالامیر معلە) و وەزیری ئیعلام (شفیق الکمالی). شەفیق کەمالی بەلینی هەندی دەسکەوتی تایبەتی پی دابون، لە سەر ئەوە زوری نوسەران رەئیان وا بو بەشداری ریکخراوە عیراقیەکە بن.
ناکوکی دوروودریژی ناو جولانەوەی کورد و، ناکوکی شەخسی، لە ناو نوسەرانیش دا رەنگی دابوەوە، نوسەران لە ناو خویان دا ناکوک بون، تەنانەت تاوانی ناروایان ئەدایە پال یەکتری. کابرایەکی کونە شیوعی بە ناوی حەمە سەعید حەسەن، کە خوی بە چەپیکی توندرەو و، بە نوسەر و شاعیر و رەخنەگر دائەنا، نامیلکەیەکی نوسی بو دابوی بە دەزگای راگەیاندنی یەکیتی بوی چاپ بکەن. لە نامیلکەکەی دا بە زمانی سەرسەری سەرجادە درا بو، جنیوی پیسی بە نوسەر و ئەدیبەکانی کورد دابو، ئیتیهامی کرد بون بە ترسنوکی،

جاسوسی، جاشایەتی بەعس.. نامیلکەکە بڵاو بووەوە، بەڵام دەنگی نارەزایی لە هەموو تەریبەکانەوە بەرز بووەوە. چەندین نووسەر و نامەیان نارد و، ئەوەی ئەوانی زۆر نارەحەت کرد بوو، ئەوە بوو: نامیلکەکە، دەزگای راگەیاندنی یەکێتی چاپ و بڵاوی کرد بووەوە.

لە سەدا هەڵەیەکی منی تێ دابوو، لە کاتی چاپ کردنی دا ئەرسەلان بە پێشەڵ لە منی پرسی حەمە سەعید نامیلکەیەکی هێناوە بۆی چاپ بکەین، بیکەین یا نە؟ منیش بێ ئەوەی بزانم یا بپرسم ناوەرۆکەکەی چی تێ دایە، یا ئەرسەلان بۆم باس بکا، بە گوێرەی دابینکردنی سەرەتای «نان و ئازادی» بۆ نووسەرانی کورد وتم بڵاوی بکەنەوە! ئەوسەز ئەرسەلان خۆیشی ئەو جۆرە نووسینانەی پێ خۆش بوو. لە سەرەتاوە ئەگەر ئەرسەلان ئەم هەڵەیەی بە من نەکردایە، ئەم بەزمەش دروست نەئەبوو.

من کەوت بوومە هەڵوێستێکی دژوارەوە: لە لایەک هەموو نووسەرەکان لە من زیز بوون و گلەییان لێ ئەکردم، چونکە بە ئاگاداری من بڵاو کرا بووەوە. لە لایەکی ترەوە جنێو و ئیتیهامەکانی حەمەسەعید راست نەبوون و، ئەگەر لە دەزگای راگەیاندنی یەکێتیەوە بڵاوی نەکرادایەتەوە هیچ نرخێکی نەئەبوو. لەم بابەتە نووسەرانە هەبوون، کە بەعس یان حشع رایان ئەسپاردن بۆ پەلاماردانی نووسەرانی تر، بەڵام کەس بایەخی بە نووسینەکانی ئەوان نەئەدا، هی ئەم چونکە لە دەزگایەکی شۆڕشەوە دەرچوو بوو، حسابێکی تری بۆ ئەکرا.

نووسەرەکان خۆیان نامیلکەیەکیان لە وەڵامی نامیلکەکەی حەمە سەعیدا نووسی و، داوایان لە من کرد: هەم پێشەکی بۆ بنووسم، هەم لە دەزگای راگەیاندنی یەکێتی بۆیان چاپ بکەن. داواکەیانم جێبەجێ کرد. حەمە سەعید زیاتر خۆی تووشقی کرد و، ئەیویست خۆی بە «قوربانیی ئازادی بیر» پیشان بدا. بە درز وە خۆی لە هەموان گورگە کرد و کەوتە جنێودانی «مثقف و موزون». بەم کاسپیە ترمە لە ڕێگای حشعەوە خۆی گەیاندە سوید.

*

شێرکۆ بێکەس

دوای ئاشبەتاڵ شێرکۆ بێکەس دوور خرا بووەوە بۆ خوارووی عێراق، لە ئاوایییەکی دواکەوتووی گەرم لە سەر ڕووباری فورات دایان نابوو. ئەم دوورخستنەوەیە شێرکۆی لە شیعر نەخست بوو. لەو ماوەیەدا چەند شیعرێکی سیاسی درێژی دانا بوو. لەوانەی گەیشت بوونە ئێمە: «کۆچ» و «برایمۆک». لە ئاوزەنگ بە ڕێکوپێکی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و عەرەبییەکان و، هەموو کتێبەکانی دەرئەچوون پێمان ئەگەیشت.

«کۆچ» شیعرێکی سیاسی بوو، بە زمانێکی ئەدەبی چیرۆکی ئاشبەتاڵ و چوونی بە کۆمەڵی بۆ ئێران ئەگێڕایەوە. پاش ماوەیەک «دەستنووسی «داستانی هەڵۆ سوورەکانی قەندیل» مان پێ گەیشت. ئەمە شیعرێکی سیاسی بوو چیرۆکی دەس پێ کردنەوەی شۆڕشی ئەگێڕایەوە. شیعرەکانی بە لای منەوە زۆر بەرز و کاریگەر و، پڕ بوون لە دیمەنی جوان و، ئاوازی خۆش. جا نازانم هۆی ئەمە ئەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە باسی قۆناغێکی خەباتی کوردی ئەکرد خۆمی تێ دا بەشدار بووم، یان هەر بە ڕاستی شیعرەکان بە لای ڕەخنەوانێکی بێلایەنیشەوە وەها بوو. لە سەر ئەم شیعرە پارتی بڕیاری کوشتنی شێرکۆیان دا.

لە مێژ بوو لە گەڵ شێرکۆ دوورەدوور ئاشناییمان هەبوو. ئەگەرچی لە بیروباوەڕی سیاسی دا جیاواز بووین، بەڵام من هەمیشە بە ڕێزێکی زۆرەوە لە شیعرەکانی شێرکۆم

ئەروانی، ئەو کاتەی لە «ڕوانگە» دا بانگی نوێ کردنەوەی ئەدەبی کوردییان دا، ڕێزی لە لای من زیاتر پەیدا کرد. ئەمجارە ئیتر لە هەڵوێستی سیاسی دا لە یەکتری نزیک کەوتینەوە. نامەیەکم بۆ نارد و، ئەویش وەڵامی دامەوە. ئیتر ئاڵوگۆڕی نامەمان بێ پسانەوە بەردەوام بوو. سەیرم کرد شێرکۆ بە تەنیا شاعیر نییە، بەڵکو ڕووناکبیرێکی گەورەی کوردە، خاوەنی بیروڕای سیاسی پێگەیشتوو و کاملە. ئەوەندەی تر لە لای من خۆشەویست بوو. زۆر زۆر شیعری ئەنارد لە ئێستگە بڵاو ئەکرایەوە. شیعرەکانی لە ناوەڕۆک و شێوەدا تازە بوون و، بابەتێکی نوێ و داهێنراو بوو لە شیعری سیاسی کوردی دا. بۆ پێشمەرگە و بزواندنی گیانی شۆڕشگێڕانەیش لە هەناوی مرۆڤی کوردا کارێکی بێ وێنە بوو.

تا لە ناوزەنگ بووم ئەمتوانی ڕووبەڕوو ببینم. کە چومە دوڵی بالیسان چەند جارێ لە گەڵ ڕەئوف بێگەرد، مستەفا ساڵح کەریم، تاهیر ساڵح سەعید بە نهێنی هاتن و، پێکەوە دانیشتین. قسە و باسی جۆراوجۆری سیاسی و ئەدەبیمان ئەکرد.

*

حەسۆ لە چاسوسان

لە درێژەی شەڕەکانی حدکا - تیران دا هێزێکی پارتی لە چلەی زستان دا بە سەرکردایەتی حەسۆ میرخان زاڕاکی و، بە یارمەتی تیران لە تاڵوەتانەوە هەڵکشا بوون بۆ چیاکانی پشتی دۆڵە تو نزیک لوتکەی چاسوسان، بەرامبەر ناوزەنگ. بەفرێکی ئەستوور سەرتاپای شاخەکەی لووس کرد بوو، ئەوان بۆ ئەوەی سەرمایان نەبێ چادرەکانیان لە بەفر گرت بوو، بۆ ئەوەی ون نەبن لە ڕێگاکەی بناری شاخەکەوە تا چادرەکانیان پەتیان ڕایەڵ کرد بوو، بە پەتەکەدا ڕێگاکەیان ئەدۆزیەوە و، بە کۆڵ خواردەمەنی، سووتەمەنی، تەقەمەنی و کەلوپەلی تریان سەرئەخست. چاروبار خانووەکانی ناوزەنگیان ئەدایە بەر هاوەن. ناوزەنگ ئیتر لە مەترسی کەوتن دا بوو. ئەبوو مشووری جێگایەکی تر بخۆین بۆ بارەگای دەزگا سەرکردەییەکان، بیرمان لە ناوچەی باوزی کرد بووەوە.

پێش ڕاگوێزان ناوچەکە چەندین گوندی وەکو: باوزێ، سەرشیو، ڕازان، ئەشکەنە، قندول، چەکوان، دەوڵان، بەرکێشان، بالیلان، گەنارێ تێ دا بوو. شوێنێکی شاخاوی خۆش، پڕ دار و دەوەن و، کانی و ئاو، پشتی دابوو بە چیای چارتاسکەوە، کە بەشێ بوو لە زنجیرەی چیای هەزمل، زەردکە، پولفت... تیپی جوتیاران سەر لەنوێ ناوچەکەیان ئاوەدان کردەوە. فەرماندەی تیپی جوتیاران: محەمەد ڕازانی و، فەرماندەی کەرتەکانی لە کوێستانەکانی بۆڕێ، بیوەکە، قزوغان، سیوکان، سائیە.. بارەگایان دانا بوو، خانووبەرەیان لێ دروست کرد بووەوە.

بڕیارمان دا هەندێ لە دەزگاکان بنێرینە ئەوێ. پێشەکی هێزێکمان نارد هەندێ جێگای ئەمین بۆ دەزگای ڕاگەیاندن دیاری بکەن. دەزگای ڕادیۆیان گواستەوە و، ئێستگاکەیان لە شوێنێک دامەزراند لە پشتی ئەشکەنە ناوی قزلەگی بوو.

لە دەوروبەری نەورۆزەوە دەستیان کرد بە گوێزانەوە. هەندێ لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و دەزگای ڕاگەیاندن.. چونە ئەوێ و، چەند جێگایەکیان ئاوەدان کردەوە. بەشێ لە کەلوپەلی بارەگاکانی ناوزەنگ گوێزرایەوە بۆ ئەوێ.

*

### هاتنی مامجەلال بۆ خۆشناوەتی

دوای تەوەی شەڕی قەندیل بە لادا کەوت. هێزەکانی جوولە دەرکران بۆ ئێران. بارەگاکان لە ناو زەنگ کەم بووبوونەوە و، زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی بە ناوچەکان دا بڵاو بووبوونەوە ئیتر کاتی ئەوە هات بوو، هێزەکانی ناوزەنگ تەنک بکرێن و ئینجا چۆڵ بکرێ. ملازم عومەر و هێزێکی کەم مانەوە. مامجەلال بەرەو خۆشناوەتی هات. لە نزیک گوندی بالیسان بارگەی خست و، کەپریان دروست کرد و خەیمەتیان هەڵدا. ئەوە جاری یەکەم بوو مامجەلال لە شارەکان نزیک ببێتەوە، بە هەزاران کەس لە توێژی جۆراوجۆری خەڵکی گوند و شارەکانی کوردستان ئەهاتن بۆ سەردانی.

*

### جەمال تایەر: مردنێکی ناوەخت

جەمال تایەر لە سلێمانی لە دایک بوو، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە سلێمانی و، خانەی مامۆستایانی تەواو کرد. بوو بە مامۆستا. هێشتا هەرزەکار بوو تێکەڵاوی ژیانی سیاسی بوو. ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان و پارتی بوو.

ئەندامی شانە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە بوو.

دوو جار گیرا و، هەردوو جار دوای ئەشکەنجەدانی زۆر لە «ئەمن»ی سلێمانی بە ڕێکەوت پێش تەواو بوونی لێکۆڵینەوە و درانی بە دادگا، بەر لێبووردنی گشتی کەوت و بەر بوو. لە کاتی گرتنی دا ئازایەتییەکی بێ وێنەی نواند بوو. ساڵانی ١٩٨٠ - ١٩٨٣ لێپرسراوی ڕێکخستنە نهێنییەکانی ناوشاری کۆمەڵە و، لێپرسراوی مەفرەزەکانی ناو شار بوو. کە هاتیشە شاخ بوو بە بەرپرسی دەزگای ناوەندی ڕێکخستن. یەکێ بوو لە سەرکردە هەڵکەوتوەکانی کۆمەڵە.

ڕۆژی ١٧ ی تەمووزی ٨٣ ئەیویست بڕوا بۆ گەڵاڵە. ئەو ڕۆژە حاجی عوسمان بانگ ئەکا بە ئۆتۆمبێلەکەی من بیبات بۆ گەڵاڵە. جەبار لێخوڕینەکەی باش نەبوو، چەند جاری پێم وت بوو ئۆتۆمبێل لێ نەخوڕێ. مامۆستا جەمال زۆری لێ کرد بوو لە گەڵی بڕوا. ئۆتۆمبێلەکە پیکابێکی دەبڵ کابینە بوو. خۆی لە پێشەوە سوار ئەبێ و، جەبار لێ ی ئەخوڕێ و، خانەی ناوەڕاست و پشتی ژمارەیەکی زۆرتر لە یاری خۆی پێشمەرگە سواری ئەبێ. لە کاتی ڕۆیشتن دا پێشەکەی سووک و پشتەکەی زۆر قورس ئەبێ. لە سەر جادەی بالیسان، کە جادەیەکی تەخت و خۆش بوو، لە ناسەیەک دا هەڵگەڕابووەوە و، دەستبەجێ مامۆستا جەمال مرد بوو. چەند پێشمەرگەیەکیش بریندار بوو بوو.

کە هەواڵەکەیان دا بە من یەکسەر چووم بۆ بالیسان تەرمەکەیان برد بوو بۆ مزگەوتەکەی ئەوێ. پاش شاشتن بە خاکمان سپارد و لە سەر گۆڕەکەی هەندێ قسەمان کرد. لە سەردەمی خوێندنی ناوەندییەوە، بە هۆی کاری سیاسییەوە، هاوڕێ ی یەکتری بووین. لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا لە گروپەکەی ئێمە بوو. مردنی مامۆستا جەمال زیانێکی گەورە بوو لە کۆمەڵە و یەکێتی و بۆشاییەکی گەورەی دروست کرد. لە کاروباری ڕێکخراوەیی دا یەکجار شارەزا و، لە بیر و لێکدانەوەی سیاسی دا زیرەک و ورد و، لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە و گیروگرفت دا ئازا و چاونەترس بوو. دژی دەستەگەری و چەپایەتی توندڕەو بوو. ئەم مردنە ناوەختە بۆ من کۆستێکی ڕاستەقینە بوو، هاوڕێیەکی دڵسۆز و پشتیوانێکی پتەوم لە دەس چوو. جەبار هیچی لێ نەهات بوو، بەڵام لە ترسی من خۆی شارد بووەوە و، تا ماوەیەکی درێژ

نەیویرا خۆی پیشانی من بدا، چونکە لە ڕیزی پێشمەرگایەتی دەرم کرد بو. جەبار لە ١٩٧٨ ەوە لە گەڵ خۆم پێشمەرگە بو، کوڕێکی وریا و ئازا و مشورخۆر بو، بە ڕاستی دڵسۆزی من بو، منیش زۆرم خۆش ئەویست و ڕێزم ئەگرت. ماوەیەکی درێژ کاروباری ماڵ و پارەکانمی بە ڕێوە ئەبرد. دوای ئەوەی نائومێد بو سەری خۆی هەڵگرت بۆ ئەڵمانیا.

*

کۆبونەوەی سەرکردایەتی کرا. لەم کۆبونەوەیەدا چەند بڕیارێکی گرنگ درا. بۆ یەکەمین جار یەکێتی دروشمی: «دیموکراسی بۆ عێراق و، مافی چارەنوس بۆ گەلی کورد» ی بەرز کردەوە و، ناوی ڕادیۆکەی لە «دەنگی شۆڕشی عێراق» ەوە کرد بە «دەنگی گەلی کوردستان».

*

## کۆنفرانسی کۆمەڵە

سەرکردایەتی کۆمەڵە بڕیاری دا خۆی ئامادە بکا بۆ سێیەمین کونفرانس. بۆ ئەو مەبەستە دەزگای ڕێکخستن کە پێکهات بو لە: ئازاد هەورامی، قادری حاجی عەلی، ڕێکەوتی عوسمان بەگ. ڕاسپارد سەرپەرشتی کۆنفرانسەکانی کەرتەکانی ڕێکخستن بکەن بۆ هەڵبژاردنەوەی ئەندامانی کەرت و، نوێنەرانی کۆنفرانسی سێیەم. هەرسێکیان بە ڕێ کەوتن بۆ بەجێهێنانی ئەرکەکەیان.

*

## شەڕی دوەمی جود

هەواڵ هات هێزەکانی جود سەر لە نوێ هاتونەتە ناوچە سنوریەکانی قەندیل، لە ئەلاترکانەوە تا دوڵی بالیسان بڵاو بونەتەوە. هێزی تیپەکانی بالەک، کارۆخ، هەرێمی ١٤ لە دوڵی خانەقا پەڕینەوە، چیاکانی مامە ڕوت، کەلەکی بالیسی، گرت و لێیان دامەزران. جەیش هێرشێکی کرد و، هەندێ شوێنی ناوچەکەی گرت و هالیکۆپتەر کەوتە فڕین و سوڕانەوە. هێزەکانی یەکێتی لە چیاکانی سەروی دوڵی خانەقا کشانەوە چیاکانی خواروی دوڵەکە. جەیش کشایەوە. هێزەکانی جود شوێنەکانیان گرت و، هەمو چیاکانی سەروی جادەی خانەقا کەوتە دەستیان و، ڕادیۆی پارتی گرتنی ناودەشت و دوڵی خانەقای وەکو سەرکەوتنێکی گەورەی جود باس کرد.

هەر ٤ لایەنەکەی جود: پارتی، حشع، حسک، پاسۆک، هەمو هێزەکانی خۆیان بۆ ئەم لەشکرکێشیە ئامادە کرد بو. ئێرانیش کارئاسانی بۆ کرد بون، یارمەتی دابون و، چەند پاسدارێکیشی وەکو ئەفسەری پەیوەندی لە گەڵ نارد بون.

ئەوسا زۆری ئەندامانی سەرکردایەتی یەکێتی بۆ کۆبونەوە هات بون بۆ دۆڵی بالیسان. بڕیارمان دا هێزێک بە سەرکردایەتی عەلی پچکۆل و سەید کەریم بنێرین نەهێڵن زیاتر پێشڕەوی بکەن و ئەگەر بۆیان بکری دەریان کەن. عەلی و سەید کەریم لە بەرەبەیانی ٨٣/٨/١٣ دا هێرشێکیان بۆ کرد بون بۆ چیاکانی ئەوبەر جادە، دەستیان لە چەند شوێنێکی گرنگ گیر بوبو، لەوانە کەلەکی بالیسیان، بەڵام نەیانتوانی بە درێژە بە هێرشەکەیان بدەن و، بە تەواوی دەریان بکەن.

زارگەلی

لە دوڵی بالیسانەوە بەڕێ کەوتم. ناظمی حەمەی سلێمان و، عەلی تەیی یشم لە گەڵ

بوون. لە بناری کاروخەوە دابەزینی هەلیکۆپتەر و شەوە تۆپی هێزەکانی ئێران و عێراق لە «گرد مەندیل» بە چاکی ئەبینران. عێراق گردمەندیلی ناو نابوو: «گردە مەند» و ئێرانیش ناوی نا بوو: «تەپەی شەهید صەدر». هێرشەکەی جۆرە هاوزەمان بوو لە گەڵ هێرشی ئێران بۆ سەر ناوچەی حاجی هۆمەران و، بە ئاگاداری و بۆ هاوکاری ئەوان بوو. پێشمەرگەکانی پارتی لە گرتنی حاجی هۆمەران دا، شان بە شانی هێزەکانی ئێران، بەشدار بووبوون. صەددام تۆڵەی ئەم بەشدار بوونەی لە بارزانییەکانی ئوردوگای قوشتەپە و بەحرکە کردەوە.

بنکەی فەرماندەییم لە زارگەڵی دانا. زارگەڵی گوندێکی راگوێزراو بوو ئاوەدانی تێ دا نەبوو. لە سەر جۆگاکە لە نزیک جادەکە و لە ناو گەڵیەکەدا جێگەمان چاک کرد. ئەو زەمانە من لەشم ساغ و تەن دروست بووم. لە جۆگاکەی بەردەمان دا گۆمێکی بچووکم دروست کرد بوو هەموو شەوێ بەر لەوەی بۆ نوستن رابکشێم، خۆم لە ئاوە ساردەکەی هەڵئەکێشا. جگە لە بەختیاری برام کە کاروباری پەیوەندی بێتەل و بروسکەی رائەپەڕاند، عەبدولرەحیم عەبدوللا، شۆڕش حاجیم.. لە گەڵ بوون. هاورێیەتی لە گەڵ عەبدولرەحیم دا زۆر خۆش بوو. پیاوێکی ئازا و بەزات و قسە خۆش و وریا بوو. لە شوێنی خۆی دا «تەعلیق» ی خۆشی ئەدا. لەم سەفەرەدا لە گەڵ حاجی خدر ئاغای ئێتی ئاشنایەتیم پەیدا کرد. هەموو ڕۆژێ لە بەیانیەوە تا ئێوارە لە لامان ئەبوو. حاجی ئاغا پیاوێکی بە ساڵاچووی بەڕێز و قسە خۆش و بە زات بوو. کوڕەکانی پێشمەرگە بوون. کەمالیان لەم شەڕانەدا رانی شکا و، ماوەیەکی درێژ لە جێگادا کەوت.

فەرماندەی تۆپەکانم بینی و، هەلومەرجی ناوچەکە و هەردوولام هەڵسەنگاند. کەوتینە خۆئامادە کردن بۆ دەرپەڕاندنی هێزەکانی جەرد.

*

هەنگەوانی

لە لای سەرووماندوە ئەشکەوتێکی گەورەی دەم کراوەی لێ بوو. هەنگێک هێلانەی لە قلیشی بنمیچەکەی دا کرد بوو. دیار بوو هەنگێکی قەرەباڵغ و کۆن بوو. هەنگوینی زۆری تێ دابوو. هەرکەس ئەهات بۆ لامان و ئەیبینی تەماعی تێ ئەکرد. بەڵام شوێنەکەی وا هەڵکەوت بوو هەرچی فێڵیکیان لە گەڵ بەکار ئەهێنا نەیانئەتوانی بیگەنێ و بیبەن.

هەنگ، بۆ جیاکردنەوەی لە مێشە ڕەش لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن: «مێش هەنگوین».

هەنگ «نێر» و «مێ» و «شا» ی هەیە.

نێرەی هەنگ لە مێ گەورەترە. رەنگی بۆرە، هەنگوین ناکا. «چزوە» ی نییە و ناتوانی پێوە بدا.

مێ لە نێر بچووکترە. باریکەڵەیە رەنگی تێکەڵاوە لە زەرد و رەش. هەنگوین ئەکا. چزوی هەیە. پێوە ئەدا لە گەڵ پێوەدان دا چزوەکەی دەردێ و ئەمرێ.

هەنگ لە بەهاران دا پورە (:شەمەکە) ئەدا. «پورەدان» ئەوەیە شایەک لە پورە ئەسلییەکە جیا ئەبێتەوە، ئەفرێ بۆ دەرەوە هەنگەکانیش شوێنی ئەکەون. شا لە سەر لقی درەخت، یا گوێسوانە یا هەر شوێنێکی تر ئەنیشێتەوە، هەنگەکانی تر هەموویان تێ ی ئەئاڵێن و لە شێوەی هێشوودا لێ ی کۆ ئەبنەوە.

بۆ گرتنەوەی ئەبێ «خەڵێف» (پلوورە، شەلتە، کەنو) یەکی تازە بهێنن ناوەکەی

هەنگوین یا هەر شیرینیەکی تری تێ هەڵئەسوون و، لە ژێر پووشی هەنگەکەدا دائەنرێ، یە گیرفی شوێنەکە یان بە کەوچک هەنگەکانی تێ ئەکەن، یا ئەیخەنە ناو پوورەکەوە، کە شاکیانی تێ چوو ئەوانیش دیسان لێ ی کۆئەبنەوە و تێ ی ئەوروکێن. پشتی خەلیلەکە ئەگیرێ، تەنیا کونی بەردەمی ئەهێڵرێتەوە بۆ هاتوچۆ. تا ئێواری لە هەمان شوێن دا دائەنرێ، کە تاریکی کرد ئەگوێزرێتەوە بۆ «هەنگەلان». هەنگەلان شوێنێکی تایبەتیە تەرخان کراوە بۆ دانانی خەلیلی هەنگەکان لە هاوین دا لە هەتاو ئەیپارێزێ و لە زستان دا لە بەفرو باران.

هەنگەکان خۆیان ناو خەلیفەکەیان بە «بەرەمێو» کونیر ئەکەن. بەرەمێو، مادەیەکی شینی رەقە. زستانیش دەمی دەرگاکەیان بە هەمان مادە دائەخەن.

هەنگ لە ناو خەلیفەکەدا لە «مێو» «شان» هەڵئەبەستێ. شانەکان ئەگەر لە باری درێژی هەڵبەسترا بن پێ ی ئەڵێن: «تیرە شان» و ئەگەر لە باری پانی هەڵبەسترا بن «پەیکە شان». شانەکان پڕ ئەکەن لە هەنگوین. هەندێ جار فریا ناکەون هەموو شانەکان پڕ بکەن، ئەوی بە بۆشی مابێتەوە پێ ی ئەڵێن: «کەمە شان». ئەگەر پوورەیەک چالاک و قەرەباڵغ بێ، «دەبەرە» ی زیاد لە پشتی پوورەکەی ئەبەستن. دەبەرە لە قوڕ وەکو گۆزە، یا لە تەختە وەکو کەللەی هیلەک دروست ئەکرێ و، دوای پڕکردنی لێ ی ئەکرێتەوە.

هەنگ بە درێژایی بەهار و هاوین خەریکی دروستکردنی هەنگوینە. لە پایزدا ئەیبڕن، واتە زۆری شانەکانی لێ دەرئەهێنن و کەمێکی بۆ خواردنی زستانی هەنگەکە بە جێ ئەهێڵن. لە کاتی بڕین دا بە دوکەڵی تەپاڵە «قاتگ» ی ئەدەن. دوکەڵەکە لە ناو پوورەکەی دا کۆ ئەبێتەوە زۆری هەنگەکان پوورەکە بە جێ ئەهێڵن ئەوسا بە چەقۆ شانەکان لە دیواری پوورەکە ئەکەنەوە. بڕینی پەیکە شان ئاسانترە لە بڕینی تیرە شان، چونکە تیرە شان بە تەنیشت یەکەوە هەڵبەستراون وریاییەکی زۆری ئەوێ بۆ ئەوەی لە کاتی بڕینی یەکێکیان دا ئەوانی تر خراپ نەبن.

دانیشتوانی ناوچە شاخاوییەکان لە بەهاردا هەنگەکانیان ئەگوێزنەوە بۆ مێرگەکانی کوێستان تا پایز لەوێ دایان ئەنێن، لە پایزدا ئەیانهێننەوە بۆ هەنگەلانی زستانە لە ناو ئاوایی دا. مێوی هەنگوینی ئەم شوێنانە سپی و هەنگوینەکەیان زەردی کاڵە. سەرچاوەی مێوەکە گوڵی گەوزی کەتیرە و سەرچاوەی هەنگوینەکەیشی هەڵاڵەی گوڵە بۆنخۆشەکانی کوێستانەکەیە.

هەنگ چەند دوژمنێکی هەیە: زەردەواڵە، شەوگەرە و مارمێلکە، هەنگەخۆرە و کەندەسە.. ئەیخۆن.

مۆ، کە جۆرە پەپوولەیەکە، ئەچێتە ناو پوورەکەیەوە لە ناو شانەکانی دا گەرا دائەنێ. شانەکان وێران ئەبن و هەنگەکە ئەمرێ.

نیچ کە بە شوێنەکەیان قیر بۆ ئەویش پوورەکە ئەشکێنێ و هەنگوینەکەی ئەخوا و، هەنگەکان سەرگەردان ئەبن.

هەندێ جار زەردەوێی ئەگرێ بۆ چاککردنەوەی بە دوکەڵی تیسکە ماسی قاتگی ئەدەن. هەروەها توشی رەواتی ئەبێ. هەندێ جاریش لە برسان دا پەلاماری پووری یەکتری ئەدەن و، بە هەزاران دانە لە بەر دەرگای پوورەکانیان دا لە یەکتری ئەکوژن. بۆ ئەوەی ئەم شەڕە بکوژێتەوە ئەبێ هەنگوین یا شیرینیان بۆ دابنرێ.

جۆرە هەنگێکی کەمێ هەیە وردترە لە هەنگی ئاسایی لە ناو کونە بەردا هێلانە ئەکا، لە هەندێ شوێن پێ ی ئەڵێن: «شەمەتلێنکە» و لە هەندێ شوێنی تر: «شەپەترکە». ئەمیش شان هەڵئەبەستێ و هەنگوینی تێ ئەکا. تامی هەنگوینەکەی خۆشترە لە هەنگوینی ئاسایی، بەڵام کەمە، هەر بەشی پارووەکە. پێم وانیە لە سەر شەمەتلێنکەی کوردستان هیچ لێکۆڵینەوەیەکی زانستی کرا بێ.

دوای راگوێزانی دێهاتی سنور ژمارەیەکی زۆر هەنگ بەرەڵڵا بوبون، لە کلۆری دار و کونی بەرد و ئەشکەوت دا جێگیر بوبون. هەنگدزز ئەیان دۆزیەوە. لە سەر کانی چاودێری هەنگەکانیان ئەکرد کە ئەهات بۆ ئاوخواردنەوە و، دوای هەستانی بۆ فڕین چاودێری هەنگەکەیان ئەکرد چەند بەرز ئەبێتەوە و، بەرەو کوێ ئەڕوا، بەوەدا شوێنەکەیان دیاری ئەکرد و ئەچون بۆ دۆزینەوە و گرتنەوە و بردنی.

پێشمەرگەکانی دۆڵی بالیسان و هەندێ لە خەڵکی ناوچەکە هەندێ هەنگیان گرت بوەوە و، کردبویانە شەلکەوە و، لە هەنگەلانی بچوک و ئەبیتراودا دایان نابو. لەشکرەکەی پارتی کە هات بون، دوای ئەوەی زۆربەیان بری بو شەلەکانیشیان لە ناو هەلکێشا بو، بۆ ئەوەی هەنگەکان برن.

*

## کاروباری لوجستیکی

لە تەقەمەنی و خواردەمەنی و پێخەف دا ناتەواو بوین. شۆرش حاجیم کرد بە لێپرسراوی کاروباری لوجستیکی کڕینی ئازوقە، تەقەمەنی.. تەقەمەنی مان لە قاچاخچی بە نرخێکی گران ئەکری. چەردەیەکی باش فیشەکی کلاشینکوف، بی کەی سی، گوللەی ئاربیجی، نارنجۆکمان.. کڕی. ئازوقەیش بە زۆری نان و هەندێ خواردنی قوتو بو. پێشمەرگەکان هەمو رۆژێ رادیۆی پارتیان ئەکردەوە. جنێوی زۆر ناشیرینیان بە یەکیتی تێدا و، باسی لێشاوی خواردەمەنی، تەقەمەنی، کەلوپەلی ئەکرد کە عیراق بە لۆری لە دۆڵی خانەقاوە بۆ یەکیتی ئەنێری. ئەم پروپاگاندە درۆیەی کە هەمو رۆژێ رادیۆکەیان دوبارەی ئەکردەوە، لە دو لاوە بۆ ئەوان بە زەرەر بو:

– وردی هێزەکانی خۆیانی ئەڕوخاند، کە ژیانیان لە بەرزاییەکانی قەندیل دا بە هۆی سەرما و برسێتی و دوریان لە کەسوکار و چۆڵیی ناوچەکەوە زۆر ناخۆش بو.

– قینی پێشمەرگەکانی یەکیتی هەڵئەساند و، رقیانی لە جوە ئەوەندە ئەستور ئەکرد کە بە هیچ جۆرێ دەستیان لێ نەپارێزن و، وەکو خائینی دوژمن و، بەکرێگیراوی بیگانە رەفتاریان لە گەڵ بکەن. پێشمەرگەکان دانە جیرەیان بو لێیان.

*

شوێنێک لە زنجیرەی بیە بە ناوی بەرمەیدانەوە بە دەس چەکدارەکانی پارتیەوە بو، ئەیروانی بە سەر جادەکەدا و، بە سەر بەشێکی هێزەکانی ئێمەدا. زۆرجار لەوێوە تەقەیان ئەکرد و، خەڵکیان بریندار ئەکرد. حەسەن کوێستانی و عەلی نەبی بە تەما بون پەلاماری بدەن ئەو شوێنەیان لێ بسێنن. شەو بو بە تەقەیەکی گەرم و، گوللەی ئاربیجی لە تاریکی شەوەکەدا وەکو پشکۆی ئاگر ئەهات و ئەچو. من لە زارگەڵێوە چاودێری شەڕەکەم ئەکرد. وامزانی هێزەکەی ئێمە پەلامار ئەدەن، کەچی هێزەکانی پارتی هەمان شەو پەلاماریان دابو شوێنەکەی ئێمە بگرن. لەم شەڕەدا برایەکی تری حەسەن و پێشمەرگەیەکی تر کوژران، بەڵام

حەسەن شوێنەکەی بەرنەدا و دانەبەزی تا هێرشەکەی پارتی تێک شکێنرا.

*

کۆبونەوەیەکم لە گەڵ فەرماندەکانی پێشمەرگە کرد کە چی بکەین؟ دو رەئی جیاواز بون: هەندێکیان ئەیانوت لەم شاخە سارده بکشێینەوە چیاکانی خوارووی جادە؛ درە بێ و تەوره و، لەوێ دابەزرێین. هەندێکی کە ئەیانوت ئەبێ پەلاماریان بدەین و، بیانکەینەوە بە دیوی ئێران دا. ئاڵم، کە یەکێ لە فەرماندەی بەتالیۆنە تازا و هەڵکەوتوەکانی شۆرشی ئەیلول بو، لەم رەئیەدا بو، وتی: «ئەوانەی ئەڵێن لەم شاخانە بکشێینەوە بۆ شاخەکانی ئەوبەر، لەوبەریش کە هاتنە سەرمان ئەڵێن با بچینە کاروخ و بەرمکە دیفاع بکەین. لەویش کە هاتنە سەرمان ئەڵێن با بچینە هەورێ.. ئاخیرییەکەی وای لێ دێ ئەبێ لە دەشتی کەرکوک شەریان لە گەڵ بکەین.. چاکتر وایە شەرەکە لێرە بکەین و لێرە بیانشکێنین!»

*

خۆ ئامادە کردنمان تەواو کرد. لە گەڵ پێشمەرگەکانی گەرمیان دا بە کەلەکی باڵەبیان دا سەرکەوتم بۆ نزیک سەنگەری پێشمەرگەکان. چەند کەسێکی شارەزام هەڵبژارد بچن بۆ نۆرینی شوێنەکانی جود. هاتنەوە ئاگاداریی وردیان لە سەر شوێنەکانیان و تەوارەی هێزەکانیان کۆ کرد بوەوە.

هەندێ سەرچاوەمان پەیدا کرد بو دەسگیاسەکانی ئەوانیان بۆ ئەناردین. ئەوانیش زانیاری باش و بە کەڵکیان دەس ئەکەوت. هەواڵەکانی بزمان ئەهات وایان ئەگەیاند ئیدریس لە دێیەکی نزیک ئەوان بو لە دیوی ئێران ئاگاداری کرد بون کە دێت بۆ سەردانیان. من بەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بوم. چەند ساڵ بو بنەماڵەی بارزانی لە واشینتۆن و کەرەج دانیشت بون و، خەڵکیان بۆ شەری ئێمە ئەنارد، وا ئێستا خۆی دێت بۆ مەیدانی شەر. ماوەیەک هێرشەکەم راگرت بە هیوای گەیشتنی ئیدریس. هەر دەر نەکەوت. ژیانیشمان بە شاخەکەوە زۆر ناخۆش بو، ئاوی کانیەکانی ئەوەندە سارد بو بە زەحمەت دەس و دەموچاوی پێ ئەشۆرا. هەمومان پشتی دەست و روەمەتمان قلیشا بو، روخسارمان تاریک هەڵگەرا بو. شەو زۆر سارد و خواردنمان زۆر خراپ بو. هێڵەکانی رووبەرو بونەوەمان لە یەکتری نزیک بو، لە تەقەی بەرامبەردا .٢ کەس زیاتر بریندار بوبو. بەلام هیچ کەسی لە پێشمەرگەکان خۆی نەئەدزییەوە.

*

شەرە جنێو بە هوکی تۆکی

رۆژێکیان هوکی تورکیەکەم کرد بوەوە لە گەڵ عەلی پچکۆل قسەم ئەکرد. کابرایەک هاتە سەر خەت. قسەکانی پێ برەم. پرسی: «تۆ فلانی؟»

وتم: «بەلێ!»

جنێوێکی بە دایکم دا وتم: «دایکم نەماوە!»

جنێوێکی بە ژنەکەم دا وتم: «ژنم نیە!»

جنێوێکی بە خوشکم دا وتم: «هەمویان شویان کردوە مێردیان هەیە!»

وتم: «بۆچی لە مەسئولەکانتان ناپرسن لە پاش ئەوەی هەمو ساڵێک جارێک بتانهێنن بۆ سەر یەکێتی و هەندێکتان بە کوشت بدەن و بە شکاوی بتانگێرنەوە بۆ ئێران، بۆچی لە گەڵ یەکێتی رێک ناکەون بە خۆشیی و بە بێ شەر بێنەوە بۆ کوردستان؟»

وتی: «ئێمە عەینەک لە چاوەکانی پشتناشان نین - مەبەستی شیوعییەکان بو کە لە شەڕی ئاداردا تێشکا بوون - ئێمە شێر و پڵنگەکانی بادینانین.. ئێمە هاتووین دابکەت....»

کوڕەکە بە کرمانجی ئەدوا، لام سەیر بو بادینانی کە بە ئەدەب و مەعریفەت ناسراون، جنێوفرۆشی وەهایان تێ دا بێ. سەیرم کرد قسەکانم کاری تێ ناکا، وتم: «شێر و پڵنگی بادینان گوێ بگرە! هەولێری قسەیەکیان هەیە ئەڵێن: مەیدان مشکان نەیانخواردوە! لە مەیدانەکەدا یەکتری ئەبینین»

بە هەمو هێزێکی تۆکییەکانم ڕاگەیاند: ئیتر دایخەن و جارێکی تر قسەی پێ نەکەن تا خۆم بە نامە ئاگاداریان ئەکەمەوە.

*

مەیدانی شەڕەکەم کرد بو بە ۳ شەرگە:

شەرگەی سەرەکی زنجیرە چیای بێبە بو کە هێزەکانی پارتی و بارزانییەکانی لێ دامەزرا بو.

شەرگەی خەریک کردن، ئەمیش دو قۆڵ بو:

قۆڵی یەکەم، لە سەر چیای بێبە، نزیک بنکەکەی من کە ئەبو عەلی ئەبی پەلاماریان بدا و، هەمویان لایان وابو ئەمە هێرشی سەرەکی لێ ئەکرێ.

قۆڵی دوەم، زنجیرە گردێکی نێوان جادەی خانەقا و گوندەکانی ئەندزێ، لیوژێ، سلێ و بۆلێ.. کە هێزەکانی حسک و حشعی لێ دامەزرا بون، ئەبو هێزەکەی عەلی پێچکۆل پەلاماری بدا.

لە شەڕی مانگی مایس دا، حشع و حسک جەزرەبەیان پێ گەیشت بو، ئەمانویست ئەمجارەیان جەزرەبە لە پارتی بسرەوێنین و، غروریان بشکێنین. لە بەر ئەوە تەرکیزمان کردە سەر ئەوان.

جارێکی تر تاقمێک پێشمەرگەی تێکەڵاو لە شارەزا و نەشارەزام نارد بچن بۆ سەیری شوێنەکانیان و، ڕێگاکانی پەلاماردانیان. خۆم ناوچەکە شارەزا بوم. جاری یەکەم ساڵی ۱۹۷۱ و جاری دوەم لە کاتی کارەساتی هەکاری دا ساڵی ۱۹۷۸ دی بوم و، ئەو چەند ڕۆژەیش کە بە شاخەکەوە بوم، بەردەوام سەیرم ئەکرد و لە شارەزاکانم ئەپرسی و، بیرم لێ ئەکردەوە: ڕوبەڕو پەلاماریان بدەین، یان لە لاوە!

ڕوبەڕو تووشی زیانی گیانیی زۆر ئەبوین و، ئەوانیش وایان چاوەڕێ ئەکرد لەوێوە پەلامار بدەین. بەڵام بە درێژایی دوڵی خەلاپ بۆشایی بو، ئەوان پڕیان نەکرد بوەوە و هێزیان لێ دانەنا بو. ئەمانتوانی لەوێوە بە نهێنی لێیان بسووڕێینەوە. دوڵەکە درێژ بو ئەوان بە درێژایی بەرەیەیان - کونەکۆتر - بێبە دامەزرا بون و، یەکێ لە بنکەکانی فەرماندەییان لە سەر کانی کونەکۆتر دانا بو. لە پاش ئەوەی بە ڕێچکە و لە یەک ڕیزدا پەلاماری یەک شوێن بدەن، من وەهام دانا کە بە پانایی شاخەکە لە شێوەی «کەلە دەرەوە» دا لە ۸ جێگاوە پەلاماریان بدەن.

هێزەکانم گوڵبژێر کرد، چالاک و تەندروست و بە زاتەکانم جیا کردەوە، شارەزا و نەشارەزا و، پێشمەرگەی ناوچەکە و پێشمەرگەی دەرەوەی ناوچەکەم تێکەڵاو کرد و، ۸ تاقمی ڕێکوپێکم لێ پێک هێنان.

هەر تاقمی فەرماندەی یەکەم و دووەم و سێیەم و، شوێنی هێرشەکەیان و ئامانجەکانیانم بۆ دیاری کردن و، داوام لێ کردن سەعات ٩ ی شەو خۆیان و پێشمەرگەکان بێن بۆ دوایین کۆبوونەوەی پێش هێرشەکە.

لە کاتی دیاریکراودا ئامادە بوون. هەموویان ٢٣٠ کەس بوون. بەڵام هەڵبژاردەی هێزەکەی یەکێتی و، لە پیاوە هەرە ئازا و دڵسۆزەکانی کورد بوون. لە قسەکانم دا گرنگیی سیاسی هێرشەکە و، شکاندنی جۆدم بۆ روون کردنەوە و ئاگادارم کردن کە:

- نابێ لە کاتی ڕۆیشتن دا قسە و، دەنگە دەنگ بکەن و یەکتری بانگ بکەن.
- نابێ لایتی دەس بە کار بهێنن. پیلەکانی هەڵبگیرنەوە. نابێ جگەرە بکێشن.
- نابێ هۆکی تۆکی بەکار بهێنن تا تەقە دەس پێ ئەکا.
- هەمو کەسێ ئەبێ پێشمەرگەکەی بەردەمی و، ئەوەی دوای خۆی بناسێ و، نابێ ئەو ریزە لە هیچ حاڵەتێک دا، جگە لە کوژران و بریندار بوون، تێک بدا.
- هەر کەس کوژرا لە شوێنەکەی خۆی بە جێ ی ئەهێڵن تا شەر بە لادا ئەکەوێ و، هەرکەس بریندار بو یەک کەس لە گەڵی ئەگەڕێتەوە.
- ئەگەر فەرماندەی یەکەم کوژرا، هی دووەم جێگەی ئەگرێتەوە و، هی دووەم کوژرا، هی سێیەم جێگەی ئەگرێتەوە لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا کە پێیان سپێردراوە.

سەعات ١٠ ی شەو خواحافیزیم لە تاقمی یەکەم، کە ڕێگاکەی لە هەموویان دوورتر بو، ئینجا تاقمی دووەم و سێیەم تا هەشتەم کرد و، بە ڕێ کەوتن.

*

عەلی نەبی خۆی ئاگاداری جووڵانی هێزەکە و، ئەرکەکانی خۆی بو، بە نامەیش ئاگاداری ئەزڵی عەلی پچکۆلم کرد؛ کە گوێیان لە تەقەی شەر بو، لە بەرزاییەکانی بیبە، ئەوانیش هێرشەکەیان دەس پێ بکەن و، هۆکی تۆکییەکانیان بکەنەوە.

سەعات ٤.٢٠ دەقیقەی بەیانی ڕۆژی ١ ی ئەیلول، هێشتا تاریک و روون بو تەقە دامەزرا و، لە هەمو شوێنەکان وەکو داسان ئاپو شەر دەستی پێ کرد. دوای ١٥ دەقیقە هۆکی تۆکییەکانی: سەید کەریم، رەحمان سەیدە، عەزیزی داوە، برایمی حاجی کوێخا، قادر خەیات.. مژدەیان دا کە ئەرکی خۆیان بە جێ هێنا و، هێزەکانی پارتی دەستیان کرد بە هەڵاتن. عەلی نەبی پێش سەرکەوت، من و حەسەن کوێستانی و عەبدولرەحیمیش بە دوای دا.

*

یەکێ لەو دیمەنانەی هەرگیز لە بیرم ناچێتەوە لە کاتی سەرکەوتن دا پێشمەرگەیەکی تیپی سەفین ناوی فارووق بو بە سەختی بریندار بوبو، لە بن بەردێک دا دانیشت بو خوێن لە برینەکەی سنگی ئەچۆڕا، دوای مردنی کە گیرفانی گەڕا بوون ٢٥٠ فلس لە گیرفانی دا بو، کە سەرکەوتم بۆ شەرگە و لاشەی کوژراوێکی پارتییان پیشان دەم ٢٠٠ تمەن لە گیرفانی دا بو، لە دڵی خۆم دا بە زەییم بە خۆم و بە گیانبازەکانی گەلەکەم دا هاتەوە. لەم شاخە بەرزە لە سەرچی شەر ئەکەن؟

شەری سەرەکی تەواو بو. دنیا روناک بوبوە. هێزێکیان لە لوتکەی بۆڵی دانا بو کشانەوەکەیان بپارێزێ. چاومان لێ بو بە کۆمەڵ بە قەندیل دا بە ڕێ کەوتن بەرەو تیهران. لەم سەفەرەدا بە زۆری عەبدولرەحیم بە هۆکی تۆکییەکەی من قسەی ئەکرد. وتم: «بزانە شیر

و پلنگەکانی بادینان ئادوزیتەوە هەندێ قسەیان لە گەل بکەم)، عەبدولرەحیم چەندی هاواری
کرد کەسیان وەلامی نەدایەوە، نازانم خەریکی راکردن بو، یا کوژرا بو.

*

حەسۆ لە کونەکۆتر
پارتی، بە تایبەتی بارزانییەکان، زەرەرێکی زۆریان لێ کەوت. دو لە فەرماندە
ناسراوەکانیان: حەسۆ میرخان ژاژۆکی و عەبدولرەحیم جەسیم کوژران. هەردوکیان لەوانە
بون لە گەل مەلا مستەفا چو بون بۆ مەهاباد و، دوایەتر بۆ یەکێتی سۆڤیەت. لە شۆرشی
ئەیلول دا حەسۆ فەرماندەی هێزی کاوە بو لە قەلادزە و، عەبدولرەحیم فەرماندەی هێزی
حەمرین بو لە بادینان. حەسۆ میرخان دولەمەری بە سەختی بریندار بو بەلام دەرباز بو.
حەسۆ ژاژۆکی سالێک بو بە دوامانەوە بو لە کۆلان نەشەبوەوە. بە زستان جاسوسانی لێ
گرتبن و هێزی ئێرانی هێنایە سەرمان و، بە هاوین قەندیلی لێ گرت بوین. لە سەر
کانیەکەی کونەکۆتر کوژرا بو، هەگبەیەکی لێ بە جێ مابو، یادداشتەکانی خۆی و هەندێ
نامەی ئیدریس و مەسعود و، کەسانی تری تێ دا بو. چەند پاسدارێکی ئێرانیشی لە گەل
کوژرا بو.
لە یەکێتی یش دو لە فەرماندە ئازاکانی کوژران: ئەحمەد مەولود، فەرماندەی تیپی
کاروخ، بەیانی زو لە پەلاماردانی بیبیدا. ناظمی حەمەی سلێمان، فەرماندەی تیپی
خالخالان، لە دوای نیوەرودا لە راونانی شکستەی هێزەکەدا لە نزیک بولی.
بە درێژایی رۆژ هالیکۆپتەری عێراقی چاودێری مەیدانی شەرەکانی ئەکرد و،
چاروبار رێزێکی کورانەی بە سەردا ئەتەقاندین.

*

من هێشتا لە بیبە بوم مەحمودی حەمە بور گەیشتە سەر شاخ. مەحمود زو زو
ئەهات بۆ لام و نامەی ئەم و ئەوی بۆ ئەهێنام، بەلام ئەمجارە پێم سەیر بو لەم کاتەدا هات
بو. دەمەو ئێوارە هەمو شت تەواو بو داهەزینەوە بۆ بنکەکەی زارگەلی. مەحمود کوڕێکی لە
سلێمانیەوە لە گەل خۆی هێنا بو داوای پارەیان لێ کرد بو، ئەیویست بیبەخشن.
من کەوتمە ئامادە کردنی چەند وتاری بو رادیو، کادرێکی راگەیاندنی مەلبەندیشم لە
لا بو، باسەکانی هەموی تایپ کرد و، نامیلکەیەکی درێژی لێ دەرچو چاپ و بلاو کرایەوە.
ریپورتاجێکی درێژی لە سەر شەرەکان و، یادداشتەکانی حەسۆ و، نامەکانی ئیدریس و
مەسعود و، ناوی کوژراوەکان تێ دایە.

*

عەرەب و ئیسرائیل چەند جاری تەرمی کوژراوەکانیان ئەگۆرییەوە و، چەند جاری
کوژراوی ئیسرائیلی کە ئەکەوتە لای عەرەب لە گەل گیراوی زیندوی عەرەب دا
ئەیانگۆرینەوە. منیش ویستم چاو لەوان بکەم. لە گەل پێشمەرگەکان قسەم کرد، وتم: چەند
جار ئەوان لە هەورامان و لە هەکاری پێشمەرگەی ئێمەیان کوشتوە و، ئەیانهێشتوە
کەسوکاریان تەرمەکانیان وەربگرنەوە. ئێوەش لاشەکانی ئەمان بشارنەوە بەلکو «جەنازە
بەرامبەر بە جەنازە» پێیان بگۆرینەوە. قەندیل پڕ ناو پەسیری زۆرە. پێشمەرگەکان ئەوەندە
رقیان لە حەسۆ و تاقمەکەی بو، زۆر زو تەرمەکانیان لە کون و پەناو پەسێری شاخەکە دا
شاردەوە. حەسۆ ئەو زەمانەی کە فەرماندەی هێزی کاوە بو لە پشدەر ژنێکی لە خەلکی ئەو

ناوچەیە هێنا بوو. خەزوورەکەی و هەندێ لە کەسوکاریان هات بوون تەرمەکەی بەرنەوە. منیش پێم وتن: «خەزانەکانی، عەلی عەسکەری و خالید سەعید و شێخ حسێن چەند ساڵە بە تاواتەوەن شوێنی گۆڕەکانیان بزانن. کەی شوێنی گۆڕەکانی ئەوانتان بۆ دۆزینەوە ئێمەیش شوێنی تەرمەکانتان پیشان ئەدەین!»

*

## عەلی پچکۆل و چا

خواردنمان خراپ بوو، پارەمان کەم بوو، یەکدوورۆژ بوو چامان لێ بڕا بوو. عەلی پچکۆل چەند جارێ داوای کرد: هێزەکان ئیزن بدەین، من جارێ مانەوەیانم بە پێویست ئەزانی تا دڵنیا ئەبووم لە کشانەوەی یەکجاریی هێزەکانی جەود. عەلی ڕۆژێک نامەیەکی بۆ نووسی بووم: تەلی پێشمەرگەکان ٣ ڕۆژە چایان نەخواردۆتەوە، سەریان ژان ئەکا ناتوانن ئەرکەکانیان بە جێ بهێنن، ئەگەر چامان بۆ نەنێری، پلاوی لێ ئەکەین. منیش بۆم نووسی: من مەسئولی عەسکەری جەبهەکەم نەک مەسئولی چا. نابێ پێشمەرگەکان، لە بەر نەبوونی چایی، ئیزن بدا. لە سەر ئەمە تووڕە بووبوو، خۆی و مەفرەزەکەی لێیان دا بوو گەڕابوونەوە بۆ ناوچەی چەمی ڕیزان.

*

مەکتەبی سیاسی بە بۆنەی ئەم شەڕەوە بەیانێکی دەرکرد. لە بەیانەکەدا لایەنەکانی جەودی بانگ کرد بوو بۆ چارەسەرکردنی سیاسی کێشەکان و بۆ ئاشتبوونەوە. ئاگاداری نووسەرەکانی ڕادیۆمان کرد بوو زنجیرەیەک وتار بەو مەعنایە بنووسن. ڕادیۆی پارتی بە جنێو وەڵامی ئەدایەوە و، هەڕەشەی ئەکرد. منیش بە بێتەل لەسەم لە گەڵ یەکێکیان کرد و داوام لێ کرد تەعلیقێکیان لە سەر بنووسێ بە ناونیشانی: «وێنگۆ تەفاهوم ناکا» ئەم عینوانە لە هەموو وتارەکانی کە زیاتر ورووژاندنی بۆ جنێودان.

*

هێزەکانی جەود ئاوا بوون بۆ ئێران و، تا چەند ساڵی تێتر وازیان لە گەڕانەوەی بە کۆمەڵ و لەشکرکێشی هێنا.

*

کە هێزەکانی جەود لە کوردستانی عێراق دەرکران، دانیشتوانی دێهات لە یەکێتی زیاتریان پێ خۆش بوو، نەک لە بەر ئەوەی یەکێتییان لە هەموویان خۆشتر ئەویست، بەڵکو لە بەر ئەوەی ئەرکی ٤ حزبیان لە کۆڵ بوەوە، تەنیا هی یەکێکیانی لە سەر مابوو.

*

## گیرانی بارزانییەکان

ئەو کاتەی ناوچەی حاجی ئۆمەران بوو بوو بە مەیدانی گەرمی جەنگی عێراق - ئێران. بنەماڵەی بارزانی و سەرانی پدک بە ئاشکرا هاوکارییان لە گەڵ هێزەکانی ئێران ئەکرد دژی جەیشی عێراقی. کۆکردنەوەی دەنگوباسی عێراق و هێزەکانی و، چاوساغی و ڕێبەری هێزەکانی ئێران و، و هێنان و بردنی دیدەوانی تۆپخانەی ئێرانی ئەمە بەشێکی کەمی ئەو هاوکارییە ئاشکرایە بوو. لە هێرشەکانیش دا ئەوان وەکو هێزی پارمەتیدەر و خەریککەر و لیدانی پشتەوە بەشدار ئەبوون.

بەر لە هێرشەکانی ئێران بۆ حاجی ئۆمەران، بەعس وەکو لە گەڵ یەکێتی دەستی

بە پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی بیروڕا کرد بوو، لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی یش دا هەمان کاری دەس
پێ کرد بوو. لە بەر ئەوەی ئەوان لە ناو تیهران دا دانیشتبوون و، ئاشکرا کردنی پەیوەندی لە
گەڵ عێراق، ئەبوو بە هۆی غەزەبی تیهران، ئەمەیان شارد بووەوە. لەو کۆبوونەوەیەدا کە لە
- ناوزەنگ لە نێوان نوێنەرانی یەکێتی و نوێنەرانی حکومەت دا کرا، ئەبوو ئەحمەد (عەقید
رکن خلیل محمد شاکر) جێگری سەرۆکی ئەوسای دەزگای موخابەرات بارزان تکریتی، بە
ڕاشکاوی داتی پێوەدا تا کە لە گەڵ بنەماڵەی بارزانی هەمان پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی بیروڕایان
کردووە.

بەشدار بوونی بنەماڵەی بارزانی و هێزەکانیان لە هێرشەکانی ناوچەی حاجی هۆمەران
دا، لە لای صەددام جگە لەوەی بە خیانەتی نیشتمانی دائەنرا، بۆ خۆیشی بە خیانەت و
دەسپەڕین و فێڵ لێ کردن ئەژمارد. بارزانییەکانی لە عێراق مابوونەوە لە ئۆردوگای بەحرکە و
قوشتەپەدا کۆ کرا بوونەوە. زۆری پیاوەکانیان بوو بوون بە چەکهەڵگری «جەیشی شەعبی» و
بە دڵسۆزی ئەرکەکانی خۆیان بە جێ ئەهێنا.

شێخ عوسمانی کوڕی شێخ ئەحمەد و عیماد و ئەدهەمی کوڕی بوو بوون بە بەعسی.
عیماد سکرتێری مەجلیسی تشریعی بوو. عوبێد و لوقمان و صابیر لە بەغدا دانیشتبوون.
عوبێد بۆ شکاندنی باوکی ماوەیەک لە وەزارەتی بەعسییەکان دا بوو بە وەزیری دەوڵەت.
دەزگاکانی بەعس لە ڕاپۆرت و نووسینەکانیان دا بە بنەماڵەی بارزانیان ئەوت: «سلیلی
الخیانە».

صەددام بۆ ئەوەی تۆڵە لە بنەماڵەی بارزانی بکاتەوە، هێزێکی حەرەسی جمهووری لە
بەغداوە نارد دەوری ئۆردوگاکانی قوشتەپە و بەحرکەیان گرت. هەر پیاوێکی بارزانییان
بەردەس کەوت لە گەنج و پیر هەموویان گرتن. شێخ عوسمان و کوڕەکانی و، کوڕەکانی
مەلا مستەفا: عوبێد و لوقمان و صابیریان چنییەوە. سەر و سۆراخیان نەما. دوای گرتنیان
بە ماوەیەکی کورت صەددام لە یەکێ لە وتارەکانی دا لە تەلەفزیۆن دا وتی: ئەوانە
خیانەتیان کردووە لە بەر ئەوە: «ارسلناهم الی الجحیم». وا باو بوو کە مەسعود و ئیدریس،
هاوزەمان لە گەڵ هێرشەکانی تیهران دا بۆ حاجی هۆمەران، هەواڵیان بۆ بارزانییەکان ناردووە
خۆیان ئامادە بکەن بۆ چەک هەڵگرتن و گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی سنوور.

لەو کاتەدا کە بەعس ئەم تاوانە گەورەیەی بەرامبەر بە بارزانییەکان کرد من لە خەتی
بووم. ڕۆژێکیان کوڕێکی بارزانییان هێنا بۆ لام ناوی عەبدولباقی بوو. باسی کارەساتەکەی
بۆ گێڕامەوە. لە یەکێتی دڵنیا نەبوو، چونکە تازە شەڕەکانی قەندیل بڕابوو وای ئەزانی ئێمە
ڕقمان لە هەموو بارزانییەکە. دوای ئەوەی لە گەڵ مامجەلال قسەم کرد عەبدولباقیم بینییەوە و
لە زمانی سەرکردایەتی یەکێتییەوە پێم ڕاگەیاند: «ئەگەر ئەتانەوێ بڕۆن بۆ تیهران ئێمە هەموو
کارئاسانییەکیان بۆ ئەکەین بۆ ڕەوانە کردنیان. ئەگەر لە کوردستان و لە شوێنەکانی خۆیان
ئەمێننەوە هەر یارمەتییەکیان لە ئێمە بوێ بە پێ ی توانا پێشکەشیان ئەکەین. هەر
کەسێکیشیان ئەیەوێ لە گەڵ یەکێتی بێ بە پێشمەرگە بەخێرهاتنی ئەکەین». عەبدولباقی
گەڕایەوە هەولێر و لە گەڵ هەندێ لەوانەی مابوون قسەی کرد. دیسان هاتەوە لامان و بڕیاری
دابوو بێ بە پێشمەرگە. ناردم بۆ لای مامجەلال. مامجەلال دڵنەوایی زۆری کرد بوو.
عەبدولباقی بوو بە پێشمەرگە و کرا بە فەرماندەی کەرت. کوڕێکی دڵسۆز و وریا بوو.
جارێکیان یەکێ لە بارزانییەکان وتی کوشتنی ئەوانە بە تایبەتی شێخ عوسمان و

کوڕەکانی مەلا مستەفا وەکو بیتاقە وابو بۆ مەسعود دەربچی. بەعسییەکان بەم کارە
سەرۆکایەتی عەشیرەتی بارزانیان بە تەنها بۆ مەسعود هێشتەوە بە تایبەتی کە ئیدریس
مرد. لە ناو کوڕەکانی مەلا مستەفادا کەس نەما بو مونافەسەی بکا و، وەکو عەشیرەتەکانی
تر ئەمانیش پارچە پارچە بن و، هەر کوڕێک چەند تیرە و تایفەیەک بە لای خۆی دا
رابکێشی. ئەوانەی مابون هەمویان لە دایکی خۆی و، لە خۆی منالتر بون.

*

## بەرەو ئاسۆس

هەلومەرجی کوردستان زۆر ئالۆزا بو. ئەمانئەتوانی هەمو ئەندامانی سەرکردایەتی،
یاخود مەکتەبی سیاسی پێکەوە لە یەک شوێن کۆ بینەوە، ئەبو دابەش بین. لە لایەکەوە
بۆ سەلامەتی خۆمان وا باش بو، لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە خۆمان سەرپەرشتی
کارەکان بکەین. من لە مێژ بو بڕیارم دابو بچم بۆ بەری مەرگە.

کە ناوەزەنگیان بە یەکجاری چۆل کرد، مولازم عومەر چو بو بۆ کانی کەنێر لە
پشتی کانی تو لە بەری مەرگە، ماوەیەک بو هات بوە دۆلی بالیسان، بڕیارمان دا پێکەوە
بگەڕێینەوە. ئاوات قارەمانی پێش بانگ کرا بو بۆ لێپرسینەوە و ڕێگای درابو بگەڕێتەوە
شارباژێر، ئەویش تێکەلاوی کاروانەکەی ئێمە بو.

هێزەکمان بە ئوتومبێل بەرەو بناری هەوری بە رێ خست.

چوینە سکتان. دێ یەکی گەورە بو بەلام بە هۆی دوژمنایەتی ناوخۆییانەوە
گوندەکەیان وێران ببو، چەند کەسێکیان لە یەکتری کوشت بو. لە ڕقی یەکتری هەر
لایەکیان چو بو لە لای یەکێکی دەسەلاتدار ببو بە جاش.

شەو بە لای مەعسکەری هیزوپ دا ڕەت ئەبوین ئوتومبێلێک لە سەر جادەکە
لایتەکانی لە ئێمەی ئەدا ڕێچکەکمان لەو شەوە تاریکەدا بەرچاو ئەکەوت. هەمو خۆمان دا
بە ئەرزدا بۆ ئەوەی نەیبینین. لە کابرای شوفێرمان خوری لایتەکەی بکوژێنێتەوە.
شوفێرەکە پەشۆکا بو نەیئەزانی چی بکا. شتێکی چاوەڕێ نەکراو بو لەم شوێنەدا توشی
پێشمەرگە بێ. هەرچۆنێ بو ئوتومبێلەکە ڕۆیشت. ئێمە هێشتا خۆمان دا بو بە ئەرزا لە
ناو ئێمەوە بلێسەیەکی گەورە بەرز بوەوە و گرمەیەکی گەورە هات. لە ڕیزەکەدا عومەر لە
پێش منەوە بو. بە دەم ڕێگاوە قسەمان ئەکرد. ماوەیەک بو تۆزا بو. زۆر ئەترسام شتێکی
لێ هات بێ. لە ناو هەمویان دا خەمی ئەوم بو یەکسەر وتم: «کاک عومەر سەلامەتی؟»
وتی: «سەلامەتم!» ئەگەر شتێکی بە سەر بهاتایە تاحەز و دوژمن ئەیانوت: پیلانی خۆیان
بوە. سەرەتا وامانزانی هاوەنی مەعسکەرەکەیە. کەوتینەوە ڕێ چوینە داری قەسەمران. تا
تەرسا کەس خۆی نەکرد بو بە خاوەن، دەرکەوت پێشمەرگەیەکی دەستەکەی ئاوات
نارنجۆکەکەی لە سەر پێ بوە، لە شلەژاوی دا لە دەستی دەرچوە. کەللە سەری
پێشمەرگەیەکی بریندار کرد بو.

ناوچەکە بە ڕەبیە و مەعسکەر تەنرا بو ئەمانئەتوانی بمێنینەوە. شەو چوینە گوندی
مێوزە لە بناری کۆسرەت و، ڕۆژەکەیشی هەر لەوێ ماینەوە، بۆ عەسرەکەی چوینە ئالیقە.
پێشتر چەند بەلەمێکیان بۆ ئامادە کرد بوین. لە تاریکایی شەودا بە بەلەم لە ئاوی
ئەستێلی دوکان پەڕینەوە بۆ بەری مەرگە. لە کەناری ئاوەکە و لە کەلکی مەرگە پێشمەرگە

چاوەڕێیان نەکردبن. هەر ئەو شەوە چوینە ئاوەژێ. جەیش بە پەرێنەوەی ئێمەی زانی بو، ڕۆژی دوایی هالیکوپتەر پەلاماری بەلەمی ماسیگرەکانی دا زۆری سوتاند.

*

چیای ئاسۆس لەوەڕگایەکی دەوڵەمەندە بۆ بە خێوکردنی ئاژەڵ و، گیا و پوشی زۆری هەیە، بەڵام ئاوی کەمە، چینی بەردەکانی ئەستورنیە. لە بەرزاییەکانی دا تەنها چالیهەفری لی یە، هاوینان دەری ئەهێنن و ئەیتوێننەوە. هەندێ جێگا «ماقوز» لی یە. لە قەرەچوخ بە ماقوز ئەڵێن «هەرکەو». ماقوز ئەو ئاوەیە کە لە چالایی سەر بەردا ئەمێنێتەوە. کەو و کەوی لە هاوین دا لی ی ئەخۆنەوە. «گادەر» و «کوڕیس» لە لوتکە بەرزەکانیتی. بە مەڕی گوێ شۆڕ ئەڵێن: «کوڕیس»، بەڵام ناوی «گادەر» لە چەند جێگای تریش هەیە: ناوە بۆ شاخ و، ناوە بۆ ئەو ڕوبارەی کە لە سەر سنوری عیراق - ئیران هەڵئەقوڵێ و بەرەو شنۆ ئەکشێ. تاک و تەرا بزنە کێوی لی ما بو. وەکو ئەیانوت سەردەمی زو پڵنگی لی بینراوە.

*

بەری مەرگە

بنگرد، ناوەندی ناوچەکە بو، بنکەی ناحیەی لی بو. ئوردوگایەکی گەورەشی لی کرا بوەوە نزیکەی ٤ هەزار ماڵی تی دا بو.

ناحیەی بنگرد پێک هات بو:

گوندەکانی بناری ئاسۆس: ویسی، بێخێ، بێترخێ، بیانە، دولە گزم، سەرتەنگ، نێزۆکی، خانەلی، کانی هەنجیر، سەرچیا.. ڕاگوێزرا بون و، گەرمکان، ناودەشت، کەڵەکان، بناوێلی ئاوەدان بون.

گوندەکانی بەری مەرگە: کانی تو، چنارێ، ئاوەژێ، هەوارەبەرزە، خورخورە، باخیان، گزمەزەڵ ڕاگوێزرابون. لژتەر، هەڵۆنە، نۆڵچکە، سۆفیان، مەرگە، پاشکێش، مەلا سەفی، بیوەکە، بیگمی، شارستێن، دولە بی، سیدەر ئاوەدان بون.

هەردو دیوی ئاسۆس گوندە ئاوەدان و ڕاگوێزراوەکانی لە ژێر دەستی پێشمەرگە دا بو، بەڵام گوندەکانی: کویرەکانی، هەنجیرە، بنگرد، خۆشاو، بێمورشە، بەردەشان، سیوکان، سیناجیان، قەرەتەپە، دیبێژە، مەمەندئاوا، بەردەکوز، سەرسیان کە هەندێکیان لە سەر جادە و، هەندێکیان لە لیواری ئەستیلەکەی دوکان دا بون، لە ژێر دەسەڵاتی بەعس دا بون.

هەندێ لە خەڵکی شوێنە ڕاگوێزراوەکان لە ناوچەکە دورخرابونەوە بۆ ئوردوگای تەکی لە سەر ڕێگای چەمچەماڵ.

لە ڕوی پێکهاتنی خێڵەکییەوە ناوچەکە تێکەڵاو بو لە: شیلانە، جاف و ترکە ڕەشە.

ترکە ڕەشە تیرەیەکی بچوک بون لە سەرسیان و بەردەکوز دائەنیشتن.

شیلانە، ٣ تیرە بون:

پیرە، کە لە گوندەکانی بێمورشە و هەڵۆنە و، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان چوبونە چوارقوڕنە، ژاراوە، ڕانیە، ئەسکی کەلەک.

شوانە، لە گوندەکانی بنگرد، سۆفیان، سەرچیا، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان لە سولتانەدی و ژاراوە دائەنیشتن.

ڕەجەب، یا تالی (تالی گەوری ڕەجەب بوە)، ئەمانیش لە بەردەشان و، هەندێکیشیان دوای ژێرئاوکەوتنی گوندەکانیان لە بازیان دانیشتن.

گوندەکانی: خورخورە، باخیان، گۆمەزەڵ، دۆڵبی، شارستێن، سیدەر، کوێرە کانی و هەڵپیرە بەشێ بون لە ناوچەی جافەتی.

*

ناوچەکە چەند گوندێکی تێ دایە ئەمێنی لە ئاستی دا ڕاپوەستێ، لەوانە: مەرگە، بەردەشان، کانی تو.

– مەرگە، کانی و ئاوی زور و، ئەرزی فراوانی چاندنی داتەویلە و، باخی هەڵهێری هەیە. چوار مزگەوتی تێ دابو: مزگەوتی کانی چاوان، کانی سەردەشت، گەرمک و جافان. مزگەوتەکان بە ناوی کانیەکانەوە ناو نرا بون. چەند گۆرستانێکی نزیکە. هەندێکیان گەورەن و، کێلی گۆڕەکانیان بەرز و ئەستور و، هەندێکیان نیگاری شمشێر و خەنجەر و مەلیان لە سەر بو. کێلە کۆنەکانی هیچ نوسینێکیان لە سەر نیە. پێ ئەچێ مەرگە لە کۆنەوە ئاوەدان بوبێ. ئەم گۆرستانانە ئەمێنی لێکۆڵینەوەی مێژوییان لە سەر بکرێ. دانیشتوانی ناوچەکە هەندێ ڕوداوی دەماودەم ئەگێرنەوە کە لە سەردەمی هاتنی لەشکری ئیسلام دا مەرگە پایتەختی قەراڵێکی گەورە بوە و، دوای شەڕی قورس و خوێناوی ئینجا ناوچەکە گیراوە و، بە شمشێر ئیسلامیان کردون. پشدەرییەکان بە مەرگەییەکان ئەڵێن: «مەرگەیی ئەسحابەکوژ!». مەزاری «پیرۆتە سوری مەرگەیی» کە لە ناوچەکەدا بە شوێنێکی پیرۆز دائەنرێ کەوت بوە دامێنی گەورە قەڵا و پشتی مەرگەوە. ئەوسا «ڕەبیە» یەکێ گەورەی جەیشی لێ بو. گوایە پیرۆتە سور لە گەڵ هاتنی ئیسلام دا موسوڵمان بوە و، لە شەڕێکی دینیی دا کوژراوە و لەوێ ناشتویانە. گێرانەوەکان ئەفسانەن، پشت ئەستور نین بە هیچ بەڵگەیەکی مێژویی.

ئەوسا ناوەندی قەزاکەیان گواستۆتەوە بۆ قەڵادزە. مەرگە سەردەمێک بنکەی ئیمارەتی بابان بوە. بە پێ ی «بەیتی کاکە شێخ و کاکە میر»، هەندێ لە میرەکانی بابان لەوانە ئەم دو میرەی بەیتەکەیان بە سەردا هەڵدراوە، لە ئەنجامی زورداری و بەدڕەوشتی دا، بە دەستی مەرگەییان بە کۆمەڵ کوژراون. تا ساڵی ۱۸۹۳ مەرگە ناوەندی قەزای پشدەر بوە.

وەکو ئەیانوت: مەرگە و لێژەر و هەندێ گوندی تری ناوچەکە دەرپشکی کوشندەیان هەبو. تا من لەوێ بوم چەند جارێ دەرپشک بە پێشمەرگە و خەڵکی کەوەی دا، بەڵام کەسی نەکوشت.

کاتی خۆی مەرگە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە بوە، هەر بۆیە بە هەمو ناوچەکە ئەوترێ: «بەری مەرگە».

*

– بەردەشان گوندێکە کاتی خۆی سەر بە مەرگە و دواییتر سەر بە بنکرد بوە. یەکێ لە بە ناوبانگترین بەیتبێژەکانی کورد: عەلی بەردەشانی، لەم دێ یەدا لە دایک بوە. حاجی قادری کۆیی لە باسی شاعیرەکانی کوردستان دا بەمجۆرە ستایشی کردوە:

دو عەلین وەکو حەسسان
حەریر و بەردەشانە مەسکەنیان

له دو عەلی، مەبەستی: عەلی حەریری و عەلی بەردەشانی و، له حەسسان
مەبەستی: حەسان کوڕی ثابتە. حەسسان شاعیرێکی عەرەبی کۆنی سەردەمی جاهیلی
بوو، دوای ئیسلام بە ستایشی پێغەمبەر ناوی دەرکردوە.
ژمارەیەکی زۆر بەیت، چیرۆک، گۆرانی، قسەی نەستەق.. بە سەر زمانی
خەلکەوەیە، ئەدرێتە پال، کە هەموی نیشانەی بلیمەتی ئەون. کەچی سەرگوزشتەی ژیانی
خۆی ڕوون نیە و، بابەتەکانی کەسێکی نەبی، کە لەم سالانەی دوایی دا تۆمار کراون، ئەوی
تری نەنوسراوەتەوە، بەلام بەوەدا کە یەکێ لە بەیتەکانی بۆ ئەورەحمان پاشای بابان وتوە،
دیارە هاوچەرخی ئەو بوە.
بەردەشان مەرکەزی عەشیرەتی شیلانە بو.
ڕەسول مامەند لە بەردەشان لە دایک بوە. کە من لە ناوچەی نیشتەجێ بوم، کوێخا
ڕەسول، یەکێکی ناردە لامان بۆ پێشوازی. بێگومان ئەمەی لە پیاوەتی
بەرزی برای ڕەسول، چونکە هیچ ئیشێکی بە ئێمە نەبو، جگە لەوەش ئێمە لەو کاتەدا لە گەل حسک
خۆی بو، 
ناکۆک بوین.

*

- کانی تو کەوتۆتە بناری شاخەوە لە کۆتایی دولێک دایە لایەکی ئاسۆس و،
لایەکی شاخی چل بزنەیە. هەوای خۆش و دیمەنی جوان و، چەند کانیەکی سارد و
سازگاری تی دایە، دوانیان لە بەرزایی هەلئەقولێن و ئەڕژێنە قولایی دولەکەوە. زستان
بەفرێکی زۆری لی ئەباری.
زەویوزاری کشتوکال و دانیشتوانیان کەمە، ئەرزەکانیان بە دەس بەردەوێر و چاک
کراوە. ڕەزی تری و باخی میوە و ترشیان زۆرە. پیاو تەیینی پشتاوپشتی خەلکی ئەم دێ
بە چەند ڕەلەیان لە گەل باخەکانیان داوە. میوەیەکی لی بو، وەکو هەلوژە ڕەشە بەلام
بچوکتر و تامیشی خۆشتر، پێیان ئەوت: «سیکەرۆ».
ئاژەلداری ئەکەن. هەوای ناوچەکە بۆ پەروەردە کردنی ئاژەل، بە تایبەتی بۆ ڕاگرتنی
بزنە مەرەز، لە بارە.
دانیشتوانی ناوچەکە لە کۆنەوە شارەزاییەکی زۆریان هەیە لە ئەونگەری دا. ئافرەت
لە تەشی ڕستن و بەرهەمهێنانی داوی بارێک دا و، پیاو لە چنینی بەرو دا. شالی کانی تو
و چارۆی بۆ تەنکی و سفتی و جوانی بە ناوبانگە.
کانی تو و کانی کورکور ئەشی بکرێن بە شوێنێکی تووریستی خۆش. بە هاوین
سەیران و بە زستان بۆ یاری سەربەفر.

*

ئەم ناوچەیەش وەکو خۆشناوەتی و، زۆر ناوچەی تری کوردستان بزن ڕائەگرن. بزن
لە مەر هەرزانترە، بە خێوکردنی ئاسانترە، زۆرتر بەرگەی نەخۆشیی و سەختیەکانی
سروشت ئەگری.
لە کوردستان ۳ جۆر بزن هەیە: بزنی ڕەش، بزنی مەرەز، بزنی کەوی.
بێچکەی بزن: کار یا کارژولە (لە بونەوە تا تەمەنی ئەبی بە ۳ مانگ)، گیسک
(لە ۳ مانگیەوە تا ئەبی بە ۱ سال)، چێبر (لە ۱ سالیەوە تا ئەبی بە ۲ سال)، ئینجا بە
نێرەکانی ئەوترێ: نێری، سابرێن، تەگە و بە مێ یەکانی: بزن.

کار تا لە خەم ئەرمەنی لە «کوز» دا پەروەردە ئەکری. کوز بە «تەیمان» چوار دەوری ئەگیری، بزن لە زستان دا ئەکریتە «پشتیر» یا «هۆڵ» ەوە.

ئەو ساڵەی بزن نەزێ، شیریشی نابێ، بزنی بێ شیر پێ ی ئەڵێن: «قسر».

بزنی ڕەش و بزنی مەرەز لە گەڵ نێرێی یەکتری جوت ئەگرن، بەچکەکەیان «دورە، یا دورەگ» دەرئەچێ.

مووی بزنی ڕەش، زبر و ڕەقە بۆ دروستکردنی جلوبەرگ بە کەڵک نایەت، بەڵام گوریس، ڕەشماڵ، ڕەشکە، جەواڵ، تەنر، خەرار..ی، لی دروست ئەکری.

مووی بزنی مەرەز، ڕەنگی جۆراوجۆری جوانی ڕەش، سپی، خورمایی، شینکی.. هەیە و، نەرم و خاوە، بەزو (کر، شاڵ)، بەرماڵ، پۆپەشمین، جاجم، گۆرەوی، پۆزەوانە، دەسکێش، بلوز و، لە هەندێ شوێن پەتانی.. لی دروست ئەکری.

بزنی ڕەش بەرگەی سەختی سروشت ئەگری و، لە شاخەوانی دا وریا و سەرکەڵەیە، بەڵام زەرەری گەورە لە جەنگەڵ و باخ ئەدا، چونکە چرۆی تازە پێگەیشتووی درەخت ئەخوا و، توێکڵی قەدەکەی ئەکرێنێتەوە، دارەکە ڕشک ئەبێ، لە بەر ئەوە پێ ی ئەڵێن: «کوللەی ڕەش».

پەندی زۆر لە سەر بزن هەیە، وەکو: «بزن بۆ شەوی جێ ی خۆش ئەکا»، هەروەها: «بزن ئەجەلی بێ نانی شوان ئەخوا»، هەروەها: «خوا هەقی بزنی کۆڵ بە سەر بزنی شاخدارەوە ناهێلی»، هەروەها: «گیا ئەوەیە بە دەمی بزن خۆش بێ»، هەروەها: «نەمخواردەم و نەکردم، گیسکێ جرینگاندم».

بۆ یەکێ کە زۆر زوو بکەوێتە خۆشییەوە ئەڵێن: «وەکو بزنی دیلیزە ساڵی دو بەهار ئەخوا». بۆ یەکێ بەڵێنەکانی بە جێ نەهێنێ ئەڵێن: «وەکو بزن وایە دەستبۆژ هەڵناگری». بۆ یەکێ هەمیشە جارێ لە دوای خۆشییەک ناخۆشییەکی بە سەر بێ، ئەڵێن: «وەکو گیسکەکەی هەیاسی خاسی لی هاتووە»

*

بارەگای تیپی ئاسۆس لە ئاوەژێ و کەرتەکانی بە درێژایی بناری ئاسۆس بڵاو بوبونەوە.

بارەگای تیپی ٦٨ ی مامەندە لە لۆتەر و، کەرتەکانی لە بناری ئاسۆس بە دیوی پشدەردا دابەش ببوون.

بارەگای تیپی ٤٤ ی چەکوچ لە گەرمکان و، بارەگای تیپی ٤١ ی کورەکاژاو لە کەلەکان بو. ئەم دو تیپە لە چاو ئەوانی کەدا بە ژمارە کەمتر بون.

هەندێ لە کەرتەکانی تیپی ٦١ ی جوتیارانیش، بە هۆی شەڕەکانی عێراق - ئێرانەوە، پەڕی بونەوە بەری ئاسۆس هەندێکیان لە کاتی تۆ بارەگایان دانا بو. ئەم هێزانە هەمویان سەر بە مەڵبەندی دو بون کە بارەگاکەی لە سەرگەڵو بو.

کاکەمین قادر بەرپرسی کەرتی ڕێکخستنی قەڵادزە لە چنارتێ بو. کە گەیشتینە ناوچەکە، تازە خەریکی ئاواکردنەوەی گوندە وێرانکراوەکانی بون، لە بەر ئەوە شوێنێکی ئەوتۆی ئامادەی لێ نەبو بیکەین بە بارەگا، ئێمە خۆمان خانو دروست بکەین. پێشمەرگەکان لە ئاوەژێ و مەرگە جێگەی کاتیان پەیدا کرد و، منیش چەند ڕۆژێ لە ماڵی عەبدولرەحیم بوم لە ئاوەژێ.

ئاوەژی گوندێکی بچووک بوو. پشتی دابوو بە ئاسۆسەوە رووی لە قەرەسەرد بوو. چەند کانی و کارێزێکیان هەبوو، بەڵام زەوییوزاری کشتوکاڵیان کەم و لێژ و، بەرداوی بوو. نزیکەی ۲ ماڵێکیان لە تەکیەوە هات بوونەوە بنەیان دانا بوو. رەزی تری و ترش و باخەکانیان وشک بووبوو، تازە خەریکی ژیاندنەوەی بوون. ژمارەیەکی کەم بزنی سەرمز و بزنی رەش و گاوگۆتاڵیان پەیدا کرد بوو. دانیشتوانی ئاوەژی کەم دەرامەت و، ژیانێکی هەژارانەیان هەبوو، بەڵام ئیمپەمتیان دەوڵەمەند و نەفسیان بەرز و، لە میوانداری دا دڵ و دەروون فراوان بوون. هەر لە ئاوەژی ماڵی کامەرانی بەهجەتی عەونی، زێرەی عەبدوللا رووی، ئەحمەدی حاجی محەمەدی قەرەتەپە، حەمەی حەمەباقی.. لی بوو.

خەڵکی ناوچەکە بە گشتی پەیمان خۆش بوو، ئەمە لەوێ جێگیر بوین، لایان وابوو تیتر هێزەکانی جەیش ناتوانی بە ئاسانی بێتە سەریان و، جارێکی تر رایان بگوێزێ.

مام ئەحمەد

مام ئەحمەد لە سەرەتای دەس پێ کردنەوەی شۆڕشەوە بووبوو بە پێشمەرگە. زۆرجار کە لە قسەکردن دا ناوی یەکێکی لە بیر بچوایە «وانیک» ی بە کار ئەهێنا بە پاسەرشاتی ئەوت: وانیک عەرەفات و، بە قاسملوی ئەوت: وانیکلو.. لە بەر ئەوە ناویان نا بوو مام ئەحمەد وانیک، ئەگەرچی لە بنەماڵەیەکی ناسراوی خەڵکی ناوچەکە بوو، بەڵام پێشمەرگە و خەڵک هەر بەم ناوەیەوە ئەیانناسی.

دوای ئەوەی ڕێگای مەرگە - بەرگەلو کرایەوە تراکتور و ئوتومبێل هاتوچۆی پێ دا بکەن. رۆژێکیان دلێر بە ئوتومبێل هات بوو بۆ ئاوەژی. مام ئەحمەد ئەیویست بڕوا بۆ بەرگەلو. بە دلێری وت بوو: «کە ڕۆیشتی منیش لە گەڵ خۆت بەرە!» دلێر وت بووی: «باشە، بەڵام من زۆر زوو شەتم لە بیر ئەچێ بۆ ئەوەی لە بیرم نەچێ لە سەعات ئەوەندەوە لە سەر ڕێگاکە چاوەڕێ بکە کە هاتم سوارت ئەکەم» مام ئەحمەد وای زانی بوو تایەوێ سواری بکا. وت بووی: «ئەگەر ئەوەندە زوو زوو شتت لە بیر ئەچێ ئەوە بۆچی ڕۆژێ لە بیرت ناچێ لە باتی بەرگەلو بچی بۆ بنکرد!» بنکرد ئەوسا هێزەکانی حکومەتی لی بوو.

خاڵە مین

خاڵەمین، یەکێ لە پیاوە ڕیش سپییەکانیان ئاوەژی، ژوورێکی لە دوو ژوورەکەی ماڵی خۆیان بۆ من تەرخان کرد. بە درێژایی ٦ مانگی رابوردو، بە هۆی گەران و سووڕان و شەروشۆڕەوە، لە هاوسەرەکەم دابڕا بووم. ناردم بە دوای دا ئەویش هات لەوێ نیشتەجێ بوین. تا خانووەکەی خۆم تەواو بوو، چەند حەفتەیەک میوانی ئەو بوین. ئەو ماوەیە تێکەڵاویمان زیاتر و دۆستایەتیمان بە هێزتر بوو. خاڵەمین خۆی نموونەی پیاوی جوامێر و، هاوسەرەکەی نموونەی خانمی خانەدان و، منداڵەکانی نموونەی مرۆڤی بەرز بوون.

مام باپیر

مام باپیر، یەکێکی کە لە پیاوە ڕیش سپییەکانی ئاوەژی، کانییەک و پارچەیەک ئەرزی دامێ ماڵ و بارەگای لە سەر دروست بکەم. شوێنەکە ناوی «کوڕوان» بوو نزیکی ئاوەژی بوو. مام باپیر پیاوێکی ژیر و بەڕێز، شارەزای کاروباری عەشایەر و قسە خۆش بوو. حەمەی کوڕیشی بە دڵسۆزییەکی بێ ئەندازەوە کاروباری هێنان و بردنی بەرید و پێویستییەکانی تری ئەنجام ئەدا.

خاڵە مین و مام باپیر خاڵ و خوارزا بوون و، هەردووکیان باوکیان لە شۆڕشی شێخ

مەحموودا لە سەرەتای سییەکان دا کوژرا بوو. خۆیشیان لە شۆڕشی ئەیلول دا پێشمەرگایەتییان کردبوو، بەڵام دانویان بە یەکەوە نەئەکولا.

*

خانوو دروست کردن لێرە کارێکی زەحمەت نەبوو. جادەی قیر بۆ ناوچەکە ڕاکێشرا بوو، ئەمانتوانی کەرەسەی خانوو دروستکردن: بلۆک، چیمەنتۆ، گەچ، دەرگا و پەنجەرە.. لە شار بکڕین. دیسان کەوتینەوە خانوو دروست کردن. بناغەکەیمان دانا. خانوویەکی دە ژووری بۆ پێشمەرگەکان و، چەند خانوویەکی دوو ژووری بۆ خۆم و ماڵەکانی تر. لە هەموویان دا تەوالێت، حەمام، چێشتخانەی تایبەتی مان دروست کرد. کەوڕیکیشمان بۆ ئاژەڵ و ئیستر دروستکرد و، لە دەوروپشتی خانووەکان چەندین چاڵمان بۆ خۆپاراستن لە هێرشی ئاسمانی و تۆپباران هەڵکەند. وەستا و کرێکاری هەموو خانووەکان پێشمەرگەکان خۆیان بوون.

خانووەکان تەواو بوون. کاتی خۆی کەلوپەلی بارەگاو ماڵەکەمان لە ئاوزەنگەوە گوێزابووەوە هەرزنە و، دوای ئەویش هێنابوویانە ئاوەژێ. پێشمەرگە بارەکانیان گومرگ کرد بوو، ئەوی بە کەلکیان هات بوو بردبوویان، تەنیا شتی ئەیان بردە بوو کتێبەکانم بوو، وەکوو خۆی مابوو. سەرلەنوێ مشووری کەلوپەلی بارەگا و ماڵمان خوارد.

*

بەڕوو

هەندێ شوێنی بناری ئاسۆس دارستان بوو. داری بەڕوو، قەزوان، گوێژ، بەلالووک.. ی لێ بوو. پشتی چنارێ لە هەمووی چڕتر بوو. پاش دانانی بنکەکانی پێشمەرگە، کەوتنە دارڕین: بۆ سووتاندن و بۆ دارەڕای خانوو. چەند کەسێکی خەڵکی چنارێ هاتن بۆ دەربڕینی بێزاری و نارەزایی. شارەزاکانیان ئەیانوت: لێرەوارەکەی پشتی چنارێ دانیشتوانی ناوچەکەی چەند جارێ لە قاتوقڕی و برسیتی و، ئاژەڵەکانیانی لە مردن، ڕزگار کردوە: خەڵک بەری دارەبەڕوویان خواردوە و، ئاژەڵەکەیش گەڵاکەی. لە بێزاری ئەوەدا بوون ئەم سامانە بە نرخە لە ناو بچێ.

دارستان بەشێکە لە سامانی نەتەوەیی. لە زۆر جێگا دابەش کراوە و، هەر جوتیارێک «قەدەغە» ی خۆی هەیە، کەسی کە بۆی نیە بیبڕی، گەڵاکەی ئەکەن بە «گەڵ» بۆ ئالیکی زستانی بزن و، لق و پۆپەکەی بۆ سووتاندنی خۆیان بە کار ئەهێنن، ئەم جۆرە بڕینە کاری تێ ناکا. بەڵام بڕینی بێ پلان و خەڵوز کردن، بەشێکی زۆری قەوتاندوە و، ژیاندنەوەی سەر لە نوێ ی کارێکی یەکجار دژوارە.

داری بەڕوو، چەند جۆرە و، چەند بەری جیاوازی هەیە:

١. بەڕوو، دانەی بەڕو درێژکۆلە و ڕەنگی قاوەیی تیرە. هەندێکیان گەورەن پێ ی ئەڵێن: «وێلوو». کڵاوێکی پرابەری سەرەکەی لە سەردایە پێ ی ئەڵێن: «جەوت». پێشینان وتوویانە: «خوا کڵاوی بۆ بەڕوو کردوە». جەوت بۆ خۆشکردنی کوندە، مەشکە، هیزە.. بە کار ئەهێنرێ و، بەڕوویش بە زستان لە ناو ژیلەمۆدا برژاندوویانە، یا پێشاندوویانە و خواردوویانە. لە قاتوقڕی دا هاڕیوویانە و بۆ خواردن «خەپلە» یان لێ دروست کردوە. بە زوری تامەکەی تفت و تاڵە. بە زەحمەت، بە بێ ئاو، لووت ئەدرێ.

وەکوو دەربڕینی بێزاری لە دووبارە بوونەوەی خواردنێکی ناخۆش ئەڵێن: «بەڕوو بە کاڵی، بەڕوو بە کوڵاوی، بەڕوو بە برژاوی..» و، یەکێ کە بە پەلە و بێ پسانەوە قسە بکا

پیّ ی ئەلێن: «ئەلی ی بەرو ی لە دەم دا تەقییەوە» و، وەکو نیشانەی یەک گەوتن و نەخۆشیی گران، ئەلێن: «پلە بیّ و، بەرووان نەخوا!».

٢. مازو، بەرێکی خڕ و سەختە. لە پایزدا ئەیچنن و لە بازاردا بە کیشانە ئەیفرۆشن. بۆ دەباغی پیستە بە کار ئەهێنرێ. پێشینان وتویانە: «بە زۆر بیمەی بۆ مازوچنین بە دارەکەی دا ناروانی».

کاروانچی و ئەوانەی زۆر بە ڕێگادا ئەڕۆن، کە پێیان «تلۆق» ئەکات و، پێستی نێوان پەلەپەکانیان ئەسوتێتەوە، مازو ئەهارن و لە گەڵ خەنە دا ئەیگرنەوە. لە پێیانی ئەدەن، پێستی پێیان «پنگر» ئەکاتەوە.

٣. گزگل.

٤. سیچکە، لە هەندێ ناوچە پێ ی ئەلێن: «گلوان»، بەرێکی تری بەروە خڕە لە شێوەی هەلوژە ڕەشەدا. تویکلەکەی ڕەق و قاوەیی تیرە، ناوەکەی جۆرێ لە ئاردی زەردی تێ دایە. نرخێکی بازرگانی ئەوتۆی نییە. پێشینان وتویانە: «بە مازوان تێ شکاوە، ئێمەی بە سیچکان هەلسیتەوە».

هەندێ سال گەزۆ لە سەر گەلای داربەرو ئەبارێ، گەلاکەی کۆ ئەکەنەوە و ئەیکوتن لە بازاردا بە کیشانە ئەیفرۆشن، پاش کولاندنی «شۆکە» و «گەزۆ» ی لێ دەر ئەهێنرێ. لێکۆلینەوەی زانستی دەری خستوە گەزۆ نابارێ، بەلکو جانەوەرێکی پچوکە بە چاو نابینرێ لە سەر گەلای داری بەرو زیاد ئەکا و، لە ئەنجامی هەندێ «تفاعل» ی کیمیایی دا دروست ئەبێ.

داری بەرو سەخت و قورسە، بە کەلکی دارەڕای خانو نایەت چونکە ئەوەندە قورسە دیوار بەرگەی ناگرێ، بە زۆری بۆ سوتاندن بە کاری ئەهێنن، بەلام لە ئەورووپا دیکۆری قەشەنگی لێ دروست ئەکەن، نەخشی جوان لە قەدی دارەکەدایە.

*

مەلبەندی یەک لە ناو شەڕی عیراق - ئیران دا

هێزەکانی ئیران تا ئەهات لە کوردستانی عیراق نزیک ئەبونەوە. زەمانەی شەڕ گەیشت بە ناوچە سنورییەکانی حاجی ئۆمەران، قەلادزێ، پێنجوێن. عیراق و ئیران، هیچ لایەکیان دەستیان لە ئێمە نەئەپاراست. هەندێ جار «ڕصد» ەکانی ئیران کە بە چاوساغی پێشمەرگەکانی پارتی و حسک ئەهاتنە پێشەوە، شوێنەکانی ئێمەیان بۆ ئەکردن بە نیشانە.

شەڕی حاجی ئۆمەران کاری لە مەلبەندی سێ و، شەڕی قەلادزە کاری لە بارەگاکانی سەرکردایەتی کرد بو. ناوچەی ناوزەنگ - شێنێ مان چۆل کرد بو، ناوچەی بادێنی بەشیان پێ چۆل کرد بوین. دەزگای ڕاگەیاندن و ڕادیۆ گواستبویانەوە دۆلی جافەتی.

شەڕ بە گەرمی کەوتە ناوچەی پێنجوێن. مەلبەندی یەک کوت بوە مەترسییەوە. هەمو ڕۆژێ بۆردومان ئەکرا. ئەوسا یەکێ حاجی سەفەر، لە جێگەی مەلا بەختیار، کرا بە لێپرسراوی مەلبەندی یەک. ئێمە ئاگاداری یەکێ حاجی سەفەرمان کرد، فەرمان بە هێزەکانی یەکێتی بدا پەلاماری جەیشی عیراق نەدەن، بۆ ئەوەی بتوانی هێرشەکانی ئیران ڕابگرێ، چونکە هاتنی ئیران بۆ ناوچەکە ئەبو بە هۆی چۆلکردنی ناوچەکە و وێرانبونی و، لە ئەنجامی ئەوەیش دا ئەبو بارەگاکانی مەلبەندی یەک و تیپەکانی شارباژێر چۆل بکەن.

ماهیر عەبدولرەشید تکریتی قائیدی فەیلەقی یەک بو. ماهیر بەعسییەکی

ڕەگەزپەرست بو، لە بەیانەکانی دا جنێوی بە «فورسی مەجوس» و «نەوەکانی دارا و روستەم» ئەدا! هەندێ، پێشمەرگە و، هەندێ لە دانیشتوانی ناوچەکە، گوێیان نە دابوە فەرمانی مەلبەند، بۆ دەرخۆنی چەک و تەقەمەنی بە دزی مەلبەندەوە، هەندێ بۆسەیان بۆ هێزەکانی جەیش نابوەوە تازاریان دا بون. ئەویش چەند بەیانێکی پڕ هەڕەشە و جنێوی بە سەر ئاسمانی شارباژێردا بە فڕۆکە بڵاو کردەوە. جگە لەمەیش «تعمیم» یکی بە بروسکە بە سەر کەرتەکانی فەیلەقەکەی دا بڵاو کردبوەوە لە یەکێکیان دا نوسی بوی: «تقرر اباحة عرض و مال المخربین وذویهم».

مەلبەندی یەک توشی گیروگرفتێکی گەورە بوبو. ناوچەکەیان بەردەوام لە ژێر تۆپباران و بۆردومانی هێزەکانی عیراق دا بو. ناچار بون بیر لە گواستنەوە بکەن. لەو کاتەدا بەهادین لەو ناوە بو، کە ئەم پێشهاتانە ئەبینی، لە سەر ئاوازی یەکێ لە سرودەکان ئەم بالۆرەیەی ڕێک خست بو:

ئەی هاوڕێیان! من ڕەنجبەرم
من .....م
قوری دنیا بە سەر سەرم
جاش و عەسکەر هاتنە سەرم
مەلبەندی یەک بۆ کوێ بەرم؟

*

شەڕ لە ٣ مەیدان دا

ئیمە لە ٣ لاوە لە شەڕەوە گلا بوین: شەڕ لە گەل عیراق، شەڕ لە گەل ئیران، شەڕ لە گەل جود. زۆر کەس بە شێتیان ئەزانین و، ئامۆژگاریمان ئەکردین بۆ ماوەیەکیش بێ، شەڕ لە یەکێ لەم مەیدانانەدا سارد بکەینەوە.

هەوڵەکانی خۆمان لە گەل جود بەری نەگرت.

هەمو ئەو وتارانەی لە رادیو بە نیازی بانگکردنی لایەنەکانی جود بۆ ئاشتی، بەو پەڕی توندی و، بە جنێوی ناشیرین، لە رادیوی پارتیەوە وەڵامیان ئەدرایەوە.

هەمو ئەوانەی ئامادەییان پیشان دا بو بۆ ناوبژی لە نێوان یەکێتی و جودا، ئێمە قبوڵمان کرد بو، لە ناو ئەوانەدا مەلا، ڕیش سپی، سەرۆکی عەشیرەت، ئەدیب، مامۆستای زانستگاکان تی دا بو. نە پارتی و نە حشع گوێیان نەئەدایە قسەی هیچ کامێکیان. پەیوەندی لە گەل سەرانی جود بۆ کەسانی کە لە سلێمانی و بەغدا ئەژیان کارێکی دژوار بو، چونکە ئەوان لە ئێران بون و، کەس بە ئاسانی دەستی ئەیان ئەگەیشتێ.

مامجەلال نامەی بۆ کاربەدەستانی سوری و، بۆ خالید بەگداش سکرتێری حیزبی شیوعی سوری و، بۆ نایف حەواتمە سکرتێری جبهەی دیموکراتی فەلەستین نوسی بو، داوای لی کرد بون لە نێوان یەکێتی و حشع دا ناوبژی بکەن. حشع گوێیان نەدانێ و، ئامادەی ئاشتبونەوە نەبون.

ئومێدێکمان نەمابو بەو نزیکانە لە گەل جود ئاشت ببینەوە، بە تایبەتی سەرانی جود لەو کاتەدا زیاتر کەوتبونە ژێر «ئیستیمزاز» ی ئیرانیەوە، ئیران خۆی ئامادە نەبو لە گەل یەکێتی پێک بێ، لە بەرئەوە ڕێگەیشی بە جود نەئەدا لە گەل یەکێتی ئاشت ببنەوە.

ئێمە لە گەل دەرەوە پەیوەندیمان زۆر کز بو. زۆرجار بە رادیو پەیامی کورتمان بۆ

ئەناردن. لە پەیامەکان دا ناوی نهێنی ئێمە بە کوردی: «ئاسودە» و بە عەرەبی: «صابر» و،
هی هەڤالانی دەرەوە کە لە شام وەریان ئەگرت بە کوردی: «ئاوارە» و بە عەرەبی: «صامد»
بو. پەیامەکەی خۆمان بە رادیۆکەی یەکێتی دا ئەنارد و، پەیامەکەی ئەوانمان لە رادیۆی
«صوت العراق» وەرئەگرت کە بەعسیە عیراقیەکانی سەر بە سوریا سەرپەرشتیان ئەکرد.

پەیامێکمان نارد بۆ هەڤالانی دەرەوە. کورتییەکەی ئەمە بو:

ئێمە لە ٣ لاوە لە شەڕەوە گلاوین. هەولی زۆرمان داوە لە گەل جود پێک بێین. سەری نەگرتوە. لە گەل سوریا و لیبیا و فەلەستینییەکان هەول بدەن شەڕی ئێمە و جود رابگرن و، ئێران ئێمان بۆ نەهێنێ، ئەگینا ناچارین خۆمان هەول بدەین شەڕ لە گەل عیراق رابگرین.

لەو کاتەدا د. فوئاد مەعصوم، عەبدولرەزاق فەیلی، دارای شێخ نوری، سەربەست بامەرنی، حسێن سنجاری.. لە شام بون.

*

ئازادکردنی بێتواتە

بێتواتە گوندێکە کەوتۆتە بناری چیای ماکۆک و چیای شەمشار بە سەری دا ئەروانێ. جێگایەکی خۆش و ئاووهەوای سازگارە. پێ ئەچێ لە زۆر کۆنەوە ئاوەدان بوبێ، هەندێ شوێنەواری دێرینەی تێ دا دۆزراوەتەوە. خەلکی بێتواتە لە بەخێوکردنی بزنی مەرەز و، دروستکردنی کردا شارەزاییەکی زۆریان هەبو. زۆر مال دەزگای تەونکەری تێ دا بو.

لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا عومەر مستەفا بنکەی پێشمەرگەی تێ دا دانا و، بو بە بنکەی هێزی کاوە. پاشان مەلا مستەفا عەلی شەعبان بارزانی لێ دانا، کە یەکێ لە هاوسەفەرەکانی سۆڤیەت و باوەڕپێکراوێکی نزیکی بو. عەلی شەعبان کابرایەکی زۆردار بو. ریزی دانیشتوانی ناوچەکەی نەئەگرت. بێگاری پێ ئەکردن و، خەریکی خۆ دەولەمەن کردن بو. بە زۆر کچی یەکێ لە بنەمالە ناسراوەکانی ناوچەکەی هێنا.

ئەنوەر بەگ، کە لە بنەمالەی میرانی خۆشناو و، ژنبرای عەباسی مامەند ئاغا بو. لە پەنجاکان دا کەریکاری دائیرەی غابات و، لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلول دا بەشداری خۆپیشاندانی چەکداری هەشانیەر بو. هاتە ریزی شۆڕشەکەوە، لە بێتواتە دائەنیشت، بە بیانوی گێچەلی عەلی شەعبانەوە هەلات و، پەنای بۆ حکومەت برد. هێزێکی جاشی لە ناوچەکەدا پێکەوە نا. ئەم هێزە تا بەیانی ئازاری ٧٠ مایەوە. دوای ئەوە چو بۆ بەغداد لەوێ دانیشت. بۆ دابینکردنی گوزەرانی خێزانەکەی چاپخانەیەکی دانا بو.

کە بەعس کەوتەوە جاش گرتن. ئەنوەر بەگ سەرلەنوێ چەکی بۆ حکومەت هەلگرت دژی شۆڕشەکە. دوای ئاشبەتال گەڕایەوە بێتواتە و، بو بو بە دەسەلاتدارترین کەسی ناوچەی خۆشناوەتی. لە دوای دەس پێکردنەوەی خەباتی چەکدار ئەنوەر بەگ سالی ١٩٧٧ دیسان مەفرەزەیەکی جاشی دروست کردەوە. لە لەشکرکێشییەکانی حکومەت دا بەشداری ئەکرد و، هەندێ جار هێزەکەی ئەناردە راوی پێشمەرگە. ئەگەر جاران بەهانەی ئەوە بو لە دژی بارزانی بوە بە جاش ئەمجارەیان هیچ بیانویەکی لەو بابەتەی نەبو، چونکە ئەم پێشمەرگانە بارزانی نەبون، بەلکو پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی و، هەندێکیشیان خۆشناو بون. ئەنوەر بەگ بە هۆی ئەم دەسەلاتەوە ترس و لەرزێکی زۆری خست بوە ناو دلی دانیشتوانی ناوچەکەوە،

هەرکەس گوێڕایەڵی نەکردایە و، دڵسۆزی نەنواندایە، ئازاری ئەدا.

مینێک لە ژێر تۆزتۆزمەنییەلێک دا تەقییەوە. یەکێ لە کوڕەکانی ئەنوەر بەگ لە ناو تۆزتۆزمەنییەلەکەدا کوژرا. لە سەر ئەمە ناردی کوێخا رەسوڵی پێتواتە بگرن. کوێخا رەسوڵ لە رانیە دانیشتبو، هاووڵاتییەکی ئاسایی بو، تەنیا تاوانی ئەوەبو باوکی رەشۆ بو کە پێشمەرگەی یەکێتی بو. کوێخا رەسوڵ بە سەی زانی لە دەستیان هەڵات و پەنای بۆ بارەگای حزبی بەعس برد لە رانیە. ئەنوەر بەگ ناردیە ناو بارەگای بەعس کوێخا رەسوڵیان دەرهێنا. بارەگای بەعس کوێخا رەسوڵیان نەپاراست. هەر لەوێ دا کوشتیان و، لاشەکەیان بە دوای تۆزتۆزمەنییەلێک دا تا پێتواتە ڕاکێشا و، لەوێ بە بەر چاوی خەڵکەوە لاشەکەی سوتاند. ئەم تاوانە بێ سزا تێ پەڕی.

ئەو کاتەی هێزەکانی ئێمە هاتنە خوارێ بۆ دۆڵی باڵیسان، سنووری دەسەڵاتی ئەنوەر بەگ لە پێتواتە و ڕۆژهەڵاتی دا بو. بەڵام کە بارەگای مامجەلال گوێزرایەوە بۆ دۆڵی باڵیسان و دواتر بۆ بۆتێ لە دۆڵە ڕەقە. ئەنوەر بەگ ویستی دەس بە سەر ناوچەکەدا بگرێ، رێگای رانیە بۆ خەڵیفان بۆ هێزەکانی حکومەت بکاتەوە و، بارەگا و هێزەکانی مەڵبەندی چواری یەکێتی لە دۆڵی باڵیسان دەربکا. کردیە سەر هەمو گوندەکانی ناوچەکە کە ئەبێ چەکی جاشایەتی بۆ حکومەت هەڵبگرن. دانیشتوانی ناوچەکە کوردپەروەر بون ئەیان ئەویست بێن بە جاش کەوتە گەف و هەڕەشە لێیان.

ئەنوەر بەگ بە تیرێک دوو نیشانی ئەشکاند. سەرکەوتنێکی جەنگیی بە سەر یەکێتی دا بۆ حکومەت بە دەس ئەهێنا و، جادەیەکی ستراتیجی بۆ هاتوچۆی هێزە چەکدارەکانی عێراق ئەکردەوە. لە هەمان کات دا ئەیکرد بە منەتێکی گەورە بە سەر جودا، یەکێتی جودی لە خۆشناوەتی دەرکرد بو، ئەویش یەکێتی دەر ئەکا. بەشێ لە چەکدارەکانی جود کە تەسلیم بوبونەوە لای ئەنوەر بەگ بوبون بە جاش و، چەندین جاش - پێشمەرگەی پارتی لای ئەنوەر بەگ ئامێر مەفرەزە بون.

د. کەمال خۆشناو، لێپرسراوی مەڵبەندی چوار، ئەویش بەگزادەی خۆشناوە. بە زمانی شیرین هەواڵی بو نارد کە زۆر لە دانیشتوانی ناوچەکە نەکا و، واز لەو پلانە بهێنێ. ئەنوەر بەگ وەڵامی دابوەوە کە ئەو گەورەی ناوچەکەیە و، ناوچەکە هی خۆیەتی، ئەبێ مامجەلال و مەڵبەند ناوچەکە بە جێ بهێڵن. لە هەمان کات دا کردیە سەر سەرگەورە و ڕیش سپییەکانی ناوچەکە، هەموانی گل دایەوە و، بە زۆر گوندەکانی زێوە، هەرتەل، وەری، ئیوە، سەردۆڵ، میرگەسەر، چیوە... ی چەکدار کرد و، بە شۆفڵ و بلدۆزەر سەنگەر و ڕەبیەی پێ دروست کردن. کار وا بڕیشتایە هەمو ناوچەکەی ئەگرت.

لە ناو پێتواتەدا کۆمەڵە ڕێکخستنی باش و بەهێزی هەبو. ئاگاداریی وردیان لە سەر هێز و شوێنەکانی چەکدارەکانی ئەنوەر بەگ و حکومەت هەبو. مامجەلال خۆی لە بۆتێ بو، کە نزیک بو لە ناوچەکەوە. لە سەر بنچینەی ئاگاداریییەکانی شانەکانی کۆمەڵە و، بە پرس و ڕاوێژی ئەوان، نەخشەیەکی دانا بۆ گرتنەوەی ئەو گوندانەی گیرا بون و، بۆ دەرکردنی ئەنوەر بەگ لە پێتواتە. مامجەلال هێزەکانی مەڵبەندی ٣ و چواری ساز دا و، لە مەڵبەندەکانی ١ و ٢ هەندێ هێزی تری داوا کرد.

*

### نەخشەی سەرکەوت

مامجەلال نەخشەکەی بە ناوی حیزبی مامۆستا جەمال تاهیر «سەرکەوت» ەوە ناو نا بو، کە تازە بە هێزی وەرگەرانی ئوتومبێلەوە لە دۆلی بالیسان کوژبی دوایی کرد بو.

هێزەکانی کرد بو بە ۳ بەش بۆ ئەوەی لە ۳ قۆلەوە پەلامار بدەن:

قۆلی یەکەم، هێزەکانی مەلبەندی چوار بە سەرپەرشتی شەوکەتی حاجی موشیر بۆ شاخی هەوری و گرتنەوەی چیوە و سەردۆل و میرگە سەر.

قۆلی دوەم، هێزەکانی مەلبەندی سێ بە سەرپەرشتی حەسەن کوێستانی بۆ شاخی شیرە و گرتنەوەی دەرە زیوە.

قۆلی سێیەم، هێزەکانی مەلبەندی یەک و دو بە سەرپەرشتی مامجەلال خۆی، لە دۆلی شاورەوە بو سەر شاخی ماکۆک و ئینجا دابەزین بۆ ناو بیتواتە.

رۆژی ۲۰ ی تشرینی یەکەم قۆلەکەی مەلبەندی چوار هێرشەکەی دەس پێ کرد. گوندی نێرەیان گرت و شکانی جاشەکان دەستی پێ کرد و، لە هەمو قۆلەکانەوە پەلامار دران. بو رۆژی دوایی هەمو دۆلی بالیسان و بیتواتیش کەوتە دەس پێشمەرگەی یەکێتی و، هەمو هێزەکان لە بیتواتە یەکیان گرتەوە.

ئەمە شەرێکی گەورە بو، هێزێکی گەورە بەشداری تێ دا کرد و، لە ناوچەیەکی شاخاوی فراوان دا بو. توانای یەکێتی بۆ شەری گەورە دەرخست. سەرکەوتنێکی گەورە بو بۆ پێشمەرگە و بۆ دانیشتوانی ناوچەکە، وورەی خەلکی زۆر بەرز کردەوە. بەلام تالان و راوروت، بە تایبەتی لە بیتواتە، رەونەقی ئەم سەرکەوتنەی کەم کردەوە. مالی هاورێکانی کۆمەلەیش لە بیتواتە کە دەورێکی کاریگەریان هەبو لەو سەرکەوتنەدا بەر تالان و سوتان کەوت. مامجەلال لەم تالانە زۆر نارەحەت بو. فەرماندەکانی کۆ کردەو و سەرزەنشتی کردن و، لیژنەیەکی لێکۆلینەوەی دانا بۆ وەرگرتنەوەی کەلوپەلی تالانی. راستییەکەی ئوبالی ئەم کارە لە پلەی یەکەم دا ئەکەوتە سەر دەزگای راگەیاندن، بە تایبەتی رادیو، ئەک پێشمەرگەکان. چونکە دەزگای رادیو، وەکو بەشی لە راگەیاندنی شەر بۆ بەرزکردنەوەی ورە و، ئاوردانی هەلمەتی شۆرشگێرانەی پێشمەرگەکان، هانی دابون: دەستیان لێ نەپارێزن و، مالیان تالان بکەن و، خانوبەرەیان ئاگر تێ بەر بدەن.

*

### مفاوضە لە گەل بەعس

لەو چەند مانگەدا کۆنفرەنسی ناوچەیی کەرتەکانی رێکخستنی کۆمەلە تەواو بو. ئازاد هەورامی، رێکەوتی عوسمان بەگ، قادری حاجی عەلی بەگ، کە سەرپەرشتی کۆنفرەنسەکانیان کرد بو، هاتنە ناوزەنگ بۆ ئەوەی ئەنجامی کارەکەیان بۆ من باس بکەن.

ئەرکەکانی کۆنفرەنس چەند شتێ بو:

۱. هەلسەنگاندنی هەلومەرجی رێکخراوەیی، پێشمەرگەیی، دارایی.. کەرتەکە و، هەلومەرجی سیاسی کوردستان و عیراق.

۲. هەلبژاردنەوەی ئەندامانی کەرت.

۳. هەلبژاردنی نوێنەرانی کەرت بۆ کۆنفرەنسی سێیەم.

٤. وەرگرتنی بیروڕای ئەندامان لە سەر گفتوگۆ لە گەل بەعس، ئاخۆ زۆرایەتی لە

جگە لە مان، د. سەید عەزیزی شەمزینی و صەلاحەدینی موهتەدی و چەند کەسێکی تر بەردەوام نامەیان لە گەڵ مامجەلال ئالوگور ئەکرد.

*

کومەلە لە تیهران لە ناو خویان دا بریاریان دابو خانەی موعینی کە یەکی لە کادرەکانی سەرکردایەتیان بو، تازە لە زیندان بە سەربەرزی دەرچو بو، بنێرن بو کوردستانی عیراق بو لای ئێمە. محەمەدی مەلا عەلی هینا بوی بو ناوچەی ئالان بەرەو روی ئەحمەد ئەفەرلالا، جیگری فەرماندەی هەرێمی ۳ ی، کرد بوەوە بیگەیەنێتە لای ئێمە. لەو کاتەدا شوینی ئێمە ئادیار بو.

چەند روژی خانە لە گەڵ ئەحمەد بو، جەیش لە ۲۱ ی حوزەیرانی ۷۸ دا هێرشی بو کردن بو سەر «کانی بیشو» لە نزیک گوندی «دری» لە ناوچەی ماوەت. لەم هێرشەدا ۶ کەس کوژران، یەکێکیان ئەحمەد و ئەوی تریان خانە بو.

خانە، وەکو هاورێکانی ئیانوت گەنجیکی روشنبیر و تیکۆشەر و تازا بو. برای شەهیدان: سولەیمان و عەبدوللا و، کوری محەمەد ئەمینی موعینی بو.

دوای کوژرانی خانە دو کەسی تر لە هاورێکانی بریار ئەدەن بین بو کوردستانی عیراق، ئەوەدەم ئێمە لە دەراوی گورگان بوین لە قەندیل، هەردوکیمان گەیشتن: د. جەعفەری شەفیعی خەلکی بوکان و، ساعیدی وەتەندوست (کاک برایم) خەلکی سنە بون. ساعید لە گەڵ خوی چەردەیەک پارەی بو هینا بوین پاشەکەوتی کرد بو. د. جەعفەریش لەو کاتەدا بو ئێمە زور بە سود بو چونکە پزیشکمان نەبو. تەنها یەک برینپێچمان هەبو، ئەویش هەر ئێرانی بو، ئەندامی «سازمانی ئینقیلابی» بو.

دو پیاوی روشنبیر و تیکۆشەر و بە زات و ورە بەرز بون. حەزیان نەئەکرد کەس بزانی کە ئیرانین و ناویان چیە

*

روژێکیان لە بەردەمی چادرەکەی خومان دا دانیشت بوین، حەمە سەعید لە دورەوە دو کەسی بە دی کرد، یەکێکیان جلی کوردی و، ئەوی تریان پانتولیکی جینز و کراسیکی زەردی لە بەر دا بو، پرچی بەر دا بوەوە. وتی: «وابزانم روژنامەنوسە».

کە نزیک کەوتنەوە پانتول لە پیکە عومەری حاجی عەبدوللا بو. زدم پی خوش بو ئەویش بە سەلامەتی گەیشتەوە لامان. کاک عومەر لە گەڵ کاروانەکەدا رویشت بو بچی بو سوریا و، لەوێوە بە یەکجاری بروا بو ئەوروپا. قم نامەیەکیان پی دا نارد بو بو سەرکردایەتی کومەلە. بە ناو ئیران دا لە مەهابادەوە بە نهینی لە گەڵ یەکێکی شارەزادا

گەرا بومەوە. کردم بە گاڵتە لە گەڵی، وتم: «سەفەری دەرەوت کرد. دو وڵاتی بیگانەت بە بی پاسپورت و ڤیزا بینی - مەبەستم تورکیا و ئیران بو - ئیتر هەڵی گلەییت نەماوە!»
کاک عومەر لای ئیمە گیر نەبو ئیزنی خواست بو سەردانی کەسوکاری بگەڕێتەوە نزیک سلیمانی.

سەرانی قم، سامی سنجاری و هاوڕیکانی، چەند جاری لە گەڵ ئازاد هەورامی و عومەر دانیشت بون. بەو ئیعتیبارەی هەردو ڕیکخراو: «قم» و «کومەلە» مارکسیین، باسی ڕیککەوتنی دوقولی و هاوکاریان لە گەڵ کرد بون. بو دەوریەنی ئیسازی باشی خویان ئەم نامەیەیان نوسی بو و، دابویان بە عومەر بیهینی و، دریژەی قسەکانیشمان بو بگیریتەوە.

قم تاکتیکیکی زیرەکانەی هەلبژارد بو: ئەیویست یەکیتی لە ناوەوە هەڵ بوەشینی، پیوەندی لە گەڵ کومەلە و بزوتنەوە، بە جیا لە یەکیتی یان وردتر بە جیا لە مامجەلال، دروست بکا. لەوی، لە گەڵ ئازاد و عومەر لە سەرکردایەتی کومەلە دانیشت بون و، ئەم نامەیەیان بو کومەلە نوسی بو، هەر بەو جورە لە گەڵ کاک تایەر و سەید کاکەش لە سەرکردایەتی بزوتنەوە دانیشت بون و، پەیوەندییان لە گەڵ ڕەسول مامەند کرد بو.

تاکتیکەکەی سامی بە سەر ئیمەدا لە کومەلە تی نەپەڕی، ئیمە سور بوین لە سەر ئەوەی کە ئەگەر بیانەوی ڕیک بکەون ئەبی لە گەڵ یەکیتیی نیشتمانی ڕیک بکەون، نەک لە گەڵ باڵەکانی و، داوامان لی کردن چارەنوسی هەڤاڵە بزرەکانمان ئاشکرا بکەن و، لە گەڵ ئەوان کنترولی ڕیککەوتن دابمەزرینن.

بە ڕاویژ لە گەڵ مامجەلال و د. محمود وەڵامی نامەکەمان بو نوسیەوە. هەر ئەو کاتە ئەسلی نامەکەی قم و وینەی وەڵامەکەی خومانم بو ئاگاداری و هەلگرتن نارد بو هەڤاڵانی دەرەوە. ئەبی لە لایان مابی.

بەڵام تاکتیکەکەی سامی کاری لە بزوتنەوە کرد و، پشێویەکی زوری خستە ڕیزەکانیانەوە. ڕەسول و هەندی لە هاوڕیکانی شاری کە ماوەیەک بو نارازی بون لە یەکیتی، ئەو کارەساتەی بە سەر یەکیتی هات بو دانینا بە بەلگەی ڕاستیی بوچونەکانی خویان. بە تەنیا کەوتنە پەیوەندی و گورینەوەی نامە. ئەمەش پیچەوانەی ئەو ڕیککەوتنانە بو کە لە ناو خومان دا لە سەری پیک هات بوین. پەیوەندی لە نیوان هەر ۳ باڵەکە دا: کومەلە، بزوتنەوە، خەتی گشتی، لە سەر بنچینەی جوری لە فیدرالیزم ڕیک خرا بو. لە ناو یەکیتی دا هەر باڵە سەرکردایەتی تایبەتی و، سەربەخویی ئایدیولوجی و، ڕیکخراوەیی خوی هەبو، بەڵام لە کاروباری پیشمەرگەیی و، دارایی و، پەیوەندی سیاسی

